بەرگی دووەم

# مەحــرەمــی راز

## شەرحی غەزەلیاتی حافز

### ئەکرەم عەنەبی

هەولێر - ٢٠٠٨

دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

- **مەحــرەمــی راز (شەرحی غەزەلیاتی حافز)**
- نووسین: ئەکرەم عەنەبی
- نەخشەسازی ناوەوە: طــە حسین
- پیتچنین: موسلیح
- بەرگ: ئاسۆ مامزادە
- ژمارەی سپاردن: (١٦٣٣)
- نرخ: ٢٥٠٠٠ دینار (سێ بەرگ)
- چاپی یەکەم: ٢٠٠٨
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- چاپخانە: چاپخانەی خانی - دهۆك

زنجیرەی کتێب (٣١٢)



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com
ئیمەیل: info@mukiryani.com

## غەزەلی هەشتا و نۆیەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی ئەسڵەمی موسبەغ**
**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع لان)**

**١- شنیدەام سخنی خوش کە پیر کنعان گفت**
**فراق یار نە آن می کند کە بتوان گفت**

شەنیدەئەم سوخەنی خوش کە پیری کەنئان گوفت،فیراقی یـار نـە ئـان کونـەد کـە بتـەڤان گوفت.

قسەیەکی جوانم گوێ لێ بووە کە پیری کەنعان گوتوویەتی: جودایی لە یار شتێ ناکات کـە بتوانرێ بگوترێ.

شنیدەام: گوێم لێ بوە (رابردووی تەواو)    خوش: جوان، سەرنجڕاکێش    پیرکنعان: پیری شاری کەنعان، مەبەست لە حەزرەتی (یەعقوب) باوکی حەزرەتی (یوسف) ـ د.خ ـ

نە آن می کند: ئەوەناکات، شتێ ناکات    بتوان گفت: بتوانرێ بگوترێ

رەنگە هەموومان چیرۆکی جودایی حەزرەتی (یوسف) لە (یەعقوب) ـ د.خ ـ و نارەحەتی و خەم و خەفەت خواردنی حەزرەتی یەعقوب لە تاو فیراقی کوڕە خۆشەویستەکەی بزانین، کە بووە مایـەی کوێرایی داهاتنی، ئەو پیاوە زۆر چاك دەتوانێ لەبارەی فیراقەوە بدوێت و هەرچی سەبارەت بە فیراق بڵێت سەرنجڕاکێشە، چونکە کورد وتەنی (سەد حەکیم هێندەی دەردەدارێك نازانێ)، هەربۆیە خواجە کاتێ دەیەوێت باس لە فیراق بکات باشترین ڕێگە هەڵدەبژێرێت و قسەی دەردەدارێك دەکات، دەڵێ: قسەیەکم لە پیری کەنعان بیستووە دەڵێ: جودایی و فیراق کارێك بە مرۆڤ دەکات کە لـە باسـکردن نایەت، واتە هێندە ئازاراوییە ناتوانرێ بە زمان گوزارشتی لێ بکرێت.

**٢- حدیث هول قیامت کە گفت واعظ شهر**
**کنایتی است کە از روزگار هجران گفت**

هەدیسی هۆولی قیامەت کە گوفت ڤائیزی شەهر،کینایەتیست کە ئەز روزگاری هیجران گوفت.

مەسەلەی ترسی ڕۆژی قیامەت کە وتارخوێنی شـار باسـی کـرد درکەیەکـە لـە ڕۆژگـاری جودایی.

حدیث: مەسەلە، چیرۆك    هول: ترس    واعظ : ئامۆژگاریکەر، وتارخوێن    کنایە: درکە (زاراوایەکی رەوانبێژیە) وشەیەك بەکار دەهێنرێ و مەبەست لێی واتایەکی دیکەیە



بەیتەکە درێژەی باسی جودایی و دوورییە، خواجە لێرەشدا هەرباس لە نارەحەتی جـودایی و دووری یاردەکات، دەڵێ ئەو چیرۆك و مەسەلەیەی یاخود ئەو فەرمودانەی کە وتـارخوێنی شـار لەسەر ترسی ڕۆژی قیامەت باسیان دەکات درکە و کنایەیەکە کە مەینەتی و نارەحەتی ڕۆژانی جیایی و دووری لە یار دەخاتەڕوو.

واتە: ئەوترس و ناخۆشییەی کە لە کاتی دوری و جودابییدا توشی عاشق دەبێـت لـە ترسـی ڕۆژی قیامەت دەچێت، لە بەیتەکەدا بە زیاتریش خراوەتەڕوو.

**٣- نشان یار سفرکردە از کە پرسم باز**
**کە هرچە گفت برید صبا پریشان گفت**

نیشانی یاری سەفەرکەردە ئەز کە پورسەم باز،کە هەرچـە گوفـت بەریـدی سـەبا پەریـشان گوفت.

دووبارە سۆراغ و هەواڵی یاری سەفەرکرد و لە کێ بپرسـم، چـونکە سـەبای پـەیام هێنـەر هەرچی گوت تێکەڵاو و بێ واتابوو.

نشان: هەواڵ، سۆراغ    یارسفرکردە: یاری سەفەر کردوو، ناوی بکەرە    از کـە پرسـم: لـە کێ بپرسم    برید: پەیام هێنەر، پۆستەچی    پریشان: پەرێشان: تێکەڵاو، تێکەڵ وپێکەڵ

تەنیا کەسێ کە سۆراغی یاری بۆ خواجە دەهێنا (سـەبا) بـوو، کەچـی ئـەمجارە قـسەکانی پۆستەچی سەبا یاخود پەیامهێنـەری سـەبا تێکـەڵ و پێکـەڵ و بێـسەروبەربوون و خواجـە لـە مەبەستی تێ ناگات و ناتوانێ هەواڵی یاری سەفەرکردووی دەستکەوێ، بۆیە دەڵـێ دیـسانەوە سۆراغی یاری سەفەرکردوو لە کێ بپرسم.

**٤- فغان کە آن مە نامهربان دشمن دوست**
**بە ترک صبحت یاران خود چە آسان گفت**

فەغان کە ئان مەهی نا میهربانی دوشمەن دوست،بە تـەرکی سـوهبەتی یـارانی خـود چـە ئاسان گوفت.

ئەی هاوار کە ئەو مانگە نامیهرەبانـە دوژمـن دۆستە،چـەندە ئاسـان دۆسـتانی خـۆیی بەجێهێشت.

فغان: ئەی هەوار، بەداخەوە    نامهربان: نامیهرەبان    دشمن دوست: دوژمن ویـست، کەسێ کە دوژمنی خۆش بوێ    بە ترك گفتن: وازلێهێنان، بەجێ هێشتن

لە لای شاعیران یار هەمیشە لەگەڵ عاشـقدا نامیهرەبـان و لەگـەڵ دوژمنانـدا روخـۆش و میهرەبانە وەك (نالی) دەڵێ:

ئەچێ بۆ لای رەقیب قەینا وەلێ ئەو داخە کوشتومی
لە لای من چەندە مەغرور و لەکن ئەو چەندە مەجبورە

لێرەشدا (یار) هەمان ئەو یارە ئەدەبییەیە کە خەیاڵی شاعیران دروستی کردووە، لەگەڵ دۆستان، مەغرور و قسەڕەق و نامیهرەبان و روگرژ، بەڵام لەگەڵ رەقیب و دوژمنانیش مەجبور و قسەخۆش و میهرەبان و روخۆش.

گوتم: قوربانی تۆ من بم، گوتی: قوربانی تۆ سەگ بێ
گوتم: شیشەی دڵم ناتوێ؟ گوتی: بۆ چیم؟ مەکسورە

خواجە زۆر بەداخەوە و لەداخ و ئەسەفدا و لەدەست قسەڕەقی و بێ وەفایی یاری مانگئاسای هاوار دەکات.

ئەی هاوار کە ئەو مانگە ئەو یارە نامیهرەبانەی لەگەڵ دوژمناندا دۆستە چەندە بێ پەروا و چەندە بەئاسانی وازی لە هاورێیەتی یارانی خۆی هێنا.

**٥- من و مقام رضا بعد ازین و شکر رقیب**
**که دل به درد تو خو کرد و ترک درمان گفت**

مەن ومەقامی ریزا بەئد ئەزین و شوکری رەقیب،کە دل بە دەردی تو خو کەرد و تەرکی دەرمان گوفت.

منم و مەقامی رازیبون لە مەودوا و سوپاسگوزاری رەقیب، چونکە دڵ خوی بە دەردی تۆوە گرتوە و وازی لە دەرمان هێناوە.

مقام رضا: مەقامی رازیبون، رازیبوون لای عارفەکان بریتییە لە رازیبوونی دڵ بەوەی کە خودا پەسەندی کردووە، (رازیبوون) یەکێکە لە مەقامەکانی سۆفیگەری و پاش مەقامی تەوەکول(پشتبەستن بە خودا) دێت و هەندێ جار تێکەڵ بە سنووری (حاڵ) دەبێت، یاخود دەڵێن کە رازیبوون دوایین مەقام و یەکەم حاڵە. هەروەها گوتراوە کە رازیبوون چێژ بردنە لە بەلا و تاقیکردنەوەکان و دەرچوونە لە رازیکردن (رازیبونی) نەفس و هاتنە نێو رەزامەندی خودایە، بۆ شەرحی ئەم بەیتە هێندە باسی رازیبون ناکەین، چونکە لە بەیتێکی دیکەدا بە درێژی باسی مەقامی(رەزا) رازیبوون دەکەین      رقیب: چاودێر، یاخود کەسی دووەم کە یاری خۆش دەوێ
خوکرد: خوی گرت، راهات      ترك درمان گفت: وازی لە دەرمان هێنا

خواجە دەڵێ لەمەودوا من دەچمە نێو مەقامی رازیبوونەوە و بە هەموو دەرد و عەزابەکانی تۆ رازی دەبم و سوپاسی رەقیب و چاودێرەکەشت دەکەم کە ناهێڵێ بت بینم {هروی،ج١، ل٣٩٩} یاخود دروستتر سوپاسی رەقیب دەکەم کە بە بونی ئەو من توانیم بگەم



بە مەقامی رازیبوون و لەمەودوا دڵم بە هەموو دەرد و رەنجەکانی تۆ راهاتووە و ـ کە دەردی دووری سەربازی هەموویانە — وازی لە دەرمان و دکتۆر هێناوە و لە بیری چاکبوونەوە و چارەسەردا نییە.

**٦-گره به باد مزن گر چه بر مراد وزد**
**که این سخن به مثل مور به سلیمان گفت**

گرەه بە باد مەزەن گەر چە بەر موراد ڤەزەد، کە ئین سوخەن بە مەسەل مور بە سولەیمان گوفت.

پشت بە (با) مەبەستە با بە ئارەزووی تۆش هەڵکا، ئەمە قسەیەکە کە مێرولە وەك نموونە بە حەزرەتی سولەیمانی گوت.

گره: گرێ      گره به باد مزن: بە با گرێ مەدە، واتە پشت بە با مەبەستە
برمراد: بە ئارەزوو، بە ویست      وزد: هەڵکات      مثل: نموونە
مور: مێرولە سلیمان:حەزرەتی سولەیمان کوڕی حەزرەتی داود ـ د.خ ـ یەکێکە لە پێغەمبەران،خودا توانایەکی زۆری بەخشیبە حەزرەتی سولەیمان، لەوانە دەسەڵات هەبوون بەسەر با و زانینی زمانی گیانداران و.. هتد

پەیوندی مێرولە لەگەڵ سولەیماندا بە روونی لە قورئاندا باسکراوە ـ تەنانەت سورەتێ باسی حەزرەتی سولەیمان دەکات و ناوی النمل (مێرولە)ی لێنراوە ـ چونکە کاتێ سولەیمان و سوپا بێ شومارەکەی هاتن مێرولە یاخود شای مێروان هاواری کرد کە ئەی مێروان لە ترسی پێ و سمی سوپاکەی سولەیمان بچنە ژوورەوە با نەتانپلیشێننەوە.

لە نوسخەی (قزوینی، سودی،خانلری....)دا لە بری(مور) (باد) هاتوە، بەڵام لە نوسخەی (تیموری، قدسی)دا (مور) هاتوە و د. هروی گوتەنی لەبەر ئەوەی کە چیرۆکی قسە و گفتوگۆی سولەیمان و مێرولە زۆر باسی لێوەکراوە زیاتر رێی تێدەچێ کە (مور) راستتر بێت {بۆ ئەم گفتوگۆیە بڕوانە: ج١،هروی، ل٣٩٩}

لە راستیدا کاتێ کە لەو گفتوگۆیەی نێوان حەزرەتی سولەیمان و مێرولە وردەبینەوە کە لە یەکەمین تەفسیری فارسی عیرفانیانەی قورئانی پیرۆز (کشف الاسرار)ی (خواجە رەشید الدین ابو الفضل میبدی)دا هاتووە زیاتر واتای بەیتەکەمان بۆ روون‌دەبێتەوە. جگە لەوەش گرنگی ئەم چیرۆکە لەمەدایە لە (کشف الاسرار) دا هاتووە کە بە رای (داریوش ئاشوری) حافز زۆر سودی لەم تەفسیرە عیرفانیە وەرگرتوە { داریوش آشوری،معمّای حافظ، لە ئەنتەرنێتەوە} .
(میبدی) لە (کشف الاسرار) دا نووسیویەتی:

"ڕۆژێکیان سولەیمان پێغەمبەر (د.خ) کە با ودێو و باڵندە هەمویان لەژێر فەرمانی ئەودابوون، بەسەر تەختەکەیەوە لەگەڵ دەست و پێوەند و پیاوانی دەوڵەتدا دانیشتبوو مێرولەیەك هاتە سەر ڕێ و گوتی خودا لەم دونیایەدا چ کەرەمێکی لەگەڵ کردوویت؟ حەزرەتی سولەیمان (د.خ) گوتی: وەك دەبینی بای بۆ ملکەچ کردووم، گوتی: ئەی سولەیمان دەزانی ئەمە ئاماژەی چییە؟ ئەوەی بە تۆیانداوە لەم مەملەکەتە دونیاییە هەروەك بایە، لە با چ بەرهەمێك دێت، کاری مولکی دونیاش ئاوا دەبێ{خوجه رشید الدین ابو الفضل میبدی،نواخوان بزم صاحبدلان،گزیدەی کشف الاسرار و عدة الابرار، گزینش و گزارش از: د. رضا انزابی نژاد،چاپ اول، ١٣٧٤، تهران، انتشارات جامی} .

لێرەدا خواجە دەڵێ: مێرولە گوتی بە حەزرەت پشت بە با مەبەستە هەرچەندە بەپێی ویستی تۆش هەڵکات، چونکە ڕۆژێ دێت کە تەواوبێت و بێ فەرمانی بکا.

مەبەست لەوەیە کە مرۆڤ نابێ پشت بە دونیا و شتە مادییەکان ببەستێ، چونکە ئەم شتانە خۆیان زوو لەناودەچن و گەر ماوەیەك بەپێی ئارەزووی تۆ گوزەرا فریو مەخۆ.

**٧- به مهلتی که سپهرت دهد ز راه مرو**

**ترا که گفت که این زال ترک دستان گفت**

بە موهلەتی کە سیپهرەت دەهەد ز راهـ مەرو،تورا کە گوفت کە ئین زال تەرکی دەستان گوفت.

بە مۆڵەتێك کە ڕۆژگار پێی داوی لە ڕێ دەرمەچۆ، کێ بە تۆی گوت کە ئەم (زاڵ)ە وازی لە فڕوفێڵ هێناوە.

مهلت: مۆڵەت    سپهر: ئاسمان، ڕۆژگار    ز راه مرو: لە ڕێ دەرمەچۆ، هەڵە وتاوان مەکە    زال: لێرەدا درکەیە لە (ڕۆژگار) بەڵام لە بنەڕەتدا (زاڵ) زاڵی ئەفسانەیی باوکی ڕۆستەمی زاڵە، زاڵ لە (شانامە)ی شاعیری گەورەی ئێرانی (فیردەوسی)دا ـ کە بۆ یەکەمین جار ئەو بەم شێوە ورد و درێژەی ئێستا چیرۆکە ئەفسانەییەکانی کۆنی نووسیوەتەوە و ڕۆستەم زۆراب یەکێکە لەو چیرۆکە ئەفسانەییانە — بە هۆشیار و فێڵ باز وەسفکراوە
دستان: فڕوفێڵ، مەکر و حیلە

خواجە ڕۆژگار و زەمانە بە زاڵێکی زۆرزان و فێڵباز دەزانێت کە دونیایەك فڕوفێڵی شەڕ دەزانێت، بۆ نموونە ئەو فێڵەی کە ڕۆستەم لە یەکەم بەزینیدا لەگەڵ زۆرابدا کردی و بووە مایەی ڕزگاربونی لە دەستی زۆراب، بەهەرحاڵ زاڵی باوکی ڕۆستەم لە شەڕ و داستاندا



سەرباری ئازایەتی هونەری فریودانی زۆربووە، بۆیە گەر مۆڵەت بە بەرامبەر بدات بێگومان فێڵێکی تێدایە.

خواجە ڕۆژگار و زەمانە بەم زاڵە دەزانێت، بە مرۆڤ ـ ئەو مرۆڤانەی بە دونیا دەخەڵەتێن ـ دەڵێ: بە مۆڵەت و فریوکاری دونیا فریو مەخۆ و هەڵە مەکە و لە ڕێ دەرمەچۆ، چونکە کێ پێیگوتوی کە دونیای پیری فێڵباز وازی لە فڕوفێڵ و حیلەگەری هێناوە و لە پڕ لە پشتەوە خەنجەرت لێ نادات.

**٨- غم کهن به می سالخوره دفع کنید**

**که تخم خوشدلی این است و پیر دهقان گفت**

غەمی کوهەن بە مەیی سالخوردە دەفئ کونید،کە توخمی خوشدلی ئینەست و پیری دیهقان گوفت.

غەمی کۆن بە شەرابی کۆن لابەرن، چونکە تۆوی دڵخۆشی ئەمەیە و جوتیاری پیر گوتی.

سالخورده: بەساڵاچو، لێرەدا سیفەتی شەرابە، بە واتای کۆن، ماوە دێت

دفع کنید: لابەرن، بخەنەکەنار    تخم: تۆو    خوشدلی: دڵخۆشی    دهقان: جوتیار

خواجە پێی وایە کە قسەی ژیرانەی جوتیاری پیر ئەوەیە کە تۆوی دڵخۆشی (عەشق/مەی)یە، هەربۆیە ئەم عەشقە دەبێتە مایەی لابردن و بەرکەنار کردنی غەمی کۆن، و بە مرۆڤ دەڵێ: غەمی کۆنتان بە مەیی ماوە لابەرن، چونکە جوتیاری پیر (جوتیارێك کە لەنێو تۆوەکاندا پیربووە و دەزانێت چاکترینیان کامەیە) گوتویەتی تۆوی دڵخۆشی و شادمانی ئەم عەشقە یاخود (مەی)یەیە.

**٩- مزن ز چون و چرا دم که بندەی مقبل**

**قبول کرد به جان هر سخن که جانان گفت**

مەزەن ز چون و چرا دەم کە بەندەیی موقبیل،قەبول کەرد بە جان هەر سوخەن کە جانان گوفت.

دەم لە چەند و چۆن مەکوتە، چونکە بەندەی خۆشبەخت (بەختیار) ئەوەیە کە هەرچی قسەی یارە بە دڵ و گیان قبوڵی کرد.

دم زدن: دەم کوتان، قسە لەبارەوە کردن    چون و چرا: چۆن و بۆچی، هاتنی ئەم دو وشەیە پێکەوە واتە بیانو و زۆر لەسەر شت ڕۆشتن،لە کوردیدا لە جیاتی ئەمانە(چەند و چۆن) بەکاردێت

مقبل: خاوەن بەخت، خۆشبەخت    سخن: قسە

بنەمایەکی گرنگی (عەشق) لەم بەیتەدا دیاری دەکرێت، ئەویش رازیبوون و قەبوڵکردنی قسەی یارە بە دڵ و گیان و بەبێ پرسیارکردن، ئەم بنەمایەیە کە لای حەکم و عاقڵە یۆنانیەکان بە کوێر و کەڕبوون دراوەتە قەڵەم، بەڵام لای خواجە و لای عارفەکان و تەنانەت لە فەلسەفەی رۆژهەڵاتیشدا بەگوێکردن و قەبوڵکردنی بێ چەند و چونی قسە و راسپاردەکانی یار بە دڵ و بە گیان یەکێکە لە مەرج و تەنانەت لە هۆکارەکانی خۆشبەختی عاشق.

خواجە دەڵێ: گەر دەتەوێ ببیتە بەندەیەکی خاوەن شانس و خۆشبەختی یار، هەرچی گوت بە دڵ و گیان قەبوڵی بکە و بیانو مەهێنەرەوە و بەبێ چەند و چون رازی بە.

**١٠- کە گفت حافظ از اندیشەی تو آمد باز**

**من این نگفتەام آن کس کە گفت بهتان گفت**

کە گوفت هافز ئەز ئەندیشەیی تو ئامەد باز،مەن ئین نەگوفتەئەم ئان کەس کە گوفت بوهتان گوفت.

کێ گوتی حافز وازی لە بیرکردنەوە لە تۆ هێناوە، من ئەمەم نەگوتوە و ئەوەی گوتویەتی بوختانی کردووە.

اندیشە: بیرکردنەوە آمد باز: گەڕایەوە،وازی هێنا

بهتان: بوختان، درۆ هەڵبەستن

دەڵێ بوختانیان بۆ خواجە کردووە کە وازی لە مەعشوقی حەق هێناوە و لە بیریدا نەماوە، بۆیە لێرەدا خواجە بەرگری لە خۆی دەکات و بوختانی وازهێنانی خۆی لە مەعشوقی حەق بەدرۆ دەخاتەوە و دەڵێ: کێ گوتی من وازم لە عەشق و بیرکردنەوە لە تۆ و یادی تۆ هێناوە من خۆم شتی وام نەگوتوە، هەرکەسێکیش کە گوتویەیتی بوختانی پێ کردووم.

لە راستیدا ئەم بوختان و قسە هەڵبەستنە مێژووی مرۆڤایەتی تەنیوە و یەکێك لە ناشیرینترین سیفەت و سیماکانی مرۆڤە، ئیدی چ لە عەشقی مەجازیدا بێت یاخود لە عەشقی حەقیقیدا، دەتوانم بڵێم بوختانکردن بنەمایەکی گرنگی دروستبوونی رووداوە تراژیدییە راستیەکانی وەك مەرگی حەلاج و رووداوە تراژیدیە چیرۆکی و ئەدەبیەکانی وەك (عطیل) یا (ئۆتیللۆ)... هتدە.

بەهەرحاڵ ترسناکی بوختان لەو کاتەدا زیاتر دەردەکەوێت کە پەیوەست بێت بە عەشقی حەقیقی و ژیانی رۆژانەی مرۆڤەوە، لە بواری ئاینیدا کوشتن و خوێنێکی زۆر و کافرکردنی لێ دەکەوێتەوە، ترسناکی ئەم دیاردەیەیە، بۆیە خواجە یەکسەر و بە بێ دوودڵی و بە ئاشکرا رەتی دەکاتەوە.



## غەزەلی نەوەدەم:

**بەحری هەزەجی هەشتی مەکفوفی مەحزوف**

**(مفعول مفاعیلن مفاعیل فعولن)**

**١- یا رب سببی ساز کە یارم بە سلامت**

**باز آید و برهاندم از بند ملامت**

یا رەب سەبەبی ساز کە یارەم بە سەلامەت،بازایەد و برەهانەدەم ئەز بەندی مەلامەت.

خوایە هۆکارێك بسازێنە کە یارم بە سەلامەت بگەڕێتەوە و رزگارم بکات لە داوی سەرزەنشت و لۆمەی خەڵکی.

سبب: هۆکار ساز: بسازێنە، دروست بکە بازاید: بێتەوە، بگەڕێتەوە

برهاندم: رزگارم کات، نەجاتم بدا ملامت: سەرزەنشت، لۆمە

خواجە لە دووری یاردا بێ ئارام بووە و هەندێ هەڵسوکەوتی کردووە کە بوونەتە مایەی ئەوەی کە خەڵکی لۆمە و سەرزەنشتی بکات، بۆیە لێرەدا لە خوا دەپاڕێتەوە کە هۆکار و سەبەبێك فەراهەم بکات و ببێتە مایەی هاتنەوەی یار و رزگاری بکات لە لۆمە سەرزەنشتی خەڵکی.

**٢- خاك رە آن یار سفر کردە بیارید**

**تا چشم جهان بین کنمش جای اقامت**

خاکی رەهی ئان یاری سەفەرکەردە بیارید، تا چەشمی جەهان بین کونەمەش جای ئیقامەت.

خاکی رێگەی ئەو یارە سەفەرکردووە بهێنن تا چاوی جیهانبینی خۆم بکەمە جێگەی نیشتەجێبونی.

خاك رە: خاکی سەرەڕێ، خاکی رێ سفرکردە: سەفەرکردو کنمش: بیکەم

اقامت: نیشتەجێ، ئیقامت

بە شێوەیەکی هونەری و ئەدەبیانە و ناڕاستەوخۆ خواجە دەڵێ: خاك و خۆڵی سەرڕێگەی یار- ئەو خۆڵەی کە بە سەریدا چووە ـ بهێنن تا لە جیاتی کل و سورمە بیکەمە چاوم و چاوم بکەمە مەنزڵگەی ئەوخاکی سەرەڕێیە.

**٣- فریاد کە از شش جهتم راە ببستند**

**آن خال و خط و زلف و رخ و عارض و قامت**

فەریاد کە ئەز شیش جیهەتەم راە ببەستەند،ئان خال و خەت و زولف و روخ و ئاریز و قامەت.

ئەی هاوار لە هەر شەش لاوە ڕێگەیان لێگرتم، ئەو خاڵ و خەت و پرچ و گۆنا و روخسار و بەژنە.

شش: شەش          شش جهت: شەش لا، شەش لای مرۆڤ مەبەست لە (رۆژهەڵات، رۆژئاوا، باکور، باشور، سەرەوە، ژێرەوە)          راه بستن: ڕێگەگرتن

رخ: گۆنا   عارض: روخسار          قامت: بەژن و باڵا

جوانیەکانی یار ڕێگەی دەرچوونیان لە خواجە گرتووە. ئەم عارفە جوانیەکانی یار هەر شەش لایان گرتووە و ڕێگەی دەرچوونی نەماوە، هەربۆیە ناچار دەبێت هاوار و داد بکێشێ کە ئەی هەوار، هەی داد و بێ داد ئەو جوانیانەی مەعشوقی حەق (خاڵ و خەت و پرچ و گۆنا و روخسار وبەژن) لە هەر شەش لاوە ڕێگەیان لێ گرتووم، تەواوی عارفەکان گرفتاری جوانیەکانی مەعشوقن، خواجەش لێرەدا یەکێکە لەوان.

زۆر جار لە نێوان (رخ و عارض)دا جیاوازی ناکرێت بە تایبەتی گەر جودا بەکاربهێنرێن، بەڵام (عارض) هەمو دەموچاوە و روخسارە، بەڵام (رخ) بە واتای (گۆنا) دێت ـ بەلای کەمی لەم بەیتەدا ـ هەرچەندە بە واتای روخساریش بەکاردەهێنرێت بە تایبەتی لە فارسی نوێدا.

**٤- امروز که در دست توام مرحتمی کن**

**فردا که شدم خاك چه سود اشك ندامت**

ئیمروز کە دەر دەستی توئەم مەرهەمەتی کون،فەردا کە شودەم خاك چە سود ئەشکی نەدامەت.

ئەمرۆکە لە ژێر دەستی تۆدام مەرحەمەتێ بکە بەیانی کە بوومە خاك فرمێسکی پەشیمانی چ سودێکی هەیە.

دردست توام: لەژێردەستی تۆدام،دیلی تۆم          مرحمت: میهرەبانی، مەرحەمەت

فردا: بەیانی     که شدم خاك: بومە خاك، مردم          ندامت: پەشیمانی

اشك ندامت: فرمێسکی پەشیمانی

خواجە بە یار دەڵێ: ئەمرۆ کە زیندووم و لە ژێردەستی تۆ دام و هەموو شتێکم بە دەستی تۆیە، میهرەبان بەو مەرحەمەتێکم لەگەڵ بکە، چونکە کاتێ مردم و بوومە خاك فرمێسکی پەشیمانی هیچ سودێك نابەخشێ بە من با هەر فرمێسکی پەشیمانیم بۆ برژێ.

**٥- ای آنکه به تقریر و بیان دم زنی از عشق**

**ما با تو نداریم سخن خیر و سلامت**

ئەی ئانکە بە تەقریر و بەیان دەم زەنی ئەز ئیشق،ما با تو نەداریم سوخەن خەیر و سەلامەت.



ئەی ئەوکەسەی کە بە قسە و دەربڕین دەم لە عەشق دەکوتی، ئێمە قسەیەکمان لەگەڵ تۆدا نییە بە سەلامەت.

تقریر و بیان: قسە ودەربڕین          خیر و سلامت: بە خێر و سەلامەت، خوات لەگەڵ

خواجە خۆی لەو کەسانە بە دور دەگرێت کە بە زمان و قسە خەریکی حاڵ و عەشقی حەقیقین و پێی وایە کە عارفە راستەکان و ئەو بانگەشەکەرانە هیچ قسەیەکیان بۆ یەك نییە و چاکتر وایە یەکتری بەجێ بهێڵن.

عارفەکان بۆچوونیان وایە کە عەشق و خۆشەویستی خودا و سۆفیگەری مەسەلەیەکی زمانی و قسەیی نییە و حاڵەتێکی روحی و کردارییە بە گوتەی پێشینەکان عیرفان و عەشق مەسەلەیەکی حاڵییە نەوەك قیل و قالی. گەر ئەم برِوایە لای عارفەکان بە شێوەیەکی سنووردار بەرچاو بکەوێت، لای خواجە لە رادەبەدەر جەختی لەسەر کراوەتەوە، رەنگە گەر بە وردی سەیری غەزەلەکانی خواجە بکەین لە (٥٠ ـ ٦٠) غەزەلدا بە راستەوخۆ یاخود ناڕاستەوخۆ جەخت لەسەر دەرنەبڕینی عەشق بە زمان و دورخستنەوەی زمان لەم مەسەلەیە کراوەتەوە.

لێرەشدا جەخت دەکاتەوە لەسەر ئەم مەسەلەیە کە ئەی ئەوکەسەی دەتەوێ بە قسە و دەربڕین عاشق بیت ـ کە ئەمە سیفەتێکی زاهیدە روکاریەکانە کە خواجە خۆشیی لێیان نایەت ـ لە ئێمە دورکەوەرەوە و خوات لەگەڵ، چونکە هیچ قسەیەکمان نییە لەگەڵ یەکتریدا بیکەین.

د. هروی لە (عین القضاة) ـ شرح احوال و آثار دوبیتی های بابا طاهری عریان،ـ ل ٢٧٨ — ٢٧٩)ەوە لەسەر ئەم مەسەلەیە قسەیەکی پوختی وەرگرتووە، هەرکەسێ خودا بە ڕێنمایی زانست بناسێت زمانی درێژ و قسەی زۆر دەبێت! چونکە لەم حاڵەدا خودا لێی شاراوەیە و ناچار ناسینی ئەو بە زمان و دەربڕینی، بەڵام هەرکەس خوا بە وەجد و جەزبە بناسێت زمانی دەبەستریێ و توانای قسە و وەسفکردنی نامێنێ{ج١، ل٤٠٥}.

**٦- درویش مکن ناله ز شمشیر اَحبّا**

**کاین طایفه ازکشته ستانند غرامت**

دەرڤیش مەکون نالە ز شەمشێری ئەهیببا،کین تایفە ئەز کوشتە ستانەند غەرامەت.

دەورێش لە تاو شمشێری خۆشەویستان مەناڵێنە، چونکە ئەم هۆزە هەقی خوێن لە کوژراوەکە دەسەنن.

مکن نالە: مەناڵێنە، ناڵە ناڵ مەکە          احبا: خۆشەویستان،کۆی حبیبە

طایفە: هۆزە، تیرە          کشتە: کوژراو، مقتول          ستانند: دەسەنن وەردەگرن

غرامت: خوێن

ئاشكرایە کە قاتڵ و پیاوکوژ دەبێ خوێن بە خێڵی کوژراو بداتەوە و هەقی خوێن لە بکوژ دەسەنرێت نەوەك لە کوژراو، بەڵام لە مەزهەبی خۆشەویستاندا و لای تیرەی خۆشەویستان بە پێچەوانەیە، کاتێ کەسێ دەکوژن هەقی خوێنەکە دەبێ خودی کوژراوەکە ـ کەس و کاری ـ بیدەن، بۆیە ئەی دەروێش کاتێ یاران شمشێرت لێ دەدەن، مەناڵێنە نەوەك حەقی ناڵەکەت لێ بسەننەوە. بەیتەکە ئاماژەیەکی روونە بۆ دڵڕەقی و دڕندەیی خێڵی دۆستان و یاران و پێ ناچێت ئاماژەیەکی دیاریکراوی تێدابێت بۆ هۆزێك یان خێڵێك کە یاسای خوێن و حەقی خوێن بەو شێوەیە بێت، بەڵام د.هروی پێی وایە کە بە روکار ـ ظاهرا ـ تایفەیەك لە دەروێشان هەبوون بەوشێوەیە بوون و لە کاتی کوشتندا ـ کوژراو ـ یان بە کەمتەرخەم زانیوە و حەقی خوێنی لەسەر بووە {ج١، ل٤٠٥} لە راستیدا ئەم ئاماژەیەی د.هروی لە هیچ شوێنێکی دیکەدا نەهاتووە و بەندەش زۆر بە دووری دەزانم.

**٧- در خرقه زن آتش که خم ابروی ساقی**

**بر می شکند گوشەی محراب امامت**

دەر خیرقە زەن ئاتەش کە خەمی ئەبروی ساقی،بەر می شیکەنەد گوشەیی میهرابی ئیمامەت.

ئاگر لە خیرقە بەردە، چونکە چەماوەی برۆی ساقی گۆشەی میحرابی ئیمامەت تێك دەشکێنێ.

در خرقه زن آتش: ئاگر لە خیرقە بەربدە        خم: چەماوە،خواری

برمی شکند: تێکدەشکێنێ، رەونەقی ناهێڵێ، لە رەونەقی دەخات

محراب، میحراب، ئەو جێیەی نێو مزگەوت کە ئیمامی تێدا دەوەستێت

امامت: ئیمامەت، پێش نوێژی

هەمان ناکۆکی و پێشبڕکێی نێوان شەریعەت و تەریقەتە، (ساقی) رەمزی عیرفان و تەریقەت و خرقەش رەمزی شەریعەتە ـ بێگومان مەبەست لەو بەندایەتی و زوهدە سەرزاری و روکەشیانەیە کەخەڵکی پێ فریو دەدرێ و لەدڵەوە راست ناکەن ـ هەمیشە خواجە تەریقەت و عیرفان لە خرقە و زوهدی ریاکارانەی زاهیدەکان بە چاکتر دەزانێ، لێرەدا بە دروێش (بە رای سودی) دەڵێ: ئەی دەروێش خرقەت ئاگر تێبەردە و وەرە بە راستی خەریکی عەشقی خودایی بە، چونکە جوانی عەشقی خودایی ـ ساقی وەك رەمزێك و چەماوەیی و هیلالی برۆی ساقیش وەك رەمزێکی جوانی ئەو ـ هێندە رەونەقدارە کە رەونەقی هیلالی میحرابی پێشنوێژی تێکشکاندووە و بە بای داوە.



**٨- حاشا که من از جور و جفای تو بنالم**

**بیداد لطیفان همه لطف است و کرامت**

هاشا کە مەن ئەز جۆور و جەفای تو بنالەم،بیدادی لەتیفان هەمە لوتفەست وکەرامەت.

حاشا ئەگەر من لە دەست زوڵم و جەفای تۆ بناڵم، چونکە ستەمی نەرم و نیانان هەمووی نەرم و نیانی و کەرامتە.

حاشا: حاشاللە، بە واتای (هەرگیز شتی واناکەم یا ناڵێم)        جور و جفا: زوڵم و ستەم

بنالم: بناڵم        بیداد: ستەمی، ناعەدالەتی

خواجە دەزانێ یاری نەرم و نیانی ستەم و زوڵمی لێ دەکات، بەڵام ئەم جەور و جەفایەش لای خواجە لوتف و نەرمی و حیکمەت و کەرامەتە، هەربۆیە هەرگیز لە دەستیان ناناڵێنێ. دەکرێ ئەمە یەکێ بێت لە بڕوا ئەشعەریەکانی حافز کە رەنج و دەردی دونیا بە تاقیکردنەوە و ئەزمون دابنێ و بەجۆرێك لەسەر ستەمی یار بێدەنگ بێت.

**٩- کوته نکند بحث سر زلف تو حافظ**

**پیوسته شد این سلسله تا روز  قیامت**

کوتەه نەکونەد بەهسی سەری زولفی تو هافز،پەیڤەستە شود ئین سیلسیلە تا روزی قیامەت.

حافز باسی سەری زوڵفی تۆ کورت ناکاتەوە ـ دوایی پێناهێنێ ـ ئەم زنجیرە تا رۆژی قیامەت بەردەوام دەبێ.

کوتە: کورت        کوتە نکند: کۆتایی پێ ناهێنێ، کورتی ناکاتەوە

پیوسته شد: بەردەوام بوو        سلسله: زنجیر

باسی عەشق و نهێنی عەشق و پەیوەندییە رازئاساکانی عاشق و مەعشوقی حەق (پرچ) وتاریکیەکانی پرچە، خواجە زۆر لەم مەسەلەیەش واتە مەسەلەی رازی خودایی و رەشی پرچ دەدوێ و پێی وایە مەسەلەیەکە قسە زۆر هەڵدەگرێ و تا قیامەت کۆتایی نایەت، لەم بەیتەشدا ئەوە دەخاتەڕو. حافز نایەوێ و باسی نهێنی و رازی خودایی ـ زولفی تۆ ـ دوایی پێ ناهێنێ، چونکە ئەم باسە یان ئەم پرچە زنجیرەیە تا رۆژی دوایی روون نابێتەوە و بەردەوام دەبێ، ئیدی چۆن حافز کۆتایی پێ بهێنێ.

## غەزەلی نەوەد و یەکەم:

**بەحرى موزاريعى هەشتى ئەخرەبى مەكفوفى مەقسور**

**(مفعول فاعلات مفاعيل فاعلن)**

**١- اى هدهد صبا به سبا مى فرستمت**

**بنگر كه از كجا به كجا مى فرستمت**

ئەى هودهودى سەبا بە سەبا مى فرەستەمەت،بنگەر كە ئەز كوجا بە كوجا مى فرەستەمەت.

ئەى هودهودى سەبا ئەتنێرم بۆ سەبا (سەبەء)، سەيركە لە كوێ بۆ كوێت دەنێرم.

هدهد:هودهود، پەپوسلێمانە، باڵندەیەك بووە لە دەربارى حەزرەتى سولەیماندا بووە و بووەتە رەمزى نامەبەرى      هدهد صبا: باى سەبا كە وەك پەپوسلێمانە وایە
سبا/سبأ: ناوى وڵاتى بەڵقیسە، لە سەردەمى حەزرەتى سولەیماندا ژیاوە، دەكەوێتە بەشى باشورى رۆژئاواى نیوەدورگەى عەرەبییەوە      مى فرستمت: دەتنێرم
بنگر: سەیرەكە، تەماشاكە، بزانە

خواجە بە باى سەبا دەڵێت: ئەى شەماڵى نەرمى سەبا كە وەك پەپوسلێمانەكەى حەزرەتى سولەیمان هەواڵ دەبەیت و دەهێنى، دەتنێرم بۆ وڵاتى سەبەء سەیركە لە كوێ بۆ كوێت دەنێرم، واتە سەیر كە چەند بۆ دورت دەنێرم، یاخود چەندە بۆ شوێنێكى گرنگت دەنێرم.

**٢- حيف است طايرى چو تو در خاكدان غم**

**زينجا به آسمان وفا مى فرستمت**

هەیفەست تایرى چو تو دەر خاكدانى غەم، زینجا بە ئاسمانى ڤەفا مى فرەستەمەت.

حەیفەكە باڵندەیەكى وەك تۆ لە زبڵدانى غەمدابێت، لێرەوە بۆ ئاسمانى وەفات دەنێرم.

طایر: باڵندە      خاكدان: زبڵدان

خواجە ئێرە (دونیا یاخود لاى خۆى) بە زبڵدانى غەم و تەنەكەى غەم دەزانێت و وڵاتى یاریش (ئەوێ) بە ئاسمانى وەفا دەزانێ، هەرئەمە واتە ئێرەى پڕ لە غەم وڵاتى وەفانییە. بۆیە بە پەپوسلێمانە دەڵێ: حەیفە كە باڵندەیەكى وەك تۆ بەرێز كە وەفادارێكى پێغەمبەرێك بوویت لێرە لەم زبڵدانى غەم و بێ وەفاییەدا بژیت، بۆیە لێرە ناتهێڵم و دەتنێرم بۆ ئاسمانى وەفا، بۆ ئەوێ كە لاى یارە و پڕە لە وەفادارى، ئەوێ -رەنگە مەملەكەتى سەبەء بێت ـ وەك



د.هروى پێى وایە ـ یاخود لاى یار بێت ـ وەك سودى پێى وایە ـ یاخود رەنگە هیچ یەكێك لەمانە نەبێت و بارەگا و مەیخانەى عەشق بێت، بەڵام هەركوێ بێت ئێرە (دونیا) و غەم و بێ وەفاییەكانى نییە.

**٣- در راه عشق مرحلەى قرب و بعد نيست**

**مى بينمت عيان و دعا مى فرستمت**

دەر راهى ئیشق مەرهەلەیى قورب و بوئد نیست،مى بینەمەت ئەیان و دوئا مى فرەستەمەت.

لە رێگەى عەشقدا قۆناغى نزیك و دوور نیە، بە ئاشكرا دەتبینم و دۆعات بۆ دەنێرم.

مرحلە: قۆناغ، ماوەیەك كە بە یەكجار دەبڕدرێ      قرب: نزیك      بعد: دوور
مى بينمت: دەتبینم      عیان: بە ئاشكرا

خواجە پێى وایە دوورى و نزیكى جەستەیى، زەمانى و مەكانى لە عەشقدا مەسەلەیەك نییە و قۆناغێك نین لە عەشقدا هەبن، بەڵكو دەكرێ یار زۆر لێت نزیك بێت و هەست بە دوورى بكەیت، یاخود بە پێچەوانەوە، عەشق پەیوەست نییە بە دوورییە دیاریكراوەكانەوە. بۆ نموونە ئەى مەعشوق من تۆ دەبینم و كەچى دۆعاشت بۆ دەنێرم.

**٤- هر صبح و شام قافلەيى از دعاى خير**

**در صحبت شمال و صبا مى فرستمت**

هەر سوبح و شام قافلەیى ئەز دوئایى خەیر،دەر سوهبەتى شمال و سەبا مى فرەستەمەت.

هەر بەیانى و ئێوارەیەك بە هاودەمى باى شەماڵ و سەبا قافڵەیەك دۆعاى خێرت بۆ دەنێرم.

صبح و شام: بەیانى و ئێوارە      شمال: شەماڵ، بایەكى فێنك كە لە باكورەوە هەڵدەكات، بە باى رۆژهەڵات (سەبا)و بە شەماڵى باشوریش (جەنوب) دەگوترێ

بەیتەكە رونكەرەوە و درێژە پێدەرى میسراعى دووەمى بەیتى پێشوە كە نزا و دۆعا بۆ یار دەنێرێ، لێرەشدا دەڵێ: هەر بەیانى و ئێوارەیەك بە هاودەمى و هاوڕێیەتى هەر دوو شەماڵى باكور و رۆژهەڵات قافڵەیەك دۆعا و نزاى خێرت بۆ دەنێرم.

**٥- تا لشكر غمت نكند مُلك دل خراب**

**جان عزيز خود را به نوا مى فرستمت**

تا لەشكەرى غەمەت نەكونەد مولكى دل خەراب،جانى ئەزیزى خود را بە نەڤا مى فرەستەمەت.

تا لەشکری غەمت ولأتی دڵ وێران نەکات،گیانی ئازیزی خۆمت وەك بارمتە بۆ دەنێرم.

تا: تا، بۆ ئەوەی    ملك: ولأت، مەملەکەت    نوا: بارمتە، ئێستا لـە بری (نوا) (گروگان) بەکاردێت،بە داخـەوە بـارودۆخی نالـەباری سیاسـی و سـەربازی ئـەمڕۆی ئێمەی کورد هێندە نالەبارە کە پێویست بەوە ناکات (بارمتە) شەرح بکەین

خواجە دەترسێ لەشکری غەمی یار رۆژێ وابزانێت کە ئەم لەژێر فەرمانڕەوایی یار دەرچووە و عاشقێکی گوێڕایەڵ نییە و هێرش بکاتە سەری و مەملەکەتی دڵـی وێـران بکـات. جـاران و ئێستاش بۆ دڵنیابوون لە هێزێك یاخود فەرمانڕەوایەك کە لـە پادشـا هەڵناگەڕێتـەوە و یـاخی نابێت چەند کەسێك لە خۆشەویستانی لای پاشـا بـە بارمتـە دادەنـران. خواجـەش دەڵـێ: بـۆ دڵنیابوونی خۆم ـ کە ئەم بەکارهێنانە زۆر پێچەوانەی یاسای خودی بارمەتە دانانە لە لەشکری غەمی تۆ گیانی عەزیزم وەك بارمتە لات دادەنێم تا دڵنیا بیت لە عەشقت دەرناچن و فـەرمان بە لەشکری غەمت نادەی کە مەملەکەتی دڵم وێران بکات.

سەیرە خواجە دەترسێت هێرش ببەنە سەری کەچی بارمتـەش دادەنـێ، خـۆی دەبـوا داوای بارمەتەی بکردایە لە مەعشوق، هەربۆیە یاساکەی پێچەوانە کردوەتەوە، بەڵام زۆر بـە تـەواوی مەبەستی خۆی پێکاوە.

**٦- ای غایب از نظر کە شدی همنشین دل**

**می گویمت دعا و ثنا می فرستمت**

ئەی غایـب ئـەز نـەزەر کـە شـودی هەمنـشینی دل،مـی گویەمـەت دوئـاﭬو سـەنا مـی فرەستەمەت.

ئەی لە بەرچاوان نـەبوو بوویتـە هـاودەمی دڵ، دۆعـات بۆدەکـەم و درود و ئافـەرینت بـۆ دەنێرم.

غایب از نظر: لە بەرچاوان نەبوو، ئەوەی کە بە چاو نابینرێ    همنشین: هاودەم، هاومالْ

ثنا: درود و وەسف و ئافەرین کردن

خواجە بـە مەعـشوق ـ ئـەو مەعـشوقەی بـە چـاو نـابینرێ ـ دەڵـێ: بوویتـە هـاودەم و خۆشەویستی دڵم و بەردەوام درودت بۆ دەنێرم و نزات بۆ دەکەم.

**٧- در روی خود تفرج صنع خدای کن**

**کایینەی خدای نما می فرستمت**

دەر روی خود تەفەروجی سونئی خودای کون،کایینەیی خودای‌نوما می فرەستەمەت.



لە روخساری خۆتدا لە دروستکراوی خودا وردببەرەوە، چونکە ئاوێنەیەکی وات بـۆ دەنێـرم کە خودا تیایدا رەنگ دەداتەوە.

تفرج: تەماشاکردن، گەڕان،گەڕان بەدوی خۆشیدا    صنع خـدای: دروسـتکراوی خـودا

آیینە: ئاوێنە

آیینەی خدای نما: ئاوێنەیەك کە خودای تێدا دەردەکەوێ، مەبەست لە دڵی عارفـە کـە لای عارفەکان بە ئاوێنەی رەنگدانەوەی خودا دراوەتە قەڵەم

خواجە بە یاری نادیار ـ لە بەرچـاوان نـەبوو ـ دەڵـێ: دڵـم ـ کـە دڵـی عارفـە و ئاوێنـەی خوداوەندە ـ بۆ تۆ دەنێرم تـا روخـساری خـۆت کـە رەنگدانـەوەی جیلـوەی زاتـی حەقـە لـەو ئاوێنەیەدا ببینی و چێژ و لەزەتی لێ ببەیت کە چۆن خودا لە دروستکردنیدا رازاندویەتیەوە.

**٨- تا مطربان ز شوق منت آگهی دهند**

**قول و غزل بە ساز و نوا می فرستمت**

تا موتریبـان ز شـۆوقی مەنـەت ئاگـەهی دەهەنـد،قۆول و غـەزەل بـە سـاز و نـەﭬا مـی فرەستەمەت.

بۆ ئەوەی گۆرانیبێژان لە شەوق و تاسەی من ئاگادارت بکەنەوە، قەول و غەزەلت بە ساز و نەوا بۆ رەوانە دەکەم.

مطربـان: گۆرانیبێـژان    آگهـی دهنـد: ئاگـادارت بکەنـەوە

قول و غزل: وشە و غەزەل، سەرباری واتای زمانییان هەریەکێکیان جۆرێکن لە جۆرەکانی ساز: ئامێری ساز، یاخود جۆرێکە لە ئاواز    نوا: ئاواز، ئاهـەنگ، بـە رای سـودی هەر چوار وشەکە جۆری ئاوازن {ج١، ل٥٥٧} بەڵام دەکرێ مانای (قول وغزل) وشـە و یـاخود شیعر (ساز)یش ئامێر بێت

واتە: بۆ ئەوەی کە زیاتر گۆرانیبێژان بتوانن بە رێگەی گوتنی شیعرەکانی منەوە بە گۆرانی تۆ لە شەوق و تاسەی من بۆ تۆ ئاگادار بکەنەوە، شیعر و غەزەلت بە ئـاوازی (نـەوا) کـە بـە ئامێری ساز لێبدرێت بۆدەنێرم.

**٩- ساقی بیا کە هاتف غیبم بە مژدە گفت**

**با درد صبرکن کە دوا می فرستمت**

ساقی بیا کە هاتفی غەیبەم بە موژدە گوفت،با دەرد سەبرکون کە دەﭬا می فرەستەمەت.

ساقی وەرە کە فریشتەی جیهانی غەیب مژدەی پێـدام، بـە دەردەوە ئـارام بگـرە، چـونکە دەرمانت بۆ دەنێرم.

هاتف: فریشتەیەك کە لە جیهانی نادیارەوە بانگ بکات بە بێ ئەوەی دەرکەوێت
درد: دەرد
خواجە بە ساقی دەڵێ: وەرە فریشتەی جیهانی غەیب لە غەیبەوە مژدەی پێدام کە سەبر و ئارام لەسەر دەردی دروی بگرە، چونکە دەوا و دەرمانت بۆ دەنێرم.

**١٠- حافظ سرود مجلس ما ذکر خیر تست**

**تعجیل کن که اسب و قبا می فرستمت**

هافز سرودی مەجلیسی ما زیکری خەیری توست،تەئجیل کون کە ئەسب و قەبا می فرەستەمەت.

حافز سرودی کۆڕی ئێمە یادی چاکەی تۆیە، خێراکە چونکە ئەسپ و کەوات بۆ دەنێرم.

ذکر خیر: یادی چاکە، باسکردن بە چاکە     تعجیل کن: خێراکە
قبا: کەوا (کەوای جافی)

ڕەنگە مژدەکەی فریشتەی غەیب کە دەوای بۆ دەنارد ئەم بەیتە بێت کە بانگهێشتی دەکەن بۆ مەجلیس و کۆڕی یاران و باسی چاکەی دەکەن.

جاران وا باوبووە لە کاتی بانگهێشتکردنی کەسێکدا (ئەسپ و کەوا) یان بۆ ناردووە تاوەکو نەبوونی نەکاتە بیانو یان نەبێتە ڕێگر، بۆیە بە خواجەش دەڵێت: لە کۆڕ و مەجلیسی ئێمەدا بەردەوام باسی چاکەی تۆیە ـ وەك بڵێی بوەتە سرودی کۆڕەکەمان ـ خێراکە وەرەوە بۆ لامان، چونکە دەعوەتت دەکەین و ئەسپ و کەوات بۆ دەنێرین. سودی دەڵێ ڕەنگە مەبەست لە (قبا) لەم بەیتەدا (بارانی، کراسی ئاودانەدەر، سەر بەرگ، پاڵتۆی ئەمڕۆ) بێت، چونکە جاران باو بووە کە کاتێ کەسێك بانگهێشت بکرایە ئەسپ و(بارانی)یەکیان بۆ دەنارد بە تایبەتی لە ڕۆژانی باراناویدا {ج١، ل٥٥٩}.

لە (حافز)ی(خلخالی) قەزوینیدا لە بری (تعجیل کن)ی میسراعی دووەم (بشتاب هان) بەکارهاتووە کە لە ڕووی واتاییەوە هیچ جیاوازییەکیان نییە.



## غەزەلی نەوەد و دووەم:

**بەحری موزاریعی هەشتی ئەخرەبی مەکفوفی مەحزوف**

**(مفعول فاعلات مفاعیل فاعلن)**

**١- ای غایب از نظر به خدا می سپارمت**

**جانم بسوختی و ز جان دوستدارمت**

ئەی غایب ئەز نەزەر بە خودا می سپارەمەت، جانەم بسوختی و ز جان دوستدارەمەت.

ئەی لە بەرچاوان نەبوو بە خوات دەسپێرم، گیانمت سوتاند و لە گیان زیاتر خۆشم دەوێیت.

می سپارمت: دەسپێرم     دوست دارمت: خۆشم دەوێی

یار و غەمی یار و جەفای یار گیانی خواجە دەسوتێنن، بەڵام ئەمە نابێتە مایەی ئەوەی کە خواجە یاری خۆش نەوێ و بەردەوام لە گیان زیاتر خۆشی دەوێ و دەیسپێرێتە دەست خودا.

حافز بە یار دەڵێ: ئەی لە بەرچاوان نەبوو ئەتسپێرم بە خوا، گیانمت سوتاندو لە گیان زیاتر خۆشم دەوێی.

هەرئەم ئاگرەیە کە بەردەوام حەللاج دەسوتێنێ و کەچی ناشتوانێ لەژێر دەسەڵاتی یار دەربچێت، خۆشەویستی یاریش وای لە خواجە کردووە کە لەگەڵ سوتانی گیانشیدا هەرخۆشی بووێت.

**٢- تا دامن کفن نکشم زیر پای خاک**

**باورمکن که دست ز دامن بدارمت**

تا دامەنی کەفەن نەکەشەم زیر پایی خاك،باڤەرمەکون کە دەست ز دامەن بدارەمەت.

تا داوێنی کفن ڕانەکێشمە ژێر پێی خاك، باوڕمەکە کە دەست لە داوێنت بەردەم (هەڵگرم).

نکشم: نەکێشمە، نەخەمە     زیر: ژێر     پای خاك: پێی خاك     دەست ز دامن بدارمت: دەست لە داوێنت هەڵگرم، واز لە عەشقت بهێنم

میسراعی یەکەم وێنەیەکی شیعری زۆر جوان و تاکەکەسی و نوێی خواجەیە، لەلایەکەوە داوێنی بۆ کفن دروستکردووە (پێ) شی بە خاك بەخشیوە و ڕوحیشی داوەتێ، بەمەش وێنەیەکی زۆرجوان و نوێی بۆ مردن کێشاوە لە بری ئەوەی بە سادەیی بڵێت تا نەمرم دەڵێ: تا داوێنی کفنەکەم نەخەمە ژێر پێی خاکەوە. لەم وێنە شیعریەدا جگە لە جوانی شیعری ئەو

باوەڕە عیرفانیەشمان بۆ دەردەکەوێ کە مرۆڤ نامرێت و مەرگ وناشتنیش، هی کفن و ئێسك و پروسکە نەوەك مرۆڤ.

خواجە بە جوانی بە یار دەڵێ: تا نەمرم و نەمکەن بەژێر خاکەوە واز لە عەشقت ناهێنم و دەست لە داوێنت هەڵناگرم، بۆیە ئەگەر پێیان گوتی باوەڕ مەکە یاخود هەرگیز باوەڕ مەکە من واز لە عەشقت بهێنم.

**٣- محرابی ابرویت بنما تا سحرگهی**

**دست دعا بر آرم و در گردن آرمت**

میهرابی ئەبرویەت بنما تا سەهەرگەهی،دەستی دوئا بەرئارەم و دەر گەردەن ئارەمەت.

میحرابی برۆت بنوێنە تا بەرەبەیانێك دەست لە دۆعا هەڵگرم و بیخەمە گەردنت.

بنما: بنوێنە، دەرخە،نیشان بدە سحرگە: بەرەبەیان بر آرم: هەڵگرم

گردن: گەردن گردن آرمت: بیکەمە گەردنت

لە روخساری بەیتەکەدا ئەوە روونەبێتەوە کە ئەی یار برۆتم نیشان بدە تا بەرەبەیانێکی زوو کە دەستی دۆعا و نزام بەرزکردوەتەوە واز لە دۆعا و نزا بێنم و دەست بکەمە ملت و لە باوەشت بگرم، بەڵام دەبێ ئەم برۆنواندنە چی بێت کە خواجە واز لە خۆشەویسترین سەرمایەی (دۆعای بەرەبەیان) دەهێنێ بۆی (ابرو) کە سیفاتی جوانی یاری حەقە و دەرکەوتنی جیلوەکردنی زات و سیفاتی ئەوە لای خواجە لە نزای بەرەبەیان خۆشەویسترە. ئەسڵەن تەواوی نزای خواجە بۆ خاتری دەرکەوتنی ئەو جیلوە جوانەی تەواوی ئافەریدەکانە، خواجە بە مەعشوقی حەق دەڵێ: بەرەبەیانێك کە من مەشغوڵی دۆعا و نزام ـ یاخود مەشغوڵی شەریعەت و نزاکردنم و دەستم بەرزە ـ تۆ جیلوەبکە بۆ من و تیشکی نوری خۆتم بۆ دەربخە تا من واز لە دۆعا بهێنم و ئاوێزانت بم.

**٤- گر بایدم شدن سوی هاروت بابلی**

**صدگونه جادویی بکنم تا بیاورمت**

گەر بایەدەم شودەن سوی هاروتی بابلی،سەد گونە جادویی بکونەم تا بیاڤەرەمەت.

گەر ناچاریش بم بچمە لای هاروتی بابلی، دەچم و سەد جۆر جادو دەکەم تا بتهێنم.

گر بایدم شدن: گەر پێویست بکات بچم هاروت بابلی: هاروتی بابلی یاخود (هاروت و ماروت)، هاروت و ماروت لە قورئاندا هاتوە و دوو فریشتە بوون کە خوای گەورە بۆ تاقیکردنەوەی مرۆڤ ناردنیە سەرزەوی و خەڵکیان فێری سیحر و جادو دەکرد، بەڵام بەرلەوە پێیان دەگوتن کە ئێمەش تاقیکردنەوەیەن و نابێ داوای بکەن، وەك لە سورەتی (البقرە /١٠٢)



دەفەرموێ:"و ما انزل علی الملکین ببابل هروت ومروت و ما یعلمان من احد حتی یقولا انما نحن فتنة فلا تکفر.."

بەڵام لە ئەفسانەی ئاینیدا ئەم چیرۆکە بەم شێوەیە گۆڕاوە: هاروت و ماروت دو فریشتە بوون و دابەزینە سەرزەوی ـ ئەمەش لەسەرداوای خۆیان گوایە داد لەسەر زەوی پیادەبکەن ـ بەڵام پاشان لایاندا و هەموو جۆرە گوناهێکیان کرد و خوداش غەزەبی لێگرتن و لە بیرێکی بابلدا سەربەرەو خوار هەڵواسراون و دەمیشیان ناگاتە ئاو، ئەڵێن کەسێ کە بیەوێ فێری جادو ببێ لەسەر بیرەکەوە پرسیاریان لێ دەکات و فێری دەکەن.

جاران ئێمە منداڵ بووین دەیانوت ئەگەر چل رۆژ بە میز دەستنوێژ هەڵگریت و (ئەلحەمد و قولهوەڵا ـ فاتحە واخلاص) بە بەرەواژی بخوێنی و لە نوێژدا قسەی دیکە بکەیت دەبیتە جادوگەر.

ئەمانە هەمو ئەو ترسەن کە ئەمرۆ دەگوترێت و ئەو حەقیقەتە راستییە بوون کە جاران و لەسەردەمی هاروت و ماروتدا هەبوون.

(شێخ طنطاوی جواهری) لە تەفسیری (الجواهر فی تفسیر القران الکریم)دا سەبارەت بە ئەفسانەی هاروت و ماروت دەڵێ:" بە بڕوای جولەکە فریشتە مرۆڤیان بە سوك دایە قەڵەم، خوداش فەرمانی پێکردن کە لە نێو خۆیاندا دوو کەس هەڵبژێرن تا لە رواڵەتدا وەك مرۆڤیان لێ بێت، هاروت و ماروتیان هەڵبژارد و دابەزینە سەر زەوی و لە نێو مرۆڤدا مانەوە تائافرەتێك فریوی دان و (اسم اعظم) ـ ئەو ناوە شاراوە خوداییە کە هەرکەس فێری بو هەموو داوکارییەکی جێبەجێ دەبێت هەروەك ئەوەی کە حەزرەتی سولەیمان دەیزانی ـ لە وانەوە فێربوو یاخود لێی دزین و خۆی بووە ئەستێرەی زوهرە، ئیدی عەزاب دران و لە شاری بابل هێڵرانەوە تا رۆژی دوایی و ئەوانیش خەڵکی فێری جادوگەری دەکەن". ئەمە خورافاتە و چۆن ئایەتەکە ئەم مانایە هەڵدەگرێ.

مەسەلەی هەڵواسینی بەرەوخواری هاروت و ماروت لە ئەدەبیاتی کلاسیکی کوردیشدا ـ کە بە زۆری رەنگدانەوەی ئەدەبیاتی فارسییە ـ هاتوە. (نالی) دەڵێ:

رەقیب و مودەعی هەردو عەلاقەی چاوی جادوتن
لە گۆشەی گۆشەوارەت نائیبی هاروت و ماروتن

بەهەرحاڵ خواجە بە مانای قورئانی (هاروت)ی بەکارهێناوە، چونکە زیاتر مەسەلەی پەیوەندی کوفر و جادوی خستۆتەڕو، خودی گوتەکانی خواجە بەم شێوەیە : ئەی یار بۆ هێنانەوەی تۆ هەمو هەوڵێك دەدەم و هەمو رێگەیەك دەگرمەبەر تەنانەت ئەگەر ناچاریش بم بچم بۆ لای هاروتی بابلی خۆم فێری جادو بکەم کە ئەمە ئەبێتە عەزاب بۆم، بەڵام هەردەیکەم.

**٥- خواهم كه پيش ميرمت اى بى وفا طبيب**

**بيمار باز پرس كه در انتظارمت**

خاهەم كه پيش ميرەمەت ئەی بی ڤەفا تەبيب،بيمار باز پورس كه دەر ئينتيزارەمەت.

ئەی پزيشكی بێ وەفا ئەمەوێ لە بەردەم تۆدا بمرم،لەم نەخۆشە بپرسە، چونكه لە چاوەڕوانيتدام.

خواهم: ئەمەوێ      ميرم: بمرم      بى وفا: بێ وەفا      باز پرس: لێپرسينەوە، هەواڵپرسی
در انتظار : لە چاوەڕوانی

بێگومان تەنيا يارە كە پزيشكی بێوەفايە، چونكه لەلايەكەوە دەرمانی دەردی دڵی عاشقانی پێيە و لەلايەكی ديكەشەوە بێ وەفايە بەرامبەر بە پەيمانەكەی! خواجە ئەمانە چاك دەزانێ، بەڵام هێشتا داوای لێدەكات كە لێپرسينەوە و دوا ساتەكانی ژيان لای ئەو بەسەر ببات، هەربۆيە پێ ی دەڵێ : ئەی پزيشكی بێ وەفا هەواڵێكم بپرسە، چونكه ئەمەوێ لای تۆ بمرم و چاوەڕێت دەكەم.

**٦- صد جوى آب بستەام از ديده در كنار**

**بر بوى تخم مهر كه در دل بكارمت**

سەد جويی ئاب بەستەئەم ئەز ديدە دەر كەنار،بەر بوی توخمی ميهر كە دەر دل بكارەمەت.

سەد جۆگەی ئاوم بە كەناری چاومدا هەڵكردووە بە ئومێدی ئەوەی كە تۆوی خۆشەويستی و وەفا لە دڵتدا بچێنم.

جوى: جۆگە      بر بوى: بە ئوميدی      مهر: خۆشەويستی، وەفا      تخم : تۆو
بكارم: بچێنم، بڕوێنم

لە كاتی تۆوچاندندا ئاو پێويستە بۆ ئەوەی سەوزبێت، بەڵام خواجە دەڵێ: بۆ ئەوەی لە دڵی تۆدا تۆوی خۆشەويستی و وەفا بچێنم سەد جۆگە ئاوم بە لای چاومدا هەڵكردووە.

سەرەتا مەبەست لە سەد جۆگە ئاوی كەنار چاو، گريانە. سودی دەڵێ: واتە لە تاو زۆری گريانم لە كەنارمدا دەرياچە دروست بووە بە ئومێدی ئەوەی كە بەڵكو تۆ گريانم ببينی و بەزەيت بە مندا بێتەوە و منت خۆش بوێ{سودی،ج١،ل٥٦٤} شەرحی سودی هێندە ئاشكرا و تەواوە كە ئيدی پێويستی بە لێكدانەوەی ديكە نيە، بەڵام بەيتەكە ئەو پەيوەندييەشمان بيردەخاتەوە كە لە نێوان گريانی بەندە و لێبوردنی خودا داهەيە.



**٧- خونم بريخت و ز غم عشقم خلاص داد**

**منّت پذير غمزەى خنجر گذارمت**

خونەم بريخت ڤەز غەمی ئيشقەم خەلاس داد،مننەت پەزيری غەمزەيی خەنجەر گوزارەمەت.

خوێنی رژاندم و لە غەمی عەشق رزگاری كردم، منەتباری غەمزەی خەنجەر وەشێنتم.

بريخت : رژاند (ئەم كارە يەكێكی ديكەيە لە كار/ چاوگە دولايەنەكان واتە تێپەڕ و تێنەپەڕەكان ولە كورديدا بەرچاوناكەون،لێرەدا ريخت تێپەڕە )      خلاص داد: رزگاركرد
منت پذير : منەتبار      غمزە :خەمزە،ناز، عيشوە      خنجرگذار : خەنجەر وەشێن، چەقۆكێش، بەڵام چەقۆكێش لە كورديدا مانايەكی نێگەتيڤی وەرگرتووە )

غەمزە ونازی خەنجەروەشێنی يار خواجەی كوشتووە، كەچی ئەو لە بری گلەيی لە نازی چەقۆكێشی يار سوپاسگوزار و منەتبارييەتی. چونكه راستە خەمزەی يار كوشتويەتی و خوێنی راژاندوە، بەڵام نەجاتی داوە و لە غەمی عەشق رزگاری كردووە، هەربۆيە خۆی بە منەتباری ئەو خەمزە و نازە دەزانێ.

**٨- بارم دە ازكرم سوى خود تا به سوز دل**

**در پاى دم به دم گهر از ديده بارمت**

بارەم ديه ئەز كەرەم سوی خود تا بە سوزی دل،دەر پای دەم بە دەم گوهەر ئەز ديدە بارەمەت.

بە لوتف و گەورەيی خۆت بوارم بدەرێ تا بەرەو تۆ بێنم بە دڵی گەرمەوە لە بەرپێتدا سات بە سات گەوهەرت لە ديدە بۆ ببارێنم.

بار : بوار و مۆڵەت      دە: بدەرێ      از كرم : بە لوتف و گەورەيی
بە سوز دل : بەدڵی گەرەمەوە، لە ناخی دڵەوە، بە ئاگری دڵەوە      در پای : لە بەرپێتدا
دم بە دم : سات بەسات      گهر: گەوهەر      بارمت : ببارێنم

خواجە بۆ فرمێسك رشتن لە بەرپێی ياردا داوای مۆڵەت لە يار دەكات. بە يار دەڵێ: مۆڵەتم بدەرێ تا لە گەورەيی و بەخشندەيی خۆت بێم و بكەومە سەر پێت و فرمێسكی وەك گەوهەرم لە بەرپێتدا ببارێنم و بڕێژم.

**٩- حافظ شراب و شاهد و رندى نه وضع تست**

**فى الجمله مى كنى و فرو مى گذارمت**

هافز شەراب و شاهيد و ريندی نە ڤەزئی توست،فيلجولە مى كونی و فرو مى گوزارەمەت.

حافز شەراب و مەحبوب و رەندی شایستەی تۆ نییە، بەهەرحاڵ ئەیانکەیت و چاوپۆشیت لیٚ دەکەم.

شاهد : محبوب، یار، خۆشەویست ( بە رای سودی ئەم وشەیە لە فریشتە وەرگیراوە، چونکە عەرەب بە فریشتە- شاهد- یش دەڵێن ){سودی،ج١،ل٥٦٦}

نه وضع تست: شایەنی تۆنی یە، بارودۆخی تۆ نییە      فی الجملە: بە هەرحاڵ، هەرچۆن بێت

فرومی گذارمت : چاوپۆشیت لیٚ دەکەم، لێت ناگرم

ئەم بەیتە گوتەی کیٚ یە؟ نەفس یاخود روحی خودی خواجە؟ یار؟ خودا؟ قازی و فەرمانڕەوا؟ پادشا؟ فریشتەی غەیب؟ مەلا و مامۆستا؟ ٠٠٠٠یان ٠٠٠؟

نازانرێت هی کیٚ یە، بەڵام ئاشکرایە کەچی دەڵێت جۆرێك لە موژدە و چاوپۆشییە، بە خواجە دەڵیٚ: هەرچەندە مەی و یار و رەندی شایانی تۆ نییە و هەرسێکیشیان دەکەی؛ واتە هەم مەی دەنۆشی و یارت هەیە و رەندیشی، بەڵام چاوپۆشیت لیٚ دەکەم و لێت ناگرم.



## غەزەلی نەوەد و سێیەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی مەحزوف**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلن)**

**١-چە لطف بود کە ناگاە رشحەی قلمت**

**حقوق خدمت ما عرضە کرد بر کرمت**

چە لوتف بود کە ناگاە رەشحەیی قەلەمەت،هقوقی خدمەتی ما ئەرزە کەرد بەر کەرەمەت.

چ بەخشندەییەك بوو کە لەناکاو پرژەی قەڵەمەکەت، حەقی خزمەتی ئێمەی بۆ گەورەییت خستەڕوو.

ناگاە: لەناکاو، لەپڕ      رشحە: پرژە      رشحەی قلم: پرژەی قەڵەم، پرژەی مەرەکەب، مەبەست لە نووسینە      عرضە کرد: خستەڕوو

لە فەزا و واتای غەزەلەکەدا وادەردەکەویٚ کە ئەم غەزەلە یاخود بەلای کەمی چەند بەتێکی غەزەلەکە لە وەڵامی نامەیەکدا ـ رەنگە نامەیەکی خەیاڵی بێت ـ نووسراوە.

سودی پیٚ وایە کە یەکیٚ لە دۆستانی خواجە پاش ئەوەی کە ماوەیەك خواجە لە بیری دەکات، دواتر نامەیەکی بۆ دەنێرێت و باسی چاکە و دۆستایەتی پێشو دەکات، خواجەش لە وەڵامدا ئەم نامەیە دەنووسێت، هەروەها رای هرویش هەر بەم شێوەیەیە. ئەکریٚ ئەم بیرە یاخود ئەم نامەیە نامەیەکی خەیاڵی و وەهمی بێت و خەیاڵی شاعیرانەی خواجە دروستی کردبێت. هەرچۆن بێت، خواجە دەڵێت: تۆ مافی پێشووی خزمەت و دۆستیی ئێمەت بیرکردبوو کەچی لە ناکاو لوتفی قەڵەمەکەت بوو کە ئێمەت بیرکەتەوە٠

**٢- بە نوك خامە رقم کردەای سلام مرا**

**کە کارخانەی دوران مباد بی رقمت**

بە نوکی خامە رەقەم کەردەیی سەلامی مەرا،کە کارخانەیی دۆوران مەباد بی رەقەمەت.

بە نوکی خامە سەلامت بۆ نووسیوم، خوابکات کارگەی رۆژگار بیٚ نووسینت نەبیٚ.

نوك : نوك      خامە : قەڵەم      رقم کردەای : نووسیوتە      کارخانە : کارگە

دوران : رۆژگار      مباد : نەبیٚ      بیٚ رقمت : بە بیٚ تۆ

خواجە دوعای خێر بۆ نووسەری نامە دەکات و دەڵێ : بە نوکی خامەکەت سەلامت بۆ من نووسیوە و ناردووتە ئاواتەخوازم کە دونیا ( کارگەی دەوران ) بە بێ ناوی تۆ و بە بێ تۆ نەبێت و هەرگیز لە دونیا دەرنەچی ( لە کوردەواریدا دەڵێت: هەرگیز ناوت کوێر نەبێتەوە )

**۳- نگویم از من بی دل به سهو کردی یاد**

**که در حساب خرد نیست سهو بر قلمت**

نەگویەم ئەز مەنی بی دل بە سەهڤ کەردی یاد،کە دەر هیسابی خیرەد نیست سەهڤ بەر قەلەمەت.

ناڵێم بە هەڵە یادی منی بێ ئارامت کردوەتەوە، چونکە بە داوەری عەقڵ قەڵەمی تۆ هەڵە ناکات(لە حیسابی عەقڵدا نییە قەڵەمی تۆ هەڵە بکات).

نگویم : ناڵێم، وابیرناکەمەوە، وانازانم بیدل : بێ قەرار، بێ ئارام

سهو: هەڵە خرد: عەقڵ، هۆش

لێرەدا خواجە ئەو گومانە رەتدەکاتەوە کە نەوەك ( نامەنێر ) یار بە هەڵە نامەکەی ناردبێت، بەڵکو دەڵێت بە عەقڵی کەسدا نایەت و ڕێی تێ ناچێت کە قەڵەمی تۆ بە هەڵە شت بنوسێت؛ بۆیە وانازانم یاخود ناڵێم کە تۆ بەهەڵە یادی منی بێ ئارام و بێ قەرارت کردوەتەوە.

**٤- مرا ذلیل مگردان به شکر این توفیق**

**که داشت دولت سرمد عزیز و محترمت**

مەرا زەلیل مەگەردان بە شوکری ئین تۆوفیق،کە داشت دۆولەتی سەرمەد ئەزیز و موهتەرەمەت.

بە سوپاسگوزاری ئەوەی کە بەختی جاویدان تۆی خۆشەویست و بەڕێز کردووە من زەلیل مەکە.

مگردان : مەکە ذلیل مگردان : زەلیل مەکە سرمد : جاویدان، نەمر

ئەو کەسەی خواجە نامەکەی بۆ دەنێری بە هۆی بەختی باش و جاویدانییەوە لەلای هەمووان ئازیز و بەڕێز بووە؛ بۆیە خواجە پێ ی دەڵێ: بۆ خاتری ئەو بەڕێزیەت کە سوپاسی دەوێ لە جیاتی سوپاس من زەلیل و کەم مەکە ( لەم بەیتەوە وا دەردەکەوێ کە ئەم نامەیە ـ ئەگەر نامە بێت ـ بۆ کەسێکی دەسەڵاتدار نێردراوە).

**٥- بیا که با سر زلفت قرار خواهم کرد**

**که گر سرم برود برندارم از قدمت**

بیا کە با سەری زولفەت قەرار خاهەم کەرد،کە گەر سەرەم بروەڤەد بەرنەدارەم ئەز قەدەمەت.



وەرە کە لەگەڵ سەری زوڵفتدا پەیمانێك ئەبەستم، ئەگەر سەریشم تێچێت سەر لە بەرپێت هەڵناگرم.

قرار خواهم کرد : پەیمان دەبەستم سرم برود : سەرم بڕوات، سەرم تیاچێت

برندارم : هەڵناگرم

لێرەوە فەزای غەزەلەکە دەگۆڕێت و زاراوە و چەمکە عاشقی و عیرفانیەکان دێنە ناوەوە و فەزای سروشتی مادیانەی نامەکە لە دەست دەچێت ئەمەش لە غەزەلدا ـ کە یەکێ لە بنەماکانی نەبوونی یەکیەتی بابەتە ـ دیاردەیەکی ئاساییە. وەك خوی سروشتی عاشقانەی خواجە کاریگەربونی ئەم بە پرچی یار و خۆ خستنە بەرپێ ی ئەو، پەیمان لەگەڵ یاردا دەبەستی و دەڵێ : وەرە، پەیمان لەگەڵ سەری پرچتدا دەبەستم کە هەتا ئەمرم سەرم لەسەر زەوی و لەبەرپێتدابێت،تەنانەت گەر سەریشم بچێت و تیاچم سەرم لە بەرپێت بەرزناکەمەوە.

پەیوەندی بەرپێ و سەری زوڵف ( کە لە بەیتەکەدا هاتووە) بە شێوەیەکی نادیار و شاراوە ئەوە دەخاتە روو کە سەری پرچت دەگاتە پێت.

**٦- ز حال ما دلت آگه شود ولی وقتی**

**که لاله بردمد از خاك کشتگان غمت**

ز هالی ما دلەت ئاگەه شەڤەد ڤەلی ڤەقتی، کە لالە بەردەمەت ئەز خاکی کوشتەگانی غەمەت.

دڵت کاتێ بە حاڵێ ئێمە دەزانێت، کە گوڵاڵە لە سەر خاکی کوژراوانی غەمت دەربێت( سەوزبێت).

کشتگان : کوژراوان

خواجە بە (....) دەڵێ دڵتان لە حاڵی ئێمە ئاگادار دەبێتەوە، بەڵام زۆر درەنگ و تا ئێمە لە ژیانداین ئەو بە ئاگا نایەتەوە، بەڵکو کاتێ بەئاگا دێیتەوە کە گوڵاڵە سورە لە سەر گۆڕی کوژراوانی غەمت سەوزبووە و سوری گوڵاڵە بیرت دەخاتەوە کە ئەوە خوێنی کوژراوی خەمتە.

**٧- صبا ز زلف تو با هر گلی حدیثی راند**

**رقیب کی ره غمّاز داد در حرمت**

سەبا ز زولفی تو با هەر گولی هەدیسی ڕاند،رەقیب کەی رەهی غەمماز داد دەر هەرەمەت.

سەبا سەبارەت بە پرچی تۆ لەگەڵ هەموو گوڵێکدا قسەی کرد، دەرگاوان کەی ڕێگەی داوە قسەهەڵبەست بێتە حەرەمتەوە.

باهرگلی: لەگەڵ هەر گوڵێکدا، لەگەڵ هەموو گوڵێکدا، (لە کوردیدا پێکهاتەی دووەم بەکاردێ)     حدیثی راند: قسەی کرد، باسی کرد     رقیب: دەرگاوان، پاسەوانی بەردەرگا، چاودێر   غماز: قسەهەڵبەست، دووزمان

سەبا دەگەیشت بە هەر گوڵێك باسی نهێنییەکانی تۆی دەکرد و نهێنی تۆی بڵاودەکردەوە، چاودێری بەردەرگات کەی رێگەی داوە ئەم دووزمان و قسەهەڵبەستە (سەبا) بچێتە حەرەم و شوێنی مەحرەمانی تۆ (یار)ەوە ئاوا ئەم هەموو نهێنییە دەزانێت.

بەیتێکی عارفانەیە و گەر سەبا بە رەقیب و ئەوکەسانە بدرێتە قەڵەم کە قسە لە عیرفان و عەشقی ئیلاهی و نهێنیەکان دەکەن (زلف) خودی نهێنیەکانە، بەڵام خواجە لێرەدا ئەوەی پێ سەیرە کە ئەوان (سەبا ـ رەقیب) چۆن چوونەتە نێو حەرەمسەرای یارەوە.

**٨- روان تشنەی ما را بە جرعەیی دریاب**

**چو می دهند زلال خضر ز جام جمت**

رەڤانی تەشنەیی ما را بە جورئەیی دەریاب، چو می دەهەند زولالی خیزر ز جامی جەمەت.

چون ئاوی زوڵاڵی خدر (ئاوی حەیات) ت لە جامی جەمدا دەدەنێ، بە قومێك گیانی تینوی ئێمە بەسەربکەرەوە.

روان: گیان     تشنە: تینو     دریاب: بەسەربکەرەوە     می دهند: دەدەن

خضر: خدر، (زلال خضر) لە بنچینەدا (آب زلال خضر)ە، بەڵام لەبەر کێشی شیعرەکە (آب) نەهاتووە، مەبەست لە ئاوی زوڵاڵی خدر ئاوی حەیاتە کە رەمز و نیشانەی جاویدان بوون و نەمرییە     جام جم: پێکی جەمشید کە نهێنی تێدا دەردەکەوت و نیشانەی مەعریفەت و رەمزی دڵی عارفە

خواجە عیرفان و نەمری پێکەوە گرێداوە و ئەو شەراب/عەشقەی کە لە یارەوە پێی دەگات هەردووکی تێدایە؛ واتە عەشقێکی عارفانەی جاویدانی؛ هەربۆیە داوای دەکات و دەڵێ: کاتێ ئاوی حەیاتی خدرت لە پێکی جەمشیدا دەدەنێ لە بیرت بێت و گیانی تینوی منیش بە قومێك پاراو بکەرەوە.

لە هەندێ نوسخەدا ئەم بەیتەش نووسراوە:

دلم مقیم در توست حرمتش می دار

بە شکر آن کە خدا داشتەست محترمت



**٩- همیشه وقت تو ای عیسی صبا خوش باد**

**کە جان حافظ دلخستە زندە شد بە دمت**

هەمیشە ڤەقتی تو ئەی ئیسیی سەبا خوش باد،کە جانی هافزی دلخەستە زیندە شود بە دەمەت.

هەمیشە کاتی تۆ خۆش بێت ئەی سەبای عیسا نەفەس، چونکە گیانی حافزی دڵبریندار بە هەناسەی تۆ زیندوبوویەوە.

دلخستە: دڵبریندار     بە دمت: بە هەناسەت

خواجە ئەو شەماڵەی لای یارەوە هەڵدەکات بە شەماڵی مەسیحایی دەزانێت و پێی وایە وەك هەناسەی مەسیحایی مردو زیندو دەکاتەوە و گیانی خۆشی بە نیوە مردویەك زانیوە و دەڵێ: ئەی شەماڵی لای یار کە وەك نەفەسی مەسیحایت بۆ من. هەمیشە شادبیت وا هەڵتکرد و بۆنی یارت بۆ هێنام و گیانی من ـ حافز ـ ی دڵبریندارت بە هەناسەی مەسیحایت زیندوکردەوە.

## غەزەلی نەوەد و چوارەم:

**بەحری موزاریعی هەشتی ئەخرەب**

**(مفعول فاعلاتن مفعول فاعلاتن)**

**١- زان یار دلنوازم شُکری ست با شکایت**

**گر نکته دان عشقی خوش بشنو این حکایت**

زان یاری دلنەڤازەم شوکریست با شیکایەت، گەر نوکتە دانی ئیشقی خوش بشنەڤ ئین هیکایەت.

سوپاسگوزاری ئەو یارەم کە دڵم دەداتەوە، بەڵام لەگەڵ شکات و گلەییدا، گەر نوکتەی عەشق دەزانی چاك گوێ لەم چیرۆکە بگرە.

دلنواز: دڵدەرەوە    شکر: سوپاس    نکتەدان: نوکتەزان

بشنو: گوێ بگرە

خواجە نوکتەیەك سەبارەت بە عەشقی خۆی و یار دروست دەکات، لە هەمان کاتدا سوپاس و شکاتی لە یار هەیە. ئەم دو دژە پێکەوە کۆکراوەتەوە و نوکتە زانەکانی عەشق نەبێت نایزانن کە چۆن لە یەك کاتدا خواجە سوپاسی یار دەکات و گلەیی و شکاتیشی لێ دەکات؛ بۆیە دەڵێ: لە هەمان کاتدا سوپاسی دڵدانەوەی ئەو یارەم دەکەم و گلەیی و شکاتیشم لێی هەیە ئەگەر نوکتەزانی عەشقی چاك گوێ لەم چیرۆکە بگرە:

**٢- بی مزد بود و منّت هر خدمتی که کردم**

**یا رب مباد کس را مخدوم بی عنایت**

بی موزد بود و مننەت هەر خدمەتی کە کەردەم،یا رەب مەباد کەس را مەخدومی بی ئینایەت.

بێ هەقدەست و منەت بوو هەر خزمەتێکم کرد، خوایە خزمەتکراوی بێ عینایەت بە نسیبی کەس نەکەی.

مزد: هەقدەست،کرێ    مخدوم: گەورە، خزمەتکراو، ئاغا    عنایت: یارمەتی دان بە میهرەبانییەوە، چاکەکردن

بی عینایەت: دژی (عینایەت)ە

لێرەدا واتای بەیتی یەکەم روندەبێتەوە کە بۆچی لەگەڵ سوپاسدا شکات و گلەییشی لە یار هەیە.



خواجە لێرەدا دەڵێ: هەرچی خزمەتم بە یار کرد و هەرچەند خزمەتکاریم کرد نە حەقدەستم وەرگرت نە منەتیشی زانی؛ بۆیە گلەیی لێدەکەم، بەڵام بۆ دڵدانەوەم سوپاسگوزار و منەتباری ئەوم، خوایە ئاغا و گەورەی دڵڕەق و نامیهرەبان بە نسیبی کەس نەکەیت؛ واتە یاری من خزمەتکراوێکی نامیهرەبانە.

**٣- رندان تشنه لب را آبی نمی دهد کس**

**گویی ولی شناسان رفتند ازین ولایت**

ریندانی تەشنەلەب را ئابی نەمی دەهەد کەس، گویی ڤەلی شناسان رەفتەند ئەزین ڤیلایەت.

کەس ئاوێك بە رەندانی تینو نادات، دەڵێی وەلی ناسان لەم مەملەکەتە باریان کردووە.

تشنە لب: تینو    گویی: دەڵێی، وەك بڵێی    ولی: هاورێ، دۆست، هەروەها یەکێکە لە نێوەکانی خودا و لە سورەتی (الشوری)دا دووجار (هو الولی) هاتووە ئەوانیش لە ئایەتی (٩ و ٢٨)دا دەکرێ (ولی شناسان) دۆست و هاورێ ناسان یاخود خوداناسان بێت

رفتند: کۆچیان کردووە، باریان کردووە، رۆشتون

این ولایت: ئەم هەرێمە، بە قسەی سودی مەبەست لەم هەرێمە (شیراز)ە {ج١، ل٥٧٧}

لە هەرێمەکەی خواجەدا کەسێ نییە رێزی رەندان/عارفان بگرێت و قومە ئاوێکیان بداتێ تا لێوی وشك و تینویانی پێ تەڕ بکەنەوە، وەك بڵێی ئەم مەملەکەتە خوداناس، یاخود وەلی و عارف ناسی تێدا نەمابێت و هەمو پیاوچاك و خواناسەکان ئێرەیان بەجێ هێشتبێ.

**٤- هرچند بُردی آبم روی از درت نتابم**

**جور از حبیب خوشتر کز مدّعی حمایت**

هەر چەند بوردی ئابەم روی ئەز دەرەت نەتابەم، جۆور ئەز هەبیب خوشتەر کز موددەئی هیمایەت.

هەرچەندە ئابڕوت بردم، روو لە دەرگات وەرناگێڕم، ستەمی خۆشەویست خۆشترە لە پەنا و پاراستنی دوژمن.

آبم: ئابڕوم    بردی آبم: ئابڕوت بردم    نتابم: وەرناگێڕم

مدعی: دوژمن، مودەعی

ئەی یار هەرچەندە عەشقی تۆ ریسوای کردم و ئابڕوی تکاندم، بەڵام هەرگیز پشت لە دەرگا و عەشقت ناکەم، چونکە ستەم و تاڵی یاری ئازیز زۆر خۆشترە لەوەی کە دوژمن داڵدەت بدات و پاسەوانیت لێ بکات.

**٥- در زلف چون کمندش ای دل مپیچ کانجا**

**سرها بریده بینی بی جرم و بی جنایت**

دەر زولفی چون کەمەندەش ئەی دل مەپیچ کانجا،سەرها بوریده بینی بی جورم و بی جینایەت.

ئەی دڵ مەپێچرێ لە پرچی وەك کەمەندی، چونکە لەوێدا سەری زۆر دەبینی کە بێ تاوان و جینایەت بڕاون.

کمند: کەمەند، پارچە گوریس یان حەبلێکی درێژە کە سەرێکی ئەڵقەیی دەکرێت و بۆ گرتن و لە داوخستنی مرۆڤ یاخود گیانلەبەری دیکە بەکاردێت، جاران بۆ بەستنەوە و دیلکردنی پاڵەوانەکان بەکاردەهات مپیچ: مەپێچرێ، مەئاڵێ بریده: بڕاو جرم: تاوان

لە پرچی وەك کەمەندی یار سەری بڕاوی بێ تاوانی زۆر هەیە، ئەی دڵ تۆش لێی مەئاڵێ،چونکە بە دەردی ئەوان دەچی.

بە زاراوەی عارفەکان، ئەی دڵ لە نهێنی و ئەسراری ئیلاهی (پرچ) مەئاڵێ و هەوڵی کردنەوەیان مەدە، چونکە زۆرکەس لەو ڕێیەدا سەریان تیاچووە بە بێ ئەوەی هیچ گوناه و تاوانێکیان هەبووبێ.

**٦- چشمت به غمزه ما را خون خورد و می پسندی**

**جانا روا نباشد خونریز را حمایت**

چەشمەت بە غەمزە ما را خون خورد و می پەسەندی،جانا رەڤا نەباشەد خونریز را هیمایەت.

چاوانت بە غەمزە خوێنی ئێمەی خوارد و پەسەندی دەکەیت، گیانە ڕەوا نییە پارێزگاری کردن لە خوێنڕێژ.

مارا خون/خون مارا: خوێنی ئێمە روا نباشد: ڕەوانییە، نەشیاوە
خونریز: خوێنڕێژ، پیاوکوژ خون خوردن: واتە خوێنڕژاندن و کوشتن

خواجە دەڵێ: چاوانت بە غەمزە خوێنی منیان ڕژاندوە و بەمەش بووەتە پیاوکوژ و کەچی تۆ پەسەندی دەکەیت، ئەی گیانەکەم نازانی کە پارێزگاری کردن لە پیاوکوژ (کە چاوت پیاوکوژە) شیاو نییە.

**٧- در این شب سیاهم گم گشت راه مقصود**

**ازگوشەیی برون آی ای کوکب هدایت**

دەر ئین شەبی سیاهەم گوم گەشت راهی مەقسود، ئەز گوشەیی برون ئای ئەی کۆوکەبی هیدایەت.



لەم تاریکە شەوەدا ڕێگەی مەبەستم ونکردووە، ئەی ئەستێرەی ڕێنمایی لە گۆشەیەکەوە هەڵبێ.

شب سیاه: شەوی ڕەش، شەوی تاریك، تاریکە شەو گم گشت: ونبو
راه مقصود: ڕێگەی مەبەست برون آی: دەرکەوە، هەڵبێ
کوکب: ئەستێرە هدایت: ڕێنماییکەر،ڕێپیشاندەر

خواجە هیجران و دووری یار بە شەوێکی نوتەك دەزانێت کە تیایدا ڕێگەی مەبەست ون دەکرێت و خودی ئەو نەبێت کەسی دیکە ناتوانێت ڕێ پیشاندەری ڕێبوار بێت، هەربۆیە دەڵێت: لەم تاریکەشەوەدا ڕێگەی مەقصودم لێ ونبووە لە سوچێکەوە هەڵبێ ئەی ئەستێرەی ڕێنمایی. دەکرێ (هدایت) هەمان هیدایەتی خودایی بێت کە دەفەرموێ "یهدي من یشاء الی صراط المستقیم"{١٤٢/٢} . گەر دونیا بە تاریکە شەوێك بدرێتە قەڵەم و مرۆڤ ڕێگەی ون بکات ئەوا تەنیا هیدایەتی خواییە ڕێگە پیشاندەری بێت و خواجەش لێرەدا داوای ئەو هیدایەتە خواییە دەکات.

**٨- از هر طرف که رفتم جز وحشتم نیفزود**

**زنهار ازین بیابان وین راه بی نهایت**

ئەز هەر تەرەف کە رەفتەم جوز ڤەهشەتەم نەیەفزود،زینهار ئەزین بیابان ڤین راهی بی نیهایەت.

لەهەرلایەکەوە ڕۆشتم جگە لە ترس هیچم زیادی نەکرد، ئامان لەم بیابان و ئەم ڕێگە بێ کۆتاییە.

طرف: لا جز: جگە وحشت: ترس، ترس لە تەنیایی نیفزود: زیادنەبوو، زیادی نەکرد
زنهار: ئامان

ئامان لە بیابانی ڕێگەی بێ کۆتایی عەشق/ مەعریفە/ نهێنی خودایی کە لەهەر لایەکەوە دەڕۆیتە ناویەوە و بە هەر لایەکدا پەلدەکوتی لە فراوانی و کۆتاییدا جگە لە ترس هیچی دیکە پەیدا ناکەیت. ئەم مەسەلەیە زیاتر بۆ عەشق بەکاردێت ـ یاخود خواجە زیاتر بۆ عەشقی بەکاردەهێنێ ـ چونکە خواجە عەشق بە دەریای بێ کەنار و ڕێگەی بێ کۆتایی و بیابانی بێ بن ئەداتە قەڵەم.

لێرەشدا جەخت لەسەر ترسی دوایی نەهاتنی عەشقی ئیلاهی دەکاتەوە.

**٩- این راه را نهایت صورت کجا توان بست**

**کش صد هزار منزل بیش است در بدات**

ئین راه را نهایەت سورەت کوجا تەڤان بەست،کیش سەد هەزار مەنزل بیشەست دەر بیدایەت.

کەی دەتوانرێ کۆتایی ئەم رێگەیە وێنا بکرێت (تصور بکرێت) کە سەرەتاکەی سەد هەزار قۆناغ (مەنزڵگە) زیاترە.

صورت بستن: وێناکردن، تصورکردن بیش است: زیاترە

لە سودی و تیموری دا بەیتی (٨ و ١٠) بەدوای یەکدا هاتوون، لەبەرئەوەی کە واتای ئەم دوو بەیتە تەواوکەری یەکترییە پەیڕەوی لەم رێکخستنە دەکەین، جگە لەمەش بەیتی دوایی لە نوسخە دێرینەکاندا نەهاتووە، بەڵام جەنابی خورەمشاهی و غنی و هروی هێناویانە، بۆیە ئێمەش نووسیمانەوە.

لە بەیتی پێشودا باس لەم رێگەیە کرا کە بێ کۆتایە، لێرەدا زیاتر بێ کۆتایی ئەم رێگەی عەشقی حەقیقی یە روون دەکاتەوە، دەڵێ: چۆن کۆتایی ئەم رێگەیە وێنا دەکرێت لە کاتێکدا کە سەرەتاکەی یاخود هەر ئەوەڵی رێگاکە لە سەد هەزار مەقام و قۆناغ (ماوەیەك رۆشتن و دانیشتن بۆ پشودان) زیاترە. ئەم رێگەی عەشقە کە هەر سەرەتاکەی سەد هەزار قۆناغ زیاترە چۆن دەتوانرێ کۆتاییەکەی مەزەندە بکرێت.

**١٠- ای آفتاب خوبان می جوشد اندرونم**

**یك ساعتم بگنجان در سایەی عنایت**

ئەی ئافتابی خوبان می جوشەد ئەندەرونم، یەك سائەتەم بگونجان دەر سایەیی ئینایەت.

ئەی هەتاوی جوانان جۆش دەدات ناخم، تەنیا یەك کاتژمێر لە سێبەری لوتف و مەرحەمەتی خۆتدا پەنام بدە.

آفتاب: هەتاو می جوشد: جۆش دەدات، دەکوڵێت اندرون: ناخ، دڵ

بگنجان: جێم بکەرەوە، پەنام بدە سایە: سێبەر

ئەی یار کە لە نێو جواناندا وەك هەتاو تیشکدەدەیتەوە ناخ و جەرگم دەکوڵێ و جۆش دەدات کاتژمێرێك لە ژێر سێبەری لوتف و ئاگاداری خۆتدا جێم بکەرەوە، تا دەرونم فێنك بێتەوە.

لای عارفەکان جوانان سێبەرێکن لە جوانی یاری حەقیقی و ئەو وەك خۆرێك وایە بۆ جوانان و جوانانیش وەك ئەستێرە تیشکی ئەو پێچەوانە دەکەنەوە. خواجە لێرەدا بەو (یاری حەقیقی) خودای خاوەن سێبەری عینایەت و خاوەن پەنا و پشتی بەندەکان دەڵێت: لە دووری ئەم رێگە نەبڕاوەی عەشقدا ناخم جۆش دەدات ئەی خودا ماوەیەك لە سێبەری عینایەتی خۆتدا



(عینایەت: یارمەتی خودایی) جێم کەرەوە، واتە یارمەتیم بدە و لوتفی خۆتم بەسەردا ببارێنە تا ئەم رێگەی عەشقە تەی کەم.

**١١- عشقت رسد بە فریاد ور خود بسان حافظ**

**قرآن زِبَر بخوانی در چاردە روایت**

ئیشقەت رەسەد بە فەریاد ڤەر خود بە سانی هافز، قورئان زبەر بخانی دەر چاردە ریڤایەت.

عەشق بە فریات دەگات تەنانەت گەر وەك (حافز)یش بە چواردە ریوایەت قورئان بە لەبەر بخوێنی.

رسد بە فریاد: بە فریات دەگات ور خود: تەنانەت گەر بسان: وەك

زبر: بە لەبەر بخوانی: بخوێنی

چاردە روایت: چواردە ریوایەت، لە کاتی کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆزدا حەوت جۆر خوێندنەوە بەرچاو گیراوە کە بەهۆی جیاوازی شێوەزارەکانی عەرەبی و دووریان لە سەنتەری دابەزینی قورئان (مەکە و مەدینە) و لە هەمووی گرنگتر دروست نەکردنی مانای جیاوازی دژ هاتوونە ئارا.

هەریەك لەم خوێندنەوانە لە لایەن دو کەسەوە ریوایەت کراوە (گێڕدراوەتەوە) هەربۆیە پاشتر حەوت خوێندنەوە و چواردە ریوایەت بۆ قورئانی پیرۆز هاتە ئارا کە بریتی بوون لە:

١- خوێنەر: عبداللە بن عامر دمشقی (کۆچی دوایی ١١٨ك) راوی یەکەم: هشام بن عمار (١٥٣ ـ ٢٤٥) راوی دووەم: ابن ذکوان، عبدالله بن احمد (١٧٣ ـ ٢٤٢).

٢- خوێنەر: عبداللە بن کثیر مکی (٤٥ ـ ١٢٠) راوی یەکەم: البزی، احمد بن محمد (١٧٠ ـ ٢٤٣) راوی دووەم: ابو عمر محمد بن عبدالرحمن ملقب بە قُنبُل (١٩٥ ـ ٢٩١).

٣- خوێنەر: عاصم بن ابی النّجود (٧٦ — ١٢٨) راوی یەکەم: حفص بن سلیمان(٩٠ ـ١٨٠) روای دووەم: شعبە بن عیاش (٩٥ ـ ١٩٤).

٤- خوێنەر: زبّان بن علاء = ابو عمرو بصری (ح٦٨ — ١٥٤) راوی یەکەم: حفص بن عمر الدوری (م.٢٤٦) راوی دووەم: ابو شعیب سوسی، صالح بن زیاد (١٩٠ ـ ٢٦١).

٥- خوێنەر : حمزە بن حبیب کوفی (٨٠ ـ ١٥٦) راوی یەکەم: خلّاد بن خالد کوفی، ابو عیسی شیبانی (١٤٢ ـ ٢٢٠) راوی دووەم: خلف بن هشام (١٥٠ ـ ٢٢٩).

٦- خوێنەر: نافع بن عبدالرحمن مدنی (٧٠ ـ ١٦٩) راوی یەکەم: وَرش، عثمان بن سعدی مصری (١١٠ ـ ١٩٧) راوی دووەم: قالون، عسی بن مینا (١٢٠ ـ ح٢٢٠)

٧- خوێنەر: كسائی، علی بن حمزه (١١٩ ـ ١٨٩) راوی یەكەم: لیث بن خالد (م. ٢٤٠) راوی دووەم: حفص بن عمر الدوری (كه راوی ـ ابو عمرو بصری، زبان بن علاء ـ یش بووه){د.خرمشاهی، ج١، ل٤٤٧ ـ ٤٤٨}.

له سەرەتاوه تەنیا ئەم حەوت جۆره هەبوو، بەڵام پاشان تەنیا سێ خوێندنەوەی دیكه پەسەندكراو جگه لەم خوێندنەوەیه جۆری دیكه پەسەند نەدەكرا. له سەدەكانی دواتردا له نێوان ئەم ده جۆر خوێندنەوەیەدا سێ ریوایەت و سێ خوێندنەوه ناوبانگیان دەكرد كه بریتی بوون له (ریوایەتی الدوری بۆ خوێندنەوەی ابو عمرو بصری، ریوایەتی ورش بۆ خوێندنەوەی نافع، ریوایەتی حفص بۆ خوێندنەوەی عاصم){هەمان سەرچاوه}، بەڵام پاشتر ریوایەتی حفص بۆ خوێندنەوەی عاصم به تەواوی ناوبانگی دەركرد و لەگەڵ هاتنه ئارای چاپی قورئاندا به یەكجاری بوه تاكه خوێندنەوه و ئەمڕۆ نزیكەی تەواوی قورئانەكان له سەراسەری جیهانی ئیسلامی و جیهاندا بەم ریوایەت وخوێندنەوەیه.

بێگومان مەبەستی خواجه لەم چوارده ریوایەته، هەمان ئەو شێوه جیاوازانەی خوێندنەوه و ریوایەتەكانه بۆ نمونه جیاوازی (مالك، مليك، ملك) له (مالك یوم الدین)ی فاتحەدا. {بۆ درێژەی ئەم بابەته بڕوانه خرمشاهی،حافظ نامه، ج١،ل٤٤٢ ـ ٤٥١).

ئەم بەیتەی خواجه یەكێكه لەو بەیتانەی كه خوێندنەوەی جیاواز و شرۆڤه و راڤەی جیاوازی بۆ كراوه، له خوێندنەوەكان:

(هروی) ور خود (سودی) گرخود (غنی ـ قزوینی) گرخود (قشمەای) اگر خود (خرمشاهی) ارخود (تیموری) گرخود (خانلری، جلال نائینی، نذیر، عیوضی ـ بهروز) ورخود

بەڵام له روی واتاوه سێ جۆر راڤه كراوه بەم شێوەیه:

١- د.خرمشاهی باس له رای هەندێك راڤەكەران دەكات كه تەنانەت ناوداریشیان تێدایه ـ هەرچەنده ناویان ناهێنێ ـ كه پێیان وایه:

(رسد) به واتای گەیشتن هاتووه و (هاوار و ناڵه)یان به قۆناغ و مەنزڵگەیەكی عەشق داوەته قەڵەم و پێیان وایه كه خواجه گوتویەتی: تەنانەت گەر قورئان به چوارده ریوایەتیش به لەبەر بخوێنی عەشقت هەر دەگاته قۆناغی هاوار و ناڵه و له تاو عەشق دەناڵێنی. د.خرمشاهی پێی وایه كه ئەم راڤه هەڵەیه لەوەوه سەرچاوه دەگرێ كه پەیوەندییەكی بەتین له نێوان عەشق و ناڵه و هاواردا هەیه، بەڵام ئەو پێی وایه ناڵه و هاوار لوتكەی عەشق نییه و عارفه گەورەكان شتی وایان نەگوتوه تاوەكو مرۆڤ پێی بگات، ئەمه لەلایەكەوه، لەلایەكی دیكەشەوه ناڵه و



هاوار گەر هەشبێ له قۆناغه ساوا و سەرەتاییەكانی عەشقدا هەیه نەوەك له قۆناغه پێشكەوتوەكاندا {ج١، ل٤٤٩}

بێگومان رای جەنابی خورمشاهی راسته و خودی بەیتەكەش ئەم جۆره لێكدانەوەیه هەڵناگرێت، لەلایەكی دیكەوه (به فریاگەیشتن) هەتا ئێستاكەش ماوەتەوه و به هەمان واتا بەكار دێت.

٢- هەر جەنابی دكتۆر خرمشاهی دەڵێ: هەندێك پێیان وایه كه ئەم بەیته كاكڵێكی (فقهیانه)ی هەیه و گرنگی و رێزی قورئان و قورئانناسی دەخاتەڕوو، بەم شێوەیه مانای دەكەن: ئەگەر قورئانی پیرۆز وەك حافز و به چوارده ریوایەت به لەبەر بخوێنی، ئەوكاته بەم هۆیەوه عەشق به هاناتەوه دێت و دەستگرۆیت دەكات و رزگارت دەكات.{هەمان سەرچاوه ل٤٥٠}

لێرەدا (ور خود) به مانای (ئەگەر خود) هاتوه و رستەیەكی مەرجی دروستكردووه؛ واته: عەشق به فریاتدەگات ئەگەر وەك حافز قورئان به چوارده ریوایەت به لەبەر بخوێنی.

٣- رای سێیەم و شرۆڤەی سێیەم شرۆڤەیەكی واقیعی بەیتەكه و تا رادەیەكی زۆر مەشرەبێكی عارفانەشی هەیه: جەنابی{سودی، ج١، ل٥٨١ خرمشاهی،ج١،ل٤٥٠} جوانی و كاكڵداری شەرحەكەی سودی وای له خورەمشاهی كردووه كه دەقا ودەق به ئەمانەتەوه بینووسێتەوه، كه ئێمەش دەقاودەق دەینووسینەوه:

ئەگەر تۆش وەك حافز قورئانی پیرۆز به چوارده ریوایەت به لەبەر بخوێنی هێشتا بۆ گەیشتن بەس نییه، بەڵكو عەشق به فریات دەگات، گەیشتن بەخوا (وصول الی الله) به عەشقه، نەوەك به لەبەرخوێندنی حەوت جۆری قورئان به چوارده ریوایەت، چونكه گەر وابوایه به (قیاس ـ پێوان) خستنەبری ئەوا پێویست بوو تەواوی كەسانێك كه قورئانی پیرۆزییان خوێندووه، وەلی (پیاوچاك و نزیكەكان)ی خوا بن {سودی، ج١١، ل٥٨١}.

له رێبازی عارفەكاندا تەنیا لایەنی فیقهی ئایین بەس نییه بۆ گەیشتن به حەق و مەعبودی راستی، بەڵكو عەشق پێویسته و توێشوی رێگه و سەفەری دوور و درێژی رێگەی بێ كۆتایی عەشقه.

هەربۆیه خواجه دەڵێ: هەرچەنده عیبادەت بكەیت (كه له سەروی هەموویانەوه قورئان لەبەركردنه) گەر عەشقت نەبێت ئەو سوده زۆرەت پێ ناگەیەنێت و به فریات ناگات، بەڵكو تەنیا عەشق به فریات دەگات.

رەمزە ئاینییەکان لەخۆیاندا بەهایان نییە و خودای جوان بەهای پێ بەخشیون بەجێهێنانی ئەو رەمزانە بێ گیانی عاشقانە هیچ سودێك بە مرۆڤ ناگەیەنن (هەرچەندە ئەمە رایەکە لە نێو عارفەکاندا هەیە و زۆرینەی خەڵك و مەلاکان باوەڕیان پێی نییە).

هەربۆیە لەم جۆرە تێڕوانینەدا پێویستە عەشق بێتە ناوەوە، مرۆڤ بە عەشقی خودایی دەستی بە سەرفرازی دەگات نەوەك بە ئەنجامدانی ئاماژەیەکی بێ گیانی وشك و بێ تام کە خۆشی نازانێت چ دەکات.



## غەزەلی نەوەد و پێنجەم:

**بەحری هەزەجی هەشتی تەواو**

**(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)**

**١-مدامم مست می دارد نسیم جعد گیسویت**

**خرابم می کند هردم فریب چشم جادویت**

مودامەم مەست می دارەد نەسیمی جەئدی گیسویەت،خەرابەم می کونەد هەردەم فەریبی چەشمی جادویەت.

شەماڵی پرچی لولت بەردەوام مەستم دەکات و فریوی چاوی جادوگەریشت وێرانم دەکات.

مدام: بەردەوام مست می دارد: بە مەستی دەم هێڵێتەوە، مەستم دەکات

گیسو: پرچی درێژ، پەلکە

خرابم می کند: وێرانم دەکات، داغانم دەکات، تێکم دەدات، بێهۆشم دەکات

هر دم: هەمیشە، بەردەوام، هەردەم فریب: فریو

دوو شتی جوانی یار خواجە مەست و بێ هۆشی دەکەن کە ئەوانیش بۆنی پرچی لولی و فریوی چاوانی جادوگەرینی، چونکە هەمیشە لولی سیفەتی پرچ و فریوکاری و جادوگەری سیفەتی چاوانی یارە و ئەم دوو ئەندامەش عاشق مەست و بێ هۆش دەکەن، ئەم خۆی دەڵێ: هەرکاتێ شەماڵی پرچی بۆنخۆشی لولت بە دەماخم دەگات مەست دەبم، چونکە ئەم شەماڵەش بەردەوامە منیش بەردەوام مەستم، بەڵام ناز و خەمزە و فریوکاری چاوانی جادوگەرت لەوەش خراپترم لێ دەکات و داغانم دەکات.

لە رواڵەتدا (مەست/خراب) دوو سیفەتی خراپن، بەڵام لە عیرفاندا دوو زاراوەی یاخود ئاماژە بە دوو حاڵەتی چاکن، خواجە هەمیشە بە نهێنییە خوداییەکان مەست دەبێت و ئاگای لە خەلق نامێنێ و جوانی (جیلوەی یار)یش بە تەوای لە خۆی دادەڕنێت.

**٢- پس از چندین شکیبایی شبی یارّب توان دیدن**

**که شمع دیده افروزیم در محراب ابرویت**

پەس ئەز چەندین شەکیبایی شەبی یارەب تەڤان دیدەن،کە شەمئی دیدە ئەفروزیم دەر میهرابی ئەبرویەت.

پاش چەندین ئارامی و سەبر ئایا دەکرێ شەوێ ببینین کە مۆمی دیدەمان لە میحرابی برۆکانتدا داگیرسێنین.

پس: لە پاش    از: لە    شكیبایی: ئارامی،سەبر    توان دیدن: دەتوانرێ ببینرێ، دەكرێ ببینین    یارب: خوایە (بۆسەرسوڕمان بەكارهاتووە)
افروزیم: داگیرسێنین، هەڵكەین.

خواجە هێندە دووری بینیووە و ئارامی لەسەر گرتووە ئەوەندە نارەحەتی ئەو دوورییەی چەشتووە كە خەریكە بینینی یار بە مەحاڵ دەزانێت و باوەڕ نەكات كە ئیدی جارێكی دیكە چاوی بە چاوی یار دەكەوێتەوە. خواجە بۆ ئەم چاوپێكەوتنەوەیە، وێنەیەكی شیعری جوانی دروستكردووە كە ئەویش (چرای چاو لە میحرابی برۆدا هەڵكردن)ە و مەبەست لەم وێنە؛ واتە بە دیدار شادبوونەوە. هروی ئەم وێنەیە بە واتای نزاكردن لەو شوێنەدا دەزانێ، چونكە دەڵێ: (مۆم لە میحرابدا داگیرساندن) ئاماژەیە بە دابونەریتی داگیرساندنی مۆم لە میحرابی مزگەوت و شوێنی پیرۆزدا بە مەبەستی دۆعاكردن، بەم پێیەش واتای بەیتەكە دەبێتە:

بڵێی پاش ئەم هەموو ئارامگرتنە لەسەر دووریت شەوێك ببینین كە بتوانم مۆمی دیدەم لە میحرابی برۆتدا داگیرسێنم و دوبارە داوات لێ بكەمەوە. بە گشتی بەیتەكە ببینینەوەی یار بە مەحاڵ دەزانێ.

**٣- سواد لوح بینش را عزیز از بهر آن دارم**

**كە جان را نسخەیی باشد ز نقش خال هندویت**

سەڤادی لۆوهی بینش را ئەزیز ئەز بەهری ئان دارەم،كە جان را نوسخەیی باشەد ز نەقشی خالی هیندویەت.

رەشایی پەڕەی چاوم لەو روەوە(بۆیە) لا ئازیزە كە دانەیەك بێت لە نەخشی خاڵی رەشی تۆ بۆ گیانم.

سواد: رەشنوس، رەش    لوح: پەڕە    بینش: چاو، بینایی
سواد لوح بینش: گلێنە، سۆما، بیلبیلە

لە وڵاتی رۆژهەڵاتدا بە زۆری سۆمای چاو رەشە و بە دەگمەن سۆمای شین و سەوزی كاڵ ـ كە سیفەتی سۆمای ئەوروپاییەكانە بە تایبەتی باكوری رۆژئاوا ـ هەربۆیە زۆرجار بە سۆما رەشێنەی چاویش دەگوترێت، خواجە لێرەدا بەم شێوەیە وەسفی گلێنەی چاوی خۆی دەكات و دەڵێ: من ئەگەر گلێنەی چاوم (كە رەشە) خۆش دەوێ لەبەر ئەوەیە لە خاڵی رەشی تۆ دەچێت و وەك نمونەیەك یاخود دانەیەك لە خاڵی رەشی تۆیە كە لای گیانم خۆشەویستە لە چاوانمدا هەڵم گرتوە.



**٤- تو گر خواهی كە جاویدان جهان یكسر بیارایی**

**صبا را گو كە بردارد زمانی بُرقع از رویت**

تو گەر خاهی كە جاڤیدان جەهان یەكسەر بیارایی،سەبا را گو كە بەردارەد زەمانی بورقەئـ ئەز رویەت.

تۆ گەر دەتەوێ یەكسەر هەمو جیهان بۆ یەكجاری بڕازێنیتەوە، بە سەبا بڵێ ماوەیەك پەچە لە سەر روت لابدات.

یكسر: یەكسەر    بیارائی: بڕازێنیتەوە    صبا را گو: بە سەبا بڵێ    بردارد: لابات
زمانی: ماوەیەك    مرقع: روبەند، پەچە

خواجە پێی وایە كە روی یار شاراوەیە لە جیهان بۆیە جیهان ناڕازێتەوە، چونكە مەخلوقات و جیهان لە نوری روی ئەوەوە جوانی وەردەگرن. خواجە بە یار دەڵێ: گەردەتەوێ لە پڕ و یەكسەر جیهان بۆ هەتاهەتایە بڕازێتەوە ماوەیەك خۆتیان بۆ دەرخە تا لە نوری جوانی تۆ بۆ هەتاهەتایە جوان بن، تۆ بە شەماڵ بڵێ كە ماوەیەك روبەندەكەی سەرت ـ پەردەكەی روخسارت ـ لابدات تا جیهان بە نورت بڕازێتەوە.

خواجە لەم بەیتەدا زیرەكانە دەیەوێت یار وا لێ بكات روبەندەكەی لابات تا خۆی بیبینێ، بەڵام بەداخەوە ئەو روبەندەی سەر رومەتی یار خودی خۆمانین وەك خواجە بە خۆی دەڵێ:(تو خود حجاب خودی حافظ از میان برخیز)واتە: بۆ بینینی یار دەبێ حیجابی خۆمان لابەرین، خۆزگە بەو رۆژەی كە ئەو پەردەیە هەڵدەدەینەوە.

**٥- و گر رسم فنا خواهی كە از عالم براندازی**

**برافشان تا فرو ریزد هزاران جان ز هر مویت**

ڤە گەر رەسمی فەنا خاهی كە ئەز ئالەم بەرەندازی،بەرەفشان تا فرو ریزەد هەزاران جان ز هەر مویەت.

ئەگەر دەتەوێ نەریتی تیاچون (فنا) لە جیهاندا هەڵگری (نەمێنێ) پرچت راوەشێنە تا هەزاران گیان لە هەرمویەكتەوە بكەوێتە خوارەوە.

براندازی: لاببەیت، هەڵگریت، لەناوببەیت    برافشان: راوەشێنە، بتەكێنە
فرو ریزد: بكەوێتە خوارەوە، بەربێتەوە    زهر: لە هەر

خواجە پێی وایە پرچی یار بووەتە مایەی تیاچونی گیانەكان یاخود بووەتە مایەی دروستبونی (فنا) توانەوە و لەخۆدەرچون گەر ئەم پرچە لولە بكرێتەوە ئیدی (فنا) یان تیاچوون و مەرگ نامێنێ. خواجە بە یار (ئەو یارەی كە نهێنییەكانی هەموانی توشی فەنا و تیاچوون كردووە)

دەڵێ: گەر دەتەوێت دابونەریتی فەنا ـ لەناوچوون ـ لە جیهاندا لاببەیت و هەڵی بگریت، پرچت راتەکێنە تا هەزاران گیان لە هەر مویەکی بکەوێتە خوارەوە و ئیدی تیاچون نامێنێ.

ئەم گوتانە فەزایەکی عیرفانی دروست دەکەن، لای خواجە نهێنییە خوداییەکان بوونەتە هۆی هاتنە ئارای (فەنا/ لەناوچون) ئەگەر ئەو نهێنیانە بکرێنەوە ئیدی کەس گیرۆدە نابێت. خواجە بڕوای وایە مرۆڤ گیرۆدەی کردنەوەی راز و نهێنییە خوداییەکانە و گەر ئەو راز و نهێنانە بکرێتەوە و شیبکرێتەوە کەس گیرۆدە نابێت.لێرەشدا خواجە شەڕی خۆی دەکات، چونکە گیرۆدەترین کەس بە نهێنییەخودایەکانەوە خودی ئەوە.دیسانەوە بە داخەوە دەبێ چاوەڕێی تەواوبوونی خۆمان بکەین و پاشان بە هیوای کردنەوەی ئەو گرێ کوێرانەی ژیان بین (بە هزری دیل و سنوورداری نێو زەمان و مەکان)، چونکە دەمێکە قەڵەمەکانی چارەنووس هەڵگیراون و لاپەڕەکانیش وشك بوونەتەوە.

**٦- من و باد صبا مسکین دو سرگردان بی حاصل**

**من از افسون چشم مست و او از بوی گیسویت**

مەن و بادی سەبامسکین دو سەرگەردانی بی هاسیل،مەن ئەز ئەفسونی چەشمی مەست و ئو ئەز بویی گیسویەت.

من و بای سەبای بێ چارە دوو سەرگەردانی بێ ئەنجامین، من لە جادوی چاوی مەست و ئەو لە بۆنی پرچت.

مسکین: بێ چارە، داماو، هەژار(سودی) دەڵێ گەر سیفەتی سەبا بێت  واتای ـ میسکبار ـ دەدات بەڵام ئەوەی راستی بێت ئەم جۆرە دەربڕینە لە فارسیدا بەرچاو ناکەوێ چونکە فارس لە بری مسك ـ مشك بەکار دەهێنن بەو واتایە دەبوایە (مشکین) بوایە،سودی هەربەم لێکدانەوەیە لە شرۆڤەکەشدا جیاواز بوەتەوە چونکە پێی وایە نابێ هەژار ـ مسکین ـ بدرێتە پاڵ سەبا لە کاتێکدا لە شیعردا هەمو ئەم دانە پاڵانە دروست و رێ پێدراوە هەربۆیە بە رای بەندە (سودی) خۆماندو کردنێکی بێ سودی ئەنجامداوە و واتای دروستی( هەژار،داماو)ە

سرگردان: سەرگەردان، ئاوارە  بی حاصل: بێ ئەنجام

خواجە هاوڕێیەك بۆ خۆی پەیدا دەکات کە وەك خۆی دورە لە یار و مەستی یارە ـ سەبا. دەکرێ هەمان خودی نەفس بێت کە بەردەوام لەگەڵماندایە، بەهەرحاڵ هەندێ جار ئەم (سەبا)یە دەبێتە هاوڕێ ـ هەرچەندە جاروبار دەبێتە رەقیب ـ لێرەدا سەباش داماو و بێ چارە وەك خواجە، هەردوکیان پێکەوە سەرگەردان و ئاوارەی بێ بەرهەم و ئەنجامن، هەردوکیان بە هۆی نهێنییەکانی یارەوە، خواجە جادوی چاوی مەست و سەباش بۆنی پرچی.



بەیتەکە فەزایەکی عیرفانی تەواوی هەیە: (چاوی مەست) (پرچ ـ پرچی لول) نهێنی و شاراوە خوداییەکانن خواجە و سەباش دو عاشقی داماو و ئاوارەی رێگەی بێ نیهایەتن.

ئەوەی کە شاعیر لە دو بەیتی یەکەمدا بە ئاشکرا نەیدەخستەڕو (پێویستی ئەم بەدەرکەوتن و شیکردنەوەی نهێنییە) لێرەدا بە ئاشکرا دەیخاتەڕو، ئەی یار من و سەبا هەردوکمان داماو و سەرگەردانی بێ ئەنجامین (لە شیکردنەوەی رازەکاندا) من لەدەست جادوی چاوی مەستت و ئەو لە بۆنی پرچت.(جەنابی د.سروش) سەبارەت بەم بەیتە نوسیویەتی: " لە زاراوەی عارفانەدا جیهان پرچی (گیسو) خودایە واتە سروشت تاریکخانەیە، کەمترین پلەی وجودە و هاودەم و دراوسێی تاریکییە ئەوکاتە ئەو زانا و فەیلەسوفانەی کە دەیانەوێ لە بەڵگەی سیستەم و وجوب و ئیمکان و عیلەت و مەعلولەوە خوا بناسن هەمان ئەو کەسانەن کە چاوەکانیان خوی بە تاریکییەوە گرتوە و تاریکی و زوڵمەتی پرچی خوداوەند ئەوانی فریوداوە و مەستی کردون، ئەم مەستییە زۆر جیاوازە لە مەستیی ئەو کەسانەی کە سەیری چاوی خوداوەند دەکەن و لەو شەرابە دەنۆشن، عارفەکان ئەو کەسانەن کە مەفتونی ئەفسونی چاون"{ عبدالکریم سروش، حدیث بندگی و دلبردگی،ل٢٧٩ ـ٢٨٠، مؤسسەء فرهنگی صراط، چاپ دوەم، اسفند١٣٧٥ك.ه}

بەم پێیە خواجە جیاوازی لە نێوان مەفتونی و سەرگەردانی و مەستی خۆی و سەبادا دادەنێت و دەڵێ راستە هەردوکمان دو بێ حاصڵی ئاوارەین بەڵام من مەستی خودی چاوانی مەستی تۆم و ئەو لە گێژاو و زوڵوماتی پرچتدا مەستە.

**٧- زهی همت که حافظ راست کز دنیی و از عقبی**

**نیامد هیچ درچشمش بجز خاك سر کویت**

زیهی هیمەت کە هافز راست کز دنیا و ئەز ئوقبا،نەیامەد هیچ دەر چەشمەش بجوز خاکی سەری کویەت.

ئافەرین لەم هیمەتە کە حافز هەیەتی کە لە دونیا و ئاخیرەتدا جگە لە خاکی سەرکۆڵانی تۆ هیچی لە بەرچاو نییە(کە لە دونیا و ئاخیرەتدا جگە لە خاکی سەرەڕێت هیچ شتێ لە بەرچاوی بەهای نییە).

زهی: ئافەرین، ماشەڵڵا،وای        راست : هەیەتی        دنی: دنیا        عقبی: دواڕۆژ

خواجە ئافەرینی ئازایەتی و هیممەتی خۆی دەکات و لە هەمان کاتیشدا سەری لێ سوڕماوە، چونکە لە دونیا و لە دواڕۆژیشدا جگە لە یار هیچی دیکەی بەلاوە گرنگ نییە و هەمو شتەکان لە پێش چاوی بێ بەهان.

ئەم قۆناغە قۆناغێكی پێشكەوتوی عیرفانە و چاوپۆشیكردنە لە جگەلەخودا (یار) هـەمان ئەو قسانە بوو كە (رابیعەی عەدەوی) دەیكـردن و دەیگـوت: خوایـە گـەر لەبـەر بەهەشـت و جەهەنم دەتپەرستم لە بەهەشت بێ بەشم بكە و بمخەرە دۆزەخەوە، بەڵام گـەر لەبەرخۆتـە، بـێ بەشم مەكە لە بینینی خۆت، خواجەش گەیشتووە بەم پلەیە كـە شـتەكانی دونیـا و ئـاخیرەتی بەلاوە بێ بەهاترە لە خاكی سەرەرێی یار.

وەك گوتمان ئەمە پلەیەكی بەرزی عیرفانە و تیایدا هەمو شـتەكان سـفر دەبنـەوە و تـەنیا خودی یار دەمێنێتەوە. لە (كلیات شمس)داهاتوە:

طواف حاجیان دارم بگرد یار می گردم
بهانه كردەام نان را ولیكن مست خبازم
نه اخلاق سگان دارم نه بر مردار می گردم
نه بر دینار می گردم كه بر دیدار می گردم

{بە نەقڵ لە: حدیث بندگی و دلبردگی،ل٤٧}

**** **** ****

بە كۆتایی هاتنی ئەم غەزەلە قافیەی (ت) تەواو دەبێت و لە پیتی (ت) تـا (خ) ش چـوار پیتی (ث، ج، چ،ح)ش هەن كە دەبووایە ببن بە پیتی قافیەی غەزەلەكانی خواجە، لـە راسـتیدا لە تەواوی نوسخە جیاوازەكاندا ـ بە پشتگوێ خستنی راسـتی و دروسـتی دانـەپاڵ حافزیـان ـ (٨) غەزەل هەن كە سەرواكەیان ئەم پیتانەیە. بۆ نمونە لە حافزی (تیمـوری)دا سـێ غـەزەلی (ث) و دوانـی (ج) و یـەك (چ) و دو (ح) بەرچـاو دەكـەون {تیمـوری، ل١٧٢ ـ١٨٠}. لـە شەرحەكەی(سودی)یشدا یەك غەزەلی (ث) و یـەك (ج) و دو (ح) هەیـە، بـەڵام لـە نوسـخەی قەزوینیدا تەنیا یەك غەزەلی (ث) و یەكێكی (ج) و یەكێكی (ح) هەیە، ئەمە لەكاتێكـدا كـە لە نوسخەی (د. رشید عیوضـی ـ كە لەسەر هەشت دێرینترین نوسخەی حافز ساغكراوەتەوە كە تازەترینیان تەنیا نزیكەی سی ساڵێك پاش كۆچی دوایی خواجە نوسراوەتەوە و ئەوانی دیكەیان كۆنترن ـ) و (د.هروی)دا هیچ غەزەلێك بەرچاو ناكەوێت كە سەروایان ئەم چوار پیتە بێت.

ئـەوەی وای لـە بەنـدە كـرد كـە هـیچ كـام لـەم غەزەلانـە شـرۆڤە نەكـەم لەلایەكـەوە پەسەندنەكردنی رای (د. رشید عیوضی ) (د.هروی)... بوو، بەڵام لەلایەكی دیكەوە بوونی ئەو جیاوازییە زۆرە بوو لە نێوان نوسخەكاندا كە لەو سێ غەزەلەدا هەبوو كە لە نوسخەی قەزوینی دا هەیە. لێرەدا هەوڵ دەدەین هەندێك لەو جیاوازیانە بخەینەڕو.



١- غەزەلی (ث): سەرەتا پێویستە ئەوە بڵێین كە ئەم غەزەلـە لـە پاشـقافیەی (الغیـاث) كۆتایی دێت، لە نوسخەی (تیموری) دا بووەتە سێ غەزەل {تیموری ل١٧٢ ـ ١٧٤}، بەڵام لە نوسخەی : (ب، جـن، س، سـا، ش، ی)دا نـەهاتوە{ تیمـوری ل١٧٤} لـەو غەزەلەشـدا كـە هاوبەشە لە نێوان نوسخەكاندا ئەم جیاوازانە بەرچاو دەكەوێ:

أ- لە نوسخەی تیموریدا (١١) بەیت و لە سودیدا (٧) و لـە قەزوینیـدا (٥) و لـە (ك) دا (٧) لە (مج)دا (٦) بەیتە.

ب- بەیتی چوارەم لە سودی و قەزوینی و (ك) و (م)دا بەم شێوەیەیە:

خون ما خوردەاند این كافر دلان          ای مسلمانان چه درمان الغیاث

بەڵام میسراعی یەكەمی لە نوسخەی دیكەدا (خون ما خوردەاند و روگردان شدند)ە.

ج- بەیتی پێنجەم لە سودیدا ـ كە بەیتی حەوتەمی تەیموریە ـ بەم شێوەیە:

داد مسكینان بده ای روز وصل          از شب یلدای هجران الغیاث

بەڵام لە (ك)دا لە بری (از شب) (درشب) هاتووە.

٢- غەزەلی (ج): لەم غەزەلەشدا كە لـە نزیكـەی نیـوەی نوسـخەكاندا هـاتووە، چـەندین جیاوازی دەبینرێ:

ا- میسراعی یەكەم و دووەمی بەیتی یەكەم لە هەندێك لە نوسخەكاندا پێش و پاش خراوە وەك (سوی) و (تیموری)

ب- ئەم غەزەلە لە سودیدا (٩) و لە قزوینی دا (٨) و لە تیموریـدا (١٠) و لـە (ك) دا (٨) بەیتە.

ج- بەیتی دووەم لە قەزوینی دا بەم شێوەیە:

دو چشم شوخ تو برهم زده ختا وحبش          به چنین زلف تو ماچین دهند داده خراج

بەڵام میسراعی یەكەم لە (ك) و سودیدا (دو چشم مست تو آشـوب جملـە تركـستان) و لـە (م)دا (دو چشم مست تو آشوب جمله خوبان) و لە تیموریشدا (دو چشم مست تو برهم زند ختـا وختن) هاتوە.

د- لە قزوینی دا بەیتی سێیەم بـەم شـێوەیە (بیـاض روی تـو روشـن چـو عـارض رخ روز سواد زلف سیاه تو هست ظلمت داج)

بەڵام لە سودیدا (بیاض روی تو روشن تر آمد از رخ روز
سواد زلف تو تاریكتر ز ظلمت داج) و
لە تیموریدا (بیاض روی تو روشن تراست از رخ روز  سواد زلف تو تاریكتر ز ظلمت داج)

لە (ك) دا لەبری (از رخ روز)ی میسراعی یەکەم (رخ نور) و لە (مج)دا (ازمە بدر) و هەروەها میسراعی دوەمیش بەم شێوەیەیە :

(زلف سیاه تو ظلمت شب داج).

٣- غەزەلی (ح): ئەم پیتە لە نوسخەی تیموری و سودیدا دو غەزەلە، بەڵام لەو غەزلە هاوبەشەی کە لە سودی و قەزوینی و نوسخەکانی دیکەشدا هەیە چەند جیاوازییەك بەرچاو دەکەوێ وەك:

أ- لە قەزوینی و سودی و نوسخەی دیکەدا (٨) بەیت و لە تیموردا (١١) بەیتە.

ب- بەیتی دوەم لە قەزوینی دا بریتیە لە (سواد زلف سیاه تو جاعل الظلمات بیاض روی چو ماه تو فالق الاصباح)

لە سودی و (ك)دا : (سواد زلف تو بنمود جاعل الظلمات     بیاض روی تو بگشود فالق الاصباح) لە تیموری و کۆمەڵێ نوسخەی دیکەشدا هەمان شێوەی سودی هەیە، بەڵام لە بری (زلف) (روی) هاتووە.

د- بەیتی سێیەمی قزوینی ( ز چنین زلف کمندت کسی نیافت خلاص     از آن کمانچەی ابرو و تیر چشم نجاح)

لەگەڵ ئەوەی ئەم بەیتە لە سودی و تەیموری و نوسخەکانی دیکەدا بەیتی سێیەم نییە ـ رەنگە لە زۆربەیاندا پێنجەم بێت ـ بەم شێوەیە هاتووە:

(ز چنگ زلف کمندت کسی نیافت نجات     نە از کمناچەی ابرو و تیر چشم نجاح)

بەڵام لە نوسخەی (م)دا میسراعی دووەم بەم جۆرەیە:

(نە از کمان دو ابروی تو ز چشم نجاح)

د- گەورەترین جیاوازییەك کە لەم غەزەلەدا دەبینرێ، جیاوازی بەیتی (تەخەلوس)ە، چونکە بەیتی (تەخەلوس) لای (قزوینی) جیاوازە لە بەیتی (تەخەلوس) لە نوسخەکانی دیکەدا، بەیتی (تەخەلوس) لە قزوینی دا بریتییە لە:

صلاح و توبە و تقوی زما مجو حافظ     ز رند و عاشق و مجنون کسی نیافت صلاح

بەڵام ئەم بەیتە لە نوسخەکانی دیکەدا دوو بەیت پێش کۆتاییە و بەم شێوەیەیە ـ بە لەرەچاو گرتنی جیاوازی دیکە:

صلاح و توبە و تقوی (زما مجو هرگز) سودی (مجموی هیچ ازما) تیموری (مجوی از من مست) م (ك. ئەم بەیتەی تێدانییە). ز رند و عاشق و مجنون کسی نجست فلاح (سودی) ز رند عاشق مجنون کسی نیافت فلاح (تیموری).



هەروەها (بەیتی تەخەلوس) ی تیموری و سودی و نوسخەکانی دیکە بەم شێوەیەیە:

دعای جان تو ورد زبان حافظ باد     همیشە تا کە بود متصل مسا و صباح

بەڵام لەم بەیتەی (قزوینی)دا لەبری (حافظ باد) (مشتاقان) هاتووە.

ئەوەی شایانی ئاماژە پێکردنە تیموری سەبارەت بە یەکەمین غەزەلی (خ)ش گومانی بۆ هەموان دروست کردووە، چونکە لە تێبینییەکانیدا نووسیویەتی: (اوحدی کازرونی) ئەم غەزەلە بە هی حافز نازانێت، بەڵام نەیگوتوە هی کێیە، هۆیەکەش بۆ ئەوە دەگێڕێتەوە کە پاش مەرگی خواجە (شاە شجاع) فەرمانی داوە کە هەرکەسێ غەزەلێکی خواجە بهێنی (٢٠٠) دیناری وەك دیاری پێ بدرێت، هەربۆیە لە هەمولایەکەوە غەزەل دەدرایە پاڵ خواجە و دەهێنرا، بەڵام تیموری بە پشتبەستن بە (محمد گلندام)کۆکەرەوەی دیوانی حافز و هاوسەردەم و هاوڕێی ئەو ئەم رایە رەتدەکاتەوە، چونکە بێدەنگ بونی (گلندام) سەبارەت بەم غەزەلە پاك و یەکلایەنە بوونی غەزەلەکە دەسەلمێنێ.

هەرچۆن بێت دەکرێ یەکەم غەزەلی (خ)ی قزوینی بنوسرێتەوە، چونکە سەرباری ئەم گوتەیەی سەرەوە و بوونی لە نوسخە دێرینەکاندا و نووسینەوەی لەلایەن گەورەکانەوە تا رادەیەکی زۆر نزیکی لە رایەکاندا هەیە، بەڵام سەبارەت بەم (٨) غەزەلەی پێشو ئەوا جیاوازیەکان گەلێ لەوە زیاترن کە قەڵەمی کورتی ئێمە لێرەدا خستیەڕوو، هەربۆیە بەندە وای بە چاك دەزانم کە لێرەدا ئێمەش نەبینە پاڵپشت بە پشتڕاستکردنەوەی هەندێ غەزەلی گومانلێکراو ـ هەرچەندە بەندە غولامێکم زیاتر هیچ نییم و گەورەکان پێشتر ئەو هەنگاوانەیان هەڵگرتووە.

## غەزەلی نەوەد و شەشەم:

**بەحری هەزەجی شەشی مەحزوف**

**(مفاعیلن مفاعیلن فعولن)**

**١- دل من در هوای روی فرّخ**

**بود آشفته همچون موی فرّخ**

دلی مەن دەر هەڤای روی فەرروخ،بوڤەد ئاشوفتە هەمچون مویی فەرروخ.

دڵی من لە تاسەی دیداری روی موبارەك (شاد)دا وەك موی پیرۆز پەرێشانە.

هوا: ئارەزو، مەیل، تاسە فرّخ: موبارەك، پیرۆز آشفتە: پەرێشان موی: مو

دڵی خواجە لە تاسە و ئارەزوی دیداری روی پیرۆز و موبارەکی یاردا وەك پرچی پەرێشان و ئاڵۆسکاو پەشێو و ئاڵۆسکاوە. بەیتەکە وەسفێکی سادەی پەرێشانی دڵە لە تاسەی دیداری روخساری موبارەك و پیرۆزدا.

**٢- بجز هندوی زلفش هیچکس نیست**

**کە برخوردار شد از روی فرّخ**

بجوز هیندویی زولفەش هیچکەس نیست،کە بەرخوردار شود ئەز روی فەرروخ.

جگە لە پرچی رەشی هیچکەس نییە کە بەهرەمەند بوبێ لە روی پیرۆز.

بجز: جگە هندو: رەش، هیندی هندوی زلفش/ زلف هندویش: پرچی رەش

برخوردار: بەهرەمەند، پشك بردن

روی پیرۆزی یار پاکە و تەنیا دەستی پرچی رەشی خۆی نەبێت کەسی دیکە نەیتوانیوە لێی بەهرەمەند بێت و نەبووەتە پشکی کەس.

دەکرێ (هندو) بە هیندیش راڤە بکرێت.

**٣- سیاهی نیك بخت است آنکە دایم**

**بود همراە و همزانوی فرّخ**

سیاهی نیکبەخت ئەست ئانکە دایم،بوڤەد هەمراە و هەمزانوی فەرروخ.

رەشێکی بەختەوەرە ئەوەی کە هەمیشە هاودەمی پیرۆز (فرخ)ەو ئەژنۆ بە ئەژنۆی فەرروخ دادەنیشێ.



سیاه: رەش، کۆیلەی رەش نیك بخت: بەختەوەر، خۆشبەخت زانو: ئەژنۆ

همزانو: ئەژنۆ بە ئەژنۆ

ئەو رەشە خۆشبەخت و بەختەوەرەی کە هەمیشە لەگەڵ روی یار و هاودەمی یارە و تا ئەژنۆی ئەو دێت و ئەژنۆی ناوە بە ئەژنۆیەوە هەمان پرچی رەشی بەیتی دووەمە.

**٤- شود چون بید لرزان سرو بستان**

**اگر بیند قد دلجوی فرّخ**

شەڤەد چون بید لەرزان سەرڤی بوستان،ئەگەر بینەد قەدی دلجویی فەرروخ.

دار سەروی باغ وەك بی دەلەرزێت ئەگەر بەژنی پەسەنکراوی پیرۆز ببینێت.

بید: بی لرزان: لەرزین دلجو: پەسەند، پەسەندکراوی دڵ

(فرخ) وەك سیفەتێك یاخود ناوێك بۆ یار بەکاردەهێنرێت هەرچەندە لە تەواوی بەیتەکانیشدا مانای زمانی خۆی لەدەست نادات.

سودی لەکۆتایی ئەم غەزەلدا (فرخ آغا)ی هێناوە، بەڵام (هروی) دەڵێ: بەڵگەیەك بە دەستەوە نییە کە بزانرێت ئەم (فرخ آغا)یە کێییە و (همایون فرخ)یش بە فەرمانڕەوای (رەی) داوەتە قەڵەم{د.هروی، ل٤٣١} سەبارەت بەم غەزەلە سودی پێی وایە کە ئەمە یەکێکە لە غەزەلە سست و لاوازەکانی خواجە {سودی، ج٢، ل٦٥٦}.

لێرەدا مەسەلەی وەك بی لەرزینی دار سەرو هێنراوە لە کاتێکدا کە بەژنی پەسەندکراوی دڵبەری یاری موبارەك دەبینێ، سودی پێی وایە لە غیرە و داخدا دەلەرزێ، هرویش دەڵێ لە حەسودی دا وەك بی دەلەرزێ. بێگومان لەرزین لە کاتی داخ و حەسودی بگاتە لوتکە یاخود لە کاتی توڕەیی و ترسی زۆردا رو دەدات.لێرەدا گەر غیرە و حەسودی وەرگرین ئەوا واتای بەیتەکە دەبێتە:

دارسەروی نێو باغ کە بە بەژنرێکی بە ناوبانگە کاتێ کە بەژن و بالای رێك و جوانی موبارەك و پیرۆزی (یار)ی بینی لە حەسودی و داخدا وەك بی کەوتە لەرزین.

بەڵام دەکرێ بڵێین دارسەروی نێو باغ کە رەونەقی جوانی باغە و ئەمەش بە بەژنرێکی و قەد و باڵاکەوەیە کاتێ بەژن و باڵای موبارەکی یاری بینی لە ترسی لەدەستدانی ئەو رەونەقەی وەك بی کەوتە لەرزین.

**٥- بدە ساقی شراب ارغوانی**

**بە یاد نرگس جادوی فرّخ**

بدە ساقی شەرابی ئەرغەڤانی،بە یادی نەرگسی جادوی فەرروخ.

ساقی به یادی چاوانی سحراوی (پیرۆز/یار)ەوە شەرابی ئەرخەوانی رەنگمان بدەرێ.

شراب ارغوانی: شراب ئەرخەوانی رەنگ (سوری ئاڵ)　　بەیاد: به یادی، به خۆشی

نرگس جادو: چاوی سحراوی، چاوی فریودەر و جادوگەر

چاوانی یار سیحراوییه و مرۆڤ مەست دەکات، هەربۆیە شەراب چاوانی مەست و جادوگەری یار بیری خواجه دەخاتەوه و به ساقی دەڵێ: به یادی چاوانی (پیرۆز/یار)ەو شەرابی سورمان بدەرێ.

**٦- دوتا شد قامتم همچون کمانی**

**ز غم پیوسته چون ابروی فرّخ**

دوتا شود قامەتەم هەمچون کەمانی، ز غەم پەیڤەستە چون ئەبروی فەرروخ.

له تاو غەم بەژنم وەك کەوان چەمایەوه وەك برۆی پیرۆز (یار).

دوتا شد: دوو لا بو، وەك برۆ دووبەش بوو، چەمایەوە　　کمانی: کەوان، کەوانی

پیوسته: بەردەوام، بەڵام لێرەدا دەکرێ وەك برۆ بێت درێژکراوه و بەیەکداچونی برۆ بێت

بەژن و باڵای رێکی خواجه له تاو غەمی بەردەوام یاخود غەم ـ دەکرێ غەمی عەشق بێت ـ هەروەك برۆی چەماوەی یار وەك کەوان چەمیوەتەوە.

**٧- نسیم مشك تاتاری خجل کرد**

**شمیم زلف عنبر بوی فرّخ**

نەسیمی موشکی تاتاری خەجیل کەرد،شەمیمی زولفی ئەنبەربویی فەرروخ.

شەماڵی میسکباری تاتاری شەرمەزارکرد، بۆنی پرچی عەنبەرباری پیرۆز (یار).

مشك: میسك　　تاتاری: تەتەری، تەتەرستان، شوێنی ژیانی ئەو ئاسکانەی میسکیان لێوه دەردەهێنرێت و میسکی تاتاری زۆر بەناوبانگ بووه

خجل کرد: شەرمەزار کرد　شمیم: بۆنی خۆش　　عنبر بو: عەبنەربار، عەنبەرین

له وەسفی یاردا دەڵێ: بۆنی خۆشی عەنبەرینی پیرۆز/یار هێندە خۆشە، شەماڵی بۆنداری میسکی تاتاری شەرمەزارکرد که زۆر ناوبانگی هەیه؛ واته بۆنی پرچی یار له بۆنی میسك خۆشترە.

**٨- اگر میل دل هرکس به جای ست**

**بود میل دل من سوی فرّخ**

ئەگەر مەیلی دلی هەرکەس بە جاییست، بوڤەد مەیلی دلی مەن سویی فەرروخ.

ئەگەر دڵی هەموو کەسێ مەیلی له شوێنێکه، مەیلی دڵی من بەرەو یار( پیرۆز)ە.

میل: مەیل، ئارەزوو　　سوی: بەرەو



خواجه دەڵێ گەر هەمووان مەیلیان له جێیەك بێت من تەنیا مەیلم لای یار/ پیرۆزە.

**٩- غلام همت آنم که باشد**

**چو حافظ چاکر هندوی فرّخ**

غولامی هیمەتی ئانەم که باشەد،چو هافز چاکری هیندویی فەرروخ.

غولامی هیمەتی ئەوکەسەم که وەك حافز خزمەتکاری خاڵی رەشی (فرخ) بێت.

چاکر: خزمەتکار　　هندو: بەندەی رەش پێست، چونکه به بەندەی سپی پێست دەگوترا (ترك)،خاڵی رەشی یار

غولام و بچوکی کەسێکم که وەك حافز بەندەی خاڵی رەش یاخود خزمەتکاری رەشپێستی (فرخ)یار بێت.

له هەندێ نوسخەدا له بری (همت) (خاطر) هاتووه و له نێوان (چاکر)(هندو)شدا (و)دانراوه که کاریگەرییەکی ئەوتۆی لەسەر واتاکەی نابێت.

## غەزەلی نەوەد و حەوتەم:

**بەحری موزاریعی هەشتی ئەخرەبی مەکفوفی مەقسور**

**(مفعول فاعلات مفاعیل فاعلات)**

**١- دی پیر می فروش که ذکرش به خیر باد**

**گفتا شراب نوش و غم دل ببر ز یاد**

دی پیری مەیفروش کە زیکرەش بە خەیر باد،گوفتا شەراب نوش و غەمی دل ببەر ز یاد.

دوێنی پیری مەیفرۆش- کە یادی بە خێربێت- گوتی شەراب نۆشبکە و غەمی دڵ لە بیر بەرەوە.

دی: دوێنێ ذکرش به خیر باد: یادی بە خێر بێت گفتا: گوتی

ببر ز یاد: لەبیرکە، لەبیربەرەوە

دوێنێ پیری تەریقەت یادی بە خێر گوتی غەمی دڵ لەیادکە و مەشغوڵی عەشق بە.

**٢- گفتم به باد می دهدم باده ننگ و نام**

**گفتا قبول کن سخن و هرچه باد باد**

گوفتەم بە باد می دەهەدەم بادە نەنگ و نام،گوفتا قەبول کون سوخەن و هەر چە باد باد.

گوتم: بادە ئابڕو و ناوبانگم بە بادەدات، گوتی: قسەکە قبوڵ بکە و هەرچی دەبێ با ببێ.

بە باد می دهد: بەبادەدات، لەناو دەبات ننگ و نام: ئابڕ و ناوبانگ

کاتێ کە پیری تەریقەت بە خواجە دەڵێ ڕێگەی عەشق بگرەبەر، خواجەش دەڵێ: گوتم ئاخر ئەم ڕێگەی عەشقە ناوبانگ و ئابڕووم دەبات و بەهۆی ئەوەی کە دێمە نێو کۆڕی عاشقانەوە هەموو ئەوانەی تر لەدەست دەدەم، بەڵام پیری تەریقەت (مەیفرۆش) دەڵێ بە گوێی من بکە و لەوە مەترسە کە ئابڕوت بچێ و هەرچی دەبێ بابێ. یاخود دەکرێ کە (سخن)ی میسراعی یەکەم لە بەیتی دووەم بێت، واتە: گوتی ئەو قسەی کە خۆت کردت ـ بادە ئابڕووم دەبا ـ قەبوڵکە و و گوێ مەدەرێ:

مەبەست لەوەیە کە ڕاستە بادە ئابڕ و ناوبانگت بەبادەدا تۆش ڕازی بە بەمە و گوێ مەدەرێ با بیبا و هەرچی دەبێ با ببێ.

**٣- سود و زیان و مایه چو خواهد شدن ز دست**

**از بهر این معامله غمگین مباش و شاد**

سود و زیان و مایە چو خاهەد شودەن ز دەست،ئەز بەهری ئین موئامەلە غەمگین مەباش و شاد.



قازانج و زیان و سەرمایە لەدەستدەچن، سەبارەت بەم مامەڵەیە غەمگین مەبە و شاد بە.

سود: قازانج مایە: سەرمایە ازدست شدن: لەدەست چون از بهر: سەبارەت

لە ڕاستیدا چەند یارییەکی زمانی لە نێو بەیتەکەدا هەیە و دەبنە مایەی گۆڕینی واتای بەیتەکە. (سودی) دەڵێ: مادام قازانج و زەرەر و سەرمایە هەمووی لەناودەچن، کەواتە سەبارەت بەو مامەڵەیەی باسکرا نە غەمگین بە و نە دڵشاد.

واتە: چونکە ئەم دونیایە ماڵی فەنا و لەناچوونە نە بە قازانجەکانی دڵشاد و نە بە زیانەکانی غەمگین بە. خوالێخۆشبو (سودی) مامەڵەی بە میسراعی یەکەم داوەتە قەڵەم (هەر مامەڵەیەك کە قازانج و سەرمایە و زەرەت لەدەست چێ کە مەبەست لە مامەڵەی دونیایە). هەروەها (غمگین و شاد)یشی بۆ (مباش) گێڕاوەتەوە، بەڵام دەکرێ مەبەست لە (معاملە) مامەڵەی بەیتی پێشتر بێت (چوونە نێو ڕێگای عەشق و لەدەستدانی ناوبانگ) یان نەچوونە نێو دونیای عەشق و بەدەستهێنانی ناوبانگی دونیایی.هەروەها دەکرێ (غمگین مباش) جیا بێت و (مباش) بۆ شاد نەگەڕێتەوە، بەڵکو بەتەواوی پێچەوانە بێتەوە و (شادباش) بێت.بەمەش واتای بەیتەکە دەبێتە: مادام لەم دونیا فانیەدا قازانج و زەرەر (بەدەستهێنانی ناوبانگ و لەدەستدانی) و سەرمایە (خودی مرۆڤ) لەدەست دەچێت و کۆتایی پێدێت سەبارەت بەم مامەڵەیە (شراب نوش و دل ببر ز یاد) و لەدەستدانی ناوبانگ دڵتەنگ مەبە و شادبە مادام هەمووی لەناودەچێت لە ڕێگەی تەریقەت غەمگین مەبە و شادبە.

**٤- بادت به دست باشد اگر دل نهی به هیچ**

**در معرَضی که تخت سلیمان رود به باد**

بادەت بە دەست باشەد ئەگەر دل نەهی بە هیچ،دەر میئرەزی کە تەختی سولەیمان ڕەڤەد بە باد.

ئەگەر دڵ بدەی بە هیچ بات دەستگیر دەبێ لە شوێنێکدا کە تەختی سولەیمان بە با لەناودەچێ.

دل نهی: دڵ ببەستی، دڵ بدەی

معرض: سودی دەڵێ ئەم وشەیە (معرَض)ەو بە واتای ئەو جلوبەرگە نیوە ڕووتە دێت کە جاریەکان لە کاتی فرۆشتنیاندا خۆیانی پێ دادەپۆشن بۆ ئەوەی جوانتر دەرکەون، بەڵام بە زۆری بە واتای شوێن بەکاردێت. ئەکرێ (مَعرَض)یش بێت وەك هەندێ خوێندنەوەی نوێ لێرەشدا بە واتای نمایشگا و شوێنی نمایشکردن دێت و لەگەڵ ماناکەدا جوانتر دەگونجێ، بەڵام لە نوسخە دێرینەکاندا (معرَض) نووسراوە رود به باد: بە بادەچێ، بە هۆی باوە دەڕوات

(هیچ) لەم بەیتەدا مەبەست لە دونیایە هەروەها (بادەست کەوتن) (با بەدەست هێنان) واتە بێ ئەنجام و بێ هودە، ئەو شوێن و نمایشگایەش کە تیایدا تەختی سولەیمان ی تیا لەناودەچێ یاخود تەختی سولەیمانی بەسەر پشتی باوە تێدا دەبینرێ هەمان دونیایە.خواجە دەڵێ: ئەگەر دڵ بدەی بە دونیای دون (هیچ) جگە لە هەوا هیچت دەستگیر نابێت و هیچ بەدەست ناهێنی خۆ ئەگەر بێت و ئەم کارەش بکەیت ئەوا لە پێشانگایەکدا دەیکەت (با بە دەست دەهێنی) کە تیایدا با تەخت و تاراجی حەزرەتی سولەیمانی لەناوبردووە، لە کاتێکدا کە بە سەر پشتیەوە بوو.

مەبەست لەوەیە دونیای هیچ دەبێتە بەڵای گیان و لەهەمان کاتیشدا هیچە و بێ نرخە و نموونەی ئەمەش زۆرە.

**٥- حافظ گرت ز پند حکیمان ملالت است**

**کوته کنیم قصه که عمرت دراز باد**

هافز گەرەت ز پەندی هەکیمان مەلالەتەست،کوتەه کونیم قیسە کە ئومرەت دراز باد.

حافز گەر پەند و ئامۆژگاری دانایانت پێ ناخۆشە وازدەهێنین و تەمەن درێژ بێت.

مەلالەت: بێزاری، لێرەدا (ملالت) بە واتای نارەحەتی و پێ ناخۆش بوونە    دراز: درێژ

خواجە لە سەرزاری پیری تەریقەتەوە دەڵێ: ئەی حافز ئەگەر پەند و ئامۆژگاری دانایانت پێ ناخۆشە (پەندی دانایان چوونە نێو جیهانی تەریقەتە) باشە قسە ناکەین و ئامۆژگاریت ناکەین بەڵام تەمەن درێژ بێت و خوات لەگەڵ.



## غەزەلی نەوەد و هەشتەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی ئەسڵەمی موسبەغ**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع لان)**

**١- شراب و عیش نهان چیست کار بی نیاد**

**زدیم بر صف رندان و هرچە بادا باد**

شەراب و ئەیشی نەهان چیست کاری بی بونیاد، زەدیم بەر سەفی ریندان و هەرچە بادا باد.

شەراب و عەیشی نهێنی کارێکی بێ بناغەیە، خۆمان خستە ریزی رەندان و هەرچی دەبێ با ببێ.

کار بی بنیاد: کاری بێ بناغە،کاری پوچ    زدیم بر صف رندان: خۆمان خستە نێو ریزی رەندانەوە، چووینە نێو ریزی رەندانەوە    هرچە بادا باد: هەرچی دەبێ با ببێ

هەرچەندە پێشتر واتای عیرفانیی(شراب و عیش)مان خستوەتەڕوو، بەڵام بۆ زیاتر روونکردنەوەی واتای بەیتەکە جارێکی دیکە واتای عیرفانیان دەنووسینەوە:

واتای سەرزاری بەیتەکە: خواجە پێی وایە کە مەینۆشی و بە خۆشی ژیان (عەیش و نۆش) بەدزییەوە هیچ خۆشی و تامێکی نییە و کارێکی پوچە، هەربۆیە خۆی دەخاتە نێو ریزی رەندان و گوێ بە هیچ نادات، ئەم گوێیی بە هیچ نەدانەش زۆر وەستایانە بە زاراوە و دەربڕینێکی رەمەکی دەریدەبڕێت و دەڵێ: (هەرچی دەبێ بابببێ)، بەڵام واتای عیرفانی بەیتەکە بەم شێوەیە:

لە عیرفاندا (شراب) عەشقە یاخود عەشقێکە کە لە رواڵەتدا بشاردرێتەوە کاری پێچەوانە ئەنجام بدرێت، هەروەها (عیش)یش بریتییە لە چێژی خوگرتن و ژیان لەگەڵ حەقدا.

هەردوو وشەکە واتای عیرفان و عەشقی حەقیقی دەخەنەڕوو، بەم پێیەش خواجە دەڵێ: شاردنەوەی عارف بون و عەشقی حەق کارێکی بێ بنچینەیە و هەرگیز ناتوانرێت بشاردرێتەوە، هەرچەندە کاتێ کە بڵاویش دەبێتەوە ئیدی دەبێتە مایەی دروستبونی گرفت و کێشە، بەڵام لای خواجە شاردنەوەی سەختترە، بۆیە دەڵێ: عارفی و عەشقی حەقیقی بە نهێنی کارێکی بێ بناغە و پوچە، هەربۆیە ئێمە خۆمان خستە ریزی عارفەکانەوە ـ رەندەکانەوە ـ و گوێ بە گرفت و لەمپەرەکان نادەین و هەرچی دەبێ با ببێ.

**٢-گره ز دل بگشا وز سپهر یاد مکن**

**که فکر هیچ مهندس چنین گره نگشاد**

گریە ز دل بگوشا ڤز سیپیهر یاد مەکون، کە فیکری هیچ موهەندیس چونین گریە نەگوشاد.

گرێی دڵ بکەرەوە و باسی فەلەك مەکە، چونکە بیری هیچ ئەندازیارێك ئەم گرێیەی نەکردۆتەوە.

گره: گرێ　　بگشا: بکەرەوە　　مهندس: ئەندازیار، گەردوونناسی

گرێی سەر دڵ خەم و خەفەتە، ئاخۆ ئەم گرێیە بە کێ دەکرێتەوە؟ بە زانست یان ئەستێرەگەری؟

خواجە دەڵێ ئەم گرێیە بکەرەوە و دڵخۆش بە و باسی ئەستێرە و بورجەکان، یاخود فەلەك و نهێنییەکانی ئاسمانەکان مەکە، چونکە بیری هیچ ئەستێرەگەر ـ ئەندازیارێك ـ ئەم گرێیەی نەکردوەتەوە.　وەك هەمموو جارێك لێڵی دەکەوێتە بەیتەکەوە:

باسی ئاسمان مەکە ئایا مەبەست لەوەیە کە پشت بە ئەستێرەگەری مەبەستە و باسی مەکە یاخود دوای نهێنییەکانی فەلەك مەکەوە ـ کە جاروبار فەلەك و گەردوون مانای قوولتر دەگەینن بە واتای خالق ـ هیچ ئەندازیارێك ئەم گرێیەی نەکردۆتەوە ئایا ئەوگرێیە گرێی خەم و خەفەتی دڵە یاخود گرێی نهێنی گەردوونە.

واتای یەکەمیان شەرحی سودی و هرویيە، بەڵام گەر مانای دووەمیان وەرگرین راڤەی بەیتەکە بەم شێوەیە: گرێی دڵ بکەرەوە ـ خەم و خەفەت لەبیرکە ـ بە دوی کردنەوەی گرێی پڕ نهێنی و تەلیسمی گەردوون مەکەوە، چونکە بیری هیچ ئەندازیار و ئەستێرەگەریەك ـ زانست ـ ئەم گرێیەی نەکردوەتەوە.

بەرای بەندە ئەم واتایە لە واتای ئەم بەیتەی ژێرەوە نزیکە:

حدیث از مطرب و می گو راز دهر کمتر جو　　کە کس نگشود و نگشاید بە حکمت این معما را

**٣- ز انقلاب زمانه عجب مدار که چرخ**

**ازین فسانه هزاران هزار دارد یاد**

ز ئینقیلابی زەمانە ئەجەب مەدار کە چەرخ،ئەزین فەسانە هەزاران هەزار دارەد یاد.

هەڵگەڕانەوەی زەمانەت پێ سەیر نەبێ، چونکە گەردوون هەزاران هەزار لەم چیرۆکانەی لە یادە.

انقلاب: هەڵگەڕانەوە، گۆڕان　　انقلاب زمانه: گۆڕانی بارودۆخ　　عجب مدار: پێت سەیر نەبێ　　هزاران هزار: هەزاران هەزار، زۆر



دارد یاد/بە یاد دارد: لە بیریەتی (هروی) انقلاب زمانە بە جەنگ و خوێنڕێژی ڕۆشتنی پادشایەك و دام و دەزگاکەی و هاتنی پادشایەك و دەسەڵاتێکی نوێ و گرتن و کوشتنی فەرمانبەر و خزمەتکارانی دەسەڵاتی پێشو دەزانێت کە دەڵێت ئەم جۆرە رووداوانە لە سەرانسەری ژیانی شاعیردا هەبووە بە تایبەتی لە ساڵانی(٧٣٦ ـ ٧٩١ك.م) {ج١،ل٤٣٣}

دەکرێ واتای بەیتەکە پەیوەست کرێت بە رووداوە دەستنیشانکراوە مێژوییەکانەوە و ئەم واتایەی لێ وەربگیرێ ـ هەروەك د. هروی هەندێ جار هەوڵی لەم شێوەیە دەدات ـــ بەڵام دەشکرێ بە شێوەیەکی گشتی باس لە رووداوە دووبارەکانی مرۆڤ بکرێت و ئاماژە بە هیچ رووداوێکی مێژویی نەکرێت.

چونکە دەستەیەك شاعیر هەبوون و ئێستاش هەن کە مێژوو راستەوخۆ لە دەقە شیعریەکانیاندا رەنگدەداتەوە و شیعرەکانیان ئاوێنەیەکە بۆ مێژوو بەڵام لە بەرامبەر ئەم دەستەیەدا دەستەی دووەمیش هەیە کە ئەگەر مێژووش لە پشت شیعرەکانیەوە بێت ئەوا هێندە بە شاراوەیی دەردەکەوێت کە بە بێ بوونی مێژووش شیعرەکان واتا لەدەست نادەن،گەر شیعری شاعیرانی دەستەی یەکەم ئاوێنەی مێژوو بێت ئەوا شیعری شاعیرانی ئەم دەستەیە لەو دیوارە بڵندە دەچێت کە رەنگە یەکێك لە خشتەکانی مێژوو بێت و بە دەرهێنانی ئەو خشتەش هیچ زیانێك بە خودی دیوارەکە نەکەوێت و بگرە جوانتریش ببێ، بەندە پێم وایە کە خواجە لە شاعیرانیی دەستەی دووەمە و شیعرە مێژوویەکانیشی ئەگەر ئەم ناونانە دروست بێت ـ بە ئاسانی ـ لە مێژوو دادەبڕێن.

بۆیە مانای گشتی بەیتەکە دەبێتە: لە وەرگەڕانی بارودۆخی گۆڕانی لەناکاوی زەمانە سەرت سوڕنەمێنێ، چونکە ئەمە کە لە تەمەنی کورتی تۆدا روودەدات دیاردەیەکی دوبارەی مێژوی مرۆڤایەتییە و گەردوون و چەرخ (کات) هەزاران هەزار لەم جۆرەی لە یادە.

خۆدەکرێ ئەم (انقلاب زمان)یە مەبەست لە بێ وەفایی و بەڵێنشکێنی دونیا بێت، چونکە خواجە (ئەشعەریەکان) رقیان لە دونیایە و هیچ کاتێ ئاوڕێکی دۆستانەی لێ نادەنەوە.

**٤- قدح به شرط ادب گیر زانکه ترکیبش**

**ز کاسەی سر جمشید و بهمن است و قباد**

قەدەح بە شەرتی ئەدەب گیر زانکە تەرکیبەش،ز کاسەیی سەری جەمشید و بەهمەنەست و قوباد.

بە ئەدەبەوە پێکی شەراب بە دەستەوە بگرە، چونکە خۆڵەکەی (پێکهاتەکەی) لە کاسەی سەری جەمشید و بەهمەن و قوبادە.

به شرط ادب: به ئەدەبەوە، بە ئەدەب    گیر: بگرە    زانکە: چونکە، لەو رووەوە کە
ترکیبش: خاکەکەی، پێکهاتەکەی    کاسە سر: کەللە سەر

جمشید: یەکێکە لە گەورەترین پادشاکانی زنجیرەی پێشدادیەکان و لە چیرۆکە میللیە ئێرانیەکاندا ناوی هاتووە و کورتکراوەکەی (جەم)ە    بهمن: لە چیرۆکە میللییە ئێرانیەکاندا هاتووە کە کوڕی ئەسفەندیار و پاش کوژرانی باوکی گشتاسبی باپیری تاج و تەختی پێ سپاردوە

قباد: کیقباد: یەکەمین پادشای کیانییەکان {هروی، ج١، ل٤٣٤}

پێکی جاران لە گڵ دروست دەکرا، خواجە پێی وایە کە ئەوگڵە هەمان کەللەسەری پێشوەکانە کە پاش مەرگیان بوونەتەوە خۆڵ، لەوانەش جەمشید و بەهمەن و قوباد، بۆیە دەڵێ: کاتێ پێك بە دەستەوە دەگری بە ئەدەبەوە بە دەستیەوە بگرە، چونکە لە گڵی کەللەسەری گەورەکان دروستکراوە.

ئەم بەیتە تەواوکەری هەمان ئەو بێوەفایەیە کە دونیا بەرامبەر مرۆڤەکان دەینوێنێ.

**٥- که آگه است که کاووس و کی کجا رفتند**

**که واقف است که چون رفت تخت جم بر باد**

کی ئاگەهەست کە کاووس و کەی کوجا رەفتەند،کە ڤاقیفەست کە چون رەفت تەختی جەم بەر باد.

کێ دەزانێ کە کەیکاوس و کەیانییەکانی دیکە بۆ کوێ چون، کێ دەزانێ کە چۆن تەختی جەمشید بەرباد بوو.

آگە است: دەزانێ    کاوس: دووەمین پادشای کەیانیەکانە پاش کەی قوباد
کی: کەیانییەکان، یاخود پاشاکانی دیکەی کەیانی، گەورە    واقف است: دەزانێ
برباد رفتن: لەناچون، بەربادبون    تخت جم: تەختی جەمشید، کە وێرانەکەی لە شیراز نزیکە

خواجە باس لە چارەنوسی پێشوەکان دەکات کە کەس چوزانێ ئەو هەموو پادشا و دەسەڵات و سەڵتەنەتە بۆ کوێ و چوون لەناوچوون و تێپەڕین.

هەرچەندە بەندە خاوەن را نیم، بەڵام جۆرە ناسازییەك لەنێوان (کاوس وکی)دا هەست پێدەکەم و وادەزانم لە ڕەچاوەکردنی (بەکارهێنانی ڕەسمی و ڕێزداریانەی ـ رفتند ـ ەوە بۆ تاك سەرچاوەی گرتوە)، چونکە (کاوس) خۆی لە ناودارترین پادشاکانی کەیانیەکانە و هێندە بە کەیکاوس بەناوبانگە کاوس ناگوترێ، هەربۆیە ڕەنگە لەبەر خاتری کێش پێش و پاش خرابێت و (کاوس کی) بێت و (رفتند) مەبەست لە خودی کەیکاوس بێت و لە ڕێز و گەورەییدا بە کۆ



هێنرابێت. ئەم بۆچونەی من تەنیا هەستە و سەرچاوەی زانستیم نییە، هەربۆیە لە بەیتەکەدا دەستکاریم نەکرد، بەڵام دەکرێ ببێتە جێگەی تێڕامانی گەورەکان.

سودی (جم)ی بە حەزرەتی سولەیمان داوەتە قەڵەم {ج٢، ل٦٦٢} و دەڵێ : کێ دەزانێ کە تەختی سولەیمان چۆن بە سەر با دا دەڕۆشت و چۆن بەربادبوو، بەڵام پێ ناچێت خواجە مەبەستی سولەیمان بوبێت، چونکە لەلایەکەوە نە لەم بەیتەدا و نە لە غەزەلەکەشدا باسی سولەیمان هاتووە لەلایەکی دیکەشەوە ناوی زۆر لە پادشاکانی دیکەی ئێرانی هێنراوە.

**٦- ز حسرت لب شیرین هنوز می بینم**

**که لاله می دمد از خون دیدەی فرهاد**

ز هەسرەتی لەبی شیرین هەنوز می بینەم،کە لالە می دەمەد ئەز خونی دیدەیی فەرهاد.

لە حەسرەتی لێوی شیرین، هێشتاش دەبینم کە گوڵاڵە سورە لە خوێنی دیدەی فەرهاد دەدرێت.

ز حسرت: لەتاو، لەحەسرەتی (نەگەیشتن یا دوری)    هنوز: هێشتا    می بینم: دەبینم
می دمد: سەردەردێنێ، دەڕوێت، سەوزدەبێت

شیرین و فرهاد: ناوی دو پاڵەوانی داستانە شیعریەکانی (نظامی گەنجەوین) و لە ئەدەبی میللی نەتەوەکانی ئێرانیشدا هەیە و ڕەمزی عەشقی ناکام و بێ ئەنجامن

فەرهاد بەو هەموو عەشقەوە کە بۆ شیرین هەیبوو ئامادە بوو کێوی بێستون لە تاقەوسانی کرمشان بتاشێت و جۆگە راکێشێ بە ئاواتی گەیشتن بە لێوی شیرین و گەیشتن بەو سەری نایەوە و بووە شەهیدی عەشق و ماچی عەشق بووە حەسرەت بۆی، هەربۆیە ئەمڕۆ گوڵاڵە سورە لە خوێنی چاوانی فەرهاد سەوزدەبێت. چیرۆکی ئەو حەسرەتە دەخاتەڕوو فەرهاد بۆ لێوی شیرین هەیبووە یاخود ئەو حەسرەتەی لێوی سوری شیرین کە فەرهاد بردیە ژێر گڵ و وایکردوە کە تائێستاش هەرگوڵاڵە سورە لەسەر گۆڕەکەی فەرهاد سەوز بێ.

لە هەندێ نوسخەدا (خاك تربت) هاتووە کە خاکی گۆڕە.

**٧- مگر که لاله بدانست بی وفایی دهر**

**که تا بزاد و بشد جام می ز کف ننهاد**

مەگەر کە لالە بدانست بی ڤەفایی دەهر،کە تا بزاد و بشود جامی مەی ز کەف نەنهاد.

دەڵێی گوڵاڵە بێوەفایی دونیای دەزانی، ئاوا لەو کاتەوەی کە لەدایك بوو تا کۆچی کرد پێکی دانەنا.

مگر: دەڵێی، وەك بڵێی    بدانست: دەیزانی    دهر: دنیا، زەمانە، ڕۆژگار
بزاد: لەدایك بوو، هاتەدونیا    بشد: کۆچی کرد، لەدونیا دەرچوو

کف: دەست          ننهاد: دانەنا

کاسەو پەڕەکانی گوڵاڵە لە پێك دەچن و سوریەکەشی لە پێکێکی پڕ لە شەراب، خواجە ئەم پەڕە سورانە بە پێکی پڕ لە شەراب دەزانێ وای بۆ چووە کە ڕەنگە گوڵاڵەسورە بۆیە ئەم پێکە دانانێ لەبەر ئەوەیە کە لە بێ وەفایی دونیا ئاگادار بووە.

خواجە دەیەوێ بڵێ: دونیا بێ وەفایە بەرامبەر هەموو ئەوانەی کە تیایدا دەژین، مرۆڤ یاخود ئافەریدەی دانا ئەو کەسەیە کە پشت لە دونیا بکات، مرۆڤ بەهۆی ئەوەی کە لەم ڕاستیە بێ ئاگایە هەر بە دوای دونیاوەیە و مەشغوڵی عەشقی حەق/شەراب نابێت، بەڵام کاتێ بەم ڕاستیەی زانی ئیدی پێکی شەراب دانانێ، وەك گوڵاڵەسورە کە هەمیشە دەڵێی پێکی لەدەستایە.

لە سەراپای غەزەلەکەدا فەزایەك دروستکراوە بۆ بە نەفرەتکردنی دونیا و پشتکردنە ئەو و دەرخستنی عەیب و عارەکانی.

**٨- بیا بیا که زمانی ز می خراب شویم**

**مگر رسیم به گنجی درین خراب آباد**

بیا بیا کە زەمانی ز مەی خەراب شەڤیم،مەگەر ڕەسیم بە گەنجی دەرین خەراب ئاباد.

وەرە وەرە کە زەمانێك بە مەی مەست بین، لەوانەیە (بەڵکو) لەم دونیا (لەسەر وێرانە بنیادنراوەدا) بە گەنجینەیەك بگەین.

بیا بیا: وەرە وەرە          خراب شویم: مەست بین (تا ئەوپەڕی مەستی)          مگر: بەڵکو (لەوانەیە)          گنج: گەنج، خەزێنە

خراب آباد: درکەیە لە دونیا، واتە ئاواییەك لەسەر وێرانە بونیادنراوە ـ سودی پێی وایە (خراب آباد) واتە وێرانەیەکی زۆر وێران

خواجە بە گوێگر دەڵێ وەرە با ماوەیەك / زەمانێك بە مەی مەست بین، بەڵکو بەهۆی ئەم مەستیەوە لە وێرانەی دونیا خەزێنەیەك بدۆزینەوە (ڕێمان لە خەزێنەیەك بکەوێ).

دەبێ ئەو گەنج و خەزێنەیە چی بێت کە مرۆڤ بە مەی و لە مەستیدا و لەم وێرانەی دونیادا ڕێی لێ دەکەوێت؟

کاتێ کە (مەی) و (مەستی) عەشق و بێ ئاگایی لە خەلق و عاشقبوونی حەق بن، ئەوا بێگومان ئەو خەزێنەیە تەنیا خۆشەویستی حەقە و هیچی دیکە؛ واتە وەرە با لەم وێرانەیەی دونیا خۆمان بە عەشقی حەقەوە خەریك بکەین و تیایدا بە مەستی بگەین، بەڵکو ڕێمان لەو عەشقە حەقیقییە بکەوێت.



**٩- نمی دهند اجازت مرا به سیر و سفر**

**نسیم باد مصلّی و آب رکناباد**

نەمی دەهەند ئیجازەت مە را بە سەیر و سەفەر، نەسیمی بادی موسەللاڤو ئابی ڕوکناباد.

مۆڵەتی گەڕان و سەفەرکردنی من نادەن، شەماڵی بای (مصلا) و ئاوی (رکناباد).

نمی دهند اجازت: مۆڵەت نادەن          سیر: گەڕان          (مصلا) و (رکناباد)

بەکەمیان جێگەی پیاسە و ڕابواردن بووە لە دەرەوەی شیراز و دووەمیشیان ڕوبارێکی نزیکی شیرازە وەك دەگوترێت خواجە زۆر هۆگری شیراز و سروشت و ئاوهەواکەی بووە و لێرەشدا ئەو ڕایە دووپات دەکاتەوە و دەڵێ: دڵگیری و خۆشەویستی شەماڵی فێنکی هەوای دەشتی موسەلا و ئاوی جۆگەلەی ڕوکناباد ڕێگەی ئەوەم پێ نادەن سەفەر بکەم و بڕۆم بۆ گەڕان. واتە دڵم نایەت بەجێیان بهێڵم.

**١٠- قدح مگیر چو حافظ مگر به نالەی چنگ**

**که بستەاند بر ابریشم طرب دل شاد**

قەدەه مەگیر چو هافز مەگەر بە نالەیی چەنگ،کە بەستەئەند بەر ئەبریشمی تەرەب دلی شاد.

وەك حافز پێك مەگرە مەگەر لەگەڵ ناڵەی چنگدا، چونکە شادی دڵ بە ئاوریشمی شادی بەستراوەتەوە.

قدح مگیر: پێك مەگرەدەست، شەراب مەنۆشە          چنگ: چەنگ، جۆرێکە لە ساز
بستەاند: بەستراوەتەوە، پەیوەستکراوە          ابریشم: ئاوریشم، پەیوەندی ئاوریشم و چەنگ لەوەدایە کە ژێیەکانی چنگ لە ئاوریشمی بادراو دروست دەکرێت، هەربۆیە ئاوریشم درکەیە لە ئامێری چنگ          (ابریشم طرب) ئاماژەیە بەو واتایەی کە لەم ئاوریشمە بە دەستی مۆسیقاژەن خۆشی و شادی بەرزدەبێتەوە، هەروەها پەیوەستبونی دڵی شاد بە ئاوریشم تەرەبەوە، بەو واتایەیە کە یەکێ لە پێویستییەکانی دڵشادی مۆسیقا و ئاوازی چنگە و دڵی شاد پەیوەستە بە بوونی مۆسیقاوە.

خواجە ئەم ڕاستییە دەزانێ کە عەشق بە ئاوازی مۆسیقا و چەنگەوە جوانترە و ڕەقس و سەماع زیاتر دێتەدی، بۆیە بە هاودەردان دەڵێت: تا ئەو کاتەی کە ئاوازی چەنگ نەبێ پێك بە دەستەوە مەگرن، چونکە شادی دڵ پەیوەستە بە ئاوریشمی مۆسیقاوە و بوونی مۆسیقا دڵ شاد دەکات و لەم شادیەشدا مەینۆشی سەفا و چێژێکی تایبەتی هەیە ئاماژەیە بە عەشق و خۆشەویستی حەق بە ئاوازی ڕەقس و سەماعەوە.

## غەزەلی نەوەد و نۆیەم:

**بەحری موزاریعی هەشتی ئەخرەبی مەکفوفی مەقسور**
**(مفعول فاعلات مفاعیل فاعلات)**

**١- دوش آگهی ز یار سفرکرده داد باد**
**من نیز دل به باد دهم هرچه باد باد**

دوش ئاگەهی ز یاری سەفەرکەردە داد باد،مەن نیز دل بە باد دەهەم هەرچە باد باد.

شەوی رابردوو با (هەوا) هەواڵی لەبارەی یاری سەفەرکردووەوە هێنا، منیش دڵی خۆم دەدەم بە با هەرچی دەبێ بابێ.

آگهی داد: هەواڵی هێنا    من نیز: منیش    دل به باد دهم: دڵ بە با دەبەخشم

دڵ بە با بەخشین؛ واتە لە بری مزگێنی دڵم دەدەم بە با. دڵ بە با دان دیسانەوە واتە عاشقی با دەبم، بەڵام لێرەدا واتای یەکەم دروستترە و خواجە دەڵێ: شەوی رابردوو هەوا هەواڵی یاری سەفەرکردووی بۆ هێناوم و لە مزگێنی ئەم هەواڵەدا منیش دڵم دەبەخشم بە هەوا و هیچ ترسم لەوە نییە کە بێ دڵ دەبم و هەرچی دەبێ با ببێ.

**٢- کارم بدان رسید که همراز خود کنم**
**هر شام برق لامع و هر بامداد باد**

کارەم بدان رەسید کە هەمرازی خود کونەم،هەر شام بەرقی لامیئ و هەر بامداد باد.

کارم وای لێهاتووە (بە جێیەک گەیشتووە) کە هەموو شەوێك تیشکی روناك و هەر بەیانیەك با بکەم بە هاوڕازم.

بدان رسید: بەو ئەنجامە گەیشتووە، وای لێهاتووە    هر: هەر، هەموو (لە فارسیدا لە بری هەمووش بەکاردێ)    همراز: هاوڕاز، هاودەم    شام: شەو    برق: تیشك
لامع: روناکی دەر    بامداد: بەیانی

خواجە دەڵێ: وام لێهاتووە ـ کارم بەو ئەنجامە گەیشتووە ـ کە تیشك و با بکەمە هاوڕازی خۆم. بوونە هاوڕاز و هاودەم، واتە بوونە مەحرەم و مەحرەمی ئەسرار (تیشك و با) بە شێوەی جیاواز لێکدراونەتەوە و بەم لێکدانەوە جیاوازانەش واتای جیاواز لە بەیتەکەوە وەرگیراوە.

سودی (تیشکی روناك) بە ئاهی گەرم و ئاگرین و (با)ش بە ئاه دەداتە قەڵەم و دەنووسێ:

عەشقی یار بە جۆرێ کاری لێکردووم هەموو بەیانی و ئێوارەیەك کار و پیشەم ئاهو ناڵەو گریانە {ج٢، ل٦٦٧}واتە لە ئەنجامی دووری یار یا عەشقی یار ئاه و ناڵە و هاوار بوونەتە



هاوڕازم. بەڵام هروی تیشك بە رەمزی خێرایی دەزانێت و هاوڕزی بە هاودەمی و هاوڕێیەتی لەگەڵ دیاردەیەکی نادیاردا دەزانێ و هاوڕازی لەگەڵ (با)شدا بە قسەی بێ ئەنجام، بۆیە پێی وایە دەرەنجامی بەیتەکە بریتییە لە: بە هۆی کاریگەری دووری یارەوە کە لە بەیتی یەکەمدا باسی سەفەری کراوە ـ هێندە تەنیا بووم کە ناچار لەگەڵ تیشك و بادا بوومەتە هاوڕاز و راز و نیاز دەکەم. تیشك هێندە بە خێرایی تێدەپەڕێت کە گوێی لە قسەی من نابێت و قسەکردن لەگەڵ باشدا بێ ئەنجامە و پوچە {ج١، ل٤٣٨}.

لە راستیدا هەریەك لە راڤەکان جێگەی تێڕامانن، بەڵام رایەکەی (هروی) کەمتر رێی تێدەچێ، چونکە خواجە لە دووری یاردا ئاماژە بە پوچی و بێ ئەنجامی ناکات. دەکرێ لێرەدا و بەم لێکدانەوەیە بڵێین: چونکە خواجە لە نێو خاص و عامدا کەس بە مەحرەمی ئەسراری خۆی نازانێت (تیشك و با) ی کردووە بە هاوڕزی خۆی.

رایەکەی جەنابی (سودی)ش رێی تێ دەچێت، بەڵام زیاتر لە روکاری واتاکان نزیك دەبێتەوە، بەڵام گەر (برق) بریتی بێت لە یەکەمین نورێك کە بۆ بەندە دەردەکەوێت و بەرەو تەیکردنی رێگەی حەقی کەمەندکێش دەکات و با (شەماڵ) عینایەتی بەردەوام و فەیزی سەردڵی رێبوار بێت، ئەوا بە ئاسانی دەتوانین راڤەیەکی ـ تا رادەیەکی زۆر ـ نزیك لە مانای بەیتەکە بەدەستەوە بدەین.

دەکرێ بڵێین مەبەستی خواجە لەم بەیتەدا بریتییە لە وام لێهات کە بەردەوام بە لەبەرچاوگرتنی ئەم واتایانە تەریقەت هەموو شەوێك تیشك و هەموو بەیانیەك فەیز ـ با ـ بکەمە هاوڕازی خۆم.

**٣- در چین طرّەی تو دل بی حفاظ من**
**هرگز نگفت مَسکَن مألوف یاد باد**

دەر چینی توررەیی تو دلی بی هیفازی مەن، هەرگز نەگوفت مەسکەنی مەئلوف یاد باد.

دڵی بێ غیرەتی من لە چینی پەرچەمی تۆدا هەرگیز نەیگوت یادی نیشتمانی یەکەمم بەخێر.

چین را: چینی پەرچەم، پێچ و چینی پرچ

بی حفاظ: بێ غیرەت، بە کەسێ دەگوترێ کە گوێ بە سنووورە ئەخلاقیەکان نەدات و پابەندیان نەبێ    مسکن مألوف: نیشتمانی یەکەم، نیشتمانی خوپێوەگرتوو

وادیارە لەم بەیتەدا (بی حفاظ) بە واتا زمانیەکەی بەکارهاتووە کە واتای ـ پابەندبون بە پەیمانەوە رۆشتن بە دوای هەرکەسێکدا ـ دەگەیەنێت نەوەك بە واتای کۆمەڵایەتی و ئەخلاقیەکەی کە بێ غیرەت یا خوێرییە.

خواجە گلەیی لە دڵی خۆی ناکات و نایەوێ سوکایەتی پێ بکات، بەڵکو دەیەوێ سەرنجڕاکێشی خەم و چینی تورە و پرچی یار بخاتەڕو کە هێندە سەرنجڕاکێشە تەنانەت دڵی من کە ئولفەتی بە نیشتمانەوە گرتوە کاتێ دەکەوێتە نێو ئەو چینە ئیدی نیشتمانی بنەڕەتی خۆی هەر لەبیردەچێتەوە و یادی ناکاتەوە و رۆژێ لە رۆژان ناڵێ یادی بەخێر بێت.

گەر(چین) وڵاتی چین بێت (طره) دەبێتە تەجەلی و جیلوەکردنی جوانی و (چین طره)ش واتە وڵاتی جیلوەی جوانی گەر (چین) بە چین و لولی پرچ وەرگرین ئەوا (چین طره) دەبێتە نهێنییەکان، لە هەردوو واتاکەدا دەبنە سەرنجڕاکێشترین جێگە بۆ دڵی عارف و کاتێ لەم دەرگایەوە دەچنە ژوورەوە وەك بێ وەفاکان هەرگیز بیری نیشتمانی پێشویان ناکەنەوە، خواجە پێی وایە دڵی خۆی لەم دەرگایەوە چوەتە نێو ئەو وڵاتە پڕ نهێنییەی چینی تورەوە، بۆیە بێ وەفایە و یادی نیشتمان ناکاتەوە.

**٤- امروز قدر پند عزیزان شناختم**

**یارب روان ناصح ما از تو شاد باد**

ئیمروز قەدری پەندی ئەزیزان شناختەم،یارەب رەڤانی ناسیهی ما ئەز تو شاد باد.

ئەمڕۆ بەهای پەند (ئامۆژگاری)ی ئازیزانم زانی، خوایە گیان ئامۆژگاریکەری ئێمە لای تۆ شاد بێ.

قدر: بەها، رێز    پند: پەند و ئامۆژگاری    شناختم: لە زماندا بە واتای ناسیم دێت و لێرەدا مەبەست لە زانینە و لە کوردیدا ئەم جۆرە بەکارهێنانەی نییە، زانیم

روان: گیان    ناصح: نەسیحەتکەر، ئامۆژگاریکەر    از تو شاد باد: لای تۆ شاد بێ

خواجە دەڵێ ئەمڕۆ بەها و قەدری ئامۆژگاری ئازیزانی پێشوو دەزانم، خوایە لە ئامۆژگاریکەرانی ئێمە خۆش ببە و عەفویان بکە وا بکەیت کە روحیان لە لای تۆ شاد بێ.

جاران ئەزیزان پەند و ئامۆژگاری خواجەیان دەکرد، بەڵام قەدری نەدەزانی و وا ئەمڕۆ لە پاش کۆچیدوایی ئامۆژگاریکەران بەها و قەدریان دەزانێت و دۆعای خێریان بۆ دەکات. ئەم بەیتە سەلمێنەری ئەو پەندە کوردییە کە دەڵێ (چاکە بکە و بیدە بە دەم ئاوەوە)، چونکە هەر چاکەت دێتەوە رێگە. ئەوانەش کە ئامۆژگاری خواجەیان کرد وا ئەمڕۆ بە ئەنجام دەگات.

**٥- خون شد دلم به یاد تو هرگه که در چمن**

**بند قبای غنچەی گل می گشاد باد**

خون شود دلەم بە یادی تو هەرگەه کە دەر چەمەن، بەندی قەبای غونچەیی گول می گوشاد باد.



هەرکاتێ کە لە گوڵزاردا با بەندی کراسی خونچەی گوڵ دەکاتەوە بە یادی تۆوە دڵم دەبێتە خوێن.

خون شد دلم: دڵم بووە خوێن، واتە لە تاو حەسرت و ئازار و خەفت دڵم تەقی

هرگە: هەرکاتێ    قبا: کراس

بندقبا: بەندی کراس، قەیتانی کراس    می گشاد: دەکردەوە

خواجە پەڕە سەوزەکانی خونچەی بە کراسی گوڵ داوەتە قەڵەم (بند گشادن)یش، واتە کردنەوەی قەیتانی کراس تا وەکو کراسەکە داکەنرێ، کرانەوەی ئەو پەڕە سەوزانە و گەشبوونەوەی خونچە بە دەستی با هەروەك ئەوە وایە قەیتانی کراسەکەی بکاتەوە و جەستەی سوری و جوانیەکانی دەرکەوێ. یار بیری شاعیر دەخاتەوە و لە داخ و حەسرەتدا دڵی دەبێتە خوێن و خەفەت دەخوات.

**٦- از دست رفتەبود وجود ضعیف من**

**صبحم بە بوی وصل تو جان بازداد باد**

ئەز دەست رەفتەبود ڤوجودی زەئیفی مەن،سوبهەم بە بوی ڤەسلی تو جان بازداد باد.

لەدەست دەرچووبوو بوونی لاوازی من، بەڵام بەیانی بە ئومێدی گەیشتن بە تۆ با جارێکی دیکە گیانی بە بەرداکردەوە.

از دست رفتەبود: لەدەست دەرچووبوو، روو لە نەمان بوو    بە بوی وصل: بە ئومێدی پێکگەیشتن    جانداد: گیانی پێدایەوە،گیانی بە بەردا کردەوە    باز: دووبارە، جارێکی دیکە

خواجە دەڵێ بوونی من لە دەست دەرچووبوو، دەستم لێ شت بوو، بەڵام کە ئەم بەیانییە شەماڵ هات و ئومێدی دیدار و بەیەکگەیشتنی تۆی بۆ هێنام جارێکی دیکە گیانی بەبەرداکردمەوە.

**٧- حافظ نهاد نیك تو کامت بر آورَد**

**جانها فدای مردم نیکو نهاد باد**

هافز نەهادی نیکی تو کامەت بەر ئاڤەرەد،جانها فیدای مەردومی نیکو نەهاد باد.

حافز چاکی دەروونی تۆ دەتگەیەنێ بە ئارەزووەکانت، گیانی زۆر فیدای کەسی دەروونپاك بێت.

نهاد نیك/نیکو نهاد: پاك سروشت، دەروون پاك    کام: ئارەزوو

بر آورد: دەردەهێنێ    کامت برآورد: بە ئارەزووەکانت دەگەیت، ئارەزووەکانت دێنەدی

حافز دەروونپاکی بە هۆی سەرکەوتن و بەئارەزوگەیشتن دەزانێت، لـە میـسراعی یەکەمـدا ئەم راستیە بە خۆی دەڵێت و لە میسراعی دووەمیشدا دۆعا بۆ کەسی دەروون پاك دەکات {بە گوتەی سودی،ج٢، ل٦٦٩}کە خۆی یەکێکە لەوان.



## غەزەلی سەدەم:

**بەحری رەمەلی شەشی مەقسور**

**(فاعلاتن فاعلاتن فاعلات)**

**١- روز وصل دوستداران یادباد**

**یادباد آن روزگاران یاد باد**

روزی ڤەسلی دوستداران یادباد،یادباد ئان روزگاران یادباد.

یادی رۆژی وەسڵی یاران بەخێر،یادی بەخێر ئەو رۆژگارانە یادی بەخێر.

دوستداران: یاران، دۆستان، دڵداران، ئەوانەی یەکترییان خۆشدەوێ   یادباد: یادی بەخێر، لەیاددا بمێنێ

خواجە لێرەدا گرنگی بە رۆژانی دیدار و پێکـەوەبوونی خۆشەویـستان و یـاران دەخاتـەڕو و یادیان دەکاتەوە و دەڵێ: یادی بەخێر رۆژگاری پێکەبوونی یاران، یادیان بەخێر ئەو رۆژانەی کە یاران پێکەوەبوون.

**٢-کامم از تلخیّ غم چون زهر گشت**

**بانگ نوش شادخواران یادباد**

کامەم ئەز تەلخیی غەم چون زەهر گەشت،بانگی نوشی شادخاران یادباد.

لە تاڵیی غەمدا دەمم وەك زەهـری لێهـات (تـاڵ بـوو) یـادی دەنگـی (نـۆش)ی ئەوانـەی بەخۆشی یەکتری دەخۆنەوە بەخێر.

کام: دەم   تلخی: تاڵی   چوون زهرگشت: وەك زەهری لێهات (تاڵ بـوو)

بانگ: دەنگ   نوش:نۆش،لـە (نۆشـین) یـاخود (نۆشـکردن)ەوە هـاتووە، لـە نێـو بادەنۆشاندا (نۆش)ت بێت بەکار دەهێنرێت لێرەشـدا مەبەسـت لەمەیـە   شـادخواران: ئەوانەی بە شادی دەخۆنەوە و ترسیان لە هیچ نییە

خواجە ئێستا دوورە لە بەزم و شادی عەشق و لە تاڵی خەم و خەفەتـدا دەمـی وەك زهـر تاڵ بووە و دونیای لا تاڵە، لەم حاڵەتە ناڕەحەتەیـدا یـادی زەمـان و رۆژگـاری بادەنۆشـی و عەشقی دەکاتەوە و دەڵێ: ئێستا کە لە تاو تاڵیی خەمدا زارم وەك زەهر تاڵە، یـادی بـەخێر ئەو کاتانەی کە بادەنۆشان لەکاتی بادەنۆشیدا بە دەنگی نۆشت بێ و بە خۆشی تۆوە کۆڕیان پڕ خۆشی دەکرد.

**٣- گرچه یاران فارغند از یاد من**

**از من ایشان را هزاران یادباد**

گەرچە یاران فاریغەند ئەز یادی مەن،ئەز مەن ئیشان را هەزاران یادباد.

گەرچی یاران یادی من ناکەنەوە، بەڵام لە لایەن منەوە یادی ئەوان هەزاران جار بەخێربێت.

فارغند از یاد من: یادی من ناکەنەوە          ایشان: ئەوان

خواجە دەڵێ: گەرچی یاران یادی من ناکەنەوە و منیان لەبیرکردوە، بەڵام من هەزاران جار یادیان دەکەمەوە و لە لایەن منەوە هەزاران جار یادیان بەخێر.

**٤- مبتلا گشتم درین بند و بلا**

**کوشش آن حق گزاران یادباد**

موبتەلا گەشتەم دەرین بەند و بەلا،کوششی ئان هەق گوزاران یادباد.

گرفتار بووم لەم بەند و بەڵایەدا، یادی کۆششی ئەوانەی کە حەقی دۆستی بەجێ دەهێنن بەخێر.

مبتلا: گرفتار، دوچار          بند و بلا: بەند و بەڵا، بەند و داو، گرفتاری

حق گزاران: ئەوانەی حەقی دۆستی بەجێ دەهێنن

هەرچەندە ئێستا خواجە دوچاری بەندی بەڵا و گرفتاری و موسیبەت بووە، یادی کۆشش و هەوڵی ئەو کەسانە بەخێر دەکاتەوە کە لە بەجێهێنانی حەقی دۆستایەتیدا درێغییان نەکردووە.

**٥- گرچه صد رودست در چشمم مدام**

**زنده‌رود و باغ کاران یادباد**

گەرچە سەد رودەست دەر چەشمەم مودام،زیندەرود و باغی کاران یادباد.

گەرچی بەردەوام سەد رووبار لە چاومدایە، یادی روباری (زندەرود)و باخی (کاران) بەخێر.

رود: رووبار، جۆگە          مدام: بەردەوام

(زندە رود/ زایندە رود) ناوی جۆگە/ رووبارێکە لە ئەسفەهان کە بە جوانی بە ناوبانگە (باغی کاران)یش باخێکە لەسەر رووباری (زیندەرود) هەر لە ئەسفەهان

خواجە یادی ئەم دو شوێنە جوانەی سروشت دەکاتەوە و دەڵێ: گەرچی من خۆم سەد رووباری فرمێسك لە چاوامدایە (خەمبار و چاوبەگریانم و کاتی سەیران و سەفام نییە)، بەڵام یادی روباری (زایندەرود) و (باغی کاران)ی ئەسفەهان بەخێر.

هەرچەندە بەندە زۆر تامەزرۆی ئەم جۆرە لێکدانەوە مێژوییانە نیم، بەڵام ئەگەر بە دوای رووداوی مێژوویی دا بگەڕێین دەکرێ بڵێین: بەم دوو بەڵگەیە (زایندەرود) و (باغ کاران) خواجە لەم غەزەلەدا یادی دۆستانی ئەسفەهانی دەکاتەوە.



**٦- راز حافظ بعد ازین ناگفته ماند**

**ای دریغا رازداران یادباد**

رازی هافز بەئد ئەزین ناگوفتە ماند،ئەی دەریغا رازداران یادباد.

پاش ئەمە رازی حافز بە نەگوتراوی مایەوە، بەداخەوە یادی دۆستانی رازدار (مەحرەمی راز) بەخێر.

بعدازین: لەمەودوا،دوای ئەمە          ناگفتە: بە نەگوتراوی          رازداران: رازداران، مەحرەمی راز، ئەو دۆستانەی کە رازی دڵی خۆتیان لا دەدرکێنی

وەك هەموو جارێك خواجە (مەحرەمی راز)ی بەدی ناکات، خواجە لە نێو کۆمەڵگەی خۆیدا کەسێ شك نابات کە رازی خۆی لا باس بکات. لەم بەیتەدا یادی مرۆڤی بە وەفا و نهێنیپارێز دەکاتەوە، بەڵام ئێستا لێرە نین، هەربۆیە خواجە دەزانێ کە لەمەودوا نهێنی و رازەکەی بە نەگوتراوی دەمێنێتەوە، ئەو دەڵێ: لەمەودوا رازی حافز نادرکێنرێ (چونکە کەس نییە شایانی ئەوەبێت ببێتە مەحرەمی راز) خواجە ئەفسوس بۆ ئەمە دەخوات کە کەس نییە رازی خۆی لا بدرکێنێ و بەم ئەسەفەوە دەڵێ: یادی مەحرەمیی رازەکان بەخێر.

## غەزەلی سەد و یەکەم:

**بەحری هەزەجی شەشی مەقسور**

**(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیل)**

**١- جمالت آفتاب هر نظر باد**

**ز خوبی روی خوبت خوبتر باد**

جەمالەت ئافتابی هەر نەزەر باد،ز خوبی روی خوبەت خوبتەر باد.

جوانیت هەتاوی هەموو چاوێ بێت، روی چاکت لە چاکی چاکتر بێت (روی جوانت لەجوانی جوانتر بێت).

آفتاب: هەتاو، رۆژ     نظر: چاو     خوبی: چاکی، جوانی بە هەردوو واتاکە بەکاردێت و گەر مەبەست لە (چاکی) بێت ئەوا لایەنی دەروونی دەگرێتەوە و گەر (جوانی) ش بێت لایەنی دەرەکی دەگرێتەوە

خواجە بە یار دەڵێ: یاخودا جوانی تۆ ببێتە هەتاوی هەمو چاوەکان و چاوەکان لەوەوە روناکی وەربگرن و روی جوان/چاکی تۆ لە جوانی/چاکی جوانتر/ چاکتر بێت و بە لوتکەی جوانی و چاکی بگەیت و لە خودی جوانی/چاکی جوانتر و چاکتر بیت.

**٢- همای زلف شاهین شهپرت را**

**دل شاهان عالم زیر پر باد**

هومای زولفی شاهین شەهپەرەت را،دلی شاهانی ئالەم زیری پەر باد.

دڵی پادشایانی جیهان لە ژێر پەڕی (هوما)تدا بن، کە باڵی وەك شاپەڕی شەهێنە.

هما: هوما، جۆرە باڵندەیەکە کە بە باوەڕی پێشینەکان پیرۆز بووە و بەسەر هەر کەسێکەوە بنیشێتەوە بەخت روی تێ دەکات، باڵندەی بەخت     شاهین: شەهێن، باڵندەیەکی گەورەی راوکەرە کە بەرزەفڕە و تیژفڕە     شهپر: شاپەڕ، شاباڵ

خواجە پرچی یار بە هوما دەداتە قەڵەم کە وەك شاپەڕی شەهێن وایە و دەڵێ: دڵی پادشایانی جیهان لە ژێر هومای خۆشبەختی پرچی تۆدا بێت کە وەك شاپەڕی شاهێن بەرزەفڕە و رو لە گەشەیە ئەمەش واتە تەواوی پادشایان لە ژێر سایەی تۆدابن.

**٣-کسی کو بستەی زلفت نباشد**

**چو زلفت درهم و زیر و زبر باد**

کەسی کو بەستەیی زولفەت نەباشەد،چو زولفەت دەرهەم و زیر و زەبەر باد.



کەسێ کە وابەستەی پرچت نەبێ وەك پرچت پەشێو (تێکئاڵاو) و ژێروژوور بێت.

کو: کە، سودی دەڵێ واتە (کە ئەو) {ج٢، ل٦٧٥}     چو: چون، وەك

درهم: ئاڵۆسکاو، پەشێو     زیر و زبر: ژێر و ژوور، سەراوبن

گەر لە بەیتەکاتی پێشودا دوعا و نزای خێر بۆ یار و بۆ ئەو کەسانەش بکات کە وابەستەی یارن و لە ژێر فەرمانی ئەودان، لەم بەیتە و بەیتی پاش ئەمەشدا دۆعا لەو کەسانە دەکات کە گرفتار و عاشقی یارنابن، لێرەدا بەو کەسانەی کە وابەستەی پرچی یارنابن دەڵێ: یاخودا وەك پرچی خۆت تێکچن و بئاڵۆسکێن و ژێروژوور بن. یاخوا ئەوانەی دڵ بە پرچی تۆوە نابەستن پەشێو و پەریشانحاڵ بن.

**٤- دلی کاو عاشق رویت نگردد**

**همیشە غرقە در خون جگر باد**

دلی کەئو ئاشقی رویەت نەگەردەد،هەمیشە غەرقە دەر خونی جیگەر باد.

دڵێك کە عاشقی روخسارت نەبێ، هەمیشە لەخوێنی جگەردا نغرۆ بێت.

عاشق نگردد: عاشق نەبێ     غرقە: غەرق، نغرۆ

خواجە بەوەوە ناوەستێ دۆعای پەرێشانحاڵی لەو کەسانە بکات کە ناکەونە داوی پرچی یارەوە، بەڵکو دۆعای لە خوێندا غەرقبوون لەو دڵانە دەکات کە عاشقی روخساری یار نابن، ئەو تەمەنا دەکات کە ئەو دڵانە لە خوێنی جگەردا نغرۆبن و لەناوچن یاخود هەمیشە خەماوی و خەفەتباربن.

**٥- بتا چون غمزەات ناوک فشاند**

**دل مجروح من پیشش سپر باد**

بوتا چون غەمزەئەت ناوك فشانەد،دلی مەجروهی مەن پیشەش سیپەر باد.

ئەی یار یاخوا کاتێ خەمزەت تیر دەوەشێنێ، دڵی بریناری من ببێتە قەڵغانی بەردەمی.

بتا: ئەی بت (بت و صنم) لە ناوەکانی یارن و (بتا) لە دۆخی بانگکردنایە، د.هەروی نووسیویەتی کە ئەمە (بُتا) نییە، بەڵکو (بتا)یە و کورتکراوەی (بهێڵە تا)یە{ج١، ل٤٤٤}

غمزە: خەمزە، ئیشارەتی چاو، دەکرێ لێرەدا مەبەست لە چاو بێ     ناوك: تیری بچووك

فشاند: بوەشێنێ، بگرێ، بهاوێ

پیشش: لە بەردەمیدا     سپر: قەڵغان

خواجە دەیەوێ تەواوی تیری غەمزەی یار لە دڵی مەجروح و بریناری ئەم بکەوێت، بۆیە دەیەوێ یان دۆعا دەکا کە دڵی ئەم ببێتە قەڵغانی تیری خەمزەی چاوانی یار (دەیەوێ) واتە لێرەدا (بتا) بە (بهێڵە تا) لێکدراوەتەوە و واتای وردی بەیتەکە بەم شێوەیە:

کاتێ چاوانت بە خەمزەوە تیر دەوەشێنێ بهێڵە تا دڵی برینداری من ببێتە قەڵغانی.

بەڵام (دۆعا دەکا) واتە(بتا) بە (ئەی بوتی من/ ئەی یار) لێکدراوەتەوە و واتای بەیتەکە دەبێتە: ئەی یار یاخوا کاتێ کە چاوانت بە غەمزە تیر دەهاوێ هەموو تیرەکان بەر دڵی برینداری من بکەوێ.

واتە کاتێ کە غەمزە و عیشوە دەکەیت بۆ راوکردنی دڵان، یاخوا تەنیا دڵی من راو بکەیت و هەر من بکەمەوە داوی عەشقی تۆوە.

**٦- چو لعل شکرینت بوسه بخشد**

**مذاق جان من زو پر شکر باد**

چو لەئلی شەکەرینەت بوسە بەخشەد،مەزاقی جانی مەن زو پور شەکەر باد.

یاخودا کاتێ لێوی شەکربارت ماچ دەبەخشێت چەشەی گیانی من لەو پڕ شەکر بێت.

چو : کاتێ    شکرینت: شەکر بارت، شەکراویت    بوسە: ماچ    بخشد: ببەخشێ

مذاق: چەشە، شوێنی تامکردن    زوو: لەو لێی    پر: پڕ

خواجە لە بەیتی پێشودا ئاواتەخواز بو کە تەنیا خۆی بکەوێتە داوی یارەوە و لێرەشدا دەخوازێت کە لە کاتی ماچ بەخشینی لێوی شەکرباری یاردا چەشەی گیانی لێی شیرین بێت، واتە: چەند ماچێکی شیرینی لێوتم بە نسیب ببێ.ئەگەر بەیتی پێشوو بە لێکدانەوەی د.هروی لێکدەینەوە ئەم بەیتەش داوایە نەوەك ئاوات خواستن.

(بوسە/ ماچ) لە زاراوەی عیرفانیدا واتای فەیز یا چێژ دەگەیەنێت

**٧- مرا از توست هردم تازه عشقی**

**ترا هر ساعتی حسنی دگر باد**

مەرا ئەز توست هەردەم تازە ئیشقی،تورا هەر سائەتی هوسنی دیگەر باد.

هەرساتە عەشقی من بۆ تۆ تازە دەبێتەوە، ئاواتەخوازم کە هەر سەعاتێ جوانی و جیلوەیەکی دیکەت هەبێ.

توست: تۆیە    هردم: هەرساتە،هەمیشە    حسن: جوانی

شاعیر هەرساتە و سەرلەنوێ عاشق دەبێتەوە و هەرساتە و عەشقی بۆ یار تازە دەبێتەوە، خۆی لەم بەیتەدا کاتێ ئەمە دەردەبڕێ بۆ جوانی یاری دەگێڕێتەوە و ئاواتخوازە کە ئەو جوانیەی یاریش هەر سەعاتە و نوێ ببێتەوە و هەر سەعاتە و جوانی و جیلوەیەکی دیکەی هەبێ.



**٨- بەجان مشتاق روی توست حافظ**

**ترا در حال مشتاقان نظر باد**

بەجان موشتاقی روی توست هافز،تورا دەر هالی موشتاقان نەزەر باد.

حافز بە گیان تامەزرۆی روی تۆیە، خوا بکات تۆ چاوت لە حاڵی تامەزرۆیان بێت.

بەجان: بەگیان    مشتاق: موشتاق، تامەزرۆ

ئەی یاری غایب لە دیدە تامەزرۆیانی تەریقەت بە دڵ و گیان تامەزرۆ و موشتاقی دیتنی روی پیرۆز و موبارەکتن و یەکێ لەم تامەزرۆیانەش بە دیداری روت (حافز)ە، یاخوا (داوادەکەم) چاوت لە حاڵ و بارودۆخی تامەزرۆیانت بێت و ئاگاداریان بکەیت.

## غەزەلی سەد و دووەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی ئەسڵەمی موسبەغ**

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لان)**

**١- صوفی ار باده به اندازه خورد نوشش باد**

**ورنه اندیشه‌ی این کار فراموش باد**

سوفی ئەر بادە بە ئەندازە خورەد نوشەش باد،ڤەرنە ئەندیشەیی ئین کار فەراموشەش باد.

سۆفی گەر بادەی بە ئەندازە خواردەوە نۆشی بێت وەگەرنا بیری ئەم کارەی لە یادچێتەوە.

ار: ئەگەر     به اندازه: بە ئەندازە، هێندە کە لە سنوور دەرنەچێ     نوشش باد: نۆش بێت

ورنه: وەگەرنا     اندیشه: بیر     فراموشش باد:لە یادی بچێتەوە

دەبێ سۆفی بادە نەخواتەوە و شەراب نەنۆشێ، چونکە شەراب نۆشکردن سیمای عارفەکانە. بەهەرحاڵ پێویستە کاتێ سۆفی بادە دەنۆشێ هێندە بێت کە لە سنوور دەرنەچێت ئەگەرنا ئەم بیرە لە مێشکدا دەرکات چاکترە.

**٢- وانکه یک جرعه می از دست تواند دادن**

**دست با شاهد مقصود در آغوشش باد**

ڤانکه یەك جورئە مەی ئەز دەست تەڤانەد دادەن،دەست با شاهیدی مەقسود دەر ئاغوشەش باد.

ئەو کەسەی کە دەتوانێ دەست لە قومێ شەراب هەڵگرێ(بیبەخشێ بەکەسانی دی) دەستی لەگەڵ مەحبوبی مەبەستی خۆی لە ئامێزیدا بیت (دەستی خۆش بێ و بە مەعشوقی خۆی بگات).

ازدست دادن: (لەم بەیتەدا بە واتای) دەست لێ هەڵگرتن دەگەیەنێت

شاهد: مەعشوق، مەحبوب     آغوش: ئامێز، باوەش

یارمەتیدانی نەداران لای خواجە زۆر جەختی لەسەر کراوەتەوە، لێرەشدا ئەو دۆعا بۆ ئەوکەسانە دەکات کە یارمەتی نەداران دەدەن ـ ئیدی تەنانەت گەر بە قومێك شەرابیش بێت ـ دەخوازێت کە ئەو دەستەی یارمەتی نەدار دەدات بە ئاواتی خۆی بگات و هەر سەلامەت بێت و یاری خۆی لە ئامێز بگرێ.



**٣- پیر ما گفت خطا بر قلم صنع نرفت**

**آفرین بر نظر پاک خطا پوشش باد**

پیری ما گوفت خەتا بەر قەلەمی سونئە نەرەفت،ئافەرین بەر نەزەری پاکی خەتا پوشەش باد.

پیری ئێمە گوتی قەڵەمی ئافراندن (دروستکردن) هەڵەی نەکردووە، ئافەرین بۆ روانگەی پاکی هەڵەپۆشەری.

خطا: هەڵە     قلم صنع: قەڵەمی خەلقکردن، قەڵەمی قەزا     خطا نرفت: هەڵەی نەکرد

خطاپوش: هەڵەپۆش

(پیر) لای حافز زۆرجار ئاماژەیە بە رێپیشاندەر و مورشیدی رێگەی تەریقەت و هەمیشە روخسارێکی جوانی پێدەدرێت، بۆ نمونە شێخی سەنعان بە پیر دەداتە قەڵەم، بەڵام هەندێك جار خواجە گەر بیەوێت گوتەیەکی گرنگ یاخود بیرێکی قووڵ و زۆر جدی دەربرێت ئەم بەکارهێنانەی (پیر ما گفت، پیر می گوید) بەکاردەهێنێت و هێندەی گرنگی بابەت و بیرەکەی مەبەستە ئەوەندە مەبەستی لە خودی پیرەکە نییە. بێگومان لەم بەیتەشدا مەسەلەیەکی زۆر جدی خستۆتەروو، هەربۆیە ناکرێ لەسەر (پیر) راوەستین و خۆمان بخەینە ئەو گێژاوەی کە ئایا مەبەست لە پیر کێیە، لە شەرحی سودیدا ئەم هەڵەیە بەرچاو دەکەوێت و پیر بە (خدری زندە ـ خضر) یا (شێخی سەنعان) دراوەتە قەڵەم، بەڵام لە شەرحی دیکەدا مەسەلەکە بە جددی گیراوە و لە بری قسەکردن لەسەر (پیر) قسە لە مەسەلەی بنەڕەتی (خطا بر قلم صنع نرفت / رفت) کراوە، بەر لە خستنەڕوی رای بەرێزان ئەوە بە پێویست دەزانم کە بڵێم ئەم بەیتە یەکێکە لەو بەیتە بە رواڵەت سادە و بە واتا هەرە دژوارانەی کە چەندین سەدەیە رەخنەگران و راڤەکەران لە سەری رێکنەوتوون و هەندێك تەئویلیان کردووە و هەندێکی دیکەش خۆیان لە شەرحکردنی دزیوەتەوە و پێش (٥٠٠)ساڵێکیش سودی لە دەورانی قوتابیەتی خۆیدا لە بەغدا لە زانایەکی پرسیووە بە ناوی (مولانا افضل الدین) و ئەو پیاوەش لە وەڵامدا فەرمویەتی: من مانای حەقیقی ئەم شیعرە نازانم{ج٢،٦٨٠} رەنگە یەکێ لە جوانترین وەڵامەکانی بەیتەکە ئەم وەڵامەی (مولانا افضل الدین) بێت.

لە راستیدا وەك گوتم بەیتەکە لە روی داڕشتن و هەڵبژاردنی وشەکانەوە زۆر سادەیە و هیچ جۆرە رەوانبێژییەکی وای تێدا نیە کە ببێتە مایەی لێڵی و شاردنەوەی واتاکان. بەڵام لە روی واتاوە ئەم هەموو جیاوازی و گرانییە لە واتادا هەیە، بە رای بەندە و ئەوەی لە سەرچاوەکاندا بەرچاوم کەوت بە سێ شێوە لە بەیتەکە کۆڵراوەتەوە:

١-گرنگیدان و جەختکردنەوەی لەسەر واتای (پیر ما):

رای سودی و پێشینەکان لەسەر ئەوە بووە کە لێڵی واتای ئەم بەیتە لە تاریکی واتای (پیر)دایە، بۆیە هەوڵی شیکردنەوەیان داوە و لەوێشەوە واتای بەیتەکەیان لێکداوەتەوە (سودی) لە شەرحی ئەم بەیتەدا باس لەو پرسیارانەی خۆی و راوەگرتنانە دەکات کە لە سەردەمی خوێندنیدا سەبارەت بەم بەیتە ئەنجامی داون و لە ئەنجامی پرسیارکردن و را وەرگرتنەکانیدا دەگاتە ئەوەی : کە لە شام (مەلا حلیمی شیروانی و مەلا محمود ئەمینی خوشکەزای حەزرەتی مەلا عەبدولرەحمانی جامی) پێیان وابوو کە ئەم بەیتە (پیر) ئاماژەیە بە چیرۆکی (عبدلرحمن یەمەنی)، بەڵام مەلا ئەحمەدی قەزوینی کە لە شام نیشتەجێ بوو لەگەڵ مەلا مصلح الدینی لاری و شێخ حسێنی خوارزمی ـ کە ئەم دوو زاتە هەردووکیان مەلا و شاعیریش بوون ـ پێیان وابووە کە ئەم بەیتە ئاماژەیە بە چیرۆکی حەزرەتی موسا ـ علیه السلام ـ سودی لای خۆشیەوە ـ بە بێ ئەوەی ئاماژە بە سەرچاوە بکات ـ (پیر)ی بە (شێخی سەنعان)یش داوەتە قەڵەم و بەو شێوەیەش لێکی داوەتەوە:

**أ- خدر و حەزرەتی موسا ـ سڵاوی خودایان لەسەر بێت ـ**

لە سورەتی (الکهف) دا بە درێژی باسی چیرۆکی حەزرەتی موسا و خدر ـ سڵاوی خوایان لەسەر ـ کراوە، لە قورئاندا ناوی (خضر) نەهاتووە و لە بری ئەو (ذی القرنین ) یەکێکە لە بەندەکانی خودا کە هەندێ لە نهێنییە خوداییەکان دەزانێت و ئەوەی لای مرۆڤ نەزانراوە لای ئەو زانراوە، حەزرەتی موسا لەگەڵیدا دەبێت تا لێیەوە فێربێ، بەڵام بەرگەی ئەوکارانە ناگرێت کە ئەو بە پێشینی خۆیەوە ئەنجامیان دەدات، لای حەزرەتی موسا ـ ع ـ غەیبین و ئەمەش دەبێتە مایەی جودابوونەوەیان. هەرچۆن بێت (ذي القرنين) لە حەزرەتی موسا شارەزاترە، لە سەرەتادا کاتێ ئەو کارێکی نامەئلوف دەکات حەزرەتی موسا پێی دەڵێ: کە هەڵەیت، بەڵام ئەم (هەڵەتکرد)ەی حەزرەتی موسا لە نەزانینەوەیە نەوەك لە زانینەوە، چونکە کاتێ ڕووندەبێتەوە دەردەکەوێ کە کارەکەی (ذی القرنین) دروست بووە و موسا ئەودیو بینراوەکانی نەدیوە و (ذی القرنین) لەخۆوە و بەهەڵە کارناکات، بەڵکو لە دەفەتەری قەزادا نووسراون کە بیکات {بڕوانە سورەتی الکهف، ئایەتی ٦٠ ـ ٩٨}.

بەم پێیە بێت: پیری ئێمە (ذی القرنین) گوتی: قەڵەمی قەزا هەڵە ناکات و هەرکارێك کە من ئەنجامی ئەدەم لە دەفتەری قەزادا نووسراوە و من لە خۆوە کار ناکەم، بەڵکو بە فەرمانی خوایە و هەرکارێکیش لای خوداوە بێت دروستە و هەڵەی تێدانیە، ئافەرین بۆ دیدی



هەڵەپۆشەری (ذی القرنین) یا پیر، واتە ئافەرین بۆ دیدی خدر کە باوەڕی بە هەڵە نییە و پێی وایە کە قەڵەمی قەزا هەڵەی نەکردووە.

**ب- شێخی سەنعان:**

لەم لێکدانەوەیەدا (پیر) بە شێخی سەنعان دراوەتە قەڵەم،(سودی) نووسیویەتی: کاتێ هەندێ لە موریدانی شێخی سەنعان، کە لەگەڵیدا رۆشتبوون بۆ قەیسەریەی رۆم کاتێ بینیان شێخ عاشقی کچە گاورێك بووە و دەستی داوەتە مەی خواردنەوە، گوتیان ئەی پیر هەڵە و تاوانت کردووە و سوکایەتی بە شەریعەت دەکەیت و کاری دژی شەرع ئەنجام دەدەی، شێخیش لە وەڵامدا گوتی هەرچی کارێك کە من دەیکەم لە دەفتەری قەزادا بۆم نوسراون و هەرشتێ لەوێشدایە بە فەرمانی خوایە و قەڵەمی (صنع)یش کە قەڵەمی قەزاوقەدەرە هەڵە ناکات، {بۆ زیاتر ئاشنابون بەم  رایانە بڕوانە: سودی، ج٢، ل٦٨٠ ـ ٦٨١} مرۆڤ هەڵە ناکات ئافەرین بۆ دیدی پاکی کەسێ (شێخی سەنعان) کە پێی وایە قەڵەمی قەزا هەڵە ناکات و نانووسێ.

٢-گرنگی دان بە چەمکی سەرزاری بەیتەکە:

د.هەروی هەرچەندە پێی وایە کە ئەم بەیتە زیاد هەڵدەگرێت و کۆمەڵێ رای هێناوەتەوە دەڵێ: مەبەست لەوەیە کە پیر (هەر پیرێکی دەستنیشان نەکراو) ی ئێمە هەڵە لە بووندا دەبینێت و بە گەورەیی و لێخۆشبونی خۆی دایان دەپۆشێ و دەڵێ نییە، ئافەرین بۆی{ ج١، ل٤٤٦ ـ ٤٤٧}

د. هروی پێی وایە حافز وەك خەیام لای وایە ـ بە پشتبەستن بە رای د. غنی ـ "دونیا لە ئەنجامی ڕووداوێکەوە و (لەخۆوە یان بە رێکەوت) دروستبووە نەوەك کاری دروستکەر و خالق بێت، هەربۆیە پێی وایە کە هەڵەی تێدا هەیە بە پێچەوانەی قسەی حەکیمەکان کە پێیان وایە سیستەمی دروستکراوەکان چاکترینە" {گوتەی د. غنی} ، لە راستیدا ئەم بیرە سەرزاریەی د.هروی زۆر دوورە لە واتای حەقیقیی بەتیەکەوە و لە بری ئەوەی کەمێك لە لێڵی و گومان بڕەوێنێتەوە، لێڵی لە بیروبۆچونی گشتی حافزدا دروست دەکات و دەبێتە مایەی گومان لەخودی د. هرویش، چونکە ئەم قسانە لەو بیروڕایانەوە نزیکدەبێتەوە کە گوایە خواجە حافز قسەی کافران دەکات و پێی وایە کە لە وجود (بونی سەرەتا)دا هەڵە بونی هەیە (عەلامە مرتضی مطهری) لە کتێبی (تماشاگە راز)دا ئەم دێڕە پێچەوانەی خواجە دەهێنێتەوە کە دەڵێ:

نیست در دائره یك نقطه خلاف از پس و پیش   که من این مسئله بی چون و چرا می بینم

شەهید موتەهەری لە وەڵامی ئەم بەیتەدا دەڵێ: ئەوانەی ئەو بانگەشەیە دەکەن- بانگەشەی بوونی هەڵەی سەرەتایی ـ " لەوەڵامدا گوتویانە کە خواجە کاتێك بەو شێوەیە

بیری کردۆتەوە و کاتێکی دیکە بەم شێوەیە، بەڵام نازانین کامیان لە پێشدا گوتراوە.یەکێك لە فاسدەکان ـ کە زۆر حەز دەکات حافز وەك خۆی لێ بکات! ـ دەڵێ : ئەسڵەن بە رای من حافز ئەم شیعرەی لە سەردەمی کامڵیدا گوتوە. چۆن؟ بە چ بەڵگەیەك؟ چونکە ئەم قسەیە لە سنووری کوفردایە و ئەگەر ئەمە لە دیوانەکەیدا بوایە ئەو کاتە (شوجاع پاشا) رەخنەی لێدەگرت وەك بەیتی

(گر مسلمانی ازین است که حافظ دارد      آه اگر ازپی امروز بود فردایی) رەخنەی لێگرت و بەم بەڵگەیەش ئەم دێرە پاش مردنی شوجاع پاشا گوتراوە "{تماشاگه راز،ل١٧٢ ـ١٧٣}

٣- گرنگی دان بە واتای قووڵی بەیتەکە:

لە راستیدا بە دوو شێوە و دوو بۆچوونی لێکدی جیاوازەوە لە واتای قووڵی (خطا بر قلم صنع نرفت) (هەڵە لە قەڵەمی ئافەرینشدا نەبوو) کۆڵراوەتەوە کە یەکێکیان روانگەی (عیرفانی/ عەقیدەیی ئاینی) و ئەوی دیکەیان روانگەی (عەقڵی)یە.

(مەلا جلال الدين دەوانی ٨٣٠ ـ ٩٠٨ ك.م) و (موحەمەد دارابی ـ سەدەی ١١) و (علی اکبر حسين نعمت اللهی) و (شەهید موتەهەری) و(د. خرمشاهی) و تەنانەت (سودی)ش بە شێوەیەکی ورد هەوڵی خستنەڕوی واتای بەیتەکەیان داوە، جگە لە (د.خرمشاهی) کە هاوشانی روانگەی (عیرفانی / عەقیدەی ئاینی) هەوڵیداوە لە روانگەی (عەقڵانی)شەوە لە بەیتەکە بکۆڵێتەوە بەرێزەکانی دیکە تەنیا روانگەی (عەقدەیی ئاینی ـ عیرفانی) یان کردوەتە بنەمای لێکدانەوەی بەیتەکە ـ کە بە رای بەندەش هەر ئەو روانگەیە دەتوانێ بگاتە مەبەستی دروست ـ.

ئێمە لێرەدا هەوڵ دەدەین رای هەردوو روانگەکە و چاکی و کەموکورتییان بخەینەڕوو.

١- روانگەی عەقڵی / ئاینی: وەك گوتم زیاتر د. خرمشاهی لەم روانگەیەوە دواوە، جێگەی ئاماژە پێکردنە کە جەنابیان (١٥) لاپەڕەی بۆ شەرحی ئەم بەیتە تەرخانکردوە و لە کورتەی باسی روانگەی عەقڵی فەلسەفی بەم شێوەیە:

سەرەتا خوڕەمشاهی پێی وایە کە خواجە خۆی زەین و میزاجێکی فەلسەفەیانەی هەیە و هەر ئەوە وای لێدەکات کە زۆرجار لە بۆچون و عەقیدەی ئەسڵی خۆی (ئەشعەری) دەرچێت، چونکە ئەشعەری چەندە هەماهەنگی لەگەڵ عیرفاندا هەیە ئەوەندە لە فەلسەفە دوورە و دژایەتیکردنی (ئیمام غەزالی)ش لەگەڵ فەیلەسوفان و فەلسەفەدا هەر لەم روانگەیەوە بوو.

لە روانگەی (قازی عضد ایجی) ـ مامۆستای خواجە حافز ــ ەوە بوون و مەوجود یاخود خێری رەها و هیچ خراپەیەکی تێدا نیە، وەك گەردون یاخود خێری لە بوونیدا لە خراپە زیاتره



وەك ئەوانەی کە لە جیهاندان (مرۆڤ)، بەڵام بوونێك نییە کە شەڕ و خراپە سەراپای داگیرکردبێت.

لە ئاینی ئیسلامدا و لای خاوەن بیرەکان خوا دەسەڵاتدارە و قادری رەهایە و هەرچی بوێت دەیکات، هەروەها زانای رەها و هەموو شت زانە، بەڵام بە رای هەندێ لە فەیلەسوفان ـ کە رەنگە د.خوڕەمشایش بەم رایە رازی بێت ـ دەسەڵاتی خوا بە رەهای رەها (رەهای تەواو) نازانن و ئەویش چەند یاسا و قانونێکی هەیە کە پەیڕەوییان لێ دەکات، بە دەربڕینێکی دیکە خوا توانای هەرکارێکی نیە کە لە عەقڵی مرۆڤدا بێت یان مرۆڤ عەقڵی پێی نەشکێ ـ بۆ نموونە ئایا خوا دەتوانێ خوایەکی دیکەی وەك خۆی دروست بکات یاخود (نعوذ باللە) ئایا خوا دەتوانێ خۆی لەناوبەرێ ـ وەڵامی گشتی ئەوەیە کە نەخێر ناتوانێ، ئایا خوا دەتوانێ کارێ بکات کە شتێ لە جیهاندا یاخود جیهان لە یەك کاتدا هەم بوو هەم نەبوو (موجود و معدوم) بێت.

بە رای هەندێ لە فەیلەسوفەکان وەك (صدر المتأهلين) ئەم جۆرە شتە مەحاڵانە تەنیا وێناکردنیان لە زەیندا هەیە و زەین ئەوە دەردەخات کە مەحاڵن، کە وابێ جێگەی کاری توانا نییە و پەیوەندی بە توانای رەها یاخود ناڕەهاوە نییە.

لەلایەکی دیکەوە بەگوتەی (لایب نیس ـ ئەو فەیلسوفە رۆژئاوایەی کە فەیلەسوفانی ئیسلامیش پشتگیری رایەکانی دەکەن) هەر دروستکراوێك ـ هەربەوەی کە دروستکراوە ـ سنووردارە و کەموکورتی تێدایە، پێشتر گوترا کە خوا ناتوانێ کاری (ممتنع) پێشبینی نەکراو بۆ هاتنە ئارا (بەدی نەهاتو ـ مەحاڵ) بکات، بەمەش خوا ناتوانێ جیهانی دروستکراوەکان بە شێوەیەکی بێ کۆتایی و بێ سنوور لە هەموو رویەکەوە کامڵ و بێ عەیب و کەموکورتی و ئەزەلی و ئەبەدی و خاوەن هەموو جوانی و هونەرێك و خاڵی لە هەر عەیبێ دروست بکات.

بەم قەناعەتە فەلسەفیانەوە مرۆڤ دەگاتە ئەو رایەی کە دونیا پڕە لە عەیبی سیستمی و (خطا) هەڵە لە دونیا و دروستکراوەکاندا هەیە، بەڵام خودی فەلسەفییەکان پێیان وایە کە ئەم شێوەی هەنوکەی گەردوون و مەخلوقات باشترین و چاکترین شێوەیەتی و لەمە چاکتر نەدەبوو، بەمەش خوا حەکیم و لێزانانە کاری کردوە و چاکە و خراپە (خێر و شەڕ)ی خولقاندووە، چونکە سروشتی ئافەریدەکانی خودا وان کە دەبێ بوون بە وەرگرتن و پێدانەوە (دخل خرج) کامڵ ببێ، بۆ نموونە دەبێ باران ببارێت و لافاو هەستێ هەرچەندە ئەم لافاوە ماڵی چەندین هەژاریش وێران دەکا، بەڵام حکیمەتێکی گەورەتری تێدایە.

دکتۆر درێژی بە راییە فەلسەفیەکان دەدا و دەنووسێ: بەڵێ خوا نە دەتوانێ (واجب الوجود) و نە (ممتنع الوجود) دروست بکات و ویستی ئەو وابەستەی مومکیناتە، بەڵکو هەر شتێ

ئیرادەی ئەوی لەسەربێ بەرگی مومکینات دەپۆشێ، لەم رایە فەلسەفەیەدا ئیدی خوا خالقی کردەوەی بەندەکان نییە و بە گوتەیەکی تاڵ دەبێ بڵێین خوا ئێمەی دروستکرد و خۆمان کۆتایی پێ دەهێنین.

بەم گریمانەوە مانای بەیتەکە دەبێتە: پیری ئێمە گوتی قەڵەمی ئافەرینش هەڵەی دروست نەکردووە، ئافەرین بۆ چاو و دیدی پاکی هەڵەپۆشەری، واتە پیر دەزانێ و قەناعەتی وایە هەڵە و شەڕ لە دونیادا هەیە و دروستکراوە و قەڵەمی ئافەرینش دروستی کردووە، بەڵام بە ئەنقەست وادەڵێ و چاوپۆشی دەکات (ئیدی بۆچی چاوپۆشی دەکات نازانین) لێکۆڵینەوە بەم روانگە فەلسەفی / عەقڵی یە لە شتە غەیبییەکان و خودا و شتە پەیوەندیدارەکان بە خوداوە کێشەیەکی چارەنەکراو فراوانتر دەکات، چونکە خودی روانگەکە لەم مەیدانەدا دەستەوسانە و ناتوانێ بە هیچ کەنارێك بگات ئێمە لێرەدا هەوڵی خستنەڕوی کەموکورتی و دەستکورتی روانگەی عەقڵی فەلسەفی و خودی عەقڵ و فەلسەفەش دەدەین.

بەر لە هەر رایە زۆر بە پێویست دەزانم بڵێم کە بیرکردنەوە لە خودا و ناو و سیفات و شتە نادیارە غەیبییەکان بە عەقڵ و فەلسەفە و لۆژیکی عەقڵ و فەلسەفە بە هیچ شێوەیەك رێگا بە هیچ کەنارێك ناگەیەنێ، چونکە خودی عەقڵ و فەلسەفە دوو بوونی (حادث)ن و بە هیچ شێوەیەك ناتوانن لە (قدیم)ەکان بکۆڵنەوە و ئەنجامی دروست و باوەڕپێکراو بەدەستەوە بدەن، راستە ئێمەی مرۆڤ بە عەقڵمان و لە سەردەمانێکی دێرینەوە بەردەوام لە هەوڵی چارەسەرکردنی ئەم کێشە نادیارانە و شیکارکردنیاندا بووین، بەڵام بە هیچ کوێ نەگەیشتوین و بەندەش بڕوای وایە کە ناگەین، چونکە ئەوانەکاری عەقڵ و فەلسەفەنین.

(خودا) و ئەوەی پەیوەستە بە خوداوە هیچ کەس هەرگیز و هیچ کاتێ و بە هیچ لۆژێکی پێی ناگات تەنیا لە رێگەی خودی (خودا) وە نەبێت، تەنیا خۆی دەبێ کەرەم بکات و لە خۆی تێمان بگەیەنێ، بۆ پاڵپشتی ئەم رایەم گوتەی عارفی گەورەی ئیسلامی (شێخ بایەزیدی بەستامی) دەهێنمەوە کە دەڵێ:"یارب افهمنی عنك، فأنی لا افهم عنك الا بك" { ابی عبدالرحمن السلمی، طبقات الصوفیه، تحقیق: نورالدین شریب، ١٩٨٦،قاهیرە،، ل٧١}

ئەم گوتەیەی شێخ بەستامی سەرباری ئەوەی کە لە خوا دەپاڕێتەوە لە خۆیی تێ بگەیەنێ، جەخت لەسەر ئەوەش دەکاتەوە کە مرۆڤ گەر بە خودا خۆی نەبێ لە خودا تێ ناگات. کەوابێ کاری عەقڵ لەم نێوەندەدا بێ سودە و هەوڵدان بۆ شکاندنی ئەم راستیە و چونە نێو سنووری خوداوە بە عەقڵ و شیکارکردنی رەمزەکانی لە گێلییەوە نزیکە، چونکە خودی شێخ بایەزیدی



بەستامی دەڵێ :" المعرفة فی ذاك الحق،جهل" هەرچەندە لە هەندێ سەرچاوە دا بە گوتەی (ذوالنون مصری) دراوەتە قەڵەم، بەڵام لەوێدا بە (التفكر فی ذات الله) هاتووە.

وەك گوترا عەقڵ (حادث )ە و دروستکراوە و ئەویش کەمێ لە مەخلوقاتی دیکە زیاتر دەتوانێ هەڵسوکەوت و رەفتار بکات، سەبارەت بە ناسینی خودا لەلایەن عەقڵەوە (د. ابراهیم دینانی) لە (دفتر عقل و آیت عشق،ج ١)دا گوتەیەکی (ابو الحسینی نوری ـ کە یەکێکە لە ناوداران ) هێناوەتەوە، دەگێڕێتەوە کە جارێکیان لە( ابو الحسین نوری)یان پرسی کە چۆن و لە چ رێگایەکەوە خوات ناسی، ئەویش گوتی: لە رێگەی خوداوە، پێی گوترا: ئەرك و رۆڵی عەقڵ لەم نێوەندە دا چی بوو؟ لە وەڵامدا گوتی: عەقڵ بێ توانایەکە دەسەڵاتی جگە لە بەسەر بێ تواناکانی وەك خۆیدا نەبێ ناشکێ، پاشان گوتی: کاتێ خودا عەقڵی دروستکرد پێی گوت من کێم؟ عەقڵ لە وەڵامدا بێدەنگ بوو لێرەدابوو کە خوای تەبارەك و تەعالا چاوی عەقڵی بە سورمەی نوری یەکتایی خۆی روناك کردەوە و لە تیشکی ئەم نورەدابوو، عەقڵ بێدەنگی شکاند و گوتی: تۆی خوای گەورە. بەم پێیە عەقڵ بە بێ هاوکاری خودا خۆی خوا بناسێ {غلام حسین ابراهیم دینانی، دفتر عقل و آیت عشق، ج١، ل٢٦ ـ ٢٧،تهران، ١٣٨٠}.

تا ئێستا قسە لەسەر زاتی خودا و ناسینی ئەو ـ جل جلالە ـ کراو رەنگە بگوترێ ئەمە چ پەیوەندییەکی بە کرداری خەلقەوە هەیە لە لایەن خوداوە، لەم وەڵامەدا بەندە پێم وایە ناسینی خودا رێگەی زانینی هەموو ئەم شتانەی دیکەی پەیوەست بەوەوەیە و لێکۆڵینەوە لەم شتانە لێکۆڵینەوەیە لە ناسینی خوا و زاتی ئەو و سیفاتەکانی، بە تایبەتی (قادر) بوونی خودا کە راستەوخۆ لەم بابەتە دەدوێ، هەڵەی گەورەی فەلسەفە و عەقڵ لەوەدایە کە کورت بینە و بە کورتبینیشیەوە لۆژیکی خۆی بە سەر لۆژیکی (خوا)دا فەرز دەکات، دەنا بە رای بەندە هەرگیز ناتوانرێ لە لۆژیکی (حدوث)ی عەقڵ و فەلسەفەی مرۆڤدا لە عەدلی ئیلاهی بکۆڵدرێتەوە و بخرێتە ژێر مایکرۆسکۆپی عەقڵ و تیۆرداڕێژین کە ئایا خوا دادپەروەرە یاخود نادادپەروەرە، ئەم کارەی خودا چەندە عادیلانە و ئەوکارەی دیکەیان چەندە ناعادیلانەیە؟ یاخود ئایا خوا (قادر)ی رەهایە و ئەو رەهاییە تا کوێ بڕ دەکات و کاتێ من بە عەقڵی کورتی خۆم بیر دەکەمەوە ئایا خوا دەتوانێ خوایەکی تر دروست بکات یا نا و لەم گریمانە مرۆییانەشەوە قسە لە سەر لۆژیکی خودایی بکەم و بڵێم نەخێر ناتوانێ، لە راستیدا بەندە پێشتر دەمویست جیاوازی لە نێوان (ناتوانێ/ نایەوێ) یاخود نەیویستوەدا بکەم و بڵێم نایەوێ یاخود نەیویستووە نەوەك ناتوانێ یا نەیتوانیوە، بەڵام نا، ئێستا گەر وابڵێم عەقڵی کورتی منە دەیڵێت و منیش

به شێوەیەکی دیکە لۆژیکی عەقڵی (حدوث) بەکاردەهێنم، خودایە من چوزانم تۆ چیت دەوێ و چیت ویستووە.

بەندە دڵنیام کە خودا (قادر)ی رەهایە و هەمو شتێ دەتوانێ ئیدی جگە لەمە نازانم یان راستر نامەوێ بە عەقڵی (حدوث)ی خۆم هەوڵی زانینی بدەم، بەڵکو داوای فەیز و نورێك لە حەق دەکەم کە خۆی تێم بگەیەنێ.

عەقڵ دەتوانێ لەو شتانە بکۆڵێتەوە کە لە سنووری لێکۆڵینەوەی خۆیدان، بەڵام ئەم راستییە پشتگوێ دەخات و سنوورەکان دەشکێنێ، بە رای بەندە خوا و مرۆڤ دوو ئاستی زۆر جیاوازن لە یەکتری و واتا و چەمکەکان زۆر جیاوازن، راستە ئێمە دەڵێین (عدل)، بەڵام چەمکی ئەو وشەیە لە ئاستی مرۆڤدا بە سەریدا دراوە و توانای ئاستی خودایی نییە و جیاوازە لێی، پێویستە لە ئاستی (خودا)دا چەمکی (عدل) بنوسرێتەوە، بەڵام کاتێ ئێمە کەسمان لەو ئاستەدا نین هەرگیز توانای ئەو داڕشتنەمان نییە و دەبێ چاوەڕوانی خودی ئەو ئاستە بکەین کە واتاکانمان پێ بڵێت.

بەڵام ئایا قەڵەمی دروستکردن هەڵە/ شەڕی دروستکردووە یا نا؟ لە راستیدا کێشەکە بەوە دروست نابێ کە لافاو خێری لە شەڕی زیاترە، چونکە زۆرئاسان لەم مەسەلەیە رزگارمان دەبێ و دەکرێ بڵێین خەتای مرۆڤەکانە کە خانوەکانیان لە نشێودا دروست دەکەن، بەڵام ئایا شەڕی نێوان پیاوکوژ و دزەکان دروستکراوی ئەزەلن یاخود رەفتاری مرۆڤەکان؟ لە راستیدا ئەم پرسیارە هەمان پرسیاری جەبر و ئیختیاری سەرەتای مرۆڤە تا ئێستا و یەکێکە لە نهێنییە شاراوەکانی ژیان کە بەندە پێم وایە لەگەڵ هەڵدانەوەی پەردەی سەر روومەتی خودا لە بەهەشتدا ئەم راز و نهێنییە ئاشکرا دەبێت و رەنگە بەشێکی ئەو پەردەیە ئاشکرابوونی ئەم نهێنییانە و چەندانی دیکە بن.

من نازانم کە (شەڕ) دروستکراوی قەڵەمی ئافراندنە یان نا!! لە راستیدا ناشمەوێ بزانم، چونکە سالأنێکی زۆر هەوڵم داو نەمتوانی بزانم!! هەربۆیە بڕوای تەواوم بەوە هەیە ئەم رازە لەکات و شوێندا نازانرێت و کاری عەقڵیش نییە ـ واتە عەقڵ ناتوانی ـ کە بیزانێت و بێدەنگ بوون راستترین وەڵامی ئەم مەتەڵە و رازەیە و هەرچی گوتن هەڵەیە.

٢- روانگەی (عیرفانی / عەقیدەی ئیمانی) : حافز عەقیدەی ئەشعەری هەیە ـ کە زۆربەی عارفەکان هەمان عەقیدەیان هەیە ـ ئەشعەریەکان باوەڕیان وایە کە جیهان و هەرچی تێدایە تەنانەت کرداری مرۆڤیش دروستکراوی خودان، واتە لە جیهاندا جگە لەو کاریگەرێك نییە و هەمووی هی ئەوە و کارەکانی ئەویش هەموی عەدلن و کارەکانی ئەویش بە پێوەری عەدل و



دادپەروەری دەزانن و نەوەك دادپەروەری مرۆڤ بکەینە پێوەر بۆ کارەکانی ئەو. بە قسەی ئەشعەریەکان (هەرچی ئەوکردی ئەوە راستی دادپەروەریە) بە گوتەی (شێخ مەحمودی شەبستەری): "لە پاك و چاك هەرچی دەرچێت چاکە" {ج١، ل٤٤٦، خرمشاهی} مانای هیچ شتێکی خودایی تەنانەت نەرمی و چاکی و دادپەروەریشی بە واتای مرۆیی نییە، لای ئەشعەریەکان سەرچاوەی جوانی و ناشیرینی، ستەم و دادپەروەریش عەقڵی نین، بەڵکو شەرعین، واتا کاری عەقڵ نین. بەم راستییانەش مەبەستی بەیتەکە دەبێتە: پیری ئێمە واتە پیری هاوڕا و بۆچونی ئەشعەری ئێمە کە وتی هیچ هەڵەیەك لە قەڵەمی دروستکردندا رووی نەداوە و هیچی بە(شر) دروستنەکردوە راست و جوانی گوت و ئافەرین بۆ بیروبۆچون و دیدی ئەشعەریانەی ئەو.

لە راستیدا ئەم گوتانەی سەرەوە پوختەی شەرحی د.خرمشاهی یە، بەندە بە تەواوی ئەم لێکدانەوەیە و تا رادەیەکی زۆریش بۆچونی ئەشعەریەکانم لەم مەسەلەیەدا قەبوڵە،بەڵام دیسانەوە دەیڵێمەوە ئەم بۆچوونە هێندەی سەری تەسلیم دانەواندنە ئەوەندە عەقڵکاری نییە و گەر تەسلیم بە گەورەیی خودا نەبێ، ئەشعەریەت توانای سەلماندنی تەواو و شیکارکردنی ئەم رازەی نییە. بەهەرحاڵ بەندە دووپاتی دەکەمەوە کە ئەم رازە تا ساتی هەڵدانەوەی پەردە بە نهێنی دەمێنێتەوە!!

د.خرمشاهی جگە لەوەی کە حەقی تەواوی بە شەرحی بەیتەکە داوە بۆچونی چەند بەرێزێکیشی ـ لە خاوەن را و حافزناسە کۆن و نوێیەکان ـ هێناوە، کە بۆ کاملترکردنی واتاکە دەیانهێنینەوە:

أ- مەلا جلال الدین دوانی: (٨٣٠ ـ ٩٠٨ك.م) ئەم بەرێزە کە ئەشعەرییە و لە ناودارەکانی ئێرانە لە سەردەمی (خاندان ئاق قوینلو)دا پێش ئەوەی لە بەیتەکە بدوێ پێناسەی (هەڵە و راست)ی کردووە و جیای کردوونەتەوە، بۆ هەڵە و راست لە کردار و گوفتاردا و پاشان لە(بکەر/ فاعل)ی راستی کردارەکان دواوە کە تەنیا خودایە. پێی وایە دەرچوون لەم بۆچوونە و باوەڕبوون بەوەی کە لەگەڵ خودادا بکەرێکی دیکە هەیە ـ مەبەستی لە رای موعتەزیلەیە کە پێیان وایە مرۆڤ بکەری کردارەکانی خۆیەتی نەوەك خودا ـ هاوڕا بوونە لەگەڵ مەجوسیەکاندا کە باوەڕیان بە هێزی خێر و شەڕ هەیە و دواتر دەڵێ: کردارە خوداییەکان پێویستیان بە مەبەست (غرض) نییە و دوا جاریش فەرمویەتی : عنایەتی ئیلاهی لە تەواوی سیستەمی دروستکردن دەدوێت و لە تەواوی سیستەمەکەشدا هەڵە نییە و گەر جاروبار لە بەرچاوی مرۆڤ بە بەرژەوەندی نەبێ لە هەمو سیستەمەکەدا وانییە، هەرچی رودەدات ئەو بەرژەوەندییە گشتییەی سیستەمەکە

دەیگرێتەوە، ئەگەرچی بە رای کەسێك بەرژەوەندی بەشیشی خستبێتە ژێر پێوە، کەواتە مەبەست لە میسراعی یەکەم ئەوەیە کە بەپێی ئەم سیستمە گشتییەی بوو هەڵە نییە و مەبەست لە میسراعی دووەمیش ئەوەیە کە بە بۆچوونی کورت بینان کە کورت بین و کەرت بین و ئاگایان لە بکەری راستی نییە و توانای تێگەیشتنی لە بەرژەوەندی گشتی سیستەمی جیهان نییە، هەندێ هەڵە دێتە بەرچاو، بەڵام بە بۆچونی کامڵەکان کە هەموو شتێ بە کاری بکەری راست و بەرژەوەندی گشتی سیستەم دەزان هەمووی بە راست دەزانن و ئەمەش بۆچونی پیری پاکە و دەستێکی جگە لە خودا نابینێ، هەندێ کە پێیان وایە دوو میسراعی بەیتەکە دژایەتیان هەیە کە یەکەمیان ئاماژە بە نەبوونی هەڵە و لە دووەمیاندا ئاماژە بە بوونی هەڵە دراوە بەوەی لێکداوەتەوە کە مەبەست لە هەڵەی میسراعی دووەم ئەو هەڵەیە بە رای کورت بینان هەڵەیە{ج١، خرمشاهی، ل٤٧٥ ـ ٤٧٦}

ب- (محمد دارابی ـ سەدەی ١١): واتاکە، سەرەتا ئەوەیە کە لە قسەی پیر و مورشیدەوە ئەوە روون دەبێتەوە کە قەڵەمی دروستکردن هەڵەی تیانییە.

کە ئەگەر بە قسەی پیر ئەم کێشەیە بۆ ئێمە روون نەبوایەتەوە لە کەموکورتی خۆمانەوە وامان بە خەیاڵدا دەهات کە قەڵەمی دروستکردن هەڵەی تێدایە و ئەمەش هەڵەیە کە کەسێ پێی وابێ هەڵە لە دروستکردنی ئیلاهیدا هەبووبێت. ئافەرین بۆ بۆچونی پاکی پیر کە هەڵەی (خەیاڵی هەڵەی) ئێمە دەپۆشێ، واتە نەیهێشت کە ئێمە ئەم گومانە هەڵەیە ـ قەڵەمی دروستکردن هەڵەی هێناوە ـ بەرین.

هەروەها کاتێ دەیڵێین کە (خطاپوش) ؛ واتە هەڵە نابینێ وەك ئەوە وایە بڵێین لە بەر ئەوەی نووسراوە بێ هەڵەی بینی هەڵەی نەدی، ئەوە وەك ئەوە وایە کە نوسەرێك خەتێکی جوان و بێ عەیبی نووسیوە و یەکێ سەیری دەکات و نووسەرەکە دەڵێ: ئافەرین بۆ ئەم کەسە کە خەتەکەی منی بە بێ عەیب بینی، واتە وەك ئەوەی کە لە راستیدا بێ عەیب بووە ئاوا بینی {هەمان سەرچاوە}

بەم پێیە جەنابی محمدی دارابی مەبەستی لەوەیە کە کاتێ پیر سەیری کارەکانی قەڵەمی دروستکردنی کردووە کە لە حەقیقەتدا هەڵەی تێدانییە بەبێ هەڵە بینویەتی و ئافەرینی بۆ پیری ئێمە کە شتەکان بە جوانی و وەك خۆی دەبینێ.

ج- عەلامە مرتضی مطهری: مورتەزا موتەهەری لە (تماشاگە راز) دا بە دوور و درێژی لەم مەسەلەیە دواوە ئەم بەیتەشی بە نموونە هێناوەتەوە، نوسەر بەشێکی کتێبەکەی بۆ (سیستمی بوون ـ چاکترین سیستەمی بوون) تەرخانکردووە و سەرەتا لە رای فەیلەسوکان



دەکۆڵێتەوە پاشان ئەوە دەخاتەڕوو کە عارفەکان پشت بە عەقڵ نابەستن لەم بوارەدا و ئەوان بەبێ گەڕان بۆ بەڵگە ئەم سیستمە بە بێ هەڵە و بە چاکترین دادەنێن، چونکە لای ئەوان ئەم بوونە جیلوەی جوانی حەقە و هیچی دیکە، بۆیە ناکرێ لە جیلوەی حەق هەڵە هەبێ، خواجە خۆی بە عارف دەزانێت و بەم بنەمایەش ناتوانرێ لە لۆژیکی خواجەدا (هەڵە) و ئەم چەمکانە نییە و بۆچونی خواجەش هەروایە.

جەنابی موتەهەری بەم پێشەکیەوە لەو بەیتانە دەکۆڵێتەوە کە راستی قسەکانی دەسەلمێنێ و دواجار دەگاتە سەر ئەم بەیتەی لێرەدا شرۆڤەی دەکەین و سەرەتا ئەو هەڵەیە راست دەکاتەوە کە لە پێشەوە نووسیمان و ئەویش وەك پێشینەکان باوەڕی بە سیستمی گشتی و بینینی مرۆڤەوە هەیە، لەبەر ئەوەی مرۆڤ لە خوارەوە لێی دەڕوانێ تەواوی سیستەمەکە نابینێت و روانین و بینینەکەی بەشی و کەرتییە و هەرچی بڵێ بەش و کەرتی دەبێ، وەك ئەوە وایە کە مرۆڤ تەنیا ددان و کاکیلەیەکی رووت لە روخسارێکی جوانی داپۆشراودا ببینێ و رای خۆی لەسەر دەربڕێت، لێرەدا گەر مرۆڤ ئاشنایەتی بە بەشە شاراوەکان هەبێت ئەوا دەتوانێ وێنایان بکات، بەڵام کاتێ ئاشنایەتی بە نهێنیەکانی نیە ناتوانێ وێنایان بکات و هەمیشە نیگای بەش دەبێ، ئەمە لەوکەسەدا پێچەوانە دەبێتەوە کە لە سەرەوە سەیر دەکات و توانای بینینی گشتی هەیە، کەوابێ ئەوەی لە سەرەوە سەیر دەکات دیدەی تەواوی واتە (عارف)ە کە لە خواوە بوون دەبینێ، دیدەی تەواو جیایە لە وەی لە خوارەوە سەیر دەکات (فەیلەسوف و مرۆڤی رەمەکی) کە دیدەی بەش و ناتەواوە، لە دیدە ناتەواوەکەدا هەڵە و کەموکورتی دەردەکەوێ بەڵام کاتێ دیدەی تەواو هەبوو هەڵە و کەموکورتی نامێنێ. ئێستا مەبەستی حافز لەوەیە کە نە کەسێ بە دیدی پاکی تەواو بە دیدەی پیر واتە مرۆڤی کامڵ سەیر دەکات و دەبینێ هەرگیز کەموکورتی نابینێ.

بۆیە پیری کامڵ وای وت (وتی هەڵەی تیا نیە)، بەڵام جگە لە پیری کامڵ کەموکورتی بینی، چونکە کامڵ نییە بەڵام ئەسڵەن لای پیر، بوون سێبەری جوانی حەقە و هەرگیز کەموکورتی تیا نیە{ حاج شیخ مرتضی مطهری، تماشاگە راز، انتشارات صدرا، تهران، بێ س چ،ل ١٦٥ـ١٧٥}.

بە رای بەندە لێڵی بەیتەکە لە رازی نێو بەیتەکەوە سەرچاوە دەگرێ و ئەو رازەش بە عەشق و خۆشەویستی حەق تا رادەیەك روون دەبێتەوە، ئەگەرنا عەقلانیەتی موعتەزیلە و شیعە و فەلسەفە و تەنانەت ئەشعەرییەکانیش نایڕەوێنێتەوە.

واتای سادەی بەیتەکەش گەواهی ئەو راستیەیە، بـەلاّم پـاش تـەواوکردنی ئـەم تێبینیانـە رایەکی سەیر و بە رای بەندە ـ هەڵەـ م بینی کە واتایەکی مێژویی ئەم بەیتەی داوە و رای وایە کە ئەم بەیتە بۆ (شاه شجاع) نووسراوە، ئەم رایە یـاخود ئـەم گومانـەش (د. سـعید حمـدیان) خستویەتیەڕوو، کە لە کۆتایی (حافظ نامه) داهاتوە {بۆ زانیاری زیـاتر بڕوانـە حـافظ نامـە، خرمشاهی، پاشکۆی چاپی سێیەم،ج٢،١٤٢١ـ١٤٢٢ } هەرچەندە جەنابی دکتۆر خۆشـی زۆر جەختی لەسەر ناکاتەوە.

**٤- شاه ترکان سخن مدّعیان می شنود**

**شرمی از مظلمه‌ی خون سیاوشش باد**

شـاهی تورکـان سـوخەنی مودەئییـان مـی شنەڤەد،شـەرمی ئـەز مەزلەمـەیی خـونی سیاڤوشەش باد.

پادشای تورکان گوێ لە قسەی مودەعیان، دەگرێ لە ستەمی خوێنی سیاوەش شەرم بیگرێ.

مدعیان: مودەعییان (لەم بەیتەدا بە واتای حەسودان و بەدکاران دێت)        مظلمه: ستەم

(پادشای تورکان) لەم بەیتەدا و بە قەرینەی مێژویی (سیاوەش) دەبێ (افراسـیاب)ی شـای تورکان بێت لە سەردەمی کەیکاوس و رۆستەمدا، ئەفراسیابی ستەمکار و پاڵـەوانی نـاودار و بکوژی زاوای خۆی (سیاوەش) کە بووە مایەی هەڵگیرسانی شەڕێکی خوێناوی و سـەرەنجام بـە دەستی کەیخوسرەوی کوڕی سیاوەش (بە رای سودی) کوژرا.

سیاوش: کوڕی کەیکاوسی پاداشی ئێرانە و لە قۆزیدا ناوبانگی دەرکردبوو، وەك دەگـوترێ کەیکاوس ژنی زۆری هەبووە (سودی دەڵێ ـ٣٦ـ ژنی هەبووە) یەکێك لە باوەژنەکانی سـیاوەش حەز لەم دەکات و داوای کاری خراپی لێـدەکات و ئـەمیش خـۆی بەدەسـتەوە نـادات دواجـار باوەژنەکەی رقی لێی هەڵدەستێ و لای باوکی (کەی کاوس) تاوانباری دەکات بەوەی کە زینـای لەگەڵدا کردووە و ئەویش بۆ دەرخستنی بێ گوناهی خۆی دەچـێتە نـاو ئـاگرەوە و بـە سـاغ و سەلامەتی رزگاری دەبێ و بێگوناهی دەسەلمێنێ (چوونە ناو ئاگر بە مەبەستی دەرخستنی بـێ گوناهی باوەڕێکی ئێرانیە کۆنەکانە و پێیان وابووە کاتێ تۆمـەتێك درایـە پـاڵ کەسـێ دەبـێ بچێتە نێو ئاگر، ئەگەر گوناهباربوو ئاگر دەیسوتێنێ و ئەگەر بـێ گونـاه بـوو بـە سـەلامەتی رزگاری دەبێ). بەلاّم پاش ئەم رووداوە سیاوەش لە باوکی دڵگران دەبێت و ئێران بەجێ دەهێڵێ و روو دەکاتە لای ئەفراسیابی پادشای تورکـان و لـەوێ ڕێـزی زۆری لێـدەگیرێت و ئەفراسـیاب (فرنگیس)ی کچی خۆی لێ مارە دەکات و دەیکاتە یەکێ لە نزیکەکانی، بەلاّم پاشان حەسودان و بەدکاران قسەی بۆ هەڵدەبەستن و لای ئەفراسیاب رەشی دەکەن و ئەفراسـیابیش بـە قـسەیان



دەکات و بە بێ گوناه سیاوەش دەکوژێ، ئـەم خوێنـە بـووە مایـەی شەڕشـێکی درێژخایـەن و سەخت تا دواجار (ئەفراسیاب) بە دەستی کەی خوسرەو کوژرا و کۆتایی هات.

لەم بەیتەدا (شای تورکان) ئەفراسیاب نییە، چونکە خواجە دەڵێ: شای تورکـان بـە گـوێی حەسود و مودەعیان دەکات با شەرم لە خوێنی بە ناهەق رژاوی سیاوەش بکات.

کەواتە خواجە دەیەوێ بڵێ ئەی (پادشای تورك) کـە ئێـستا هـەیت و دەتـەوێ بـە گـوێی مودەعیان بکەیت و گوێ بۆ قسەی ئەوان دەگری ئاگات لە خۆت بێ بە گوێیان مەکـە و شـەرم لەو خوێنە بە ناحەق رژاوە بکە و دووبارەی مەکەرەوە، چونکە ئەوخوێنەش بۆیە بە ناحـەق رژا، چونکە شای تورکانی ئەوکات (ئەفراسیاب) گوێ لە قسەی ناحەزان گرت.

بە رای سودی (شای ترکان) (سوڵتان مەنسور)ە کە یەکێ بووە لە سوڵتانەکانی ئێلخـانی و کوڕەکەی خۆی (اسد) ـ کە یەکێ لە هاوڕێ نزیکەکانی خواجـە بـووە ـ بـە قـسە و دووزمـانی وەزیرەکانی کوشتووە {ج٢، ل٦٨٢ ـ ٦٨٣} ، بەلاّم پێناچێ ئەم رووداوە لەگەڵ واتـای گـشتی بەیتەکەدا یەك بگرێتەوە، چونکە ـ بەندە رام وایە ـ کە ئـەم بەیتـە بـۆ کەسـێکە کـە هێـشتا خوێنەکەی نەڕژاندوە و لە قۆناغەکانی سەرەتادایە و خواجە دەیەوێ رێگری بکات.

د.خرمشاهی رای (د.معین)ی هێناوە کە پێـی وایـە (شـای ترکـان) شـاه شـوجاع بێـت و سیاوەشیش خواجـە خـۆی بێـت، ئـەو نووسـیویەتی: پـاش ئـەوەی حەسـودان و ناحـەزان شـا شوجاعیان هەڵنا بە هۆی بەیتی:

(گر مسلمانی ازین است که حافظ دارد

وای اگر از پس امروز بود فردایی)

خوێنی حافز بڕژێت کە گوایە کوفری کردووە و باوەڕی بە قیامەت نییە، خواجە ئاماژە بەم رووداوە دەکات و مەبەسـت لـە (شـاه ترکـان) شـاه شـوجاعە کـە لـە سـەری دایکیـەوە لـە (قراختائیـان)ی کرمانـە و بەشـێ لـە سوپاکەشـی تـورك بـوون ) {حـافظ نامـە، ج ١، ل٤٧٨}(د.هروی) یش لێرەدا رای وایە کە ئەم (شاه ترکان) و(سیاوش)ە ئاماژە نیـە بـۆ هـیچ رووداوێکی مێژویی و مەبەستی خواجە گشتییە، {هروی ج١،ل٤٤٩}

بە هەرحاڵ خواجە ئامۆژگارییەك بۆ کار بەدەستەکان دەنووسێ کە بە ناحەق خوێن مەڕژن و پەند و عیبرەت لە خوێنی بە ناحەق رژاوی سیاوەش کە بووە مایـەی شـەڕێکی دوور و درێـژ و وێرانکەر وەربگرن.

**٥- گرچه از کبر سخن با من درویش نگفت**

**جان فدای شکرین پسته‌ی خاموشش باد**

گەرچە ئەز کیبر سوخەن با مەنی دەرڤیش نەگوفت،جان فیدایی شەکەرین پستەیی خاموشەش باد.

گەرچی لە تەکەبوردا قسەی لەگەڵ منی دەروێشدا نەکرد، گیان فیدای دەمی نەکراوەی شیرینی وەك فستەقی بێ.

از کبر: لە تەکەبوردا، لە مەغروریدا    با من: لەگەڵ من    شکرین: شیرین، شەکربار
پستە: فستەق، لێرەدا درکەیە لە دەمی بچوکی یار    خاموش: بێدەنگ، نەکراوە

یار هاتە لای خواجە دەروێشی ئێمە و تەکەبوری نەیهێشت قسەی لەگەڵ بکات، بەڵام ئەم دەورێشە هێشتا هەر قوربانی یار دەبێ، خواجە دەڵێ: گەر چی یار لەبەر غرور قسەی لەگەڵ منی دەورێشدا نەکرد و روی نەدامێ، بەڵام گیانی من قوربانی ئەو دەمە شەکربارە بێدەنگەی بێت کە وەك فستەق بچووکە.

لەکوردیدا گەر دەمی یار بە بچووك دابنرێ (نقوڵ دەم) بەکار دەهێنرێت.

**٦- چشمم از آیینەداران خط و خالش گشت**

**لبم از بوسە-رُبایان بر و دوشش باد**

چەشمەم ئەز ئایینەدارانی خەت و خالەش گەشت،لەبەم ئەز بوسە روبایانی بەر و دوشەش باد.

چاوم بووە یەکێ لە ئاوێنەدارانی خەت و خاڵی (روخساری)، خوا بکات لێویشم ببێتە ماچ فرێنانی گەردنی.

آینەدار: ئاوێنە هەڵگر    خط و خال: خەت و خاڵ، مەبەست لە روخسارە
بوسە ربا: ماچ رفێن، ماچ کەر    برودوش: سنگ و شان،گەردن

خواجە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دەڵێ: یار هەمیشە لەبەرچاومە چاوم بووەتە ئاوێنەداری روخساری و هەمیشە دەیبینم، خوابکات لێویشم بەگەردنی بگات و ببمە ماچرفێنانی گەردنی.

واتە خوابکات بە یار بگەم.

**٧- نرگس مست نوازش کن مردم دارش**

**خون عاشق بە قدح گر بخورد نوشش باد**

نەرگسی مەستی نەڤازەش کونی مەردوم دارەش،خونی ئاشق بە قەدەهـ گەر بخورەد نوشەش باد.

گەر چاوانی مەستی نەوازشکەری روخۆشی،خوێنی عاشق بە پەرداخ بخواتەوە نۆشی بێت.



نوازش کن: نەوازشگەر    مردم دار: خۆش تەبیعەت، کەسێ لەگەڵ خەڵکیدا خولق و خوی چاك بێت و دڵی خەڵکی بەدەست بهێنێ

چاوانی مەستی یار کە عاشقان نەوازش دەکات و دڵیان رادەگرێ و تەبیعەتی جوانی هەیە، حەقی خۆیەتی خوێنی عاشقان بڕژێنێت و بیخواتەوە گەر ئەم کارەی کرد و عاشقانی کردە قوربانی دەستی خۆش بێ و خوێنەکەیان نۆشی گیانی بێت.

**٨- بە غلامیّ تو مشهور جهان شد حافظ**

**حلقەی بندگی زلف تو درگوشش باد**

بە غولامیی تو مەشهوری جەهان شود هافز،هەلقەیی بەندەگیی زولفی تو دەر گوشەش باد.

لە هەموو جیهاندا حافز بە غولامی تۆ ناوبانگی دەرکرد، ئاواتەخوازم ئەڵقەی بەندایەتی زوڵفی تۆی لەگوێدا بێت.

مشهور شد: ناوبانگی دەکرد

(بە غلامی تو) دوومانا دەگەیەنێت، یەکەمیان: بە غولامی تۆ دووەمیان بە هۆی غولامی تۆوە. لە یەکەمیاندا واتە حافز بەوە ناوبانگی دەرکردووە کە غولامی تۆیە، بەڵام واتای دووەم واتە بە هۆی ئەوەی کە حافز غولامی تۆیە لە جیهاندا ناوبانگی دەرکردوە.

جاران بەندە و غولام بۆ ناسینەوەیان ئەڵقەیان لەگوێ دەکردن، خواجە لێرەدا دەڵێ: ئەی یاری حەق بە هۆی ئەوەی کە حافز بەندەی تۆیە و تەنیا سەر بۆ تۆ دادەنەوێنێت لە هەموو جیهاندا ناوبانگی دەرکردووە، هیوادارم و ئاواتەخوازم کە ئەڵقەی بەندایەتی پرچی تۆ بکرێتە گوێ و هەموو دنیا بیناسێ و لە گشت جیهاندا بناسرێتەوە، یاخود ئاواتەخوازم پرچت بە دەوری گوێمدا بێتەوە و ئەڵقە بکات و بە بەیەکگەیشتن شاد ببم.

ئەوە ئەو شانازییەیە کە عارفەکان هەمیشە بە (یار)ی حەقەوە دەیکەن و بەندایەتی و عەشقیان بۆ مەعشوق دەبێتە مایەی گەورەیی و ناوداریان لە جیهانی دیار و نادیاریشدا.

# غەزەلی سەد و نۆیەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی ئەسلەمی موسبەغ**

**( مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع لان )**

**١- بنفشه دوش به گل گفت و خوش نشانی داد**

**که تاب من به جهان طرّهء فلانی داد**

بەنەفشە دوش بە گول گوفت و خوش نیشانی داد، کە تابی مەن بە جەهان توررەیی فولانی داد.

شەوی رابردوو وەنەوشە وتی بە گولّ و زانیاری چاکی تێدایە کە پرچی فلانەکەس بووەتە هۆی دڵەڕاوکێ و پەشێوی لە دونیادا.

بنفشه: وەنەوشە دوش: شەوی رابردوو نشانی: زانیاری دەربارەی کەسێك، ناونیشان تاب: پێچ و چەماوەیی، دڵەڕاوکێ و پەشێوی به جهان/درجهان: لە دونیادا فلانی: فلان کەس

لە دوو رووەوە دەتوانرێ لە بەیتەکە بکۆڵرێتەوە، یەکەم: لە روویەکی سروشتی مادیانەوە کە شێوەی گوڵی وەنەوشەیە کە خواردەبێتەوە و شێوە لولێکە وەك پەرچەمی یار، لەم لێکدانەوە سروشتیەدا:

خواجە دەڵێ وەنەوشە دوێنی شەو سەبارەت بە خۆی قسەی بۆ گوڵ دەکرد و دەیگوت ئەم شێوە لولییەی من لە جیهاندا لە شێوەی پەرچەمی فلان کەسەوەیە و جۆرێکە لە لاسایی کردنەوەی ئەو، بە راستی ئەم زانیاریانەی وەنەوشە بە تەواوی راست بوون.

دووەم: دەکرێ لە رووی مەعنەویەوە لە شێوەکە بکۆڵرێتەوە و ئەو چەماوەیەی وەنەوشە بەوکەسە خەمبارانە بدرێتە قەڵەم کە لە خەم و خەفەتدا سەردەخەنە سەر ئەژنۆ و ملیان دادەنوێنن، کەواتە وەنەوشە دوێنی وتی بە گوڵ: دڵەراوکێ و غەمی من لە جیهاندا لە تاو پەرچەمی فلان کەسەوەیە، دەکرێ ئەم دڵەڕاوکێ و غەمە لە خۆشەویستیدا بێت یاخود لە حەسودیدا، بە راستی، ئەم زانیاریانەی کە وەنەوشە خستنیەڕوو زانیاری دروست بوون.

(فلانی) لەم بتیەدا (یار)ە، بەڵام خواجە نەیویستووە ناوی بهێنێ.

**٢- دلم خزینەی اسرار بود و دست قضا**

**درش ببست و کلیدش به دل ستانی داد**

دلەم خەزینەیی ئەسرار بود و دەستی قەزا،دەرەش ببەست و کلیدەش بە دل ستانی داد.



دڵم خەزێنەی نهێنی بوو دەستی قەدەر دەرگای داخست و کلیلەکەی دا بە دولبەرێك.

خزینه: خەزێنە، گەنجینە ببست: داخست دل ستان: دولبەر

ئەم بەیتە یەکێکە لە بەیتە پڕ ماناکانی خواجە، زۆر بە سادەیی دەڵێ: دڵی من گەنجینەی نهێنی بوو، نهێنی زۆر لە دڵمدا بوو، بەڵام دەستی قەدەر دەرگاکەی بە کلیل داخست و کلیلەکەشی دا بە دولبەرێك.

مەبەست لەوەیە کە من زۆر شت لەدڵمدا بوو، بەڵام دەستی قەدەر دەرگای داخست و منی عاشقکرد و ئیدی ئامادەنەبووم لە هیچ شوێنێ ئەو نهێنیانە بدرکێنم تەنیا لای دولبەرێك نەبێ.مانایەکی قووڵ لەم وشە سادانەدا هەیە، لە دونیای عەشق و عیرفاندا خودا کردنە مەحرەمی راز و نیازەکان قۆناغێکی پێشکەوتو و پلە و پایەیەکی بەرزە و گەورەییە بۆ مرۆڤ کە بتوانێ نهێنییەکانی نێودڵی لای هەموو کەس نەدرکێنێ و لە هەر کۆڕ و کۆبوونەوەیەکدا دەست نەکاتە دەردەدڵ، خواجەش دەڵێ: دڵی من خەزێنەی نهێنی بوو، بەڵام دەستی قەدەر کلیلی ئەم دڵەی منی دایە دەست دولبەر و تەنیا لای ئەو دەردەدڵ دەکەم.

**٣- شکستەوار به درگاهت آمدم که طبیب**

**به مومیایی لطف توام نشانی داد**

شکەستەڤار بە دەرگاهەت ئامەدەم کە تەبیب،بە مومیایی لوتفی توئەم نیشانی داد.

بە تێکشکاوی هاتمە بەردەرگات، چونکە پزیشك مۆمیای میهرەبانی تۆی بۆ دەستنیشان کردووم.

شکستەوار: چەماوە، وەك ئەوکەسانەی کە شوێنێکیان شکاوە خۆیان خواردەکەنەوە، مەبەست لە تێکشکانی دەروونی و دڵشکان یاخود خۆ بەکەم گرتنە مومیا: دەرمانی شکان

خواجە دەڵێ من وەك ئەو کەسانەی جێگەیەکیان شکاوە، یاخود بە دڵشکاوی و تێکشکاوی رووم کردە دەرگای تۆ، چونکە پزیشك دەرمانی شکانی میهرەبانی و لوتفی تۆی بۆ نووسیم.کاتێ کە لوتف و میهرەبانی دەبێتە دەرمانی تێکشکان و دکتۆریش کە دەردناسە دان بەم راستیەدا بنێت، بێگومان ئەو خاوەن لوتفە دەبێ یاری حەق بێت، خواجە زۆر بە سادەیی دەڵێت: ئەی یار/ ئەی حەق من بەندەیەکی تێکشکاوم و تەواوی زاناکانیش ئاماژە بە میهرەبانی تۆدەکەن، هەربۆیە بەم شکستییەی خۆمەوە رووم کردە دەرگای تۆ بە ئومێدی لوتفی تۆ کە دەرمانی گشت دەردانە.

**٤- تنش درست و دلش شادباد و خاطر خوش**

**که دست دادش یاریّ ناتوانی داد**

تەنەش درست و دلەش شاد باد و خاتر خوش،کە دەست دادەش یاریی ناتەڤانی داد.

تەندروست و دڵشاد بێت و دەروون ئارام کەسێ کە دەستی دادی یارمەتی بێ توانایەکی دا.

خاطرخوش: دەرون ئارام    داد: داد، دادپەروەری    ش: راناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاکە لە بری (ی) کوردی    یاری: هاوکاری، یارمەتی
ناتوان: بێ توانا، بێ هێز

خواجە دۆعا و نزا بۆ ئەو کەسانە دەکات کە دەستی دادپەروەرییان بە هانای بێ هێز و بێ دەسەڵاتەکانەوە دێت و دەخوازێت کە تەندروست و دڵشاد و دەروون ئارام بن.

لە راستیدا، ئەم غەزەلە و بە تایبەتی ئەم بەیتە کێشەی چۆنیەتی نووسینەوە و خوێندنەوەی زۆرە و لە نێوان نوسخەکاندا جیاوازی زۆر هەیە، تەنانەت گەیشتوەتە ئەو رادەیەی کە بەیتی تەخەلوس نەمێنێ ـ وەك نوسخەی د. عیوضی یاخود کەم و زیاد و پێش و پاش لە بەیتەکاندا بکرێت ـ ئێمە بەش بەحاڵی خۆمان خۆمان لە دووبارەکردنەوەی ئەم جیاوازیانە و شێوەی راستی دەپارێزین و ئەم رایەمان پێ پەسەندە کە پەیڕەویمان لێکردووە کە رای قدسی و بە نەقڵکردن لە هروی و تا رادەیەك قەزوینی یە ـ بە تایبەتی لە زنجیرەی بەیتەکان و بەیتی تەخەلوسدا ـ.

**٥- برو معالجت خود کن ای نصیحت گوی**

**شراب و شاهد شیرین کرا زیانی داد**

برو موئالەجەتی خود کون ئەی نەسیهەت گوی،شەراب و شاهیدی شیرین کەرا زیانی داد.

ئەی ئامۆژگاریکەر برۆ چارەسەری خۆت بکە، شەراب و دولبەری شیرین زیانی بۆ کێ هەیە.

معالجت: موعالەجە، چارەسەر    نصیحت گوی: ئامۆژگاریکەر، نەسیحەتگۆ
شاهد: دولبەر

ئامۆژگاریکەر هەمیشە لە زیانی شەراب و دولبەری جوان و شیرین دەدوێ لەکاتێکدا لای خواجە ئەم دوانە هیچ زیانیان نییە و پێویستە ئامۆژگاریکەر خەمی خۆی بخوات.

(شەراب و یار) لە رەمزە زۆر دیار و ئاشکراکانی عیرفان و (نصیحت گوی)یش لە رەمزەکانی ریکاری و پێست و روکاری ئاین، ئامۆژگاریکەرەکان هەمیشە باس لە خراپی تەریقەت و زیانەکانی دەکەن. خواجە لێرەدا بە بیری دەهێنێتەوە و دەڵێ : ئەی نەسیحەتکەری ریاکاری روکاریی برۆ چارەسەری خۆتکە و خەمی خۆت بخۆ، عیرفان و تەریقەت کەی زیانی هەبووە و هەیەتی.



**٦-گذشت بر من مسکین و با رقیبان گفت**

**دریغ حافظ مسکین من چه جانی داد**

گوزەشت بەر مەنی مسکین و با رەقیبان گوفت،دەریغ هافزی مسکینی مەن چە جانی داد.

بە لای منی بێ چارە تێپەڕی و بەرەقیبەکانی گوت ئەفسوس حافزی بێ چارەی مەن چ گیانێکیدا.

بر من: بەرامبەر مەن، بەلای مەن، بە تەنیشت    رقیبان: چاودێران، رەقیب
چە جانی داد: چ گیانێکی دا، چەند بە سەختی گیانی دا

لە نێوان (رقیب و حافز)دا پەیوەندی زمانی و پەیوەندی زاراوەیش هەیە، پەیوەندی زمانی چاودێر و پارێزەرن کە پارێزەر لە پێشترە، پەیوەندی زاراوەیشیان بریتییە لە (حافز) و ئەوکەسانەی دیکە کە عاشقی یاربوون، لە هەردوو واتاکەشدا یار حافزی پشتگوێ خستووە.

خواجە دەڵێ: یار لە کاتێکدا کە رەقیبانی لەگەڵدابوو بە لای منی بێچارەدا تێپەڕی و پێی گوتن: حەیف و خەسار حافزی بێچارەی من بە ناڕەحەتی گیانی دەرچوو.

مەبەست لەم گیان دەرچوونە مردن نییە، بەڵکو رەنج و عەزاب کێشانە.

## غەزەلی سەد و دەیەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی ئەسڵەم**
**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع لن)**

**١- همای اوج سعادت به دام ما افتد**
**اگر تو را گـذری بر مقام ما افتد**

هومای ئۆوجی سەئادەت بە دامی ما ئوفتەد،ئەگەر تو را گوزەری بەر موقامی ئوفتەد.

هومای لوتکەی خۆشبەختی دەکەوێتە داوی ئێمەوە، ئەگەر تۆ ڕێت بکەوێتە شوێنی ئێمە.

هما: باڵندەی بەخت    اوج: لوتکە    مقام: شوێنی نیشتەجێ بوون    افتد: بکەوێتە

خواجە دەڵێ ئەی یار گەر ڕێت بکەوێتە شـوێنی ئێمـە و پێیـدا تێپـەڕیت، ئـەوا دەگەینـە لوتکەی خۆشبەختی و هومای ئەوپـەڕی خۆشـبەختی دەبـێ بـە داوی ئێمـەوە و تـا ئەوپـەڕی خۆشبەختی خۆشبەخت دەبین.

**٢- حباب وار بر اندازم از نشاط کلاه**
**اگر ز روی تو عکسی به جام ما افتد**

هوباب ڤار بەر ئەندازەم ئەز نەشات کولاه،ئەگەر ز روی تو ئەکسی بە جامی ما ئوفتەد.

لەخۆشیدا بلقی کڵاو هەڵدەدەین ئەگەر لە ڕوی تۆ وێنەیەك بکەوێتە سەر پێکەکەمان.

حباب: بلقی سەر ئاو    حباب وار: بلق ئاسا، وەك بلـق    برانـدازم: هەڵـدەدەم
نشاط: لەخۆشی و زەوقدا    کلاه: کڵاو

خواجە دەیەوێ خۆشـی لـە ڕادەبـەدەری خـۆی لـە کـاتی جیلـوەکردنی نـوری مەعـشوقدا بخاتەڕوو، بۆ ئەم مەبەستەش وێنەیەکی زۆر جوانی شیعری دروستکردووە خواجە بلقی سەرئاوی بە کڵاودار داوەتە قەڵەم و دەڵێ: منیش لە خۆشیدا وەك ئەو کڵاوەکەم فـڕێ دەدەم، ئەمـە لـە کاتێکدا کە بلق جگە لەو کڵاوە هیچی دیکە نییە و لەکاتی فڕێدانی کڵاوەکەیدا فەنا دەبێـت و لەناو دەچێت، خواجەش دەڵێ گەر لە پرتەوی ڕوی تۆ وێنەیەك بکەوێتە سەرجام و پێکی مـن ـ گەر جیلوەیەك بکەیت ـ لە خۆشیدا فەنا دەبم و وەك بلق کڵاوەکەم فڕێ دەدەم.

هەروەك چۆن ئەم بەیتە عیرفانییە و باس لە جیلوەی یاری حەقە دەکرێ بەیتی یەکـەمیش بـە هەمان شێوە ئاماژە بێت بە جیلوەی حەق، هەرچەندە سودی زۆر بە توندی ئەم ڕایـە ڕەتدەکاتـەوە



و لە وەڵامـی ئـەم بۆچـوونەی (سـروری و شمعـی) ـــ دو لێکـدەرەوەی تـورکی دیـوانی حـافز ـــ نووسیویەتی: "کەسێ کە گوتوویـەتی میـسراعی دووەم سـەبارەت بـە خودایـە، هەڵەیـەکی زۆر گەورەی کردوە و، تا ئێرەش سەدهەزار جار ئەم هەڵەیەی کردووە " {سودی، ج٢، ل١٤٩}.

سەرباری ئەم ڕایە بەیتی یەکەمیش ئەم لێکدانەوە عیرفانییە هەڵدەگرێ.

**٣- شبـی که ماه مراد از افق طلوع کند**
**بود که پرتو نوری به بام ما افتد**

شەبی کە ماهی موراد ئەز ئوفوق تلوئ کونەد،بوڤـەد کـە پـەرتوڤی نـوری بـە بـامی مـا ئوفتەد.

شەوێك کە مانگی ئارەزوو و ئاوات لـە ئاسـۆوە هەڵبـێ، تیـشکی نورێـك بکەوێتـە سەربانی ئێمەش.

مـراد: ئـارەزوو، ئـاوات، مـوراد    افـق: ئاسـۆ    طلـوع کنـد: هـەڵبێت
بود: بڵێی، دەبێ    نوری: نورێك    بام: سەربان

خواجە دڵنیایە لەوەی کە شەوێك مانگی ئارەزووەکان (یار) لـە ئاسـۆوە سـەردەردەهێنێ و هەڵدێت، بەڵام لـەوە نیگەرانـە کـە هێـشتا دڵنیـا نییـە ئایـا لـە کـاتی هـەڵهاتنی مـانگی ئارەزووەکاندا تیشکی نورێك دەدات لە سەربانەکەی ئەم یا نا، واتە خواجە نیگەرانە لەوەی کـە کاتێ ئارەزوو و ئاواتەکان دێنەدی، ئایا بڵێی ئارەزوو و ئاواتەکانی خواجەش بێنەدی و ئەمیش بگرێتەوە. یاخود دەکرێ مانگی ئارەزوو خودی یار بێت و لە شەوێکدا وەك مانگ دەرکەوێت و لە ئاسۆوە هەڵبێت، بەڵام بڵێی لە ماڵی ئێمەش ـ حافز ـ جیلوە بکات و بە جیلـوەی نـورێکی ماڵەکەی منیش ڕوناك بکاتەوە.

**٤- به بارگاه تو چون باد را نباشد بار**
**کی اتفاق مجال سلام ما افتد**

بە بارگاهی تو چون باد را نەباشەد بار،کەی ئیتیفاقی مەجالی سەلامی ما ئوفتەد.

کاتێ با مۆڵەتی هاتنە بارەگای تۆی نەبێت، کەی بواری سەلامکردنی ئێمە دەبێت.

بار: مۆڵەت، بوار    اتفاق افتد: ڕوودات    اتفاق مجال افتـد: بـوار و مۆڵەت هەبێ

چوونە نێو بارەگای یار زۆر زەحمەت و گرانە و تەنانەت هەوا ـ با ـ ش کە سەر بە هـەموو کون و کەلەبرێکی گەردووندا دەکات، توانا و مۆڵەتی چوونە ژورەوەی نییە، ئیـدی ئێمـە چـۆن مۆڵەتمان هەبێ تا سەلامێك بکەین.

دوو پەیوەند لە نێوان نەتوانینی با و نەتوانینی ئێمەدا هەیە، یەکەمیان ئەوەی کە ئەگەر بێت و با نەتوانێ ئەوا ئێمەی بێ توانا هەرگیز ناتوانین، دووەم ئەوەی کە ئێمە بە هەوادا سەلامەکانمان بۆ یار رەوانە دەکەین و کاتێ با مۆڵەتی پێ نەدرێت ئەوا مۆڵەتی سەلامەکانی ئێمەش نادرێت.

بێگومان ئەو بارەگایەی کە با ش رێی چوونە ژوورەوەی نییە بارەگای یاری حەقە، یاخود وەك د.هروی دەڵێت : حەزرەتی سولەیمانە کە با بەبێ مۆڵەت نەیدەتوانی بچێتە بارەگاکەیەوە {ج١،ل٤٨٨}لە نوسخەی فریدون میرزای تیموری و د. عیوضیدا، میسراعی یەکەم بەم شێوەیە (ملوك را چو ره خاك بوس این در نیست ـ کاتێ پاشایان رێگەی ماچکردنی خاکی ئەم بەردەرگایەیان نییە ) کە لە روی پشت بەستن بە نوسخە دێرینەکانەوە زیاتر ئەم شێوەیە پەسەندترە، بەڵام لە روی واتا و بڵاوی نوسخە نوێیە راستکراوەکانەوە شێوەی یەکەم پەسەند ترە.

**٥- چو جان فدای لبت شد خیال می بستم**

**که قطرەیی ز زلالش بەکام ما افتد**

چو جان فیدای لەبەت شود خەیال مێ بەستەم،کە قەترەیی ز زولالەش بە کامی ما ئوفتەد.

کاتێ گیان فیدای لێوت بوو خەیاڵم دەکرد کە تامی دڵۆپێك لە ئاوی زوڵاڵی دەکەم.

خیال می بستم: خەیاڵم دەکرد، وام دەزانی، گومانم وابوو      زلال: زوڵاڵ، شیرین

به کام افتادن: تام کردن، چێژ بردن

خواجە دەڵێ: ئەی یار کاتێ گیانم کردە قوربانی لێوت، وام دەزانی هەر هیچ نەبێ تامی دڵۆپێك لە ئاوی زوڵاڵی لێوت دەکەم و دڵۆپێك دەکاتە گیانم.

گیان کردنە قوربانی وشە و قسەی یار بە ئومێدی بیستنی وشە و قسەی یار تەورەی سەرەکی ئەم بەیتەیە.

**٦- خیال زلف تو گفتا که جان وسیله مساز**

**کزین شکار فراوان به دام ما افتد**

خەیالی زولفی تو گوفتا کە جان ڤەسیلە مەساز، کەزین شکار فەراڤان بە دامی ما ئوفتەد.

خەیاڵی پرچی تۆ گوتی گیان مەکە بە هۆکار، چونکە زۆر لەم نێچیرە کەوتووەتە داوی ئێمەوە.

گفتا: گوتی    وسیله مساز: مەکە بە هۆکار    شکار: نێچیر    فراوان: زۆر



خواجە لە بەیتی پێشودا گیانی کردە قوربانی لێوی یار بەو خەیاڵەی کە بە دیدار شاد ببێت، بەڵام لەم بەیتەدا خەیاڵی نهێنییەکانی پرچی یار پێی دەڵێ: گیان مەکە بە وەسیلە و هۆکار تا بە ئێمە بگەیت، چونکە گیانی زۆر هەیە بووەتە نێچیری زولفی من و بە دیداریش نەگەیشتووە، لێرەدا یار گیان بە قوربانییەکی کەمتر دەزانێ لە وەسڵ و دیدار و بە شاراوەیی دەڵێ دەبێ لە گیان عەزیزتر پێشکەشکرێت.

**٧- به ناامیدی ازین در مرو فالی بزن**

**بود که قرعەی دولت به نام ما افتد**

به نائومیدی ئەزین دەر مەرو فالی بزەن،بوڤەد کە قورئەیی دۆولەت بە نامی ما ئوفتەد.

بە نائومێدی لەم بەردەرگایە مەڕۆ فاڵێ بگرەوە، بەڵکو تیروپشکی بەخت بکەوێتە سەر ناوی ئێمە.

مـرو: مەڕۆ    فالی بزن: فاڵێك بگرەوە، بە ئومێدی خێرەوە فاڵ بگرەوە

قرعە: پشك    دولت:بەخت    به نام ما افتد: بە ناوی ئێمەوە دەرچێ

خواجە بە خۆی دەڵێ بە نائومێدی لە بەر دەرگای یار مەڕۆ و فاڵێکی خێر بگرەوە و دۆعایەك بکە، بەڵکو ئەمە خوایە پشکی بەخت و ئیقباڵ بکەوێتە سەر ئێمە و دیدار و وەسڵی یار فەراهەم ببێت کەس چوزانێ چی لە هەگبەی بەختدایە.

**٨- ز خاك کوی تو هرگه که دم زند حافظ**

**نسیم گلشن جان در مشام ما افتد**

ز خاکی کویی تو هەرگەه کە دەم زەنەد هافز،نەسیمی گولشەنی جان دەر مەشامی ما ئوفتەد.

هەرکاتێ حافز لە بارەی خاکی کۆڵانی تۆوە بدوێ،شەماڵی بۆنخۆشی گوڵزاری گیان بە دەماخی ئێمە دەگات.

هرگە: هەرکاتێ    دم زند: بدوێ، قسە بکات    گلشن: باغ، گوڵزار

هەرکاتێ حافز لە بارەی خاکی کۆڵانی یارەوە ئەدوێ دەماخی ئێمە و هەستی بۆنکردنمان پڕ دەبێ لە بۆنی خۆشی باغی یار. یاخود:هەرکاتێ خواجە باس لە یار و جوانییەکانی عەشقی یاری حەق دەکات ئەم باسە هێندە خۆش و هێندە شیرین و بۆنخۆشە هەستی بۆنکردنمان پڕ دەبێ لە بۆنی خۆشی باغی گیان.

## غەزەلی سەد و یازدەیەم:

**بەحری هەزەجی هەشتی تەواو**

**(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)**

**١- درخت دوستی بنشان که کام دل به بار آرد**

**نهال دشمنی برکن که رنج بی شمار آرد**

درەختی دوستی بنشان کە کامی دل بە بار ئارەد،نیهالی دوشمنی بەرکەن کە رەنجی بی شومار ئارەد.

درەختی دۆستی بچێنە کە ئاواتی دڵ دەهێنێتە بار، نەمامی دوژمنی هەڵکێشە کە رەنج و زەحمەتی بێ شومار دەهێنێ.

بنشان: بچێنە    بار: بەر    آرد: دەهێنێ    بە بار آرد: دەهێنێتە بەر

نهال: نەمام، خەڵف    برکن: هەڵکەنە    بی شمار: بێ شومار، زۆر زۆر

ئەم بەیتەی خواجە وەك ئامۆژگارییەکی کۆمەڵایەتی/ئەخلاقی دێتە بەرچاو و جەخت لەسەر دۆستایەتی و دووركەوتنەوە لە دوژمنایەتی دەکاتەوە و وەك بڵێی ئەم بەیتە کوردیەی (دۆست هەزار بێ کەمە، دوژمنت یەك بێ خەمە)ی لەبەرچاوگرتووە و پاشان بەیتەکەی گوتوە، بۆیە دەڵێ : درەختی دۆستی بچێنە، چونکە بە دۆستایەتی کردن ئاوات و ئارەزووەکانی دڵت دێنەبەر و بە ئاوات و ئارەزوو دەگەیت، لە بەرامبەر ئەمەشدا خەڵف و نەمانی دوژمنایەتی هەڵکێشە، چونکە ئەو نەمامە ماوەیەکی دیکە گەشە دەکات و دەبێتە درەختێکی ریشەدار و بە ئاسانی هەڵناکەنرێت و ئەوکاتەش دەرد و مەینەتی بێ شومار لەگەڵ خۆیدا دەهێنێ، هەربۆیە تا نەمامە هەڵی کەنە.

وەك گوتمان ئەم بەیتە هاندانە بۆ دۆستایەتی کردن و بیرخستنەوەی سەرەنجامی خراپی دوژمنایەتییە.

**٢- چو مهمان خراباتی به عزت باش با رندان**

**که دردسر کشی جانا گرت مستی خمار آرد**

چو میهمانی خەراباتی بە ئیزەت باش با ریندان،کە دەردیسەر کەشی جانا گەرەت مەستی خومار ئارەد.

گیانەکەم کاتێ میوانی مەیخانەیت لەگەڵ رەنداندا بە عیزەت بە، چونکە کاتێ مەستیت خوماری هێنا نارەحەتی دەکێشی.



خرابات: مەیخانە    بە عزت باش: بەڕێز بە    دردسر: نارەحەتی، عەزاب و دەردی سەری    کشی: دەکێشی

زۆرجار وشەی مەستی و خوماری لە بری یەکتر بەکاردەهێنرێن، بەڵام لە بنەڕەتدا و وەك لەم بەیتەدا دەردەکەوێ خوماری لە مەستی جیاوازە و حاڵەتێکە کە لە خوار مەستییەوەیە کە دەکرێ پێش مەست بوون و پاش مەستبوون بێت. لێرەدا خوماریی ئەو حاڵەتە نیمچە بێدارییە کە لە دوای مەستییەوە مرۆڤ تیایدا هەست بە خەواڵویی دەکات، بەڵام عەقڵ و هۆشی بەدەست دەهێنێتەوە، لەم بەیتەدا مەبەست لە بەردانی مەستییە، کە لە کوردیدا دەگوترێ (بەریداوە) مانای (خرابات) لە بەیتەکەوە وادەردەکەوێ کە شوێنی کۆبوونەوەی سۆفی و عارفان بێت؛ واتە خانەقا یاخود تەکیە و (رندان) یش خودی سۆفی و عارفانن و گوتاری بەیتەکە ئاراستەی ئەو کەسە کراوە کە سەردانی ئەو جۆرە شوێنانە دەکات و پێی دەڵێ: کاتێ میوانی ئەو جێگایەیت و لە حاڵەتی شەوق و شور و بێ ئاگاییدایت بەڕێز لەگەڵ عارفان و سۆفیاندا قسە وکرداری نەشیاو و نالایق ئەنجام مەدە، چونکە کاتێ بە ئاگا هاتیەوە و مەستیت خوماری هێنا پەشیمان دەبیتەوە و ئەم رەفتار و گوفتارانەت دەبێتە مایەی دەردی سەری و عەزاب و گرفت.

وا پێدەچێ ئەم دوو بەیتە ئامۆژگاری بن بۆ سۆفییەکان و لە ئاستی قووڵیدا باس لەو کێشە و گرفت و رق و کینانەی ناو خەنەقا بکات هەروەك لە غەزەلێکی پێشتردا هێناویەتی.

**٣- شب صحبت غنیمت دان که بعد از روزگار ما**

**بسی گردش کند گردون بسی لیل و نهار آرد**

شەبی سوهبەت غەنیمەت دان کە بەئد ئەز روزگاری ما،بەسی گەردش کونەد گەردون بەسی لەیل و نەهار ئارەد.

شەوی هاودەمی بە دەسکەوت بزانە، چونکە دوای رۆژگاری ئێمە گەردوون زۆر دەسوڕێتەوە و شەو و رۆژی زۆر دەهێنێ.

صحبت: هاودەمی لەگەڵ یاراندا    غنیمت: دەسکەوت

غنیمت دان: بە غەنیمەت بزانە

خواجە زەمان و کاتی کورتی تەمەنی مرۆڤ بە بیری گوێگرەکەی دەهێنێتەوە و لەمەشەوە دەیەوێ پێی بڵێ: لەم تەمەنە کورتەدا هاوڕێیەتی و پێکەوەبوون لەگەڵ دۆستانەدا دەسکەوتێکی زۆر گەورەیە و ناکرێ مرۆڤ لە دەستی بدات، بۆیە بەرامبەر بە مرۆڤ ـ یاخود دەکرێ کەسەکانی بەیتی یەکەم و دووەم بن ـ دەڵێت: هاودەمی لەگەڵ دۆستاندا بە دەسکەوت

بزانە و لەم تەمەنە کورتەدا بەهرەی لێ وەربگرە، چونکە پاش رۆژگاری تەمەنی ئێمە گەردوون زۆر دەسوڕێتەوە و شەو و رۆژی زۆر بەدوای خۆیدا دەهێنێ و ئێمە بوونمان نییە.

**٤- عماری دار لیلی را که مهد ماه در حکم است**

**خدایا در دل اندازش که بر مجنون گزار آرد**

ئەماری داری لەیلی را کە مەهدی ماه دەر هوکمەست،خودایا دەر دل ئەندازەش کە بەر مەجنون گوزەر ئارەد.

خوایە بیخە دلّی کەژاوەداری لەیلا کە بێشکەی مانگ لەژێر دەستیدایە بە لای مەجنوندا تێپەڕێ.

عماری: کەژاوە عماری دار: کەژاوەدار، کەسێ کە هەوساری ئەو ئەسپە رادەکێشێ کە کەژاوەی بە سەرەوەیە مهد: بێشکە در دل اندازش: بیخەدلّی

مەبەست لە (بێشکەی مانگ) کەژاوەکەی لەیلایە کە وەك بێشکە وایە و لەیلاش وەك مانگ تیایدا دانیشتوە. بێگومان ئەوکەسەی کە ئەم کەژاوەیە رادەکێشێ کەژاوەکەی لە ژێر دەستدایە و بە رێنوێنی ئەو دەڕوات، خواجە دۆعا دەکا ئەی خوایە بیخە دلّی ئەو کەسەوە کە کەژاوەکەی لەیلێ رادەکێشێ بە لای مەجنوندا تێپەڕێ تا یەکتری ببینن.

نزایەکە بۆ بە یەکترگەیشتنی لەیلێ و مەجنونەکان یا بە شێوەیەکی گشتگیرتر هەموو عاشق و مەعشوقەکان.

**٥- بهار عمر خواه ای دل وگر نە این چمن هرسال**

**چو نسرین صدگل آرد بار و چون بلبل هزار آرد**

بەهاری ئومر خاه ئەی گول ڤەگەر نە ئین چەمەن هەرسال،چو نەسرین سەد گول ئارەد بار و چون بولبول هەزار ئارەد.

ئەی دلّ خوازیاری تەمەن بە وەگەر نا ئەم باخە هەموو سالێ سەد گولّی وەك نەسرین و هەزار بولبول دەهێنێ.

بهار عمر: بەهاری تەمەن، دەورانی جوانی و لاوی

واتای ئەم بەیتە وەك بەیتی سێیەم وایە و باس لە بەهرەمەندبوونە لە تەمەن و ژیانی مرۆیی و بەردەوام بوونی ژیانە بەبێ من و تۆش، ئەی دلّ تۆ هەمیشە لە هەولّی بەهاری تەمەن و دەورانی جوانی و لاویدا بە و هەمشیە چالاك و بە هیوا بە، خەریکی سەفای ژیانی حەقیقی بە، چونکە ئەم چیمەن و مێرغوزارەی ژیان هەرسالێ سەدەها گولّی نەسرین و بولبول دەهێنێت و دەژین.



**٦- خدا را چون دل ریشم قرار بست با زلفت**

**بفرما لعل نوشین را که حالش با قرار آرد**

خودا را چون دلی ریشەم قەرار بەست با زولفەت، بفەرما لەئلی نوشین را کە هالەش با قەرار ئارەد.

ئێستا کە دلّی بریندارم لەگەلّ پرچتدا پەیمانی بەستووە تۆ بی و خوا بە لێوی شیرینت بفەرموو کە حالّی ئارام بکاتەوە.

ریش: بریندار، پەشێو قرار بست: قەراری بەست، پەیمانی بەست نوشین: شیرین، پاراو با قرار: ئارام، لە بەرامبەر (بی قرار)دا دێت

خواجە دەزانێ کە دلّی بریندار و پەشێوی پەیمانی لەگەلّ پرچی یاردا بەستووە و بەم پەیمانەش توشی نائارامی و بێ قەراری دەبێت، بۆیە لە یار دەپاڕێتەوە کە بۆ خاتری خوا یاخود تو بی و خوا بە لێوی شیرینت بلّێ کە ئارامی بکاتەوە؛ واتە بە قسەکردن ئارامی بکاتەوە، شێوەی ئەم بەیتە لە حافزدا زۆرە کە خواجە دەزانێ کەوتوەتە داوی پرچی یار و ئەمەش دەبێتە مایەی بێ ئارامی و داوا لە لێوی یار دەکا ئارامی بکاتەوە.

**٧- درین باغ ار خدا خواهد دگر پیرانە سر حافظ**

**نشیند بر لب جویی و سروی در کنار آرد**

دەرین باغ ئەر خودا خاهەد دگەر پیرانە سەر هافز،نشینەد بەر لەبی جویی یو سەرڤی دەر کینار ئارەد.

ئەگەر خودا بیەوێ (رازی لەسەربێ) لەم باخەدا حافز جارێکی دیکە لە پیریدا لە کەناری جۆگەدا دادەنیشێ و سەروبەژنێك دەهێنێتە کەناری خۆی.

درکنار آرد: دەهێنێتە کەناری خۆی، لەخۆی نزیك دەکاتەوە

خواجە دەلّێ: ئەگەر خودا بیەوێت و رازی لەسەربێت حافز دەتوانێ جارێکی دیکە لە رۆژگاری پیریدا و لەم باغی دونیایەدا لە کەنار جۆگەدا دانیشێت و لەگەلّ یاردا بە خۆشی و سەیر و سەفا بیگوزەرێنێ.

لە نوسخەی سودی و قەزوینی و هەندێ نوسخەی دێریندا لە بری (ارخدا خواهد ـ از خدا خواهد) هاتووە و بەم واتایەش ئەم حالّەتە دەبێتە دۆعا و تەمەنای حافز کە داوا دەکات لە پیریدا لە کەنار جۆگە و لەگەلّ یاردا دابنیشێ.

## غەزەلی سەد و دوازدەیەم:

**موجتەسی هەشتی مەخبونی ئەسڵەم**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع لن)**

**١-کسی که حسن خط دوست در نظر دارد**

**محقق است که او حاصل بصر دارد**

کەسی کە هوسنی خەتی دوست دەر نەزەر دارەد،موهەقەق ئەست کە ئو هاسلی بەسەر دارەد.

کەسێ کە جوانی خەتی دۆستی لەبەرچاو بێت بێگومان کە ئەو بەرهەمی چاوی هەیە.

خط دوست: خەتی روخساری دۆست        محقق است: بێگومان

کەسێ کە دەتوانێ جوانی خەتی دۆستی لەبەرچاوبێت و ببینێ بێگومان کە بەرهەمی چاوی خۆی هەیە و هەرئەوە بەرهەمی بینین و چاویەتی.

لە راستیدا فەزای ئەم غەزەلە تا رادەیەکی زۆر عیرفانییە و بۆ لێکدانەوەی بەیتەکان پێویستمان بە فەرهەنگە عیرفانییەکان دەبێ.

بێگومان هەموو کەسێ توانای بینینی جوانی روخساری دۆستی نییە، لای خواجە تەنیا ئەو چاوانە بەرهەمدارن کە توانای دیتنی خەتی روخساری یاریان هەیە و هیچی دیکە، کەواتە کەسێ کە هەمیشە جوانی خەتی روی دۆستی لەبەرچاوە هەرئەوە کە بەرهەمی چاو و دیتنی چنیوە.

ئەم لێکدانەوەیە دەرخستنی گرنگی جیلوەکردنی دۆستە، بەڵام گەر قوولتر لە (در نظرداشتن) وردبینەوە دەکرێ بە واتای گرنگی پێدان لێکی دەینەوە و لەم واتایەشدا ئەوکەسانەن کە تەنیا جوانی خەتی روی دۆست لایان گرنگە.

ئەم بنەمایە تەنیا جوانی بینینی حق لای عارفەکان بنەما و پایەیەکی زۆر گرنگە و ئەوان هەمیشە دۆست بە جوانی رەها دەبینن، خواجە لێرەدا ستایشی ئەو چاو و ئەم بینانە دەکات.

**٢- چو خامە بر خط فرمان او سر طاعت**

**نهادەایم مگر او بە تیغ بر دارد**

چو خامە بەر خەتی فەرمانی ئو سەری تائەت دارەد،نەهادەییم مەگەر ئو بە تیغ بەر دارەد.

وەك خامە سەری گوێڕایەڵیمان خستۆتە سەر خەتی فەرمانی ئەو و هەڵی ناگرین مەگەر ئەو بە (چەقۆ) تیغ لاییبات.



خامە: خامە، قەڵەم، قەڵەمی قامیشی        نهادەایم: دامانناوە

سر طاعت نهادایم: گوێڕایەڵین، سەری گوێڕایەڵیمان داناوە

تیغ: چەقۆ، تیغ بردارد: هەڵیگرێت، لاییبات

ئەم بەیتە گوزارشت کردنە لە گوێڕایەڵی تەواو و رەهای خواجە بۆ فەرمانەکانی یار و تا دوا هەناسە و تا ئەوکاتەی کە یار خۆی دەیەوێ ئەم واز لەم ملکەچی و گوێڕایەڵییە ناهێنێ.

بەیتەکە جوانکاریەکی تێدایە و خواجە خۆی بە قەڵەم چواندووە، بێگومان قەڵەم کاتێ نوکەکەی دەخرێتە سەر شتێ ئیدی تاوەکو ئەوکەسەی کە قەڵەمەکەی بە دەستەوەیە نەیەوێ سەری هەڵناگرێ و بەرزی ناکاتەوە، خواجەش دەڵێ ئێمە وەکو قەڵەم سەری گوێڕایەڵیمان بۆ فەرمانەکانی یاری حق داناوە و سەرمان خستۆتە سەر خەتی فەرمانەکانی هەتا وەکو خۆی بە تیغ و چەقۆ سەرمان نەبڕێ و لاینەبات (نەمرین) واز لە گوێڕایەڵی و ملکەچی ئەو ناهێنین.

**٣-کس به وصل تو چون شمع یافت پروانه**

**که زیر تیغ تو هردم سری دگر دارد**

کەس بە ڤەسلی تو چون شەمئـ یافت پەرڤانە،کە زیری تیغی تو هەردەم سەری دگەر دارەد.

کەسێکی وەك مۆم مۆڵەتی وەسڵی تۆی پێدراوە کە لە ژێر شمشێری تۆ هەردەم سەر دەربهێنێتەوە.

پروانە: مۆڵەت        یافت پروانە: مۆڵەتی وەرگرت

شەمع وەك چرای ئێستا فتیلەی هەبووە و بۆ چاکتر سوتان و روناکی بەخشین پێویستە بەردەوام سەری فتیلەکە ببڕێت، خواجە ئەم حاڵەتەی وەرگرتووە و دیسانەوە تەوزیفی کردوەتەوە. لە مانای نوێدا ئەم پێی وایە کە مانەوەی فتیلە یا مۆم پاش بڕینی سەری ئارامگرتنە لە سەر عەزاب و ناڕەحەتییەکان و جەور و جەفا، لێرەشدا ئەم ئارامگرتنەی بە مەرجی گەیشتن و وەسڵی دولبەر داناوە. خواجە خۆی دەڵێ: کەسێك بە لیقا و دیداری تۆ (یار) دەگات کە وەك مۆم کاتێ بە شمشێر و تیغی یار سەری دەبڕردرێ دووبارە سەر دەربهێنێتەوە و هەوڵ بدات و نەڕەنجێ لە یار واتە کەسێ بە وەسڵی دولبەر دەگات کە لە بەرامبەر جەور و جەفا و ناڕەحەتیەکاندا خۆڕاگرە و بەردەوامە لە عەشقی مەحبوب.

**٤- به پای بوس تو دست کسی رسید که او**

**چو آستانه بدین در همیشه سر دارد**

بە پای بوسی تو دەستی کەسی رەسید کە ئو، چو ئاستانە بەدین دەر هەمیشە سەر دارەد.

کەسێك دەتوانێ پێی تۆ ماچ بکات کە هەمیشە وەك بەردەرگا سەری لە سەر خاکی ئەم دەرگایەت بێ.

پای بوس: پێ ماچکەر          دست رسید: دەستی گەیشت

وەرگێڕانی وشە بە وشەی میسراعی یەکەم بەم شێوەیەیە (کەسێك دەستی دەگاتە پێماچکەریی تۆ). ئەو/یار هەمیشە پێ دەخاتە سەر خاکی بەردەرگا، لێرەدا خواجە روحی بە (بەردەگا) داوە و وای داناوە کە بە ویستی خۆی لە پێش دەرگایە و هەمیشە پێی یار ماچ دەکات، حافزیش پێی وایە کەسێ دەتوانێ ببێتە پێماچکەری یار کە وەك بەردەرگا بەردەوام و هەمیشە سەری بخاتە سەر خاکی دەرگای یار.

سێ بەیتی دووەم و سێیەم و چوارەم باس و وێنەی جوانی گوێڕایەڵی و ملکەچی رەها و بەردەوامی و خۆڕاگرییە تا کۆتایی تەمەن کە ئەم دوانەش (طاعە و استقامە) مەرجی گرنگی گەیشتن بە دیدار و لیقای یارن.

**٥- ز زهد خشك ملولم بیار بادەی ناب**

**کە بوی بادە مدامم دماغ تر دارد**

ز زوهدی خوشك مەلولەم بیار بادەیی ناب،کە بویی بادە مودامەم دیماغ تەر دارەد.

لە زوهدی وشك مەلوولم شەرابی ساف بێنە کە بۆنی بادە بەردەوام دەماغم بە تەڕی دەهێڵێتەوە.

خشك : وشك     ملول: دڵتەنگ، بێزار     ناب: ساف، بێ خەوش     مدام: بەردەوام
تر: تەڕ، پاراو

زوهدی وشك گوتنەوە و خۆگرتنەوە حەرفیانەن کە روحیان تێدانییە ئەو نوێژە بێ گیانانەن کەوا عەشقیان تێدانیە، ئەو رۆژوانەی کە جگە لە برسێتی و تینوێتی هیچ لەزەت و چێژێك نابەخشن، ئەو هەموو چۆن و بۆچی و گوناهە و عەزابەی کە باس دەکرێت وشکە زوهدن.

ئەم مەسەلەیە کە لە دێرینەوە تا ئەمڕۆ و رەنگە تا ئاخرزەمان بەردەوام بێت بریتییە لە خوداپەرستی وشکە زاهیدەکان و خوداپەرستی عارفەکان. خوداپەرستی وشك خوداپەرستییەکی جەستەییانەیە و زۆربەی کاتەکانیش ترسێکی لە رادە بەدەر لە خودا تەنانەت تا ئاستی فۆبیاشی لەگەڵدایە، بەڵام خوداپەرستی تەڕ و عارفانە بە زۆری خوداپەرستییەکی روحی و گیانییە و هەمیشە عەشق و خۆشەویستییەکی لە رادەبەدەری بۆ خودا لە گەڵدایە. هەربۆیە خواپەرستی یەکەم بێ روح و گیانە و هیچ چێژێکی نییە. بەڵام خواپەرستی دووەم چێژ و لەزەتێکی زۆری تێدایە.



خواجە لەم وشکە زوهدە ـ کە زۆرجار تەنیا قسەیە و لە حەقیقەتدا وانییە ـ بێزارە و پێی وایە کە عەشقی پاکی ئیلاهی تەڕی و پاراوی بە دەماغ و مێشکی مرۆڤ دەدات نەوەك ئەو زوهد و ترس و هات و هاوارەی وشکە زاهیدەکان، هەربۆیە دەڵێ شەرابی سافم بۆ بێنە با بینۆشم، عەشقم بۆ بێنە بادڵم و دەماغم بە پاراوی خۆی هەمیشە بە تەڕی بهێڵێتەوە.

**٦- ز بادە هیچت اگر نیست این نە بس کە ترا**

**دمی ز وسوسەی عقل بی خبر دارد**

ز بادە هیچەت ئەگەر نیست ئین نە بەس کە تو را،دەمی ز ڤەسڤەسەیی ئەقل بی خەبەر دارەد.

ئەگەر لە شەراب هیچت دەستگیر نابێ ئەمە بەس نییە کە ساتێ لە وەسوەسەی عەقڵ بێ ئاگات دەکات.

هیچت اگر نیست: ئەگەر هیچت دەستگیر نابێ، ئەگەر هیچ سودێ ناکەیت
این نە بس: ئەمە بەس نییە
دمی: ساتێ، هەناسەیەك     وسوسە: وەسوەسە، هێزی جوێنەری دەروونی مرۆڤ بۆ خراپە، دوودڵی

وەك باسمان کردووە لای خواجە (عەقڵ) رویەکی پەسەندی نییە و هەمیشە لە بەرامبەر عەشقدا بە سوك سەیر دەکرێت و لێرەدا ئەوە دەخاتەڕو کە عەقڵە بە دەستی کورتی خۆیەوە مۆڤ توشی وەسوەسە دەکات و وای لێ دەکات بیر لە شتی خراب بکاتەوە. ئەو دەڵێ: گەر عەشق و بادە ـ عیرفان و عەشقی ئیلاهی ـ هیچ سودێکیشت پێ نەگەیەنێ بەس نییە کە بۆ ساتێك نەجاتت دەدا لە وەسوەسەی عەقڵ.

**٧-کس کە از در تقوی قدم برون ننهاد**

**بە عزم میکدە اکنون سر سفر دارد**

کەسی کە ئەز دەری تەقڤا قەدەم برون نەنهاد،بە ئەزمی مەیکەدە ئەکنون سەری سەفەر دارەد.

کەسێ کە لە دەرگای تەقواوە هەنگاوێ نەچووە دەرەوە، ئێستا نیازی سەفەری بەرە و مەیخانە هەیە.

قدم نهادن: هەنگاو هەڵگرتن     برون/بیرون: دەرەوە     بە عزم میکدە: بەرەو مەیخانە     سر سفر دارد: نیازی سەفەری هەیە

دەکرێ لێرەدا ئەو کەسە نەناسراوەی لە بەیتەکەدا هاتوە خودی شاعیر بێت کە لە بەیتی پێنجەمدا بێزاری خۆی لە وشکە زوهد دەردەبڕێ و لێرەدا دەڵێ: کەسێ کە هەرگیز لەوێ تەقوا

و شەریعەت لای نەداوە و هەنگاوی نەخستوەتە دەرەوەی ئەو ڕێگەیەوە ئێستا نیازی هەیە بەرەو مەیخانە سەفەر بکات.

لە زاراوەی عیرفانیدا (میکده) موناجات و لایەنی روحانی و عاشقانەی ئاینە خواجە زۆر جار (تقوی) بۆ لایەنی مادیانە ئاین بەکاردەهێنێ و بە شەریعەتی لە قەڵەم دەدات، لێرەدا دەڵێ کەسێ کە هەرگیز لە ڕێی تەقوا ـ شەریعەت ـ لای نەداوە و هەمیشە حەرفی بووە ئێستا ئیدی بە نیازە روو لە عالەمی موناجات و عەشقی ئیلاهی بکات.

**٨- دل شکستەی حافظ به خاك خواهد برد**

**چو لاله داغ هوایی که بر جگر دارد**

دلی شکەستەیی هافز بە خاك خاهەد بورد، چو لالە داغی هەڤایی کە بەر جیگەر دارەد.

دڵی شکاوی حافز دەباتە ژێرخاك (گۆڕەوە) داخی ئەو ئارەزووەی کە وەك گوڵاڵە بە سەر جگەریەوەیەتی.

بە خاك خواهد برد: دەباتە ژێرخاك، دەباتە گۆر، دەکوژرێ     داغ: داخ
هوائی: ئارەزوویەك

گوڵاڵە سورە خاڵێکی رەش لە ناوەندیدایە کە ئەمە لای خواجە بە داخ دراوەتە قەڵەم، خواجە دەڵێ:

دڵی من وەك گوڵاڵە سورەی داخکرا و وایە و ئەو داخەش داخی ئارەزوویەکە کە خواجە بە روونی نایڵێ، بەڵام لە فەزای شیعرەکەوە ئاشکرا دەبێ کە داخی عەشقی ئیلاهییە کە نەیتوانی بە فەنا و بەقا بگات و ئەم داخی ئارەزووە سەرەنجام دەبێتە مایەی مەرگی خواجە و دڵی سوری گوڵاڵەئاسای دەباتە ژێر خاك. کەوابێ داخی ئارەزووەکە کە بە سەر جگەری حافزەوەیەوە رۆژێ خواجە دەباتە ژێرگڵ.



## غەزەلی سەد و سێزدەیەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەشکول**

**(فعلات فاعلاتن فعلات فاعلاتن)**

**١- دل ما به دور رویت ز چمن فراغ دارد**

**که چو سرو پای بند است و چو لاله داغ دارد**

دلی ما بە دۆوری رویەت ز چەمەن فەراغ دارەد،کە چو سەرڤ پای بەندەست و چو لالە داغ دارەد.

دڵی ئێمە لە زەمانی جیلوەی روتدا پێویستی بە باغ و چیمەن نییە، چونکە وەك سەرو پێی بەندە و وەك گوڵاڵە داغی هەیە.

دور: زەمان، سەردەم     بە دور: لە سەردەمی، لە زەمانی     فراغ دارد: بێ نیازە، پێویستی پێی نییە

بەیتەکانی سەرەتای فەزای ئەم غەزەلەش وەك غەزەلی پێشو فەزایەکی عیرفانی و عاشقانەی هەیە و زەمینەیەکی هاوشێوەی پێویستە بۆ لێکدانەوەی. خواجە لەم بەیتەدا دوو جوانی دەخاتەڕو، یەکێکیان جوانی جیلوەی روخساری یار و ئەوی دیکەیان جوانی گوڵزار و چیمەنە کە هەردوکیان دەبنە مایەی خۆشحاڵی دڵ، ئەو پێی وایە لە سەردەم و کاتێکدا کە دولبەر جیلو بکات بۆ عاشقان ـ کە ئێمەش لەوانین ـ ئیدی دڵی عاشقان هیچ پێویستی بە گوڵزار و جوانیە سروشتیەکان نامێنێ، چونکە ئەسڵەن دڵی عاشقان وەك سەرو پێی بەندکراوی روی یار و وەك گوڵاڵەش داخکراوی دەستی ئەو جوانی و جیلوەیە.

خواجە لە زۆر جێگەدا باس لەو بێ نیازی و پێویستی پێ نەبونەی عاشقان لە جوانییە سروشتییەکان دەکات کاتێ کە جوانی یار خۆی دەنوێنێ، ئەو دەڵێ:

خلوت گزیدەرا بە تمشا چە حاجت است- چون کوی دوست هست بە صحرا چە حاجت است

لەم بەیتەدا میسراعی دووەم لە وەسفی دڵی ئێمەدا گوتراوە کە وەك دارسەرو وابەستە و چەقیوی جیلوەی جوانی روی یاری حەقە و وەك گوڵاڵەش داخکراو و خەفەتباری ئەو عەشقە ئیلاهییەیە کە هەیەتی.

**٢- سر ما فرو نیاید به کمان ابروی کس**

**که درون گوشەگیران ز جهان فراغ دارد**

سەری ما فرو نەیایەد بە کەمانی ئەبروی کەس، کە دەرونی گوشەگیران ز جەهان فەراغ دارەد.

سەری ئێمە بە کەوانی برۆی کەس دانانەوێ، چونکە دەروونی گۆشـەگیران پێویـستی بـە جیهان نییە.

فـــرو نیایـــد: دانانـــەوێ، کـــەچ نـــابێ   درون: ویـــژدان، دەروون
گۆشەگیران: گۆشەگیران، گۆشەنشینان

خواجە خۆی لەگەڵ عاشقان و گۆشەنشیناندا دەداتە قەڵەم،ئەو عاشقانەی کـە دونیـا لایـان هیچ نرخێکی نییە و لە عەشقی ئیلاهیدا نغرۆن، هەربۆیە سەری ئێمـە لـە بەرامبـەر کـەمانی برۆی کەسدا نەوی ناکرێت.

دەکرێ مەبەست لە میسراعی یەکەم سەرنەویکردن بێت لە ئاسـت جوانییـە دونیاییەکانـدا یاخود لە ئاست هێزە دونیاییەکاندا، بەڵام لە فەزای گشتی غەزەلەکەدا جوانییـە دونیاییـەکان واتای جوانتر دەگەیەنێ و بەم شێوەیە دەبێتـە تەواوکـەری بـەیتی پێـشوکە ئێمـەی عاشـقان و گۆشەگیرانی عارف دونیا لامان هیچ گرنگیەکی نییە و لە بوونی جیلـوەی جـوانیی روخـساری یاریشدا مل بۆ هیچ جوانییەکی دیکە کەچ ناکەین.

د. هروی بە لێکدانەوەی دووەم واتای بە بەیتەکە داوە و نووسیویەتی: مەبەست لە کەوانی ئەبرۆ چرچ و لۆچی سەرزەنشتە و دەڵێ ـ واتە حافز دەڵێ ـ ناخی ئێمەی گۆشەنیشان گوێی لـە خۆشییەکانی دونیا نییە و بۆیە لە بەرامبەر چینی برۆی کەسدا ـ تـوڕەیی کەسـدا ـ سـەرنەوی ناکەین{ج ١، ل٤٩٩}، دەکرێ ئەم لێکدانەوەیەی د. هروی لێکدانەوەی سـەرزارەکی بەیتەکـە بێت. بەڵام ئەبرۆی کەوانی، یا کەوانی ئەبرۆ هێندە زاراوەیەکی عاشقانەیە و مەبەست لێی نـاز و عیتابی یارە زاراوەیەکی کۆمەڵایەتی و سیاسی نییە.

**٣- ز بنفشه تاب دارم که ز زلف او زند دم**
**تو سیاه کم بها بین که چه در دماغ دارد**

ز بەنەفشە تاب دارەم کە ز زولفی ئو زەنەد دەم،تو سیاهی کەم بەها بین کە چـە دەر دیمـاغ دارەد.

لە وەنەوشە نارەحەتم کە دەم لە پرچی ئەو دەکوتێ، تۆ ئەم رەشە کەم بەهایە ببینە کە چـی لە مێشکدایە.

تاب دارم: نارەحەتم، توڕەم   دم زدن: دەم کوتان، قسە لـەبارەوە کـردن   سـیاە: رەش، لێرەدا درکەیە لە وەنەوشە   کم بها:کەم بەها، کەم قیمەت، کەم نرخ دماغ: دەماغ، مێشك

وەنەوشە لاڤی ئەوەی لێداوە کە لە رەشی و بۆنخۆشیدا لە پرچی ئـەو ـ یـار ـ دەچـێت. ئـەم لافە خواجەی نارەحەت یا توڕە کردووە کە وەنەوشە ئەوەندە گێل و نەزانە ئەم جۆرە خەیاڵانـەی



لە مێشکدایە، ئەو وەنەوشەیەی کە وەك بەندە رەشەکان کەم نرخ و بەهایە و یاخود ئەو رەشـی کەم نرخ و بەهایە.

لای عاشـقان و عارفـان لاڤی جـوانی وەك جـوانی مەعـشوق لێـدان گێلێتییـەکی گەورەیـە، هەربۆیەشە لێرەدا خواجە وەنەوشەی سروشت سوك دەکات کە ویستویەتی لاڤی جوانی پرچی یارلێ بدات و دەڵێ: لە وەنەوشە نارەحەت یاخود توڕە و دڵگرانم کە لاڤی جوانی پرچی یار لێ بدات، تـۆ سەیری ئەم رەشە کەم نرخەی نێو سروشت بکە کە چەندە گێلە و چ بیرێکی لە مێشکدایە.

ئەم بەیتەش دیـسانەوە جەختکردنـەوەی خواجەیـە لەسـەر روو وەرگێڕانـی عارفـەکان لـە سروشت لە کاتی جیلوەکردنی روخساری مەعشوقدا.

**٤- شب تیره چون سر آرم ره پیچ پیچ زلفش**
**مگر آنکه عکس رویش به رهم چراغ دارد**

شەبی تیرە چون سەر ئارەم رەهی پیچ پیچی زولفەش،مەگـەر ئانکـە ئەکـسی رویـەش بـە رەهەم چراغ دارەد.

شەوی تاریك و نوتەك چۆن سەر لە رێگەی پێچاوپێچی پرچـی دەرکـەم، مەگەرئـەوەی کـە وێنەی روخساری لە رێگەمدا بکاتە چرا.

تیرە: تاریـك، نوتـەك   چـون: چـۆن   سـرآرم: سـەردەرکەم، تەواوکـەم، تێپـەڕێنم
رە: رێگە   پیچ پیچ: پێچاوپێچ   عکس: وێنە
بە رهم: لە رێگەمدا

بێگومان هەمیشە پرچ و چاڵی چەناگە و روو بەربەستن لە رێگەی گەیشتن بـە مەعـشوقدا، لێرەدا بەربەستی یەکەمیانی هێناوە و دەڵێ: لە تاریکایی پرچی ئەودا چۆن چـۆنی سـەردەرکەم کە وەك رێگەیەکی پێچاوپێچ وایە تەنیا ئەوکاتە نەبێ کە وێنەی روخساری کـە دەدرەوشـێتەوە وەك چرایەك لە رێگەمدا بێت.

بە تەعبیری عیرفانی رێگەی پێچاوپێچی پرچ نهێنییە ئیلاهیەکانن و شەوی نوتەکیش ئـەم شوێن و کاتەی دونیا، وێنەی روخساری مەعشوقین نور و پرتەوی هیدایەت و رێنمایی خوداییـە خواجە لەم بەیتەدا دەیەوێ ترسناکی رێگەی عەشق و رێگا چارەی تـەی کردنـی ئـەو رێگەیـە بخاتەڕوو ئەو دەڵێ: لە شەوگاری نوتەکدا و لە رێگەی پێچاوپێچی نهێنییـە غەیبیەکانـدا گـەر پرتەوی نوری ئیلاهی نەبێتە رێنماییکـەری عاشـق و بەنـدەکان ئـەوا نارەحەتـە مـرۆڤ بتـوانێ سەردەرکات، ئەم بەیتە راستییەکی گـەورە دەخاتـەڕوو ئـەویش ئەوەیـە کـە خـودا بـە خـودا دەناسرێت نەوەك بە عـەقڵ و هەوڵە بچکۆلەکانی عەقڵ، ئێمە پێشتر لەمە دواین، واتە مرۆڤ لە

ژیاندا بە هیدایەت و دەستگرتنی خودا ـ کە لە ڕێنماییە ئاینی و موعجیزە و ئیلهامەکانـدا ـ خۆی دەبینێتەوە بە سەرنجام دەگات نەوەك بە هیچی دیکە.

لە کاتی نوسینەوەی ئەم بەیتەدا جیاوازی لە نێوان نوسخەکاندا دروست بووە، لە (قزوینی و سودی)دا میسراعی (شب ظلمت و بیابان به کجا توان رسید)ەو لە هەنـدێ نوسخەشـدا لـەبری (عکس)ی میسراعی دووەم (شمع) نووسراوە، کە جیاوازی لە واتادا دروست ناکەن.

**٥- من و شمع سبحگاهی سزد ار به هم بگرییم**

**که بسوختیم و از ما بُت ما فراغ دارد**

مەن و شەمئـی سوبهگاهی سیزەد ئەر بە هەم بگرییم،کە بسوختیم و ئەز مـا بـوتی مـا فەراغ دارەد.

جێگەی خۆیـەتی ئەگـەر مـن و مـۆمی بـەیانیان پێکـەوە بگـرین، چـونکە سـوتاوین و مەعشوقی ئێمە گوێ بە ئێمە نادات.

صبحگاهی: کاتی بەیانیان   سزد: جێی خۆیەتی، شایانییەتی   به هم بگـرییم: پێکـەوە بگرین   بسوختیم: سوتاین   بت: بت، ناوێکی مەعشوقە

از ما فراغ دارد: گوێمان پێ نادات

خواجە سوتانی خۆی و سوتانی مۆمی کاتی بەیانی کە بە درێـژایی شـەو سـوتاوە پێکـەوە کۆدەکاتەوە و لەمەوە ئەوە دەردەکەوێ کە خواجەش وەك ئەو مۆمە تەواوی شەوبێداربووە و بـۆ یار سوتاوە و ناڵاندویەتی، بۆیە دەڵێ: من و مۆمی کـاتی بـەیانیان حەقـە پێکـەوە بگـرین و واوەیلا بکەین، چونکە هەردووکمان سوتاوین، کەچی مەعشوقی ئێمە گوێی پێ نەداین و لێـی نەپرسینەوە و نەهات بەدەممانەوە.

لە هەندێ نوسخەدا لەبری (بەهم بگرییم) (بەخود بگـرییم) هـاتووە کـە مانـای بـۆ حـاڵی خۆمان بگرینە، بەڵام لە حافزدا زۆربەی جار گریان بۆ حاڵی خـودی شـاعیر نـەهاتووە، بـەڵکو گریانی ئەسەفە، لێرەشدا گریانی داخی گوێ پێ نەدانی مەعشوقە.

**٦- سزدم چو ابر بهن که برین چمن بگریم**

**طرب آشیان بلبل بنگر که زاغ دارد**

سیزەدەم چو ئەبری بەهمەن کە بەرین چەمەن بگریم،تەرەب ئاشیانی بولبـول بنگـەر کـە زاغ دارەد.

هەقە وەك هەوری بەهمەن بەسەر ئەم مێرگەدا بگریم، سەیری لانەی شادی بولبول بکە کـە قەلەڕەشی تێدایە.



سـزدم: حەقمـە، شایـستەمە   ابـر: هـەور   بهمـن: بەهمـەن، یازدەیەمین مانگی کۆچـی هەتاوییـە کـە مـانگی دووەمـی زسـتانە (٢١/ ١) تـا (٢١/ ٢)

طرب: خۆشی، شادی   آشـیان: هێلانـە، لانـە   طـرب آشـیان: هێلانەی شادی   بنگر: ببینە، سەیرکە   زاغ : قەلەڕەش، زاغ

هەوری بەهمەن هەوری بارانـاوی پڕئـاوە، ئـەم چـیمەن و مێرگـەش دونیایـە، دەبـووا لـەم مێرگەدا هەمیشە بولبول لە هێلانەی شادیدا بووایە. بەڵام بە پێچەوانەوەیە و قەلەڕەش لەجێی بولبولدایە. لێرەدا بولبول کەسی شیاو و (زاغ) کەسی نەشیاوە.

خواجە دەڵێت حەقە وەك هەوری بەهمەن بگریم و ناڕەحەت بم بۆ ئەم دونیا بێ وەعـدەی کە هەیە، چونکە دەبینم قەلەڕەش لە جێی بولبـول دانیـشتووە، واتـە کەسـی نەشـیاو لـە جێگەی شیاوە.

دونیا هەروایە و مرۆڤی نەشیاو لە شوێنی هەستیاردا دادەنرێت.

وەك لە جێگەی دیکەدا ئاماژەی پێدراوە کە شەرحی خوالیخۆشبو سوودی بەر لـە نزیکـەی (٥٠٠) ساڵ نووسراوە، لە شەرحی ئەم بەیتـەدا ئـەم گوتەیـەی سـودی سـەرنجی ڕاکێـشام کـە نووسیویەتی: (واتە جاهیلەکان جێگەی عالمەکان و بێڕێزەکان و سـوك و بـێ نرخـەکان جێگـەی بەڕێز و گەورەکانیان گرتووە وەك سەردەمی خۆمان خواخێرمان پێ ببەخـشێ) {ج٢، ل٧٣٧}. سودی بەر لە (٥٠٠) ساڵ نووسیویەتی (وەك زەمانی خۆمـان) مـنیش دەمـەوێ بنوسـم (وەك زەمانی خۆمان) من دڵنیام کە زۆرینەی نووسـەرەکانی چـاخە جیاجیاکـان هەردەنووسـن (وەك زەمانی خۆمان) بڵێی ئەم سیفەتی ناکەس پەروەر ـ سفلە پرور ـ یە هەر هی دونیا بێت یـاخود سوکی مرۆڤەکان؟!

**٧- به چمن خرام و بنگر بر تخت گل که لاله**

**به ندیم شاه ماند که به کف اياغ دارد**

بە چەمەن خەرام و بنگەر بەری تەخت گول کە لالە،بە نەدیمی شاه مانەد کـە بـە کـەف ئەیاغ دارەد.

بەنازەوە وەرە گوڵزار و سەیرکە کە لە بەرامبەر تەختی گوڵدا، گوڵاڵە هـاودەمی پاشائاسـا پێکی بەدەستەوەیە.

خرام: بەناز ڕۆشتن   تخت: تەخت، عەرش   گل: گوڵی سور   ندیم: هاودەمی گەورە

به ندیم شاه ماند: هاودەمی پاشائاسا

کف: دەست  اياغ: پیاڵەی شەراب، پێك

واتە بڕۆ گوڵزار و سەیرکە کە چۆن گوڵی سوری گوڵەباخ وەك پاشای گوڵان لەسەر تەخت دانیشتووە و لە بەرامبەریشیدا گوڵاڵە وەك هاودەمی پاشا وەستاوە و پێکی بە دەستەوەیە.خواجە لێرەدا وەسفی عەشقی سروشت دەکات.

**٨- سر درس عشق دارد دل دردمند حافظ**

**که نه خاطر تماشا نه هوای باغ دارد**

سەری دەرسی ئیشق دارەد دلی دەرمەندی هافز،کە نە خاتری تەماشا نە هەڤای باغ دارەد.

دڵی دەردەداری حافز نیازی دەرسی عەشقی هەیە، بۆیە نە تاقەتی تەماشاکردن نە ئارەزووی چونە باغی هەیە.

سرداشتن: نیازبوون   درمند: دەردەدار   خاطر: تاقەت و بیر

هوا: ئارەزوو و مەیل

خواجە بێمەیلی خۆی لە جوانیەکانی سروشت دەخاتەڕوو. هۆی ئەمەش بۆ بوونی دەرسی عەشق دەگێڕێتەوە، هەربۆیەشە لە بەیتەکانی سەرەتادا ئەم بێ مەیلییەی خۆیی بە بێ دەستنیشانکردنی هۆکارەکەی دەخستەڕوو، بەڵام لێرەدا بە راشکاوی دەڵێ: دڵی دەردەداری حافز تاقەتی تەماشای باخ و ئارەزووی چونە گوڵزار و باخی نییە و ئارەزووی سەیران و سەفای نییە. لەبەرئەوەی کە نیازی دەرسی عەشقی هەیە.

ئەم بەیتی (تەخەلوس)ە لە هەندێ لە نوسخەکاندا لە پێش بەیتی حەوتەمەوە هاتووە.



## غەزەلی سەد و چواردەیەم:

**بەحری هەزەجی شەشی ئەخرەبی مەقبوزی مەحزوف**

**(مفعول مفاعلن فعولن)**

**١- آن کس که به دست جام دارد**

**سلطانی جم مدام دارد**

ئان کەس کە بە دەست جام دارەد،سولتانیی جەم مودام دارەد.

ئەوکەسەی کە پێکی بە دەستەوەیە،هەمیشە دەسەڵاتی جەمی هەیە.

سلطانی جم: پاشایەتی جەم، دەسەڵاتی جەم   جم:جەمشید   مدام: بەردەوام، هەمیشە

ئەم بەیتە و چەند بەیتی دوای لە چاکی جام و پێکی شەراب دەدوێن. خواجە پێی وایە کەسێ کە جامی شەرابی بە دەستەوەیە بەردەوام پاشایەتی جەمشیدی دەبێت و هەمیشە سەرداری جیهان دەبێت و جەمشید لە نهێنییەکانی جیهان ئاگادار دەبێ،(جام) مەستی عیرفانی و بە شێوەیەکی گشتی عەشقی عیرفانییە. خواجە پێی وایە ئەو کەسەی کە لە عەشقی عیرفانیدایە و عەشقی ئیلاهی لە دڵدایە بەردەوام سوڵتانی جیهانە و وەك جەمشید نهێنییەکانی لا روون دەبێتەوە.

**٢- آبی که خضر حیات ازو یافت**

**در میکده جو که جام دارد**

ئابی کە خیزر هەیات ئەزو یافت،دەر مەیکەدە جو کە جام دارەد.

ئەو ئاوەی کە حەزرەتی خدر ژیانی جاویدانی لێ وەرگرت، لە مەیخانەدا بۆی بگەڕێ، چونکە لە پێکدایە.

آبی: ئاوێك   خضر: خدری زندە   حیات ازو یافت: ژیانی لێ وەرگرت

جو: هەوڵی بۆ بدە، لێی بگەڕێ

دیسانەوە خواجە دەیەوێ لێرەشدا گەورەیی و گرنگی پێك و مەی بخاتەڕوو، ئەو دەڵێ: لە مەیخانەدا بۆ ئەو ئاوە بگەڕێ کە خدری زیندە لێ خواردەوە و بووە مایەی نەمری و جاویدبوونی، چونکە ئەو ئاوی حەیاتە لە پێکدایە و شەرابە.

لێرەدا خواجە پێی وایە کە عەشق و عیرفان وەك ئاوی حەیاتی جاوید بەخشی خدر مرۆڤ جاویدان دەکات و مرۆڤ هاندەدا کە هەوڵی بۆ بدات.

**٣- سررشته‌ی جان به جام بگــذار**

**کاین رشته ازو نظام دارد**

سەررشتەیی جان بە جام بگوزار،کین رشتە ئەزو نیزام دارەد.

سەررشتەی گیانت بدە دەست پێك، چونکە ئەم رشتەیە لەو رێك و پێك دەبێ.

سررشتە: سەرەداو، رەشۆ، هەوسار بگــذار: بـدە ایـن رشـتە: ئـەم رشـتەیە، لێرەدا مەبەست لە گیانە

لەم بەیتەدا حافز ئەوە دەخاتەڕوو کە رێکخستن و جوانکردن و یاسا دارێژەری گیـان پێکـی شەراب و عەشقی ئیلاهییە، بۆیە بە مرۆڤ دەڵێ: هەوساری گیانـت بـووە بـە دەسـت عەشـقی ئیلاهییەوە، چونکە ئەم گیانە بەو عەشقە جوان و رێك و پێك دەبێ.

لەم سێ بەیتەی پێشەوەدا حافز بە قووڵی لە چاکی و لایەنە پۆزەتیڤەکانی عەشقی ئیلاهـی و عیرفان دەدوێت، بێگومان ئەم لێدوانە لە غەزەلێکدایە کە تـا کۆتـایی فەزایـەکی عیرفـانی هەیە و رەمز و زاراوە سادە و باوەکانی عیرفانیشی تێدا بەکارهێنراوە، خواجە لەم سێ بەیتـەدا سێ لە گرنگترین لایەنە پۆزەتیڤەکانی خستەڕوو کە لە بەیتی یەکەمدا پاشایەتی هەمیشەیی و لە دووەمدا جاویـدانی و ژیـانی هەتاهـەتایی و لـە سێیەمیـشدا یاسـادارکردن و رێکخـستنی کاروباری گیانە، بێگومان ئەم سێ خاڵە سێ ئاواتی گرنگی ژیانی مرۆڤن کە بە رای خواجە لـە عەشقی ئیلاهیدا پەیدا دەکرێن، لە بەیتەکانی داهاتوودا خواجە مەزهەبی خۆی دەخاتەڕوو کـە عیرفانێکی پاکی بێ ریایە.

**٤- ما و می و زاهدان و تقوی**

**تا یار سر کدام دارد**

ماڤو مەی و زاهیدان و تەقڤا،تا یار سەری کودام دارەد.

ئێمە و مەی و زاهیدان و تەقوا تا بزانین یار نیازی کامیانی هەیە.

سرکدام دارد: نیازی پەسەندکردنی کامیانی هەیە، کامیانی پێ خۆشە

خواجـە مەزهـەبی خـۆی دەخاتـەڕوو کـە ئێمـە ـ مـن ـ عەشـقمان هەڵبـژاردووە و زاهیدەکانیش رێگەی شەریعەت و تەقوای وشـك، بـەڵام ئـاخۆ یـار ـ خـودا ـ کـام رێگـە پەسەند دەکات، ئایا رێگـەی ئێمە ـ عاشقان و رەندان کە خۆشمان دەوێت و دەمانـەوێ لـە رێگەی عەشقەوە پێی بگەین ـ یاخود زاهیدەکان ـ کە دەیانـەوێ لـە رێگـەی خۆپـارێزی و ترسانەوە پێی بگەن ـ.



**٥- بیرون ز لب تو ساقیا نیست**

**در دور کسی که کام دارد**

بیرون ز لەبی تو ساقیا نیست،دەر دۆور کەسی کە کام دارەد.

جگە لە لێوی تۆوە ئەی ساقی نییە لە رۆژگاردا کەسێ کە بە ئاواتی گەیشتبـێ.

بیرون ز: جگە لـە، دوور لـە ساقیا: ئـەی سـاقی دور: رۆژگـار، دەکـرێ هــەمان دەور و ســوڕانەوەی شــەراب بێــت کــە کــۆڕی بازنــەیی دەگێڕێــت کام دارد: ئاواتی هەیە، بە ئاوات گەیشتووە

لە رۆژگاردا گەر کەسێ بە ئاوات گەیشتبـێ یاخود لە کۆڕی شەرابدا گەرکەسێ بـە ئـاوات گەیشتبـێ تەنیا بە لێوانی ساقی بووە دوور لە لێوی ساقی ـ قـسە و دیـداری سـاقی ـ کـەس نییە لە دەوردا کە بە ئاوات گەیشتبـێ. یاخود دەکرێ بگوترێ کە ئەی ساقی هەمـوو ئەوانـەی کە لە رۆژگار یا کۆڕدان جگە لە لێوی تۆ هیچ ئارەزوو و ئاواتێکی دیکەیان نییە.

لە هەردوو حاڵەتەکەدا ساقی یاری عیرفانی و مەعشوقی ئەزەلییە کـە خواجـە پێـی وایـە دیداری ئەو یاخود گوێگرتن لە گوتە و ئیلهامی ئەو لە گەورەترین ئاواتەکانی عاشقانە. یاخود هەر عاشقێ ئەمەی بۆ دەست بدات بە ئاواتی هەرە گەورەی گەیشتووە.

**٦- نرگس همه شیوه‌های مستی**

**از چشم خوشت به وام دارد**

نەرگس هەمە شیڤەهای مەستی،ئەز چەشمی خوشەت بە ڤام دارەد.

نێرگز هەموو شێوازەکانی مەستی لە چاوانی جوانتی قەرز کردووە.

شیوە: شێواز خوش: جوان، مەست وام: قەرز بە وام دارد: قەرزکردووە

خواجە دەچێتەوە نێو مەزهەبی جیلوەکردنی عارفان کـە پێیـان وایـە جیهـان و سروشـت و هەرچی تێدایە لە جوانی یار و حەق وەرگیراوە، لێرەشدا دەڵـێ ئەگـەر نێرگـز کـە یەکێکـە لـە جوانیەکانی سروشت مەستە و شـێوازی مەسـتی زۆری هەیـە، هـەمووی لـە چـاوانی جـوان و مەستی تۆوە قەرزکردووە.

**٧- ذکر رخ و زلف تو دلم را**

**وردی است که صبح و شام دارد**

زیکری روخ و زولفی تو دلەم را،ڤیردیست کە سوبح وشام دارەد.

باسی روخسار و پرچی تۆ بۆ دڵی من، ویردێکە کە بەیانی و ئێوارە دەیخوێنێ.

ذکر: باس

ئەی یار باسی جوانییەکانی روخساری تۆ و نهێنیەکانی پرچت بوونە وێردی دڵم و هەر بەیانی و ئێوارەیەك دووبارەیان دەکاتەوە. واتە دڵم بەردەوام یادی تۆ دەکات.

**٨- بر سینەی ریش دردمندان**

**لعلت نمکی تمام دارد**

بەر سینەیی ریشی دەردمەندان،لەئلەت نەمەکی تەمام دارەد.

لێوت خوێی تەواوی تامداری بەسەر سنگی برینداری دەردەدارانـدا دەکات (لێوت تامی تەواوی هەیە)

نمك: خوێ    نمك داشتن: بە تام و دڵگر

لێوی یار وەك خوێ و تامی دڵی دەردەدرانی عاشقە و لای دڵی ئەوان رەفتارەکانی یار پەسەندترین شتە

ئەم بەیتە مانایەکی دیکە هەڵدەگرێ کە دەکرێ بڵێین: لێوی تۆ خوێی تەواو بەسەر دڵی برینداری دەردەداران و عاشقاندا دەکات و هێندەی دیکە ناسۆریان دەداتێ و برینەکەیان بەسۆتر دەکات، بەڵام بە لەبەرچاوگرتنی مانای (نمك داشتن) و مانای بەیتی پێنجەم دەتوانین گومان بەرین کە مانای یەکەم لەگەڵ فەزای گشتی بەیتەکەدا دەگونجێ کە عاشقان هەمیشە موحتاجی گوتەیەکی یاری حەقن و ئێستاش خواجە ئەو راستیە دووپات دەکاتەوە.

**٩- در چاه زنخ چو حافظ ای جان**

**حسن تو دوصد غلام دارد**

دەر چاهی زەنەخ چو هافز ئەی جان،هوسنی تو دووسەد غولام دارەد.

ئەی گیانی من جوانی تۆ لە چاڵی چەناکەدا دووسەد غوڵامی وەك حافزی هەیە

لە بەرامبەر جوانی مەعشوقدا خواجە خۆی تا ئەوپەڕی کەمی کەم دەکاتەوە و بیری خۆیی دەهێنێتەوە کە سەدان عاشق ئەسیری تەنیا جوانی چەناگەی یارن و خۆی بە یەکێ لەو غوڵامانە دەزانێت کە لە چاڵی چەناگەی یاردا بەندکراون و ئەسیرن.

چەناگە لە زاراوەی عیرفانیدا چێژی موشاهەدەیە و چاڵی چەناگەش گرفتی نهێنییەکانی موشاهەدەیە، دەکرێ خواجە لێرەدا ئەم حاڵەی خۆی بخاتەڕوو کە لە نهێنی موشاهەدەی یاردا دوچاری دەبێتەوە. لەم بیتە و لە زۆرێك لە بەیتەکانی دیکەی خواجەدا ئەوە دەردەکەوێ کە خواجە لە ڕێگەدایە و نەگەیشتووە بە حەقیقەت، راستە خواجە ڕێگەی عیرفانی پێ چاك و جوانە و عاشقێکی تیۆرییە، بەڵام هەنگاو هەڵگرتنی کرداری لای خواجە و بە ئەنجام گەیشتنی کرداری زۆر کەمی بەدی دەکرێت.لەم بەیتەشدا سەرباری ئەوەی کە بە واتای ئەسیربونی دڵی حافز دێت لە جوانی یاردا، بەڵام مانایەکی ئەو گرفتانەشی لەخۆدا حەشارداوە.



## غەزەلی سەد و پازدەیەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی ئەسڵەم**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع لن)**

**١- دلی که غیب نمای است و جام جم دارد**

**ز خاتمی که دمی گم شود چه غم دارد**

دلی کە غەیب نومایەست و جامی جەم دارەد،ز خاتەمی کە دەمی گوم شەڤەد چە غەم دارەد.

دڵێ کە غەیبی تێدا دیارە و جامی جەمی هەیە، بۆ ساتێ ونبوونی ئەنگوستیلەیەك چ غەمێکی هەیە (چ باکی هەیە).

غیب نمای: نیشاندەری غەیب    جام جم: جامی جەمشید کە نهێنیەکانی گەردوونی تێدا دیاربوو، درکەیە لە دڵی عارف    خاتم: ئەنگوستیلە    گم شود: ون ببێ

دڵێك کە سیفەتی جامی جەمشیدی هەبێت و نهێنییەکان و غەیبەکان دەربخات دڵی عارفەکانە، خاتەم و ئەنگوستیلەش ئاماژەیە بە ئەنگوستیلەکەی حەزرەتی سولەیمان کە بۆ ماوەیەك دزراوە یاخود ون بووە، لە قورئانی پیرۆزدا باس لە ماوەیەکی کورت کراوە کە حەزرەتی سولەیمان تیایدا دەسەڵاتی لەدەستداوە، ئەم لەدەستدانەی کورسی دەسەڵات بە وێنەیەکی زۆر جوانی قورئانی بەیان کراوە کە خوای گەورە لە ئایەتی (٣٤)ی سورەتی (ص)دا دەفەرموێت: "ولقد فتنّا سلیمن و القینا علی کرسیه جسداً ثم اناب" لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا نووسراوە کە مەبەست لە (جسد) کوڕێکی دیکەی حەزرەتی داودە - برای سولەیمان (د.خ) - کە خراپەکار بووە و بۆ ماوەیەك دەستی بەسەر دەسەڵاتی سولەیماندا گرتووە، بەڵام پاشان گەل لێی هەستاون و کوشتوویانە و دەسەڵات گەڕاوەتەوە بۆ حەزرەتی سولەیمان {قران کریم تفسیر و بیان، اعداد د. محمد حسن الحمصی}.، هەروەها خواجە لە یەکێك لە (قطعه)کانیدا بە ئاشکرا ئاماژەی بەم (نیو جەستەیە) داوە کە دەست بە سەر موڵکی حەزرەتی سولەیماندا گرتووە:

نیم تنی ملك سلیمان گرفت    کرد مسخّر همه روی زمین...تاد   {(قطعه)ی ژمارە (٤٥) دیوانی حافظ، لیمودهی}

ئەم رووداوە مێژووییە بەرگی ئەفسانەی بە بەرداکراوە و بەم شێوە باسکراوە و دەگوترێ لە بەسەرهاتەکاندا هاتووە کە گوایە حەزرەتی سولەیمان ئەنگوستیلەیەکی هەبوو کە ناوی پیرۆز - اسم اعظم - تێدا نوسرابوو بەهۆی ئەوەوە فەرمانڕەوایی بەسەر هەموو

مەملەکەتەکەدا دەکرد، دەڵێن گوایە حەزرەتی سولەیمان ـ علیە السلام ـ بە هۆی هەڵەی یەکێ لە نزیکەکانیەوە ئەم ئەنگوستیلەیەی ونکردووە و خێویێك هەڵیگرتۆتەوە و بۆ ماوەیەك فەرمانڕەوایی کردووە و خۆی کردووە بە حەزرەتی سولەیمان، بەڵام پاشان پێی زانراوە و دیسانەوە گەڕاوەتەوە بۆ حەزرەتی سولەیمان {حافظ نامە،ج١، ل٣٢١ ـ ٣٢٣}لێرەدا ئەنگوستیلە رەمزی فەرمانڕەوایی و دەسەڵاتی دونیایە، هەر بە شیکردنەوەی ئەم رەمزەیە (سودی) پێی وایە کە ئەم بەیتە ئاماژەیە بە (مەنسور پاشا) کە هەندێ لە بەگە تورك نەژادەکان فەرمانڕەوایی شاریان گرتەدەست و لە شار دەریانپەڕاند، بەڵام پاشان مەنسورپاشا لەشکری کۆکردەوە و دەسەڵاتی گرتەوە دەست {سودی، ج٢،ل٧٤٣} . بەیتەکە بەگشتی باس لە دڵی مرۆڤی رێبواری رێگەی تەریقەت و عارفان دەکات و خواجە پێی وایە کە ئەودڵە پاکانە وەك پێکەکەی جەمشید غەیب و نادیارەکانیان تێیدا دەدرەوشێتەوە. هەربۆیە گەر بۆ ماوەیەك یا ساتێکی کورتی دونیا دەسەڵاتی لێ ون ببێ هیچ غەمێکی نییە، چونکە لە دڵەکەیدا بە رونی دیارە و دەزانێ لە کوێیە.

**٢- بە خط و خال گدایان مدە خزینەی دل**

**بە دست شاە وشی دە کە محترم دارد**

بە خەت و خالی گیدایان مەدەھ خەزینەیی دل،بە دەستی شاھ ڤەشی دیھ کە موهتەرەم دارەد.

خەزێنەی دڵی خۆت مەدە بە دەست جوانیی گەدایانەوە،بەڵکو بیدە دەست شائاسایەك کە رێزی دەزانێت و رێزی لێ دەگرێت.

بە خط و خال: خەت و خاڵ، لێرەدا مەبەست لە جوانییە شاە وش: شائاسا، کەسێ کە سیفەتی شایانەی هەیە محترم دارد: رێزی دەزانێت

مرۆڤ کە عاشق دەبێت خەزێنەی نهێنیەکانی دڵی لای مەعشوقی دەکاتەوە یاخود کە هاودەم و هاوڕێ و مەحرەمی ئەسرار دەگرێت دیسانەوە خەزێنەی نهێنییەکانی دڵی دەداتە دەست. خواجە لەم راستیەوە بە مرۆڤ دەڵێ: کاتێ عاشق دەبیت عاشقی جوانی خەت و خاڵی روخسار و لایەنی دەرەوەی گەدا و سواڵکەر و نەفسنزمەکان مەبە، بەڵکو عاشقی پاشاسیفەتان و نەفسبەرزەکان ببە. چونکە تۆ بەم عاشق بونە خەزێنەی دڵت دەدەیتە دەست مەعشوق، لەم کاتەشدا ئەو خەزێنەی دڵە بدە دەستی پاشاسیفەتەکان چونکە قەدری دەزانن.

ئەم بەیتە دەکرێ عیرفانی بێت یاخود ئەدەبی یا کۆمەڵایەتی. گەر عیرفانی بێت خواجە عەشقی دونیایی رەفز دەکاتەوە و هانی مرۆڤ دەدات عەشقی ئیلاهی هەڵبژێرن. گەر ئەدەبی و



کۆمەڵایەتی بێت ئەوە رەتدەکاتەوە کە مرۆڤ هەرکەسێکی بینی روخساری جوان بوو دڵی خۆیی بۆ بکاتەوە، بەڵکو هانمان دەدات کە مرۆڤە نەفسبەرزەکان هەڵبژێرن، لە راستیدا بەم لێکدانەوەی دوایی ئەم بەیتە بنەمایەکی زۆر گرنگی پەیوەندییە مرۆییەکانە کە ئەویش بە دەستنوێژبوونە لە هەڵبژاردنی هاوڕێ و دۆستاندا، نەخەڵەتانە بە رەنگ و روخسار، بەڵکو حوکمدانە بە دەروون و نەفسبەرزی و شاسیفەتی.

**٣- نە هر درخت تحمل کند جفای خزان**

**غلام همت سروم کە این قدم دارد**

نە هەر درەخت تەهەمول کونەد جەفای خەزان، غولامی هیمەتی سەرڤەم کە ئین قەدەم دارەد.

هەمو درەختێ بەرگەی جەفای خەزان ناگرێت، غولامی هیممەتی دارسەروم کە ئەم خۆڕاگرییەی هەیە.

(قدم) لێرەدا بە واتای خۆڕاگری هاتووە، بێگومان هەموو کەسێك بەرگەی تاڵی و سوێرییەکان ناگرێت و لە بەرامبەر ستەم و جەفای خەزاندا چۆك دادەدات و تێکدەکشێ، بەڵام لە باخدا دارسەرو ئەم خۆڕاگرییەی هەیە و بەرگەی جەفای خەزان دەگرێت و مل کەچ ناکات، خواجە خۆی دەکاتە غولامی هیمەت و ئازایی ئەو مرۆڤانەی کە خۆڕاگرن و لە بەرامبەر کێشە و گرفتەکاندا مل کەچ ناکەن، دەکرێ ئەم بەیتە تەواوکەری بەیتی پێشو بێت کە باسی لە گەدایان کرد، گەدایان گەر نهێنییان لابێت لە بەرامبەر هەر ستەم و جەفایەکدا یەکسەر تەسلیم دەبن و مل کەچ دەکەن، بەڵام مرۆڤە نەفسبەرزەکان هەرگیز چۆك دانادەن و نهێنیەکان نادرکێنن، بۆیە خواجە خۆی دەکاتە غولامی هیمەتیان.

**٤- رسید موسم آن کز طرب چو نرگس مست**

**نهد بە پای قدح هرکە شش درم دارد**

رەسید مۆوسیمی ئان کەز تەرەب چو نەرگسی مەست،نەهەد بە پایی قەدەھ هەرکە شیش درەم دارەد.

کاتی ئەوە هاتووە کە لە شادیدا هەرکەس شەش درەمی هەیە وەك نێرگزی مەست لە پای پێکدا بیڕژێت و خەرجی بکات.

رسید: گەیشت، هاتەپێشەوە موسم آن: کاتی ئەوە کز طرب: لەشادیدا

نهد: دایبنێ، بەختی بکات شش: شەش درم: درهەم، جاران

درهەم لە (نقرە ـ زیو) دروست دەکراو (دینار)یش لە ئاڵتون، واتە هەر پارەیەکی لە زیو

دروستکراو (درهەم) کەم بەهاتر بو لە پارەی لە ئالْتون دروستکراو (دینار)، لێرەدا مەبەست لە شەش درهەم سەروەت و سامانێکی کەمە (دارونەدار)

گوڵی نێرگز لە شێوەی پێکدایە کە پەڕەکانی سپییە ودەوری تۆپەگوڵە زەردەکەیان داوەوە و وەك مەستەکان خواربووەتەوە، خواجە دەڵێ: کاتی ئەوە هاتووە کە بە شادییەوە هەمووان وەك نێرگزی مەست هەرچی دارونەدارمان هەیە تەنانەت گەر کەمیشە و شەش درهەمی زیوە بۆ بادە و شەراب یاخود بۆ عەشقی ئەزەلی و لە پێناو ئەو عەشقەدا سەرفی بکەین.

**٥- زر از بهای می اکنون چو گل دریغ مدار**

**که عقل کل به صدت عیب متّهم دارد**

زەر ئەز بەهای مەی ئەکنون چو گول دەریغ مەدار،کە ئەقلی کول بە سەدەت ئەیب موتەهەم دارەد.

ئێستا وەك گوڵ درێغی مەکە لەوەی کە زێر لە بری بەهای مەی ببەخشی، ئەگەرنا عەقڵی گشتی (کامڵ) بە سەد جۆر نەنگی تاوانبارت دەکات.

زر: زێر　　　　بها: بەها، نرخ　　　　دریغ مدار: درێغی مەکە، مەیگرەوە

عقل کل: عەقڵی تەواو، عەقڵی سەرەتا و کامڵ، هەندێك عەقڵی کامڵیان بە حەزرەتی جوبرەئیل داوەتە قەڵەم، (عزالدین نسفی) دەربارەی عەقڵی سەرەتا چەند رایەکی هێناوە کە بەپێی رای ئەو دەکرێ عەقڵی سەرەتا:(گیان، نور، جوبرئەیل، میکائیل، ئیسرافیل، عزرائیل، لوح محفوظ.... هتد بێت) {سجادی} بێگومان (عقل کل) زاراوەیەکی فەلسەفی کەلامییە و هەمان واتای (لوگوس)ی یۆنانییە کە لای ئەوانیش جەدەلێکی گەورەی لە نێوان فەیلەسوفە سەرەتاییەکاندا دروست کردو و پێیان وابوو کە (لوگوس) (ئاو، ئاگر، با، خاك، یاخود ژمارە و...هتد بێت).لە راستیدا لای موسوڵمان (فەیلەسوف و عارفەکان) ئەم جەدەلە لە مادە دیارەکانی یۆنانەوە گۆڕا بۆ رەمزە نادیار و غەیبییەکانی وەك (جوبرەئیل) و تەنانەت (عەرش و... هتد). بەهەرحاڵ ئەم مەسەلەیە هێندەی گومان و بۆچوونە ئەوەندە ئەزمون و حەقیقەت نییە، چونکە مەحاڵە مرۆڤ پەی بەو نهێنییە ببات کە ئایا خودا یەکەم جار چی دروست کردووە و پاشان مادەی لەو شتە دروست کردووە؟

خواجە لێرەدا هێندە وەك زاراوەیەکی باو بەکاری هێناوە ئەوەندە مەبەستی هیچ یەکێ لەو واتایانەی سەرەوە نەبووە، چونکە هێنانی ئەم زاراوەیە لەم بەیتەدا بە مەبەستی جەختکردنەوەیە لە واتای بەیتی پێشوو کە (داکۆکی کردنە لە عەشق و مەینۆشی) خواجە دەڵێ: وەك گوڵ بەو زێڕەکانت لە خەرجکردن بۆ مەی مەگرەوە و درێغی مەکە لە دانانی زێڕ لە



نرخی مەیدا، چونکە ئەگەر ئەم کارە نەکەیت و سەروەت و سامانت بۆ مەی خەرج نەکەیت عەقڵی کامڵ بە سەد عەیب تاوانبارت دەکات و سەد عەیبت تێدا دەدۆزێتەوە. واتە گەر ئەم کارە نەکەیت عەقڵی کامڵ بە بێ عەقڵت دەداتە قەڵەم.

وەك گوتمان بەیتەکە جەخت لەسەر خەرجکردنی سەروەت و سامان دەکاتەوە، یاخود جەخت لەسەر دانانی دەستکەوتە مادیەکان دەکاتەوە لە پێناو عەشق و مەیدا کە ئەمەش رەمزی پیرۆزکردنی عیرفان و تەریقەتە.

**٦- دلم که لاف تجرّد زدی کنون صد شغل**

**به بوی زلف تو با باد صبحدم دارد**

دلەم کە لافی تەجەررود زەدی کنون سەد شوغل،بە بوی زولفی تو با بادی سوبهدەم دارەد.

دڵم کە لافی گۆشەگیری لێدەدا ئێستا بە ئومێدی پرچی تۆوە سەد کاری بە شەماڵی بەرەبەیان هەیە.

تجرد: گۆشەگیری، تەرکی دونیا و خۆشیەکانی　　　　صد شغل: سەد کار، کاری زۆر

خواجە دەڵێ: دڵم کە بە قسەی خۆی لافی ئەوەی لێدەدا وازی لە دونیا و هەرچی تێدایە هێناوە و بۆ خۆی گۆشەگیر بووە، بەڵام ئێستا بە ئومێدی بۆنی پرچی تۆوە کە بەڵکو بۆنێکی بە مێشك بگات سەد جۆر سەروکاری لەگەڵ شەماڵی بەرەبەیاندا پەیدا کردووە و پەیوەندی لەگەڵدا بەستووە.

لە روی عیرفانییەوە (با) جودایە لە یار، بەڵام خواجە دەڵێ: بە ئومێدی تێگەیشتن لە پرچی تۆ (لە نهێنییەکانی تۆ) تەنانەت پەنا بۆ ئایەتە گەردونیەکانیش دەبەم و سەد جۆرە سەروکارم لەگەڵ (شەماڵی بەرەبەیان)دا پەیداکردووە کە شتێکی سروشتییە و هەر لە نێو گەردووندایە، گەرچی دڵم لافی گۆشەگیری لێ دەدا.

**٧- مراد دل ز که جویم چو نیست دلداری**

**که جلوەی نظر و شیوەی کرم دارد**

مورادی دل ز کە جویەم چو نیست دلداری،کە جیلڤەیی نەزەر و شیڤەیی کەرەم دارەد.

مورادی دڵ لە کێ داواکەم، چونکە دڵدارێك نییە کە نیگای بە میهر و دابونەریتی بەخشندەی هەبێت.

ز کە جویم: لە کێ داواکەم　　　　شیوە: دابونەریت، رەسم

کرم: کەرەم و بەخشندەیی

وەك بڵێی خواجە گلەیی لە سەردەمی خۆی دەکات کە رێ و رەسمی بەزەیی و بەخشندەیی نەماوە و کەس نییە ئەم سیفەتانەی تێدابێت، بۆیە کەسێ شك نابات کە داوای مورادی دڵی لێ بکات یاخود مورادی دڵی خۆیی تیادا بدۆزێتەوە.

**٨- ز سرّ غیب کس آگاه نیست  قصه مخوان**

**کدام محرم دل ره درین حرم دارد**

ز سیری غەیب کەس ئاگاه نیست قیسە مەخان،کودام مەهرەمی دل رەهـ دەرین هەرەم دارەد.

کەس لە نهێنی غەیب ئاگادار نییە ئەفسانە مەچنە، کام مەحرەمی دڵە رێگەی ئەم حەرەمەی هەیە.

ز/از: لە    قصە خواندن: ئەفسانە چنین و قسەگێڕانەوە    کدام: کام    محرم: مەحرەم، کەسێ کە ئاساییە بە شتەکان بزانێت و دڵنیان لە پاکی ئەو و مەحرەمی پێدەڵێن، لە فیقهدا (مەحرەم) کەسێکە کە کەدەستنوێژی لە ئەوی دیکە ناشکێ بۆ نموونە کوڕ، مەحرەمی دایك و خوشك و نەنك و پورە، هەرچەندە بۆ مێردیش بەکاردەهێنرێت. لێرەدا مەبەست لە (مەحرەمی دڵە) کە دەکرێ سیفەتی عارفەکان بێت، چونکە ئەوان جێگەی دڵنیایی دڵن    حرم: حەرەم، حەوشە، شوێنێکی دیاریکراوی پیرۆز بۆ نموونە مەککە (حرم الله)یە و بە مەککە و مەدینە ش(حَرَمان) دەگوترێ، لەم بەیتەدا مەبەست لە سنووری غەیبە، حەرەمی غەیب

خواجە لەم بەیتەدا روو بەو سۆفیانە دەدوێت کە لافی ئەوە لێدەدەن ئاگاداری نهێنی غەیبن و باسی دەکەن، بە رای خواجە کەس ناتوانێ پێ بخاتە سنووری ئەو حەرەمە ئیلاهیە و لە نهێنی غەیب ئاگادار بێت، هەربۆیە هەرکەسێ ـ تەنانەت ئەوانەشی کە مەحرەمی دڵن و عارفن ـ باس لەو سنوورە بکات ئەفسانە و درۆ ودەلەسە دەچنێ.

خواجە لێرەدا دەڵێ: کەس ناتوانێ پێ بخاتە سنووری حەرەمی غەیبییەوە، هەربۆیە ئەفسانەی ئەوێ مەچنە ـ ئەی ئەوکەسەی بە ناوی غەیبەوە چیرۆك دەچنی ـ چونکە تەنانەت مەحرەمی دڵیش بۆی نیە بچێتە ئەو حەرەمەوە.

لەراستیدا ئەم مانایە کەمێك لێڵە ئاخۆ مەبەست لە (محرم دل) هەموو مرۆڤەکانە یاخود زۆرینەی عارفەکان، دەکرێ ئەم بەیتە رەتدانەوەی ئەو کەسانە بێت کە خۆیان بانگەشەی کەشفی ئەسراری غەیب دەکەن، نەوەك ئەو وەلی و پێغەمبەرانەی کە خودا بۆخۆی لە نهێنییە غەیبی و نادیارەکان ئاگاداریان دەکاتەوە. (د.هروی) مەیلی بەلای ئەوەدایە کە مانای یەکەم هەڵبژێرێ و پێی وایە کە خواجە هەر جۆرە پەیوەندییەکی مرۆڤ لەگەڵ غەیبیاتدا رەتدەکاتەوە {هروی،ج١، ل٥٠٩}، بەڵام جەنابی سودی میانگیرانەتر قسە دەکات و رای دووەمی بەلاوە



پەسەندە {ج٢، سودی،ل٧٤٩}، بەندە پێموایە کە ئەم دوو رایە لە باکگراوندی رۆشنبیری ئەو دوو بەرێزەوە سەرچاوە دەگرێت و باکگراوندی رۆشنبیری و کولتوری (سودی)ش لە سەردەمی خواجە حافزەوە نزیکترە تاوەکو (هروی)، بۆیە دەکرێ ئەم بەیتە بەرامبەر بەو سۆفیە چیرۆك خوانانە بێت کە بێ هیچ شتێ لەخۆوە قسەیان بەدەم غەیبیەوە هەڵبەستوە، چونکە (قصە خواندن) بڵاوکردنەوەی رازی عیرفانی و پەیوەندی نێوان مرۆڤ و مەعشوقی حەق لە سیفەتی ئەوانە و خواجە و خواجە ئاساکان ئەو سیفەتە بە خراپ دەدەنە قەڵەم، بۆیە بەوانە دەڵێ تەنانەت پاکەکانیش ناتوانن پێ بخەنە حەرەمی غەیبەوە ـ ئەگەر خوا رێنوێنیان نەکات ـ ئیتر تۆ چ خەریکی ئەفسانە گێڕانەوەی کە گوایە ئەمانە زانیاری و نهێنی غەیبن وازبێنە.

**٩- ز جیب خرقەی حافظ چه طرف بتوان بست**

**که ما صمد طلبیدیم و او صنم دارد**

ز جەیبی خیرقەیی هافز چە تەرف بتەڤان بەست،کە ما سەمەد تەلەبیدیم وئو سەنەم دارەد.

لە یەخەی خرقەی حافز چ سودێك دەبردرێ کە ئێمە (سەمەد)مان ویست و ئەو (سەنەم)ی تێدایە.

جیب: یەخە، ملیوان    طرف بربستن/طرف بستن: سودبردن، بەهرەبردن    صمد: جێگەی رازونیاز،(سەمەد) یەکێکە لە ناوە پیرۆزەکانی خوای گەورە    طلبیدیم: داوامان کرد، ویستمان    صنم: بت

بەیتەکە لە رووی زمانییەوە بۆ ئێمەی نەوەی نوێی کورد گرانییەکی تێدایە، چونکە باس لە کراسی کەوای تایبەتی سۆفیەکانی پێشوو دەکات، چونکە وەك (د.هروی) لە (فرهنگ البسە مسلمانان، دزی) نقڵیکردووە یەخەی (کەوا/خرقە)ی جارانی سۆفی و دەروێشەکان بە ناوی خوا و وشەی پیرۆز بۆ موبارەکی رازێنراوەتەوە بۆ نموونە لە یەخەکەی (یا عزیز و یا ستار و یا لطیف یا حلیم...هتد) نووسراوە {هروی، ج١، ل٥٨٠ }.

بەڵام لە کەوا وخرقەی گەورە و ماقوڵەکانی دیکە کە فەرمانڕەوا بوون یاخود راسترە بگوترێ سۆفی نەبوون وێنەی جۆراوجۆری مرۆڤی لە سەر دەچنرا، مەبەست لە (سەنەم) بوت ئەم بوکەڵە چنراوانەن کە رەمزی ناسۆفی بوونی ئەو کەسەیە کە لەبەری کردووە.

خواجە بەم شێوە زمانییەش خۆی لە کۆمەڵێ سۆفی و دەروێشە خرقە پۆشەکان دەردەکات و خۆی بە یەکێ لەوانە ناداتە قەڵەم، دەکرێ ئەم قسەیە لە سەر زاری یەکێ لە سۆفیەکانەوە کەکاتێ نەخشی بوکەڵەکانی سەر کەواکەی خواجەی بینیوە هیوا براو بووە لێی کە ئیدی سودی بۆ سۆفیگەری نابێت، چونکە لەو گروپە دەرچووە و لە بری رەمزی دەروێش و سۆفییەکان

رەمزی کەسانی دیکە بە کەوا/خرقەکەیەوەیەتی، لەم لێکدانەوە سەرزارەکیەوە بە مانای روکەشی بەیتەکە دەگەین، بەڵام لە ئاستی ژێرەوەدا واتای قووڵی بەیتەکە بەم شێوەیەیە:

ناتوانرێ سود لە عارف بوونی حافز ببردرێ، چونکە گروپی بەناو سۆفیەکان لە عیرفاندا روکەشیان مەبەستە (نووسراوی سەر کەواکان)، بەڵام خواجە حەقیقەت و ناخی عیرفانی لامەبەستە (بوت و مەعشوقی ئەزەلی)، لەهەر جۆرە لێکدانەوەیەکی بەیتەکەدا خواجە سۆفیلکە بەناو عارفەکان لەخۆی بێ هیوا دەکات و خۆی بە سۆفییەکی پیشەگەر ناداتە قەڵەم، بەڵکو رێگەی عیرفانی حەقیقی دەگرێ کە عەشقی قووڵی ئیلاهییە (بوت)، نەوەك رەمزە سەرزارەکی و روکەشیەکان.



## غەزەلی سەد و شازدەیەم:

**بەحری هەزەجی هەشتی تەواو**

**( مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن )**

**١- بتی دارم کە گرد گل ز سنبل سایەبان دارد**

**بهار عارضش خطی بە خون ارغوان دارد**

بوتی دارەم کە گیردی گول ز سونبول سایەبان دارەد،بەهاری ئاریزەش خەتی بە خونی ئەرخەڤان دارەد.

خۆشەویستێکم هەیە بە دەوری گوڵدا چەتری لە سونبول هەیە، بەهاری روخساری فەرمانی بۆ کوشتنی ئەرخەوان هەیە.

گرد: دەور    سنبل: سونبول، گوڵێك(روەكێك)ی جوانکارییە لە خێزانی سەوسەنەکان، لەم بەیتەدا (گل) درکەیە لە روخسار و سنبلیش درکەیە لە پرچ

سایەبان : چەتر    عارض: روخسار    خط: خەت، فەرمان

خواجە بە شێوەیەکی هونەرییانەی جوان وەسفی روخسار و پرچی یار دەکات و دەڵێ: بوتێك، خۆشەویستێکم هەیە کە بە دەوری روخساریدا پرچی وەك سونبولی وەك چەتر پەخشان بووە و بەهاری روخساریشی فەرمانی کوشتنی ئەرغەوانی پێیە؛ واتە روخساری لاوی وەك بەهاری هێندە جوانە کە لە جوانیدا جوانی ئەرخەوان روو لە کزی دەکات و دەڵێی ئەم جوانییەی روخساری فەرمانی کوشتن و لەناوبردنی گوڵی ئەرخەوانی پێیە.

زۆرێك لە رەخنەگرە نوێیەکان یاخود ئەو بەرێزانەی شەرحی غەزەلەکانی حافز یاخود باسیان کردوون، جەخت دەکەنەوە لەسەر مرۆڤ بوونی حافز بە پێچەوانەی پێشینەکانەوە کە هەوڵیان دەدا حافز بە مرۆڤی کامڵ یاخود بوونێکی غەیبی مرۆیی بدەنە قەڵەم، بەم واتایەش خواجە مرۆڤێکی ئاسایی بووە. (د.خرمشاهی گوتەنی :" حافز کاملەن مرۆڤە نەوەك مرۆڤی کامڵ" {حافظ نامە، مقدمە} واتە ئەکرێ حافز لە دونیا و غەریزە دونیایەکانیش دوابێت و حەزی لە کچ و لە هاورێیەتی وتەنانەت لە گوناهیش کردبێت، بەڵام گرنگییەکەی لەوەدایە کە ئەو هەمیشە مەعشوقی ئەزەلی لە سەرووی هەمووانەوە دادەنێت. بەهەرحاڵ دەکرێ ئەم دو بەیتەی پێشووی ئەم غەزەلە لە مەعشوقێکی خەیاڵی/ئەدەبی بدوێت، هەرچەندە دەتوانرێ تەئویلی عیرفانیان بۆ بدۆزرێتەوە، بەڵام بەندە لەسەر ئەو رایەم کە تا رادەی ماقوڵ خۆ لەو جۆرە تەئویلانە بپارێزم.

هەرچۆن بێت خواجە وەسفی روخسار و پرچی مەعشوقێکی خەیاڵی/ئەدەبی دەکات.

**٢- غبار خط بپوشانید خورشید رخش یا رب**

**بقای جاودانش ده که حسن جاودان دارد**

غوباری خەت بپوشانید خورشیدی روخەش یا رەب،بەقای جاڤدانەش دیه کە هوسنی جاڤدان دارەد.

غوباری خەت هەتاوی روی داپۆشی، خوایە تەمەنی جاویدانی پێ ببەخشە، چونکە جوانی جاویدانی هەیە.

خط: خەت، خەتی روخسار، گەندەموی سەر روخسار یاخود ریش    غباری خط: موی نەرمی وەك غوبار

بپوشانید: دای پۆشی، گرتییەوە  بقا: مانەوە، بەردەوامی، لێرەدا بەواتای تەمەن دێت

جاودان: جاویدان، هەمیشەیی، نەمر

به ناچاری دەبێت (غوباری خەت) بە گەندەموی سەر روخسار یاخود ریش لێکدرێتەوە لە حاڵەتی دووەمدا مەعشوقی ئەدەبی خواجە کورێژگەیەك دەبێت کە رەنگە خۆشەویستێکی وەك کور یا کەسێکی دیکەی دۆست بێت و لەم بارەشدا بە هیچ شێوەیەك ناتوانین لێکدانەوەی عیرفانی بۆ بەیتەکە بکەین تەنیا ئەوەندە نەبێ کە دەکرێ ئەم وەسفکراوە یەکێ لە پێشەواکانی عیرفان بێت کە ئەم جۆرە ستایشەش لە غەزەلەکانی خواجەدا بە زەقی دەرناکەوێ.

هەرچۆن بێت ئەم بەیتانە و چەندین بەیتی دیکە بەڵگەی ئەو راستییەن کە خواجە بە راستی مرۆڤە.

خواجە لەم بەیتەدا دەڵێ: غوباری خەت (موی نەرمی وەك غوبار) روخساری جوان و رۆشنی وەك خۆر، هەتاوی گرتۆتەوە، خوایە وەك چۆن جوانی جاویدانی و نەمری هەیە ئاوا تەمەنیشی هەمیشەیی و نەمر کە.

ئەم لێکدانەوەیە تێگەیشتنی ناتەواوی ئێمەی مرۆڤە خودا بۆخۆی دەزانێ کە چ کەڵکەڵەیەك لە پشت ئەم بەیتانەی (لسان الغیب)ەوە هەیە.

**٣- چو عاشق می شدم گفتم که بردم گوهر مقصود**

**ندانستم که این دریا چه موج خون فشان دارد**

چو ئاشق می شودەم گوفتەم کە بوردەم گۆوهەری مەقسود،نەدانستەم کە ئین دەریا چە مۆوجی خون فەشان دارەد.



کاتێ عاشق دەبووم گوتم گەوهەری مەقسودم بردەوە (دەستکەوت)، نەمزانی ئەم دەریایە چ شەپۆلێکی خوێنرێژی هەیە.

می شدم: دەبووم (رابردووی بەردەوام)    بردم: بردمەوە، بەدەستم هێنا

ندانستم: نەمزانی    خون فشان: خوێن رێژ

ئەم بەیتە یەکێکە لە بەیتە قووڵ و جەوهەریەکانی خواجە حافز و یەکێکە لەو واتا قووڵە عیرفانیانەی کە تا رادەیەکی تاکەکەسیانە لای خواجە بە شێوەیەکی زۆر دووبارە رەنگدەداتەوە کە ئەویش چواندنی عیشقە بە دەریایەکی پڕ ترسی بێ کەناری پڕ لە شەپۆلی تورە و خنکێنەر.

بەراستی ئەوگوتەیەی د. سروش کە دەڵێ (حافظ سەرەتا پێی خستە نێو ئاوو پاشان سەری لەئاگرەوە دەرهێنا) د. عبدالکریم سروش ص٢٢

پراوپڕی عەشقی پڕ مەترسی خواجەیە، حافظ هەرلەیەکەمین بەیتی دیوانەکەیدا دانی بەم مەسەلەیەدا ناوە (که عشق آسان نمود اوّل ولی افتاد مشکلها) کە عیشق پڕ لە کێشەو گرفتە هەروەها لە چەندین جێگەی دیکەشدا ترسناکی و سەرشێتی شەپۆلەکانی دەریای عیشقی خستۆتە روو.

رەنگە نەگەیشتنی حافظ بەکەناری عیش و مانەوەی لەمەقامی (حیرت) و سەرسورماویدا ئەم ترسناکییەی تۆختر کردبێتەوە، هەربۆیە هەرچی دەنوسێ و دەڵێ لێڵەو لەگەڵ خیرەتی خۆیدا خوێنەرو گوێگریش دەخاتە نێو ئە حیرەتەوە راستە خواجە زۆرجار بەسادەیی ئەم ترس و سەرسورمانە دەردەبرێت بەڵام کاریگەرییان زۆر لە دەربرینەکانیان قوڵترو شاراوەتر دەبێت.

خواجە دەڵێ کاتێ عاشق دەبووم و دەچوومە نێو دەریای بێ کەناری عیشقەوە بەخۆمم دەگوت گەوهەرو مرواری مەقسودو ویستراوی خۆمم بەدەست هێناو گەیشتمە ئامانج (دەکرێ هەرلەم بەیتەدا ئەورایە دەست بخەین کەپێی وایە حافظ بۆ رزگاربوون لەبەڵا چووە نێو عیشقی ئیلاهیەوە بەڵام دوچاری حیرەت بوو، نەگەیشتە حەقیقەت — سروش قماری شتانە) بەم پێیە خواجە هەر لە یەکەم هەنگاوەوە بەمەبەستی حەقیقەت چووەتە نێو دەریای عیشقی ئیلاهییەوەبەڵام بێ ئاگابووە لەوەی کە برینی ئەم رێگەیە هەراوائاسان نییە خۆی دەڵێ: نەمزانی کە ئەم دەریایە چە شەپۆلێکی خوێنرێژی هەیە دەکرێ میسراعی دووەم هەمان ئەو کێشەو گرفتانە بن کە لە میسراعی دووەمی یەکەمین بەیتی غەزەلەکانی خواجەدا هاتوە.

مەبەستیش لە شەپۆلی خوێنرێژ کێشەو مەسەلە نارەحەت و ماندوکەرەکانی نێو تەریقەت و عیشقی ئیلاهییە بێگومان کەس ناتوانێ گومان لەوە بکات کە خواجە مەردی مەیدانی

عەشقی ئیلاهی نییە بەڵام لەراستیدا ئەو مەیدانە جێگەی تـاوادانی ئەسپی هەمووکەسێك نییەو دەگمەنن ئەوانەی کە توانای چوون نێو ئەو حەرەمەیان هەیە.

**٤- ز چشمت جان نشاید برد کز هر سوکه می بینم**

**کمین ازگوشەای کردەست و تیراندرکمان دارد**

ز چەشمەت جان نەشایەد بورد کەز هەرسوو می بینەم، کـەمین ئـەز گووشـەئی کەردەسـتو تیرئەندەر کەمان دارەد

ناکرێ گیان لە چاوانت رزگار کرێت چونکە لە هەرلایەکە سەیردەکەم لەگۆشەیەکدا کەمینی گرتوەو تیری لەکەواندایە.

نشاید: ناکرێ، رێی تێ ناچێ، ناتوانرێ     جان بردن: گیان دەرکردن، گیان رزگار کردنی

کمین: کەمین     هرسو: هەرلایەك     اندر: لەناو

بەیتەکـە لـەگرفتاری خواجـە بەچـاوانی مەسـت و سەرنجراکێـشی یـارەوە دەدوێ خواجـە لەلایەکەوە دەزانێ کە خـۆی چـەندە گرفتـاری جـوانیی سـیحرەکانی چـاوی یـارەو لەلایـەکی دیکەشەوە دەزانێ کە چاوانی یار بێ ئەندازە سیحراوی و راوکەری دڵی عاشـقانن، بۆیـە بـاوەڕ ناکات کە لەم رێیەدا گیان بەسەلامەت دەرکات لەکاتێکدا کـە لـە هـەر گۆشـەیەکدا دەبینـێ چاوانی یار خەریکی جیلوەگەری و راوکردنی دڵی عاشقانە بۆیە بەزەحمـەتی دەزانـێ کـە گیـان بەسەلامەت دەرکات و دوچاری یاخود ئەسیری تیری چاوانی مەستی یار نەبێت.

بەیتەکە بێ ئەندازە بەیتێکی پڕمانای قووڵی عیرفانیەو لە هۆگربوونی دڵ و گیـانی یـارانی جیلوەگەری کە دونیایە جیلوەی جوانی یاری ئەزەلی دەزانن دەدوێت چونکە (چاو) گوزارشت لە جیلوە گەری ئیلاهی دەکات کە ئەم مەسەلەیە لە غەزەلەکانی خواجە زۆر رەنگدەداتەوە خواجە دەڵێ ئێمە کە ئەسیری دەستی جیلوەی جوانیەکانین ئێستاش لەگەڵ ئەم هەموو جیلوە گەریـەدا بێگومان ئەسیری ئەو جوانیانە دەبین و ناتوانین بەئاسانی لەدەستاین دەرچین.

**٥- زسرو قدّ دلجویت مکن محروم چشمم را**

**بدین سرچشمەاش بنشان کە خوش آبی روان دارد**

ز سەرڤە قەدد دەل جووئیت مەکون مەحرەم چەشمەم را، بەدین سەرچەشمەئەش بەنـشان کـە خۆش ئابی رەوان دارەد

چاوانم لە (سەرو)ی بەژنی پەسـەندکراوت مـەحروم مەکـە (دامەبـەرە) لـەم سەرچـاوەیەدا بیرۆینە کە ئاوێکی زوڵاڵی چاکی هەیە.



سروقد: بەژنی رێکی وەك دارەسرو     دلجـو: پەسـەندکراو، دڵـدەرەوەو مایـەی ئارامی دڵاتن     سرچشمە: سەرچاوە، لێرەدا مەبەست لە سەرچاوە (چاو)ە

بنشان: برۆێنە، دابنێ     روان: رەوان، لەبەر رۆشتوو زوڵاڵ

لەم بەیتەدا خواجە لەلایەکەوە وەسفی قەدی یار دەکات کە بەژنێکی رێکی سـەرو ئاسـایی پەسەندکراوی دڵە یا مایەی ئارامی دڵانە.

لەلایەکی دیکەشەوە وەسفی چاوانی خۆی دەکات کە لەبەردەوام بەفرمێسکەو ئـاوی چـاکی لەبەر دەڕوات ئەم دوو وێنەیەی لە واتایەکی دیکەدا هێناوەتەوە کە بەیار دەڵێ: بەژنی تـۆ وەك دارسەرو رێکەو پەسەندکراوی دڵانە پێویستی بە ئاو هەیەو چاوی منیش بەردەوام ئـاوی لەبـەر دەڕوات لەبەرئەوە لەبەرچاوم ون مەبەو مـەحرومم مەکـە لـە بـەژنی رێکـت و لـە سەرچـاوەی چاوانمدا ئەوەدارەو رێکە برۆێنە تاپاراو بێت و چاوانی منیش لە دیتنی مەحروم نەبێ.

لەراستیدا ئەم لێکدانەوەیە کەمێك منەتی تێدایە بەڵام خودی بەیتەکە خاڵییـە لەمنـەت و تارادەیەکیش داوایەو ئەو ئاوداری چاوانەش وەك دەرگـادا خـستنێك لـەرووی بیـانووی وشـکی یاخستنە رووی لۆڵی و تامەزرۆیی باس دەکات.

**٦- بەفتراك ار همی بندی خدا را زود صیدم کن**

**کە آفتهاست در تأخیر وطالب ار زیان دارد**

بە فتراك ئەر هەمی بەندی خۆدا را زوود صیدم کون، کە ئافەتهاست دەر تەئخیرو تالب ئەر زیان دارەد

اگر بە (فتارك) وە هەڵمدەواسی بۆخاتری خوا زوو راوم کە چونکە لەدواخـستندا بـەڵای زۆر هەیەو زیانی بۆ داواکەر هەیە.

فـتراك: ئەڵقـەی سـەرزینی ئەسـپی راوکـەرەکان کەلـەکاتی راودا نێـچیرەکانیانی پێـوە هەڵدەواسن.

ار: ئەگەر     همـی بنـدی: هەڵدەواسـی     خدارا: بۆخـاتری خـودا     زود: زوو، خێـرا

صیمد کن: راوم کە     آفتها: کۆی (آفت)ە واتە بەڵا بەڵام لێرەدا مەبەست لـە بـەڵای زۆرە نەوەك کۆی بەڵا.

بێگومان نێچیر کاتێك کە راونەکراوە دورە لە راوچییەوەبەڵام کاتێك بەئەڵقەی زینەکەیـەوە هەڵواسراوە نزیکە لێیەوە، بەڵام نرخی ئەم نزیکەیە گیانی نێچیرەکەیە، خواجـەش بـەم نزیکیـە لەیار رازییە گەرچی گیانیشی لەدەست بدات، ئەو بەیار دەڵێ گەر پاش راوکردنم و کوشتنم بەو قوڵفەدا هەڵمدەواسی و نزیك دەبمەوە لێت ئەوا خێراکە راوم بکـە چـونکە لەدواخـستندا بـەڵاو

نەهاتی زۆر روودەدەن و زیانی بۆ داواکەر هەیە لێرەدا خواجە خۆی بەداواکەر دەزانێ، بەرای بەندە ئەم بەیتە باس لە مەرگ و نزیکی بەندەیە لەخوداوە خواجە خۆشحاڵە بەمەگ بەمەرجێ پاش مەرگ لەیاری ئەزەلی و خاوەنی مەرگەوە نزیك بێت چونکە کێ دەزانێ لەم دواکەوتنەوەدا دوچاری بەڵای دوری نابێتەوە بەهەرحاڵ ئەمە ئەوپەڕی گیان فیدایی خواجەیە لەپێناو معشوقدا چونکە تەنانەت گیانیش لەپێناو نزیك کەوتنەوە لەمەعشوقدا بەخت دەکات.

**٧-چو دام طرّه افشاند زگرد خاطر عشّاق**

**بەغمّاز صبا گوید که راز ما نهان دارد**

چوو دامێ توورره ئەفشانەد زگەردێ خاترە عوششاق، بە غەممازە سەبا گوویەد کە رازە ما نەهان دارەد

کاتێ داوی پرچی لەگەردو تۆزی دڵ (خاطر)ی عاشقان دەتەکێنێ بەدوو زمانێکی وەك سەبا بڵێن کە رازی ئێمە بشارێتەوە.

چو: کاتێ، وەختێ       دام: داو       افشاند: بیتەکێنێ، راتەکێنێ

گرد: گەردو تۆز       خاطر: بیروئەندێشە، ناخ و زەین

دڵ لەم بەیتەدا بەبەڵگەی هێنانی پرچ و پێوەبوونی (خاطر)ی عاشقان بەداوی پرچەوە جوانترین مانای (خاطر) دڵە چونکە لەچەندین بەیتی دیکەدا خواجە ئاماژەیە بە گیرۆدەبوونی دڵی عاشقان لەداوی پرچی یاردا دەکات هەروەها هەردڵیشە کە جێگەی رازو نهێنیەکانی عاشق.

عشق: کۆی عاشقە، عاشقان       غماز: قسە هەڵبەست، دووزمان

غمّاز صبا: قسە هەڵبەستی سەبا       نهان: شاراوە.

خواجە دەزانێ کە دڵ و گیانی عاشقان بەداوی پرچ و پەرچەمی یارەوەن، بێگومان لەگەڵ کردنەوەو داتکاندنی داویشدا نێچیرەکان دەکەونە خوارەوەو ئاشکرا دەبن، لەم بەیتەشدا سەبا بەقسە هەڵبەست یاخود بڵاوکرەوەی نهێنەیکان بەهەموولایەکدا دراوەتە قەڵەم بۆیە دەڵێ کاتێ کەیار پرچی خۆی دەتەکێنێ و لەگەڵ ئەوتەکاندنەشدا دڵی عاشقان کەوەك گەردو تۆزی سەر پرچی یار وان دەکەونە خوارەوەو دەردەکەون بەسەبای قسە هەڵبەست بڵێن کە نهێنی عەشقی ئێمە بڵاونەکاتەوەو بەجیهانداو رازەکەمان کەشف نەکات بەڵکو داپۆشێ.

د. هروری (گرد خاطر)ی بە دڵرەنجان و گلەیی لێکداوەتەوە پێی وایە بەم واتایەی کە مەعشوق عاشقانی گلەیی دارو بەتەمای شت لەخۆی دورخاتەوەو وەڵامی گلەیی و گەزاندەیان ناداتەوە شاعیر گلەیی لە مەعشوق هەیە بەڵام نایەوێ سەبا ئەم گلەییەی بڵاوبکاتەوە{ ج ١ هروی ل٥١٤} .



بەڵام لەراستیدا بەیتەکە زۆرلەوە قوڵترەو جەخت لەسەر هەمان رای بونیادی خواجە دەکاتەوە کە نایەوێ و بەنەشیاوی دەزانێت نهێنەیکانی عیشق و عیرفان بڵاوکرێتەوە هەربۆیشە لێرەشدا دەڵێ کاتێ مەعشوق دڵی عاشقان لەپرچی (رەمزی نهێنی) دەتەکێنێ بەقسە هەڵبەستان بڵێن کە نهێنی عەشقی ئێمەی عاشقان بشارێتەوە.

**٨-چو دررویت بخنددگل مشو دردامش ای بلبل**

**کەبرگل اعتمادی نیست گر حسن جهان دارد**

چوو دەر روویەت بەخەندەد گول مەشوو دەر دامەش ئەی بولبول، کە بەرگول ئعتمادی نیست گەر حوسنێ جەهان دارەد

کاتێ گوڵ بەرووتدا پێدەکەنێ مەکەوە داوی ئەی بولبول چونکە پشت بەگوڵ نابەسترێ ئەگەر جوانی دنیاشی هەبێ.

دررویت: بەروتدا       بخندد: پێکەنێ، خەندە بکات       مشودردامش: مەکەوە داوی

حسن جهان داشتن: جوانی جیهانی هەبوون، زۆر جوان بوون.

ڕاستە گوڵ جوانییەکی لەرادەبەدەری هەیە بەڵام بێوەفاو تەمەن کورتە (بێگومان لەئەدەبیاتدا رەمزی جوانی بێوەفایە) هەرچەندە رەنگە لێرەدا هێندە تەمەن کورتی یەکە مەبەستە بێوەفاییەکەی مەبەست نیە دڵدان بەگوڵ و جوانیەکانی وە کەوتنە نێوداوی گوڵ و گوڵ ئاساکانەوە لای خواجە پەسەند نییە، گەرچی خۆی بێ ئەندازە دیلی دەستی عەشق و گوڵە، بەڵام بە بولبولی عاشق دەڵێ: خۆت مەبەستە بەگوڵەوەو مەکەوە نێو داوی جوانی گوڵەوە چونکە گوڵ هرچەندە دونیایەك جوانی هەیە بەڵام جێگەی پشت پێ بەستن نییە رەنگە ئەم بەیتە رەتکردنەوەی عەشقی دونیایی بێت.

**٩-زخوف هجرم ایمن کن اگرامّید آن داری**

**که از چشم بداندیشان خدایت درامان دارد**

زخۆفێ هجرەم ئیمەن کون ئەگەر ئومید ئان داری، کە ئەز چەشم بەد ئەندیشان خودایەت دەرئەمان دارەد

لەترسی دابڕان ئاسودەم کە ئەگەر ئومێدی ئەوەت هەیە خودا لەچاوی خراپەکاران ئاسودەت کا.

بد اندیشان: خراپەکران       امان،ایمن : ئاسودە پارێزارو دڵنیا.

(زخون هرجم ایمن کن) لەترسی دابڕان ئاسودە بوون واتە بەڵێنم پێ بدە کە هەرگیز لێم دورناکەوێتەوەو بەمەش ئیدی من دڵنیاو ئاسودەدەبم لەترسی دابڕان لە تۆ و ترسم نییە کە بەجێم بهێڵی.

خواجه بەیار دەڵێ گەر ئومێدی ئەوەت هەی خودات لەچاوی بەد بتپارێزێ ترس دابڕان لای من هەڵگرەو هەمیشە لای من بمێنەرەوەو بەجێم مەهێڵە.

بەیتەکە دووجۆر لێکدانەوە هەڵدەگرێ کە لەیەکەمیاندا خواجە چاکەکردنی یار لەگەڵ خۆیدا بیری یاردەخاتەوە تاخواداش یار بپارێزێت و پێی دەڵێ ئەگەر بەوهیوایەی خودا لە چاوی بەدکاران بتپارێزێ چاکەیەك لەگەڵ مندابکەو بەجێم مەهێڵە لەدووەمیشیاندا خواجە خۆی بە پەناو پارێزەری یار دەزانێت و پێی دەڵێ ئەگەر دەتەوێ خودا لەچاوی خراپەکاران بتپارێزرێت لای من بمێنەورەو لێم دامەبڕە، بەڵام لێکدانەوەی یەکەمیان عاشقانە ترەو لەگەڵ تەرزی گشتی بیری عاشقانەی خواجەدا یەکدەگرێتەوە.

**١٠- بیفشان جرعەای برخاك و حال اهل دل بشنو**

**کە ازجمشیدو کیخسرو فراوان داستان دارد**

قومێك شەراب برێژە سەرزەوی و گوێ لە حاڵی ئەهلی دل بگرە چونکە خاك چیرۆکی زۆری سەبارەت جەمشیدو کەیخسرۆو تێدایە.

لە نوسخەکانی خواجەدا میسراعی یەکەم بەشێوەی جۆروجۆر نوسراوەتەوە لەوانە:

(بیفکن) لەبری (بیفشان) یاخود (بین و پرس) لەبری (بشنو) و(شکوه) ولەبری (دل) بەڵام بەندە لەرووی پێکهاتەی واتاییەوە ئەم شێوە بەتۆکمەتر دەزانم خۆم لە لێکدانەوەی نوسخەکانی دیکە پاراست و پەیڕەویم لە نوسخەی عەلامە قزوینی و د. خرمشاهی کرد کە نوسخەی (خ — فلخالی).

قومەشەراب پرژاندنە سەر خاك (جرعە برخاك نشاندن): دیاری و خێرکردنی بۆ خاك و گیانی پێشوەکان د. خرمشاهی لە (د.غلامحسین صدیقی و محمد معین)ەوە وەریگرتوەو دەڵێ کە نەریتی قومە شەارب پرژاندن سەرخاك لەکۆنەوەو لای میللەتە کۆنەکانی وەك (یۆنانین ئاشوری، یەهودی) باوبووە رژاندنی ئاو لەسەر گۆڕ (دیارە لەئێراندا باوە) ئێستاش هەرماوە لەکوردستاندا ئەم ئاورژاندنە بەناشتنی دارودرەخت لەسەر گۆڕستاندا گۆڕاوە ص٨٩٧ ج ٢ خرمشاهی.

خواجە هەرخۆی لە غەزەلێکی دیکەدا ئاماژە بەخێری ئەم نەریتە دەکات و دەڵێ:

**اگر شراب خوری جرعە ای فشان برخاك**

**از آن گناه کەنفعی رسدبەغیر چ باك**

واتە گەر شەرابت خواردەوە قومێك بپرژێنە سەرزەوی لەوگوناهە کە سودێك بە کەسانی دیکەبگات چ دەبێ.



خواجە ئامۆژگاری یاخود بیری مرۆڤ دەخاتەوە کەیادی عاشقان و ئەهلی دڵ بکەرەوەو خێرو چاکەیان بۆبکەو قومێك بپرژێنە سەر خاك بۆیان، چونکە زەوی زۆری لەخۆگرتووەو چیرۆکی زۆری دەسەڵاتدارو فەرمانڕەواکانی وەك جەمشیدو کەیخوسرەوی تێدایە.

یاخود قومێ شەراب بپرژێنە سەر زەوی و مەستی بکە تاباسی عاشقانت بۆ بکات چونکە زەوی چیرۆکی زۆر دەزانێ.

**١١- خدارا دادمن بستان ازو ای شحنە مجلس**

**کەمی بادیگری خوردست و با من سرگران دارد**

ئەی بەرپرسی کۆڕ لەرای خۆا حەقی من لەئەوبسێنە، چونکە لەگەڵ یەکێکی دیکەدا مەی خواردوەتەوەو سەرگرانی یەکەی لەگەڵ مندایە.

نسخە: دارۆغە، بەرپرس      شحنە مجلس: بەرپرسی کۆڕ   سرگران داشتن: مەستی و سەرقورس بوون.

خواجە لای بەرپرسی کۆڕشکات لەئەو ئەکات کەچووە بۆلای یەکێکی دیکە سەرخۆش بووەو ئێستا سەرگرانی و حاڵەتی مەستییەکەی بۆلای ئەم هێناوەتەوەو نارەحەتی دەکات، رەنگە ئەم شکات کردنە لە ئەو سەر قورس و نارەحەتی حاڵەتی سەکرو مەستی بێت کە لای سۆفیەکان روودەدات و خواجە تارادەیەیك کەم لەدەست ماندوبێت، یاخود هەر شکاتێکی دۆستانەی عاشقانە بێت و مەبەست لێی خستنە رووی رەفتاری یاربێت کە مەجلیسی شەراب نۆشکردن و خۆش لەگەڵ خەڵکدایەو بێ ئاگایی و سەرقورسیەکەشی بۆعاشقە.

**١٢- چە عذر بخت خود گویم کە آن عیّار شهر آشوب**

**بەتلخی کشت حافظ راو شکّر در دهان دارد**

چ بیانویەك بۆ بەختی خۆمم بهێنمەوە، کە ئەو عەیارە شار شڵەژێنەرە حافظی بەتاڵی کوشت لە کاتێکدا شەکری لەزاردایە.

عیّار: عەیار: یاری زیرەکی فێلباز،     شهر آشوب: مایەی ئاشوب و ئاژاوەی شار   تلخ: تاڵ، رەنج شکردرده‌ان دارد: شەکری لە زاردایەو، واتە بەشیرین کەلامی بەناوبانگەو وەك ئەوەوایە شەکری لەزار بێتەدەرێ.

حافظ دەڵێ چۆن بیانو بۆبەختی خراپ و خەواڵووی خۆم بهێنمەوەو نەڵێم بێ بەختم، چونکە ئەو یارە جوان و عەیارەی کە دەرکەوتنی دەبێتە مایەی ئاژاوەی شار — هێندە جوان و سەرنجراکێشە — لەکاتێکدا کە بەشیرین کەلامی و جوانی لێوو دەمی بەناو بانگە کەچی منی بەتاڵی و مەینەت و رەنج کوشت.

واته خەتای بەختی خۆمە کە ئەویارە شیرین کەلامە من بەتاڵی دەکوژێت، خواجـە لێـرەدا خەتاکە دەخاتە سەربەختی خراپی خۆیی و بیانوبۆ رەفتارەکانی یار دەهێنێتەوە.



## غەزەلی سەدو حەڤدەیەم:

**بەحری موزاریعی هەشتی ئەخرەب**

**(مفعول فاعلاتن مفعول فاعلاتن)**

**١- جان بی جمال جانان میل جهان ندارد**

**هرکس که این ندارد حقّا که آن ندارد**

گیان بێ جوانی یار مەیلی جیهانی نییە، هەرکەس کە ئەمی نییە بێگومان ئەویشی نییە
(این) لەم بەیتەدا ئاماژەیە بە (مال جانان) و (آن) یش ئاماژەیە بەگیان.
حقّا: بێگومان، بەراستی.

حافظی جوانی پەرست، ئو جوانەی کە خۆی بە( جمال جمیل) داوەتە قەڵەم خواجـە وتـەواوی عارف جوان پرەسـتەکان بۆیـە دڵیـان بـەدونیا خۆشـە چـونکە جوانیـەکانی مەعـشوقی تێـدا دەبیننەوە، بەڵام گەربێتو ئەو جوانیانەی مەعشوق نەبێ ئیدی دونیاو ژیانیش شـتێکی هێنـدە بەهادار نابێت کەمرۆڤ ئارەزووی بۆبخوازێت بـەهیوابێت بـۆی، خواجـە زینـدووبون و گیـان بـە بەرهەمی (جوانی مەعشوق) دەزانێت، تەنانەت گیان و جوانی یار بەلازم و مـەلزومی یـەکتری دەزانێت ئەو دەڵێ: گیان بەبێ جوانی جانان ئارەزو مەیلی دونیاو ژیانی دونیای نییە، بەراسـت ئەوەی ئەمی نییە واتە جوانیی یاری نیی ئەویشی نابێت واتە گیانیشی نابێت.

ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەم غەزەلە تارادەیەکی زۆر فەزایەکی عیرفانیانەی هەیە، هەرەچندە هەندێك لەرەخنەگرەکان لێکدانەوەی مێـژویی بـۆ چـەند بـەیتێکی کۆتـایی دەکـەن ئامـاژەی پێدەکەین کاتی خۆیدا.

**٢- باهیچ کس نشانی زان دلستان ندیدم**

**یامن خبر ندارم یا او نشان ندارند**

نیشانە (ناونیشان) لەو دڵبەرە بەهیچ کەس نەمبینی یا لە هیچ کەسـدا نـەمبینی، یـاخود من ئاگام لێ نییە یاخود ئەو نیشانەی نییە.

زان: لەو    دلتان: دولبەر، دڵبەر، دلرفێن   ندیدم: نەمبینی    خبر نـدارم: ئاگـادارنیم ئاگام لێی نییە.

د. هروری دەڵێ: (بێ شك دلستان — لە میسراعی یەکەمـدا پـەروەردگارەدا ) ج٢ هـروری ئەم بێگومان بونەی د. هروری تارادەیەکی زۆر لادانی عیرفانـە لەبـەیت و غـەزەلـەکانی دیکـە

هەوڵدانێکە بۆ بەئاینی کردنی کۆمەڵێ بەیت و بێبەش کردن و دارنینی غەزەل و بەیتەکانی دیکەیە لەومۆرکە، بەلام ئەوەی جێگەی راستی بێت، پێویستە ئەم قسەیە لەزۆربەی زۆری بەیتەکانی حافظ دا بکرێت کەمەبەستی خودایە یاخود دروسترە کە لەکاتێکدا ئەم تێبینییە بنوسرێت کە رەخنەگر تارادەیەك دڵنیابێت مەبەست لەمرۆڤێکە یاخود مەعشوقێکی ئەدەبی دونیاییە چونکە بەرای بەندە مەعشوقی زۆرینەی بەیتەکانی حافظ عیرفانییە.

حافظ نیشانەیەك لەو یارە دڵبەرە لکەسدا نابنێ یاخود کەس ناتوانێ نیشانەیەکی لەبارەی مەعشوقەوە پێ بڵێت، ئەو پێی وایە کە یاخود ئەم بێ ئاگایە لەهەواڵی ناونیشانی یار یاخود ئەوەیە کە ئەسڵەن یار ناونیشان و نیشانەیەکی نییە کەمرۆڤ بتوانێ لەدووی بگەرێت.

بەیتەکە رەتکردنەوەی هەرجۆرە ناونیشانێکی مەعشوقی حەقەو بەدرۆخستنەوەی هەرجۆرە بانگەشەیەکە بۆدیتن و زانینی شێوەو نیشانەی خوا.

جەنابی سودی عاشقانەتر بەیتەکەی لێکداوەتەوەو دەڵێ: واتە جوانی و تەواویەك (جمال و کمال) کە دڵبەر هەیەتی لەهیچ یارێکدا نەمدیوە چونکە ئەو لە جوانە بێ هاوتاکانی جیهانە، سودی ٢ ج٢ ل٧٨٦.

**٣- هرشمبنی درین ره صد بحر آتشین است**

**دردا که این معمّا شرح وبیان ندارد**

لەم رێگەیەدا هەرشەونمێك سەد دەریای ئاگرینە، ئەفسوس کە ئەم مەتەڵە شەرح و لێکدانەوەی نییە.

شبنم: شەونم   آتشین: ئاگرین   دردا: ئەفسوس، بەداخەوە   معمّا: مەتەڵ

مەبەست لە (این ره : ئەم رێگایە) رێگای عەشقی ئیلاهییە ئەورێگا خەتەرناکەی کە خواجە زۆر لێی دەترسێت، بێومان ئەو لەوە دەترسێ کە لەرێگەی عەشقدا تووشی شکست بێت لەوە دەترسێ کە نەفسی بەدکار نەتوانێ ئەم رێگایە تەی کات و نەتوانێ بەرگەی ئەو ترسناکیانەی رێگایەکە بگرێت لای خواجە ئەم رێگایە بێ ئەندازە ترسناکە، بەشێوەیەك ئەوشەونمە پاراوە فێنکە سەد دەریای ئاگرینە واتە لەرێگەی عەشقدا تەنانەت شەونمیش دەبێتە سەد دەریای ئاگرین، لێرەدا خواجە ئەم حاڵەتە — حاڵەتی ترسناکی و گرانی رێگە عیشق — بەمەتەڵێك دەزانێت و بەئەسەفەوە دەڵێت کە بەداخەوە ناتوانرێ شەرح و لێکدانەوەی بۆ بکرێت واتە ناتوانرێت لێڵی ترسناکی و گرانی رێگەی عەشق لێکدرێتەوەو روون بکرێتەوە.

بێگومان رێگەی عەشقی ئیلاهی و تەنانەت رێگەی بەرەو خودا چوونیش (ئیسلامی راستەقینەو مسوڵمان بوونی بەردەوام وەلانانی ئارەزوو هەوەسە دونیاییەکان) گەلێ گرانە،



لەفەرمودەدا هاتووە کە (بەهەشت بە نارەحەتی — مکارە — دەورە دراوە) هەربۆیە ئارام گرتن و بەردەوامی لەگرنگترین مەرجەکانی ئەو رێگایەیە.

جەنابی سودی بەجۆرێکی دیکە بۆ مانای ئەم بەیتە چووە: ئەوپێی وایە کە هەر شەونمێك لەم رێگەیەدا سەددەریای ئاگرینە واتە بچوکترین دل بەستن و دڵدان و بەغەیری یار وەك دەریای ئاگر بەربەستی نێو رێگایە ج٢ ل٧٨٧ د. هروریش ئەم رایەی وەرگرتوەو بەجۆرێکی دیکە دایرشتۆتەوە.

**٤- سرمنزل فراغت نتوان زدست دادن**

**ای ساروان فروکش کاین ره کران ندارد**

ناتوانرێ دواقۆناغی ئاسوودەیی و ئاسایش لەدەست بدرێ، ئەی وشتەرەوان لابدە چونکە ئەم رێگە دوایی نایە.

سرمنزل: مەنزڵی کۆتایی، دوا قۆناغ، دوامنەزڵ مەقسەدە — ئەنجامك   فراغت: ئاسوودەیی ئاسایش، بوار

زدست دادن: لەدەستدان   ساربان: وشتەروان ئەوکەسی لەپێش کاروانەوە هەوساری وشتر رادەکێشی

فروکش: بهێنە خوارەوە، مەبەست لەلادان و هەوارخستنە بۆحەسانەوە   کران: کەنار لێرەدا مەبەست (کۆتایی) یە.

خواجە دەڵێ: ناتوانرێ مەنزڵی ئاسایش و ئاسودەیی لەدەست بدرێت ئەی وشترەوان لابدەو هەوساری وشتەرکانت بەرەو خوارەوە راکێشە تاهەوار بخەین یاخود ئەسڵەن نەکەوتێنەرێ و ئاسایش لەدەست نەدەین چونکە ئەم رێگەیە بێ کۆتاییەو دوایی نییە.

لەراستیدا ئەم بەیتە تارادەیەك لێڵ و ئاڵۆزەو ئەو واتایەی سەرەوە مرۆڤ رازی ناکات، بەندە دان بەوەدا دەنێنم کە بەشێوەیەکی سەیر لە بەرامبەر ئەم بەیتەدا واقورماوم چونکە ناکرێ گرانی و سەختی رێگە لای خواجەو سەروەرێکی وەك حافظ ببێتە مایەی نجولان و رێ نەکەوتن و ئەم باوەرە لەغەزەلەکانی خواجەدا هی بارسوك و دەبنگەکانە نەوەك هی خواجەو سەروەرکان بەلام مانای سەرزاری بەیتەکە بەوشێوەیە.

ئەگەر (فروکش) بە (فروکش کردن) واتە — کەمبوونەوە لەگەرمی و شیدەتی کارێك یا دیاردەیەك — لێکدەینەوە دیسان مانای دروست بەدەستەوە نادات، بەلام بەندە بەوکەمە بیرەکولەی خۆمەوەو بەرەچاوکردنی بیری گشتی خواجە فەزای گشتی غەزەلەکان و بەتایبەتی ئەم غەزەلە لەم شێوەیە بۆی دەچم:

١-ئامانج لەم بەیتە خستنەرووی ترسناکی و گرانی ڕێگەی عیشقە وەك بەیەتی پێشوودا جەتی لەسەرکراوەتەوە.

٢-مرۆڤ ناکرێت دوامەنزڵی ئامانج کە مەنزڵی ئاسایش و ئاسودەییە لەدەست بدات و ئەو مەنزڵەش لە سەرەتا دانییەو لەکۆتاییدایە.

٣-(فروکش) لادانی ساربان مەرج نییە واتای ڕاوەستانی هەمیشەیی بدات و دەکرێ لەنێوەندی ڕێگەدابن و بەمەبەستی لادانێکی کاتی و هەوارخستنێکی کورت بێت کەئەمەش لەزۆر کاتدا مانای گور دەبەرخۆ خستنەوەیە.

کەوابێ خواجە بەتەواوی مەترسی و دوری ڕێگەی عەشقی ئیلاهی دەزانێت و لەتەواوی دیوناکەشیدا ئەم ڕاستیە دوبارە دەکاتەوە بەڵام هەرگیز باسی وازهێنانی نەکردووە بەڵکو زیاتر مەستی و عەشقی دەزووێت تا تەواوی بکات خواجە دەزانێ کە ئاسوودەیی و ئاسایشی هەمیشەیی لە دوا قۆناغی ڕێگەدایەو ناکرێ مرۆڤیش ئەمە لەدەست بدات و ئێستا بە وشترەوان دەڵێ مادام ڕێگە بێ کۆتاییەو بەو ئاسانییە تەواو نابێ لادە با پشوو بدەین یاخود گورێك بخەینەوە بەرخۆمان.

**٥- چنگ خمیده قامت می خواندت بەعشرت**

**بشو که پند پیران هیچت زیان ندارد**

چەنگی بەژن چەماوە بۆ (عشرت) ڕابواردنت بانگهێشت دەکات، گوێی لێگرە چونکە پندی پیران هیچ زیانێکی بۆت نییە.

چنگ: چەنگ، جۆرە سازێکە   خیمدە: چەماوە   خمیده قامت: بەژن چەماوە، مەبەست لبەبەساڵاچووە   می خواندت: بانهێشت دەکات   عشرت: خۆشی و بەزم

پند پیران: پەندی پیران

بەیتەکە چەند ڕونکردنەوەیەکی پێویستە لەوانە (پندپیران) دەکرێ پەندی پیران بەئامۆژگاری پیران لێکدەینەوە یاخود وەك جەنابی د. بهاء الدین خرمشاهی دەڵێ (ناوی کتێبێکە لەسەدەی پێنجەمی کۆچیدا چاپکراوە) {د.هروری ج١ ل٥١٧} بەڵام خودی ئامۆژگاریەکە میسراعی یەکەمە کە چەنگی بەژن چەماوە — بەساڵاچوو — بۆ بەزم و خۆشی داوەتت دەکات بەگوێ کەو زیانی نییە یاخود بەرای بەندە خودی ئەم پیرانە لێڵی تێدایەو دەتوانرێ بەخودی (چنگ)یش لێکدرێتەوە.

هەروەها (عشرت)یش زاراوەی عیرفانیدا بەچێژی هاودەمی و یاد یاری حەق و مەعشوقی ئەزەلی (خودا)یە (رساله الفاظ واصطلاحات حافظ ل٣١ تمیوری) بەم لێکدانەوەیەش واتای



بەیتەکە بەتەواوی پێچەوانەی ڕابواردن و بەزمی دونیای دەبێتەوە سەبارەت (چنگ)یش لە عیرفانیدا (د. سجادی) نوسیویەتی: (لەئامێرە مۆسیقیەکانە لەئەدەبیاتی عیرفانیدا هەریەك لە ئامێرە مۆسیقیەکان بەپێی دەنگ و ئاوازی ڕەمزێکی هەیە، بەگشتی هۆگربوونی دڵە بە دونیای لەکونەوە و بانگێکی غەیبییە کە لەرووی ڕەوانبێژییشەوە (خمیدە قامت/ بەژن چەماوە) کەسیفەتی چنگ)ە ڕوحیەتێکی نوێ و مانای پیری و دانایی ئەو دەگەیەنێت.

لەچەند جێگەی دیکەدا خواجە چەمك و بیرە گرنگەکانی بەناوی پیروە دەخاتە ڕوو هێنانی پیر لێرەدا بەگرنگ دانە قەڵەمی ئەم بیرەیە.

ئەودەڵێ: چەنگی بەژن چەماوەی پیری بەساڵدا چوو یاخود دەنگی ئەزەلی غەیبی، تۆبەرەو چێژو لەزەتەکانی هاودەمی و یادی مەعشوقی ئەزەلی خۆت دەعوەت دەکات بەگوێی بکە یا خود ڕازی بە بەومیوانانداریە چونکە ئامۆژگاری پیران کە دونیادیدەو ئەزموندارن هیچ زیانێکیان بۆتۆ نییە.

واتە برۆ میوانداریی یادو هاودەمی مەعشوق و قازانجی زۆریش دەکەیت.

ئەگەر تەنیا لایەنی ڕووکەشی بەیتەکە وەرگرین واتاکەی بەم شێوەییە:

چەنگی بەژن چەماوە بۆ بەزم و خۆشی داوەتت دەکات بەگوێی بکە چونکە ئامۆژگاۆری پیران هیچ زیانێکی بۆت نییە.

**٦- ای دل طریق رندی ازمحتسب بیانوز**

**مست است و درحق اوکس این گمان ندارد**

ئەی دڵ ڕێگەی ڕەندی لە محتە سیبەوە فێرببە مەستەو کەس دەربارەی ئەو ئەم گومانە نایات.

محتسب: مەئموری ڕێگری لەخراپەو فەرمان بەچاکە   بیاموز: فێرببە   درحق او: دەربارەی ئەو

خواجە لێرەدا گەرچی داکۆکی لەسەر یەکێك لە چەمکە بنەرەتیەکانی خۆی دەکاتەوە کە شاردنەوەی عەشقە زۆر زیرەکانە تانە لە موحتەسیب دەدات،لەئەسڵدا کاری موحتەسیب ڕێگرییە لە خراپەو خراپەکاری کەچی خواجە دەڵێ ئەو مەستەو هێندە زۆرزان و زیرەکە کە خۆی وای دەردەخات خەڵك هەرگیز ئەم گومانی مەسیتیەی پێ نایەن، واتە ئەی دڵی من کاتێ لەڕێگەی عەشق دیت وەك مەستی موحتەسیب بەو بڵاوی مەکەرەوە چونکە هیچ پێویست ناکات ئەغیار بەم نهێنییە گەورەیە بزانێت، هەرنا لە موحتەسیبەوە فێربە.

**٧- احوال گنج قارون كایّام داد برباد**

**باغنچه بازگوئید تازرنهان ندارد**

دەنگوباسی ئەخوال) گەنجی قــارون كــە رۆژگــار لــەناوی بــرد  بــە خونــچە بڵێنــەوە تــازێر نەشارێتەوە

احوال: ئەحواڵ، دەنگوباسی    دادبرباد: ببای دا، لەناوی برد    بـاز گوئیـد: (فروخـوان) بڵێنەوە    نهان ندارد: نەشارێتەوە.

میسراعی دووەمی بەیتەك بەچەند جۆرێك نوسراوەتەوە كە (باغنچە بازگوئیـد)و (درگـوش گل فروخوان) (درگوش دل فروخوان) شێوەی یەكەم و دووەم لەرووی واتـای گـشتی بەیتەكـەووە نزیكن و جیاوازی دەربرینە لەقەڵەم ئـەوا وادروسـتتر بەخوچـنە بگوترێـت چـونكە ئـەو زێرانـە دەشارێتەوەو بەكرانەوەی بوونەو گوڵی ئیدی نیانشارێتەوە لەم شێوەیەدا مانای بەیتەكە دەبێتە: دەنگوباسی قارون بەناخی زەویدا چوونی قارون كە سەرورت و سامانی زۆری پێكەوە ناو لەبـەر ئەوەی دەیشارتەوە وفیزی بەسەر خەڵكەوە دەكرد خـوا لنـاوی بـرد، بەغونـچە بڵێنـەوەو بـۆی بگێرنەوە تائەویش زێـری نەشـارێتەوەو هێنـدە بەخونـچەیی نەمێنێتـەوەو بكرێتـەوە چـونكە سەرەنجامی قارون باش نەبوو سەرەنجامی ئەو رەزیلی و شاردنەوەیەش نامێنێ.

ئەم بەیتە هاندانی مەعشوقە بۆ خۆدەرخستن.

لەشێوەی (درگوش دل فروخـوان) بەیتەكـە واتایـەكی كۆمەلایـەتی دەبەخـشێت و ئاگـادار كردنەوەیەك دەبێ بۆ ئەو كەسانەی كەرەزیلن و لەپول و پارەی زۆریان سـود وەرنـاگرن و بەشـی خەڵكی هەژارو دەست كورتیشی لێ نادەن خواجـە دەڵـێ: دەنگوباسـی لەناوچـوونی قارونیـان بۆباس كـەن تـازێر نەشـارنەوە بـەهرحاڵ مانـای عاشـقانەی بەیتەكـە لەگـەڵ فـەزای گـشتی غەزەلەكانی جوانتر رێكدەكەوێ هەربۆیە وارێكترە لەگەڵ خونچەدا بدوێت نەوەك گوڵ.

**٨-گرخود رقیب شمع است اسرار ازو بپوشان**

**كان شوخ سربریده بند زبان ندارد**

ئەگەر خودی رەقیب مۆمە، نهێنی لێ بشارنەوە كە ئەو شۆخە سەربراوە زمانی ناوەستێ.

بپوشان: بشارەوە، داپۆشە    شوخ: شۆخ، بێ حەیا    سربریدە: سەربراو

یەكێك لەواتاكانی بەند پەیوست بوونە بەشتێكەوە وەك پەیوەست بوون بەبەڵێن و وەفاوە.

خواجە بەهێنانی ئەم بەیتە دەیەوێ وەك بـەیتی شەشـەم جـەخت لەسـەر شـاردنەوەی رازی عەشق بكاتەوەو دەگاتە ئەوپەری رازی داری و دەڵێ گەر مۆم تەنانەت چاودێرو رەقیب (لێـرەدا رەقیب بەواتای زمانی بەكارهاتووە) نهێنی عەشقی لێ بشارنەوە چونكە ئەو بێ حەیا زمانبڕاوە



— زمان براوی مۆم بەهۆی برینی فتیلەكەوەیەتی — وەفا بـە زمـانی خـۆی ناكـات و نـاتوانێ زمانی ڕاگرێت و لای وان باسی دەكات.

ئەگەر بێت و رەقیب بەكەسی دووەم یاخود عاشقی روكەشی دووەم بزانین، مانـای بەیتەكـە دەبێتە:

ئەگەر رەقیب وەك بـێ شـەرمێكی بـێ وەفـا زمـانی ناوەسـتێ و نهێنیەكانەعەشـق بـڵاو دەكاتەوە.

لەهەر حاڵەتێكدا بەیتێكی دوبارەی چەمكێكی جەوهەری بـیری خواجەیـە كـە نایـەوێ عەوام و مرۆڤی رەمەكی لەنهێنی و رازەكانی عەشق ئاگاداربن چـونكە لێـی تـێ ناگـەن و بڵاویشی دەكەنەوە.

**٩-كس درجهان نداردیك بنده همچو حافظ**

**زیراكه چون تو شاهی كس درجهان ندارد**

كەس لە جیهاندا بندەیەكی وەك حـافظی نییە لەبەرئەوەی كەس لـەدونیادا پاشـایەكی وەك تۆی نییە.

زیراكە: لەبەرئەوەی كە، چونكە    شاهی: پادشایەك

خواجە خۆی بە بەندەیەكی نایاب دەزانێت لەدونیاداو پێی وایە كە هـیچ كەسـی لـەدونیادا بەندەیەكی وەك ئەوی نییە بەڵام گرنگ ئەوەیە كە خواجە هۆی ئـەم چـاكی و نایابییـەی خـۆی بۆپادشاكەی دەگێرێتەوەو پێی وایە هۆكەی ئەو ئەوەیە كە هیچ كەسێ لـە دونیـادا پاشـایەكی وەك پاشاكەی ئەوی نییە.

بەرای د. غنی مەبەست لە (شاهت) لـەم بەیتـەدا (شـاە شـجاع) ەو (محتـسب) ی بـەیتی شەشەمیش دركەیە لە (امیر مبارزالدین) تـاریخ عـصر حـافظ — غـنی بـەنقل ازهـروری ج١ ل٥١٨ — ٥١٩

هەرچۆن بێت ئەگەر مەبەست لەشاەشجاع بێت ئەوا ستایش و مەدحی ئەوەو بەندە بەواتای غولام و خزمەتكار دێت و ئەگەر لایەنی مێژوویشی لەبەرچاو نەگرین ئەوا مانایەكی گەردوونی پەیدا دەكات و (شاە) خوداو (بەندە)ش هەمان بەندەو عەبدە.

## غەزەلی سەد و هەژدەیەم :

**بەحری مونسرح هەشتی مەتوی مەنحور**
**(مفتعلن فاعلات مفتعلن فع)**

**١-روشنی طلعت توماه ندارد**
**پیش توگل رونق گیاه ندارد**

مانگ رۆشنی رووی تۆی نییە ولە بەردەم تۆدا رەونەقی گیای نییە

رۆشنی: رۆشنی، روناکی    طلعت: روخسار روو    رونق : رەونەق    گیاه: گیا، لێرەدا مەبەست لەگیای بێ گوڵە

خواجە وەسفی یار دەکات و پێی دەڵێ: ئەسڵەن مانگ روناکی روی تۆی نییەو گوڵیش لە بەردەم تۆدا رەونەقی گیایەکی نییە.

**٢-گوشە ابروی تست منزل جانم**
**خوشتر ازین گوشە پادشاه ندارد**

گۆشەی برۆی تۆیە مەنزڵی گیانم  خۆشتر لەم گۆشەیەی پادشاش نیەتی

توست: تۆیە

خواجە خۆی بەگۆشەنشینی جەمالی گۆشەی برۆی یار دەزانێت و بەدڵنیاییشەوە دەڵێ کە پادشاش خۆشترو چاکتر لەم گۆشەیەی نییە واتە من کاتێ گۆشەنشینی جەمالی برۆی تۆم خۆم بەپادشا دەزانم و هیچم ل تەخت و سەڵتەنەتی پاشایەتی کەم نییە.

**٣-تاچەکند بارخ تو دود دل من**
**آینە دانی کە تاب آه ندارد**

ئاخۆ دوکەڵی دڵی من چی بەرووخساری تۆبکات، دەزانی ئاوێنە توانای بەرگەگرتنی ئاهی نییە

تا: ئاخر لێرەدا (تا) بەواتای (تا)ی ئامانج نیە بەڵکو(ئاخۆ، بزانین).

دود: دوکەڵ لێرەدا مەبەست لە دەردو ئاهی دڵی عاشقە،    دانی : دەزانی

تاب: بەرگی تەحەمول

لای خواجە ئاوێنە توانای بەرگەگرتنی ئاهی نییە یاخود لەرووی سروشتییەوە بەئاه ئاوێنە تەڵخاوی دەبێت بەهەرحاڵ خواجە دەڵێ ئاوێنە توانای بەرگەگرتنی ئاهی عاشقای نییە ئاخۆ



روخساری تۆ توانای بەرگەگرتنی هەبی لەبەر دەم سوتانی دڵی منداو ئاخ کردنەکانمدا، واتەئاه و ناڵە کاریگەری لەئاوێنە دەکات ئاخۆ ئاه و ناڵەی منیش کاریگەری لەروخساری تۆدەکات و میهرەبانیت دەجوڵێنێ.

**٤- شوخی نرگس نگر کە پیش تو بشکفت**
**چشم دریدە ادب نگاه ندارد**

سەیری بی شەرمی نێرگز بکە کە لە بەردەم تۆدا پشکوت بێ چاوو رووە پەیرەوی ئەدەب ناکات

شوخی: بێ شەرمی    بشکفت: پشکوت    چشم دریدە: ئەگەر وشە بەوشەوەری گێرین (چاودراو)ە

بەڵام بەواتای بێ شەرم و بێچاوورو دێت    ادب: رێزو ئەدەب

نگاە ندارد: ناپارێزێ، رعایەت ناکا، پەیرەو ناکات.

خواجە لەئامادەیی یارداو لە کاتی دیاربوونی جوانی ئەودا تەنانەت شکوتنی نێرگزیش بەوپەری بێ شەرم و حەیایی دەزانێت و پێی وایە ئەم پشکوتنەی نێرگز لە بەردەم یاری دواپلەی جوانیدا بێ ئەدەبییەو پەیرەونەکردنی رێزو ئەدەبە ئەگەرنا نەدەبوا لەئامادەیی یاری خاوەن ئەپەری جەمالدا نێرگز شەرمی پشکوتنی هەبوایە.

**٥-دیدم و آن چشم دل سیە کەتوداری**
**جانب هیچ آشنا نگاه ندارد**

بینیم و زانیم ئەوچاوە دڵرەقەی کەتۆ هەقە سەیری هیچ ئاشنایەك نەکات (روولە هیچ ئاشنایەك نەکات) دیدم و: بینیم و تێگەیشتم، زانیم، بۆم دەرکەوت.

دل سیە: واتای مانای (دل سیە) دلرەشەو بەم واتایەش مەبەست لە گلینەی رەشە، واتای زاراوەیی (دل سیە)یش دڵرەق و بێ رەحم.

جانب: رووە   بەرەو  لایەن.

خواجە گلەیی لە بێ رحمی چاوی یارو ئیهمال کردنی دۆستان و ئاشنایان دەکات لەلایەن چاوی یارەوە.

گەر واتای زمانی (دل سیە) وەرگیرین ئەوا خواجە دەڵێ: تێگەیشتم کە ئەوچاوە رەشەی تۆهەتە روو لە هیچ ئاشنایەك نەکات و چاوی رەشت بە میهرو خۆشەویستی بیەوە لالە ئاشنایان نەکاتەوە لەواتای زاراوەییشدا چاوی بێ رەحم و دڵرەقت بەمیهرو خۆشەویستی بیەوە لەئاشنایان نارواننێ.

**٦- رطل گرانم ده ای مرید خرابات**

**شادی شیخی که خانقاه ندارد**

ئەی موریدی خەرابات رەتڵی قورس شەرابم بەشادی شێخێکەوە بدەرێ کە خانەقای نییە.

رطل: پێکی گەورەی شەراب، یەکەیەکی پێوانە وەك مەن، جەنابی سودی دەڵێ نیوەمەن رەتڵێکە هەرچۆن بێت لێرەدا مەبەست لە پێکی گەورەی شەرابە.

گران: قورس، مەبەست لە (رطل گران) پێکی پڕ لە شەرابی قورسە     دە: بدەرێ

شادی: بەشادی، بەخۆشی.

مێژوونوسەکان لەسەر ئەو رایەکۆکن کە حافظ سۆفیەکی پیشەیی و خاوەن شێخ و خانەقاو خرقەو تەریقەتی تایبەتی نەبووە بەڵکو عارفێکی تیۆری و خاوەن دیدگایەکی نوێ و جیاوازی عیرفانیە خۆشی لە زۆر جێگەدا جەخت لەسەر ئەم مەسەلەیە دەکاتەوەو پێی وایە بەئارەزووی خۆی نەبووە کە ئەم رێگەیەی هەڵبژاردووە وەك لە دوا بەیتی غەزەلی (٥)دا دەڵێ:

**حافظ بخود نپوشیداین خرقەی می آلود**

**ای شیخ پاك دامن معذوردار مارا**

خرقەو بەگری عارفانەی حافظ بەعەشق و مەی شۆراوە، لێرەدا خواجە داوا لە موریدی ئەم رێگە نوێیەی عیرفان وسۆفیگەری دەکات، کەپێکێکی قورسی پڕ لە شارابی بۆ تێ بکات و بیدات بەدەستیەوە تاوەکو بەیادو شادی ئەوشێخەوە بیخواتەوە کە خانەقاو دەسەڵات و پلەو پایەی کۆمەلایەتی نییەو ئەسڵەن کەس نایناسێ.

ئەم بەیتە جەختکردنەوەیە لەسەر ئەو بیروایەی کە حافظ شێخێکی بێ خانەقاو نارەسمی بەلاوە چاکترو جوانترە لەوشێخە خانەقادارە فریودەرە فێڵبازە ریاکارەی کە بە رەسمی ناسراوەو مەرجیش نیە لە بنچینەدا بەوشێوەی بێت.

**٧-خون خورو خامُش نشین کە آن دل نازک**

**طاقت فریاد دادخواه ندارد**

بەرگەی خەفەت بگرەو بەبێدەنگی دانیشە چونکە ئەو دڵە ناسکە توانای هاواری شکاتکەری نییە

خون خور: (خون دل/ جگر خوردن) بەرگە گرتنی خەم و خەفەتی زۆر

خامش: خامۆش، بێدەنگی

نازك: ناسك   طاقت ندارد: تونای نییە، تەحەمولی ناکات  داد خواە: داواکار شکاتکەر.



هرچەندە یار لەگەڵ عاشقاندا بێ رەحمەو هەمیشە مایەی خەم و خەفتە، بەڵام خواجە بەرگەگرتن و ئارامی و سەبر لەسەر خەفەت فێری عاشقان دەکات و پێیان دەڵێ : با دەروونتان بەرگەی خەم و خەفەتی زۆربگرێ و خەفەتی زۆربخۆن و بێدەنگ دانیشن و دەست مەکەنە شکات و گلەیی کردن لەیاور لای یار چونکە دڵی ناسکی ئەو یارە توانای هات و هاواری ئەم شکاتکەرانەی نیەو بەرگی ئەمە ناگرێت.

بێدەنگی و ئارام گرتنی لەسەر نارەحەتی و ئازار لەم دێرەدا بەجوانی رەنگیداوەتەوە

درخزان هجر گل خاموش شرط و فاداری بود غوغا چرا

لێرەدا مەرجێکە لەسەر عاشقان خراوەتەروو خواجە دورتر لەمەش رۆشتوە و هۆیەکەشی دەخاتە رو کە ناسکی دڵی مەعشوقەو تەحەمول ئەم هات و هاوارو غەوغایەی نییە.

**٨-گو برو و آستین بەخون جگر شوی**

**هرکە درین آستانە راە ندارد**

بڵێ برۆ قۆڵ بەخوێنی جگەر بشۆ  هەرکەسێ کە لەم بەردەرگایەدا شوێنی نییە (رێگەی نییە) (بەهەر کەسێ کەلەم بەردەرگایەدا  شوێنی نییە بڵێ برۆ قۆڵ بەخوێنی جگەر بشۆ).

آستین: قۆڵ      شوی: بشۆ      راە ندارد: جێگەی نییە شوێنی نییە، رێگەی نییە لکوردیدا دەگرتێ (رێگەم بکەرەوە) واتە شوێنم بکەرەوە بەلام بەرەو تیاچوون دەچێت.

(آستین بەخون جگرشتن) بێگومان (خون جگر) واتای خەفەتی زیادخواردن مەبەست لەم دەربرینە ئەوەیە کە هێندە خەفەت بخوات کە خوێن لە چاوانی بێتە دەرەوەو سەرقۆڵی کراسەکەی بشوات. بەم پێیە مەبەست لەوەیە کە خەفت و داخی لەرادە بەدەر بخوات.

خواجە بەردەرگای مەعشوق یاخود ئاستانەو کۆڵانی عەشق هێندە بە سودمەند دەزانێت وادەزانێ هەرکەسێك لەوی رییەو جێگەی نەبێت شایانی ئەوەیە کە داخ و خەفەتی لەرادەبەدەر بخوات هیندە کە خوێنی جگەری لە چاونیەوە سەر بکات و قۆڵی کراسەکەی پێ بشوات خواجە بە (هەرکەسێك) دەڵێ: بڵێ بەو کەسەی کە لەم بەردەگایەدا نییە برۆ هێندەی خەفەت بخۆ تا چاوانت لەبری فرمێسك خوێن ببارێنی و سەرقۆڵەکانی پێ بشۆو

لەم بەیتەدا خواجە عەشق و عاشقی بەسودێکی زۆر گەورە دەزانێت هێندە گەورە کە گریانێکی زۆرو خەفتێکی بێ رادە بەشایانی ئەوانە دەزانێ کە نایەنە سەر ئەم رێگەیە یاخود نەهاتوونەتە نیو رێگەی عەشقی حەقیقی.

**۹- نی من تنهاکشم تطاول زلفت**

**کیست که او داغ این سیاه ندارد**

تەنیا من نیم کە دەستدرێژی زولفت دا دەکێشم  کێشەکە ئەو داخی ئەم رەشەی نییە

نی: نە، مانای نەفی و نەرێکردن دەگەیەنێت و بنچینەیەکی پەهلەوییە، بەندە پێم وابێ کە هەمان (نە) بێت بەلآم لەبەر کێش درێژکرابێتەوە چونکە تەواوی یەکەم برگکانی میسراعەکانی دیکە درێژەو تەفعیلەی (مفتعلن) ە واتە  -  بب- { سودی ج٢ ٧٩٠}

کشم: دەکێشم، رادەکێشم    تطاول: دستدرێژی، ستەم

تەنیا خواجە نییە کە گیرۆدەی دەستدرێژییەکانی پرچی رەش یارەو ئەسڵەن خواجە کەسێ شك نابات کە داخی ئەم رەشەی پێوە نەبێت و گیرۆدەی دەست درێژییەکانی ئەم رەشە نەبێت.

(رەش) ئاماژەیە بە بەندەو خزمەتکارە رەش پێستەکان کەهەمیشەلەژێر ستەم و دەستدرێژی کەسانی دیکەدا بوون بەلآم ئێستا هەمووان کەوتوونەتە ژێر دەست درێژی ئەوەوە و خەفەت و داخی لەسەر دڵیانە.

دەکرێ (داغ)یش خەم داخ بێت و دەکرێ ئەو داخە بێت کە جاران بەندەکانی پێ داخ دەکرا تاوەکو بناسرێتەوەو نیشانەی بەندەیی ئەوان بوو بەواتای دووەم (داخکردن) واتە: تەنیا من نیم ستەمی پرچی رەشت رادەکێشم بەڵکو هەرکەسێ دەبینی بەندەو ژێر دەستەی ئەوەو داخێکی ناسینەوە، بەندەیی ئەوی پێوەیە {هروی ج ١ ل٥٢٣}.

لەهەردوو حاڵەتەکەدا خواجە خۆی و هەموو عارفەکان بەگیرۆدەی پرچی یار (نهێنییە نادیارەکانی بوون) دەزانێت و لەمەشەوە حیرەت و حەیران بوون دێتەئاراوە کەبەندە پێم وایە مەقامێکە کە حافظ زۆر لەسەری راوەستاوە زۆرترین کات تیایدا ژیاوە.

**١٠-حافظ اگر سجدەی توکردمکن عیب**

**کافر عشق ای صنم گناه ندارد**

ئەگەر حافظ کرنوشی بۆ تۆ برد رەخنەی لێ مەگرە ئەی بت کاری عەشق گوناهی نییە.

سجدە توکرد:  کرنوشی بۆتۆبرد

ئەم بەیتە بەیتێکی دژوارو پڕلەلێڵی یە حافظ بەیار دەڵێ ئەگەر سوجدەم بۆبردی لێم مەگرەو چونکە ئەی یاری جوان کەوەك بوتی کافربوون بەهۆی عەشقەوە گوناه نییە.

لەروکەشدا خواجە دەڵێ گەر مرۆڤ بەهۆی عەشقەوە کافر بێ قەیدی نییە، بەلآم ماناکەی زۆر جیاوازە لەم واتا روکەشییە.



سودی سەبارەت بە (کافر) نوسیویەتی: مەبەست لە کافر (ساتر)ە واتە داپۆشەریا ئەوکەسەی کە دەشارێتەوە، بەم واتایەش (کافر عشق) واتە داپۆشەری عەشق یاخود ئەو کەسەی کە عەشق دەشارێتەوە.

هەروەها کاتێ کافر دەڵێن بەو هۆیەوە کە تۆ لەزەویدا دەشارێتەوە کەوابێ کافری عەشق واتە ئەو کەسەی کە عەشق دەشارێتەوە و نایەڵێ خەڵکی و غەیر بەعەشقەکانەی بزانن جەنابی سودی فەرمودەیەکی هێناوەتەوە کە دەڵێ هەرکەس عەشق بشارێتەوە و بمرێت وەك شەهید وایە.

{سودی ج ٢ ل٧٩٥ }بەم لێکدانەوەیە میسراعی دووەمی بەیتەکە دەبێتە ئەمە: ئەی یار شاردنەوەی عەشق و نەدرکاندنی گوناه نییە.

د. هروی پێی وایە مەبەست لە (بت) بتی ماددی نییە بەڵکو جوانی و جەماڵەو حافظیش عاشقی جەماڵە.{ د.هەروی ج ١ ل٥٢٤}.

بێگومان لێکدانەوەی جەنابی سودی بۆ میسراعی دووەم لێکدانەوەیەکی زۆر جوانە بەلآم میسراعی یەکەم رونکردنەوەی زیاتری پێویستەو بەلێکدانەوەکەی جەنابیان ناگەینە مەبەست، ئەگەر تەنیا بڵێن ئەی یار ئەگەر حافظ کرنوشی بۆتۆبرد رەخنەی لێ مەگرە پێچەوانەی میسراعی دووەم دەبێتەوە کە شاردنەوەی عەشقە چونکە کرنوش بردن دەرخستنی عەشقە نەوەك شاردنەوە.

هەربۆیە بەندە رام وایە پێویستە بەم شێوەیە بەیتەکە (بەتایبەتی میسراعی یەکەم) لێکدرێتەوە، سەرەتا دەبێ ئەوە بخەینە رو کە زۆر جار لای خواجە مەبەست لە وشە و زاراوە پەرستیشەکان (وەك سوجدەو نوێژو مزگەوت.. ) روکەشی ئاینەو لایەنە قوڵ و عاشقانەو عارفانەکەی ئاین بە زاراوە تایبەتیەکانی خۆی وەك مەیخانەومەی و عەشق و تەنانەت کافریش) دەردەبرێت.. بەم پێیە لێرەدا دەڵێ: کاتێ خواجە وەك خەڵکی رەمەکی پەرستشێکی بێ گیانی تۆدەکات و کرنوشت بۆدەبات و حاڵ و سۆزی عاشقانەنت بۆدەرنابرێت و بۆت ناسوتێ رەخنەی لێ مەگرە چونکە ناتوانێ عەشقەکەی بۆتۆو جوانی تۆ بخاتە روو، هەربۆیە ئەی یار شاردنەوەو پەنهان کردنی عەشقیش گوناهی نییە واتە کاتێ عەشقی تۆ لای خەڵك دەشارمەوەو بەتەنیا کرنوش بردنی نوێژ واز دەهێنم رەخنەم لێ مەگرە.

بەم رایە لێردا (صنم) خودی مەعشوقی ئەزەلی (خوا)یە.

## غەزەلی سەد و نۆزدەهەم:

**بەحری هەزەجی هەشتی تەواو**

**(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن )**

**١-هر آن کو خاطری مجموع و یاری نازنین دارد**

**سعادت همدم اوگشت و دولت همنشین دارد**

هەرئەوکەسەی خەیاڵێکی ئاسودەو یارێکی نازەنینی هەیە خۆشبەختی بووە هاودەمی بەختی لەگەڵدایە (بەخت یاوەریەتی).

خاطر: خەیاڵ، مجموع: کۆ، ئاسودە پێچەوانەی پەرێشانی.

همدم اوگشت: بوونە هاودەمی

لەهەندێ نوسخە دا میسراعی یەکەم (یارو خار) نەناسراوو یەکدانە نین بەڵکو لەبری (ی) کەسرەی خستنەسەر یارا دانە پاڵێن هەیە.

خواجە پێی وایە کەسێ کە پەرێشان و پەشێو نەبێت و خەیاڵێکی ئاسوەو ئارام و یارێکی نازەنینی هەبێت خۆشبەختی و بەخت هاودەم و یاوەری دەبن.

**٢-حریم عشق را درگه بسی بالاتراز عقل است**

**کسی آن آستان بوسد که جان در آستین دارد**

دەرگای حەرەمی عەشق زۆر بەزرترە لە عەقڵ کەسێ ئەو بەردەرگایە ماچ دەکات کە گیانی لەسەر لەپەی دەستی دانێت.

حریم: حەرەم درگە: دەرگا بالاتر: بەرزتر آستان: زۆرجارمانای ئاستانەمان لێکداوەتەوە لەراستیدا ئێمە لە شێوەزاری جافدا (کەلەوەر — کەلەبەر) مان هەیە کە ئەگەر لەواتای تێ بگەین پراوپری (آستان )ە.

جان درآستین داشتن: گیان لە قۆڵدا بوون، بەڵام لەکوردیدا ئەم ئیدیەمە بەشێوەی گیان لەسەر لەپی دەست بوون) بەکاردەهێنرێت و بەواتای ئامادەیی گیان فیدایی و گیان بەخشین بەکاردەهێنرێت.

خواجە دیسانەوە کەمی و سنورداری عەقڵ دەخاتەوەڕوو، ئەو پێی وایە عەقڵ ناتوانێ بەکەلەبەرو بەردەرگای حەرەم و سنوری عەشق بگات و دەرگای حەرەمی عەشق زۆر لە عەقڵ بەرزترە و ئەسڵەن عەقڵ ناتوانێ خۆڵی ئەوکەلەبەرە ماچ کات بۆیە بۆماچکردنی خۆڵی ئەوبەردەگایە پێویستە گیان فیدای بکرێت و گیان بخرێتە سەر لەپی دەست خواجە دەڵێ ماچکردنی کەلەبەری عەشق بەهای گرانی دەوێت و عەقڵ ئەوبەهایە نییە بەڵکو گیانە.



هەرچۆن بێت بەیتەکە لە نرخی عەقڵ کەم دەکاتەوە.

**٣-دهان تنگ شیرینش مگر مهر سلیمان است**

**کەنقش خاتم لعلش جاهن زیرنگین دارد**

مەگەر زاری بچوکی شیرینی ئەنگوستیلەی سولەیمانە کەنەخشی ئەنگوستیلەی یاقوتینیی جیهانی خستۆتە ژێر فەرمانی خۆیەوە

دهان تنگ: زاری تەنگ، بچوك مهر: نگینی ئەنگوستیلە یاخود ئەنگوستیلە خاتم: ئەنگوستیلە زیرنگین دارد: لەژێر فەرمانرەوایەتی ئەودایە.

حەزرەتی سولەیمان بەهۆی نەخشی سەر ئەنگوستیلەکەیەوە دەسەڵاتی بەسەر جیهاندا دەشکا.

خواجە ئەم مەسەلەیی بۆزاری مەعشوق خواستووەو گریمانەیەکی داناوە، ئەو دەڵێ: مەگەر دەمی بچوکی شیرینی نیگینی و نقێمی سەر ئەنگوستیلەکەی سولەیمانە وا نەخشی یاقوتینی ئەنگوستیلەکەی کەلێرەدا مەبەست لەلێوی سوورویا یاقوتینی مەعشوقە جیهانی خستۆتە ژێر فەمرانرەوایی خۆیەوە.

شاعیر باسی لەو جادوو سەرنجراکێشە دەکات کە لەدەمی تەنگی یاردا هەیەو هەموان گیرۆدەی بوون و پەیرەوی لە فەرمانەکانی دەکەن هەروەك ئەوەی بڵێی ئەنگوستیلەکەی سولەیمان بێت و ناوی پیرۆزی لەسەر هەڵکۆڵدراوی خەڵکی مەجبور بکات گوێرایەڵی بکەن.

**٤-لب لعل و خط مشکین چو آنش هست و انیش هست**

**بنازم دلبر خودرا کەحسنش آن واین دارد**

لێوی یاقوتین و خەتی مسکبار، رەش کاتێ ئەوی هەیەو ئەمیشی هەیە بنازم بەیاری خۆمەوە کە جوانیەکەی ئەوو ئەمی هەیە.

آنش: ئەو اینش: ئەم بنازم: شانازی بکەم بنازم

آن: پلەیەکی جوانییە کە وەسف ناکرێت و کەس توانای دەربرینی ئەو حاڵەت و پلەیەی نییە وەك (خوێنگەرمی) کوردی

حافظ ستایشی یاری خۆی دەکات کە لەرووی شێوەوە زۆر جوانەو لێوی یاقوتین و خەتی مسیکباری هەیەو لەو حاڵەتە ونییە دەروونیش بێبەش نییەو خوێنی گەرمەو هەموان دەڵێت جوانەو دەرکی دەکەن بەڵام هەستی پێ ناکەن، خواجە دەڵی مادام جوانی یارم هەم روخسارو شێوەیەو هەم خوێنگەرمی و دەروونییە کەوابێ شانازی بەوەوە دەکەم کەیارێکی وام هەیەو جوانییەکەی هەم روخساری و هەم دەرونییە.

لەهەندێ نوسخەدا لەبری (چو آنش هست و اینش هست) (چو انیش هست و آنش نیـست) هاتووە کە لەم شێوەیەدا تەنیا جۆرێك لە جوانیەکان بەیار دەبەخشێت د. عیوضی.

**٥-چوبررووی زمین باشی توانایی غنیمت دان**

**کەدوران ناتوانیها بسی زیر زمین دارد**

کاتێ لەسەرووی زەویت توانایی بەدەسکەوت بزانە چونکە رۆژگـار بـێ هێـزی زۆری لـەژێر خاکدا هەیە.

بـروری: بەسـەر رووی توانـایی: هێـز، توانـایی غنمـت: دان: بەدەسـکەوت بزانـە ناتوانیها: بێ هێزی زیر: ژێر زمین: زەوی.

خواجە لەم بەیتە ئامۆژگاری ئامێزەدا، بیرمان دەخاتەوە لەژیاندا سـوود لـە توانـاو هێـزی خۆمان وەرگرین و پێش ئەوەی بمرین ئەو هێزەی هەمانە بەدەسکەوت و غەنیمەت بدەینە قەڵەم چونکە رۆژگار لەژێر زەویداو لەنێو مردواندا بێ هێزی زۆری هەیە کـە رۆژگارێـك لەسـەرزەویدا بەهێزبوون ئەم بەیتە ئاماژەیەکی روونی تێدایە بە فەرمودەی (پێـنج شـت پـێش شـتی دیکـە حیاتك قبل موتك، شبابك قبل خرمك..) سندو نقل هەموو فەرمودەکە.

**٦-بەخواری منگرای منعم ضعیفان و نحیفان را**

**کەصدر مجلس عزت فقیر رەنشین دارد**

ئەی دەسەڵاتدار (دەوڵەمەند/ خواپێدراو) بەسوکی سەیری بێ دەسەڵات و هەژارەکان مەکە/ چونکە جێگەی هەژاری سەرەری سەروەی مەجلیسی عیزەت و گەورەییە.

بەخواری: بەسوکی، بەکەمی، بەبێ ریزی منگر: مەروانە، سەیر مەکە مـنعم: خواپێـداو، دەسەڵاتدار نحیف: بێ هێز لاوز، صدر: سەرووی

مجلس عزت: مەجلیسی عیزەت و گەورەیی رەنشین: کەسێك لەسەر رێدا دادەنیـشێت و بـێ رێ و جێیە.

مەبەست لە مەجلیسی عیزەت، واتە گەورەیی و عیزەتی نەفس و کەمی و سوکی قـەبوڵ نەکردن، بێگومان زۆرێك لە هەژارن و بێ هێزەکـان عیزەتـی نەفـسیان زۆرگـەورەیی (صـدر مجلس عزت) واتەئەو هەژارانە لەمەجلیسی عیزەتـی نەفـسدا لەپێـشەوەو سـەروەرن خـاوەن عیزەتی نەفسن.

خواجە بە خواپێداوەکان دەڵێ کاتێ هەژارو لاوازەکان دەبینی بەسوك و بێ نرخـی سـەیریان مەکە چونکە هەرچەندە ئەوانە هەژارن بەڵام عیزەتـی نەفـسیان هەیـەو لەمەجلیـسی عیزەتـدا لەپێشی پێشەوە دادەنیشن.



هەروەها (عزت) یەکێکە لەسیفەتە جوانەکانی خودای گەورەش، لە قورئانـدا جگـە لـە بەکارهێنانی دیکە دوجار (غمه لله) (٤/١٣٩، ١٠/٦٥) و هەروەها جارێکی ش(لله العزه) (٨/٦٤) هـاتووە بەواتایـەش میـسراعی دووەم دەبێتـە: چـونکە ئەوکەسـانەی لـەکۆرو مەجلیـسی خـوای خـاوەن عیـزەت و گـەورەی و بەرزیـدا لەپێـشەوە دادەنیـشن فـەقیرو هەژارەکانی سەرە رێگە نشینن.

بێگومان ئەم چەمکە ( لەپێش چوونی هـەژارو بـێ دەسـەڵاتەکان لای خـودا) زۆرجـەختی لەسەر کراوەتەوە (هێنانی فەرموده لەوبارەیەوە..).

**٧-بلاگردان جان وتن دعای مستنمدان است**

**کەبیند خیر از آن خرمن کەننگ ازخوشە چین دارد**

نزای موحتاجان (هەژاران) بەلاگێرەوەی گیان و جەستەیە، کـێ خێرلـەو خەرمانـە دەکـات کـە شارۆکەرنی (گوڵچنی بەنەنگ دەزانێت (بوونی شارۆکەران لەسەر فەرمانەکەی بەعەیبە دەزانێت).

بلاگردان: بەلاگێرەوە، مستمندان: موحتاج، دەستکورت و هەژاران.

خوشەچـین: شـارۆکەر، گوڵـچین (خوشـە) بـەوتاتی هێـشوو دێـت بـەڵام لێـرەدا مەبەسـت لەوکەسانەیە کەپاش کۆکردنەوەی خەرمان یاخود رنینی بەرهەم پاشماوەی بەرهەمەکە دەچـنەوە و شارۆی دەکەن.

ننگ داشتن: پێ عەیب بوون، بەنەنگ زانین.

سەرەتا خواجە گەورەیی موحتاج و هەژارەکان یاخود دەست کورتـەکان دەخاتـە روو، پێـی وایە کە نزاو دوعای ئەوان گێرادەبێت بەلا لەجەستەو گیان دووردەخاتەوەو وەك قەڵغان وایە پاشان رەخنە لەو خاوەن خەرمانانە دەگرێت کە بوونی ئەوهەژارو دەست کورتانە لەسەر خەرمانەکەی بەنەنگی دەزانێت کەدێن بۆچینینەوە و کۆکردنەوەی جێگە خەرمانەکەی خواجە دەڵێ: کێ خێر لەو خەرمانە دەبینێ کە بوونی شارۆکەران لەسـەر جێگـە خەرمانەکـەی بەشـووریی دەزانێـت، دەکرێ ئەم بەیتە عاشقانە بێت و مەبەست لەمەعشوق بێت و بەم شێوەیە پێی بڵێت عاشـقانی هەژار لەسەر خـەرمانی جوانیـت بەشـورەیی مەزانـە یـاخود دەکـرێ بـەیتێکی کۆمەلایـەتی ئامۆژگاری ئامێز بێت وەك بەیتی پێشوو.

**٨-صبا ازعشق من رمزی بگو باآن شه خوبان**

**کە صد جمشیدو کیخسرو غلام کمترین دارد**

سەبا رەمزێك لەمەعشوقی بەوشای جوانـە بڵـێ کەسـەد جەمـشیدو کەیخـسرەو کـەمترین غولامی ئەون.

شەخوبان: شای جوانان

خواجە باسی لەگەورەیی و جوانی یار دەکات ئەویارەی کە پادشای گەورەی وەك جەمشیدو کەیخسرەو لەغولام و بەندە بچوك و کەمەکانی ئەون و بەپادشای جوانان دەیداتە قەڵەم بەسە باش دەڵێ رەمزێك لەعیشقی منی بۆ ببە.

**٩- وگرگویدنمی خواهم چو حافظ عاشقی مفلس**

**بگوئیدش کە سلطانی گدایی همنشین دارد**

گەر گوتی عاشقێکی موفلیسی وەك حافظم ناوێ پێی بڵێن کە سولْتان هاودەمی گەدای هەیە

مفلس: موفلیس، بێ فلس، بێ عانە، هیچ نەدار    بگوئیدش: پێی بڵێن.

ئەم بەیتە تەواوکەری بەیتی پێشووە خواجە لە بەیتی پێشوودا گوتی بەسەبا رازێکی عەشقم ببە بۆلای شای جوانان و پێی بڵێ من عاشقی ئەوم، لێرەشدا دەڵێ: ئەگەر ئەوشای جوانانە گوتی من عاشقێکی موفلیسی هیچ نەداری وەك حافظم ناوێ پێی بڵێن زۆر ئاساییە، سولْتان هەبووە کە هاورێی گەداو هەژاری هەبووەو ئەگەر تۆش ئەم کارە بکەی شتێکی سەرسورهێنەرت نەکردووەو نەریت و رێ و رەسمی سولْتانی دەرنەچوویت.



## غەزەلی سەد و بیستەم :

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی ئەصلەم**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع لن)**

**١- هر آنکە جانب اهل خدا نگەدارد**

**خداش درهمە حال ازبلا نگەدارد**

هەرئەوکەسەی کە پشتی ئەهلی خوا (نزیکەکانی خوا) دەگرێت ئەو لەهەموو حاڵەتێکدا لەبەلا دەیپارێزێ

هل خدا: خۆشەویستان و نزیکەکانی خوا، اهل الله بەواتای ئەهلی قورئان و خاسانیی خودایە واتە زاناکان و حافظ قورئانەکان و پیاوچاك و وەلیەکان{ ل٤٩٩ د. خرمشاهی حافظ نامە ج١

جانب نگەدارد: پشتگرتن، ئاگا لێ بوون، پاراستن

لەزۆرێك لەنوسخەکاندا لەبری (اهل خدا) اهل وفا) نوسراوە کە بەواتای وەفاداران دێت لەهەر یەك لەم واتایانەدا بێت خواجە باس لەپشتگرتنی مرۆڤ دەکات لەلایەن مرۆڤەوەو ئەوە دەخاتە روو کەهەرکەسێ پشتی مرۆڤی چاك باخوداو وەفادار بگرێت خوداش لەهەموو حاڵەتێك و بارودۆخێکدا لەبەلاو موسیبەت دەیپارێزێت.

**٢-گرت هواست کەمعشوق نگسلدپیمان**

**نگاه دارد سرِرشتە تا نگەدارد**

ئەگەر حەزدەکەین کەمەعشوقی پەیمان نەشکێنێ سەرە داوکە چاك بگرە تائەویش بیپارێزێ.

هوا: حەز، ئارەزوو، مەیل  نگسلد: نەپچرێنی، نەبرێ  لەکوردیدا لەگەڵ پەیماندا (شکاندن) بەکاردەهێنرێت    سررشتە: سەرەداو

عەشق و پەیمانی خۆشەویستی وك داوێکە کەهەرسەرێکی لای یەکێك لەعاشق ومشعوقەو وەفاداری پەیوەستە بەهەردوو لاوەو بەتەنیا لایەك ئەوپرۆسەیە نایەتەدی، خواجە بە پشت بەستن بەم راستییە بەعاشق دەڵێ: ئەگەر مەیل و ئارەزوت وایە خود حەزدەکەی مەعشوق بەوەفاداری بمێنێتەوەو پەیمانی عەشق نەشکێنێ تۆسەری داوی عیشقی لای خۆت چاك بگرەو وەفاداری عەشق بە تاوەکو ئەویش لەلای خۆیەوە ئاگای لە عەشق بێت و پەیمان نەشکێنێ.

د. خرمشاهي پێی وایە ئەم بەیتە ئیقتیباسە لەئایەتی (وافوا بعهدی وف بعدهکم) ج١ ل٥٠٣

واتە پەیمانی من بەجێ بگەیەنن تاپیەمانی ئێوە بەجێ بگەیەنم بەم پێیە خواجە بیرمان دەخاتەوە کە خۆشەویستی و گوێڕایەڵی مەعشوق و بەردەوامی ئەو عەشقە لەدەستی خۆماندایەو گەرمی یا ساردی ئەو پەیوەستە بەخۆمانەوە.

**٣-حدیث دوست نگویم مگر به حضرت دوست**

**که آشنـــا سخن آشنـــا نگه دارد**

قسەوباسی دۆست جگە لە حەرزەتی دوست بەکەسی دیکە ناڵێم چونکە ئاشنا قسەی ئاشنا دەپارێزێ.

به حضرت : بەحزرو، بەحەزرەت   سخن: قسە

لە راستیدا ئەم بەیتە لە روی پێکهاتەی زمانییەوە زۆر سادەیە، بەڵام واتای قوولی بەیتەکە یەکێکە لە واتای جەوهەری و بنەما گرنگەکانی بیری عیرفانی و بەتایبەتی بیری عیرفانی حافز ئەو راشکاونە دەڵێت: قسەوباسی دۆست، یار بە هیچ کەسێك ناڵێم جگە بە خودی حەزرەتی دۆست نەبێت، یاخود جگە لە حزوری دۆستدا نەبێ، چونکە تەنیا ئاشنایانن واتە پێڕەوانی عیرفان و رازدارانی تەریقەتن کە قسەی عیرفان و نهێنی و رازەکانی عەشق دەپارێزن، ئەگەرنا غەیری ئەمان رازەکان بڵاودەکەنەوە.

**٤- سر و زر و دل و جانم فدای آن محبوب**

**که حقّ صحبت مهر و وفا نگه دارد**

سەر و زەر و دل و جانەم فەدای ئان مەهبوب،کە هەقی سوهبەتی میهر و ڤەفا نیگەهـ دارەد.

سەر و ماڵ و دڵ و گیانم فیدای ئەو مەحبوبەی کە حەقی هاودەمی میهر و وەفا دەپارێزێت (رعایەت دەکات).

زر: زێڕ، لێرەدا مەبەست لە ماڵ و سەروەت و سامانە

خواجە سەر و ماڵ و دڵ و گیانی دەکاتە قوربانی یارێك کە بە میهر و وەفا بێت. واتە وەفادار بێت بەرامبەر عەشق و خۆشەویستی.

لە هەندێ نوسخەدا وەك ( قەزوینی و خورەمشاهی ) لە بری (محبوب) (یاری) هاتوە کە هیچ جیاوازییەك دروست ناکات.

**٥- صبا درآن سر زلف ار دل مرا بینی**

**ز روی لطف بگویش که جا نگه دارد**

سەبا دەران سەری زولف ئەر دلی ما را بینی، ز روی لوتف بگویەش کە جا نیگەهـ دارەد.



سەبا گەر لەو سەری زولفەدا دڵی منت بینی لە روی لوتفەوە پێی بڵێ ئاگای لە جێگەی بێت و چۆڵی نەکات.

ار: ئەگەر   بینی: ببینیت   بگویش: پێی بڵێ   جا: جێگە

حەیران و سەری زولفی یار لای خواجە جێگەیەکی زۆر گرنگ و گرانبەهایە و مەحاڵە مرۆڤی عاقڵ لەدەستی بدات، بۆیە بە سەبا دەڵێ: ئەگەر لەو سەری زولفەی یاردا دڵی منت بینی کە ئەسیرە و لە حیرەتدایە، لە روی لوتفەوە (واتە پیاوەتی لەگەڵ بکە یاخود بە چاکی خۆت) پێی بڵێ جێگەیەکی زۆر چاکە و ئاگای لێ بێت چۆڵی نەکات و لەدەستی نەدات.

**٦- دلا معاش چنان کن که گر بلغزد پای**

**فرشته‌ات به دو دست دعا نگه دارد**

دلا مەئاش چونان کون کە گەر بلەغزەد پای، فریشتەئەت بە دو دەست دوئا نیگەهـ دارەد.

ئەی دڵ وابژی ئەگەر پێت بەلاداهات  فریشتە بۆت دودەستی نزا بە بەرزکراوەیی رابگرێت.

معاش: ژیان   چنان کن: وابکە   پای لغزیدن: پێ بەلاداهاتن، هەڵەکردن

خواجە ئامۆژگاری دڵی خۆی دەکات و پێی دەڵێ وابژی کە ببیتە خۆشەویستی خەڵك و خوا، بەشێوەیەك کە ئەگەر هاتو پێت بەلاداهات و دوچاری نارەحەتییەك بوویت، فریشتە دەستی نزات بۆ بەرزکاتەوە، یاخود ئەگەر هات و هەڵەیەکت کرد فریشتەکان داوای لێبوردنت بۆ بکەن. واتە هێندە چاك بە کە ئەگەر دوچاری هەرشتێك بوویت هەموان بە هاناتەوە بێن.

**٧- چو گفتمش که دلم را نگاهدار چه گفت**

**ز دست بنده چه خیزد خدا نگه دارد**

چو گوفتەمەش کە دلەم را نگاهدار چە گوفت،ز دەستی بەندە چە خیزەد خودا نیگەهـ دارەد.

دەزانی هەرکە پێم گوت ئاگات لە دڵم بێت چی وت: چی لەدەست بەندە دێت خوا ئاگاداری بێت.

دەکرێ مەبەست لە بەندە (من) بێت

خواجە دەڵێ کاتێ بەیارم گوت دڵم بپارێزە و ئاگات لێی بێ، دەزانی وەڵامی چی بوو، گوتی: من بەندەیەکم و بەندەش هیچی لەدەست نایەت و خوا پارێزەرە و ئاگاداری بێت.

لە راستیدا ئەم وەڵامە وەڵامێکی زیرەکانە و خۆ دەربازکردنێکی عەیارانەی یارە لە داوایەکی کەسانی عاشق.

**٨- غبار راهگــذارت کجاست تا حافظ**

**به یادگار نسیم صبا نگه دارد**

غوباری راهگوزارەت کوجاست تا هافز، به یادگار نەسیمی سەبا نیگەهـ دارەد.

غوبــاری رەهگــوزەرت لــە کوێیــە تــا حــافظ وەك یادگــاری لــە ســروەی بــەیانی وەرگرێت(بسەنێت).

راهگــذار: رەهگوزەر، رێگەی تێپەڕین، شوێن پێ

حافظ دەزانێ غوبار و گەرد و تۆزی رەهگوزەر و شوێن پێیەکانی یار بە شــەماڵ و ســروەی بەیانە، بەڵام دروست نازانێت لە کوێوەیە و لە کوێدایە، بۆیە دەڵێ بە یار گەرد و تۆزی ژێرپێت لە کوێیە پێم بڵێ، تا وەك یادگاری لە بای سەبای وەرگرم و لای خۆم بپارێزم.



## غەزەلی سەد و بیست و یەکەم :

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی ئەسلەم**

**( فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لن)**

**١- آنکه از سنبل او غالیه تابی دارد**

**باز با دلشدگان ناز و عتابی دارد**

ئان کە ئەز سونبولی ئو غالییە تابی دارەد،باز با دلشودەگان ناز و ئیتابی دارەد.

ئەو کەسەی کە غالیە لەتاو پرچی وەك سونبولی ئەو دەتلێتەوە دیسانەوە لەگەڵ عاشــقاندا ناز و عیتابی هەیە.

سنبل: سونبول  غالیە: مادەیەکی بۆنخۆشە لە پرچ دەدرێت  تابی دارد: پەرێــشانە، نارەحەت و قەلەقە، دەتلێتەوە  باز: دیسانەوە دلشدەگان: کۆی (دلشدە)یە کە بە واتــای (دڵ لە دەست دەرچوو) دێت؛ واتە عاشقان  عتاب: سەرکۆنە، لێپرسینەوە

خواجە دیسانەوە لە دەستی پرچی یار دەناڵێنی، لە دەستی ناز و عیتابی خودی یار لەگــەڵ عاشقاندا

حافظ لە وەسفی یاردا دەڵێ ئەوکەسەی کە غالیــە ـ ئــەو مــادە بــۆن خۆشــەی خــەڵك لــە پرچیانی دەدەن تا بۆن خۆشی بکات ـ لە تــاو بــۆن خۆشــی پرچــی وەك ســونبولیدا لــە داخــدا دەتلێتەوە، بەڵام دیسانەوە لەگەڵ عاشقاندا کەوتوەتە نازکردن و سەرکۆنەیان.

**٢- از سر کشته خود می گــذرد همچون باد**

**چه توان کرد که عمرست و شتابی دارد**

ئەز سەری کوشتەیی خود می گوزەرەد هەمچون باد،چە تەڤان کــەرد کــە ئومرەســت و شتابی دارەد.

بە سەر کوژراوی دەستی خۆیدا هەروەك بــا تێدەپــەڕێت، چــی دەکرێــت وەك عــومرە و بــە پەلەیە.

از سر: بە سەر، بە لای  کشتە: کوژراو  می گذرد: تێدەپەڕێت  همچون: هەروەك چەتوان کرد: دەتوانرێ چی بکرێت

عمر: تەمەن،عومر،مەبەست لە یــارە کــە وەك (عــومر ـ تەمــەن) ئــازیز و خۆشەویــستە شتاب: پەلە

خواجه لەو راستییەوە قسە دەکات کە تەمەن بە تیژپەڕ دەزانێت، بە راستی مرۆڤ هەمیشە تەمەنی بەکورت و خێرا داوەتە قەڵەم، جگە لەمەش یاری بە (عومر) داوەتـە قەڵـەم، چـونکە وەك عومر ئازیزە، ئەودەڵێ: یار ئێمە دەکوژێت و زۆر بە پەلە و هەروەك با بە خێرایی بە سـەر جەستەی کوژراوەکانی خۆیدا تێدەپەڕێت، لێرەدا حافظ بیانو بۆ ئەم رەفتارەی یار دەهێنێتەوە و دەنووسێ: چی دەکرێ ئیتر یار عومری ئێمەیە و عومریش پەلەیە و بە خێرایی تێدەپەڕێت.

**٣- ماه خورشیدنمایاش ز پس پردەی زلف**

**آفتابی ست کە در پیش سحابـی دارد**

ماهی خورشید نەمایەش ز پەسی پەردەیی زولف،ئافتابیست کە دەر پیش سەهابی دارەد.

مانگی روی وەك هەتاوی لە پشت پەردەی پرچەوە، هەتاوێکە کە هەوری لە بەردەمدایە.

خورشیدنمای: وەك هەتاو، هەتاوی ز پس: لە پشت آفتاب: هەتاو

در پیش: لە بەردەمدا، لە پێشیدا

لێرەدا (ماه) درکەیە لە روخساری یار، روخساری وەك مـانگی یـار کـە هەتاوییـە لـە پشت پەردەی پرچەوە هەر لە هەتاو دەچێ (یا ئەو هەتاوەیە) کە هـەور لـە بەردەمیدایـە و پێشیان گرتووە.

بێگومان لە بەردەم بەیتێکی قووڵ و دووبارەی دونیای عیرفـانی حـافظدایـن و چـەند بـارە بونەوەی شاردنەوەی روی یار لە لایەن پرچەوە دەخەینەڕوو.

حافظ وەك هەمیشە پرچی یاری بە پەردەی سـەر روخـساری ئەوداوەتـە قەڵـەم. خواجـە دەزانێ کە یار روخسارێکی مـانگ ئاسای نورانی هەتاودەرخەر و نومایشکەری هەیە، بـەڵام لە ئێمە شاردراوەتەوە و بووەتە ئەو رازەی کە تا دوایی هاتنی ئەم گەمەیەی گـەردوون شـی ناکرێتەوە، ئەم وێنەیە لای شاعیر کت و مت لەو هەتاوە زێرینە دەچێت کە هـەور بـەردەمی گرتوە و نایبنین.

**٤- آب حیوان اگر آنست کە دارد لب دوست**

**روشن است این کە خضر بهرە سرابی دارد**

ئابی هەیەڤان ئەگەر ئانەست کـە دارەد لـەبێ دوست،ڕۆوشەنەسـت ئـین کـە خـەزر بـەهرە سەرابی دارەد.

گەر ئاوی زیندەگانی ئەوەیە کە لێوی دۆست هەیەتی، ئەمە ئاشـکرایە کـە ئـەوەی بوەتـە نسیبـی خدر سەراب بووە.

آب حیوان: ئاوی زیندەگانی، ئاوی نەمری روشن است: ئاشکرایە



خدر ئاوێکی پێدراو پێی گوترا ئاوی نەمریی و تەمەنی درێژکردووە و نەمری کرد، بـەڵام لێرەدا خواجە ئەم مەسەلەیە دەخاتە ژێر پرسیار و بەگومانەوە، ئەم دەزانێ کە ئاوی نـەمری ئەو ئاوەیە کە لێـوی مەعـشوقی ئـەزەلی هەیـەتی.کـەوابێ ئەسـڵەن خـدر ئـاوی نـەمریی نەخواردۆتەوە، بەڵکو ئەوەی کە بوە بەشی خدر سەراب بوو.

لێرەدا پێویستە دوو نەمریی لە یەکدی جودا بکەینەوە نەمرییەکی مادی (تەمەن درێژی) و نەمرییەکی گیانی (عەشقی حەقیقی)، خواجە تەمەن درێژی بە سەراب و نـەمریی گیـانی (عەشقی حەقیقی و عیرفان) بە نەمریی حەقیقی دەداتە قەڵـەم، ئـەو پێیوایـە ئـاوی لێـوی دۆست یا مەعشوقی ئەزەلی مایەی نەمریی حەقیقییە نەوەك ئەو ئاوەی کە لـە زوڵوماتـەوە دێتە دەرێ، دەشڵێن کە خدر ئاوی نەمریی خواردۆتەوە، کەوابێ ئاوەکەی خدر سەرابێك زیاتر نەبووە و نەمریی حەقیقی لە ئاوی لێوی مەعشوقی ئەزەلی دایە

**٥- چشم من کرد بە هرگوشە روان سیل سرشک**

**تا سهی سرو ترا تازە بە آبی دارد**

چەشمێ مەن کەرد بە هەر گوشە رەڤان سەیلی سێ رێ شك، تا سەهی سەرڤی تورا تازە بـە ئابی دارەد.

چاوی من لافاوی فرمێسکی بە هەموو گۆشە و لایەکدا هەڵکرد، تا بەژنی سەرو ئاسای تۆ هەمیشە بە تازە دێراوی بپارێزرێت (بهێڵێتەوە).

بە هرگوشە: بە هەموو گۆشە و لایەکدا سهی: بەژن، قەد آبی: دیراوی، ئاودار و تەڕ و پاراوی

حـافظ لە نێوان فرمێسکی چاوی عاشق و تەڕ و پاراوی بەژنی مەعـشوقدا پەیوەندییـەکی راستەوانە دەبینێت و پێی وایە کە فرمێسکی چاوی عاشق دەبێتە مایـەی پـاراوی مەعـشوق، ئەو لەم باوەڕەیە کە دەڵێ: چاوانی من فرمێـسکی وەك لافـاو بـە هـەموو کـون و قوژبنێکـدا هەڵکرد بۆ ئەوەی لە هەرکوێیەك هەیت پێت بگات و نەهێڵێ بەژنی سەروئاسات وشـك و زەرد هەڵگەڕێت و هەمیشە بە ئاودراوی و تەڕ و پاراوی بیهێڵێتەوە.

**٦- غمزەی شوخ تو خونم بە خطا می ریزد**

**فرصتش باد کە خوش فکر صوابی دارد**

غەمزەیی شوخی تو خونەم بە خـەتا مـی ریـزەد، فرسـەتەش بـاد کـە خـوش فکـری سەڤابی دارەد.

خەمزەی بێ شەرمی تۆ بە ناحەق خوێنم دەرێژێ، خوا بکات فرسەتی هەبێت، چونکە بیرێکی چاکی دروست و راستی هەیە.

شوخ: بێ شەرم، جەسور، روودار، شۆخ     بە خطا: بە ناحەق، بە هەڵە

می ریزد: دەرێژێ     فرصتش باد: فرسەتی هەبێ، هەلی بۆ برەخسێ     خوش: چاك

صواب: راست

کوشتنی عاشق بە خەمزەی شۆخ و بێ شەرمانەی چاوانی مەعشوق بیرێکی دروست و زۆر چاکی نێو دونیای عەشقی حافظە، چونکە گرفتاربوونی عاشق بە جوانییەکانی مەعشوقەوە و توانەوە و فەنابون لەم جوانییە شۆخ و بێ شەرمانەی چاوانی مەعشوقدا دوا ئامانج و هیوای عاشقە و لە پلە و قۆناغە پێشکەوتووەکانی عیرفانیشە، لەم روانگەیەوە کە خواجە دەستخۆشی لە مەعشوق دەکات و پێی وایە ئەم بیرکردنەوە (رشتنی خوێنی عاشق بە خەمزەی چاوانی مەعشوق) بیرکردنەوەیەکی زۆر چاکە و راست و دروستە و لە قازانجی عاشقە، هەربۆیە دوعا و نزا یاخود هیوای سەرکەوتنی بۆ دەخوازێت.

خودی حافظ لە بەیتەکەدا دەڵێت: خەمزەی شۆخی تۆ خوێنی منی عاشق بە هەڵە یاخود بە ناحەق دەرێژێ، هیوادارم هەلی بۆ برەخسێ و خوا یارمەتی دەری بێت، چونکە بیرێکی زۆر چاکی راستی بە خەیاڵدا هاتووە.

**٧- چشم مخمور تو دارد ز دلم قصد جگر**

**تُرک مست است مگر میل کبابی دارد**

چەشمی مەخموری تو دارەد ز دلەم قەسدی جێگەر،تورکی مەستەست مەگەر مەیلی کەبابی دارەد.

چاوی مەخموری تۆ جگەری برژاوی لە دڵم دەوێت، وەك تورکی مەستە و ئارەزووی گۆشتی برژاوی هەیە.

مخمور: مەخمور، مەست، خومار     دارد زدلم قصد جگر: مەبەست ئەوەیە کە دەیەوێت دڵم وەك جگەر لە شیش بدات و لە کاتی مەستیدا بیخوات     کباب: گۆشتی برژاو، تکە

سودی لە شەرحی ئەم بەیتەدا و لە پەیوەندی نێوان (تورکی مەست) و ئەم داوایەی چاوانی خوماری یاردا نووسیویەتی: لە بەرئەوەیە کە تورکی تاتاری زۆر حەزیان لە گۆشتە بە تایبەتی گۆشتی برژاو {سودی، ج٢، ل٧٧٦}



خواجەش دەڵێ چاوانی مەخموری/خوماری یار نیازی وایە کە دڵم ببرژێنێ و بیخوات، ئەم سیفەتەی چاوانی خوماری یار لە سیفەتی تورکە مەستەکان دەچێ کە لە کاتی خوماریدا حەزیان لە گۆشتی برژاوبێت.

پەیوەندی ئەم سیفەتەی چاوانی خوماری یار و تورکی مەست لە خوێنرێژی تورکەکانیشەوە سەرچاوە دەگرێت.

**٨- جان بیمار مرا نیست ز تو روی سؤال**

**ای خوش آن خسته که از دوست جوابی دارد**

جانی بیماری مەرا نیست ز تو روی سوئال، ئەی خوش ئان خەستە کە ئەز دوست جەڤابی دارەد.

گیانی بیماری من روی داواکردن لە تۆی نییە، خۆش بە حاڵی ئەو بیمارەی کە لە دۆستەوە وەڵام دەدرێتەوە.

بیمار: بیمار، نەخۆش، (سودی) سەبارەت بە پێکهاتەی (بیمار) نووسیویەتی: لە (بیم) (آر)ەوە هاتووە؛ واتە ترس هێنەر، بەڵام وەرگێری شەرحی سودی (د. عصمت ستار زادە) نووسیویەتی: (مار) واتە لەش ساغی و (بی مار) واتە یەکێك کە لەش ساغی لەدەستداوە {سودی، ج٢،ل٧٧٦،پەراوێز}     خستە: نەخۆش، زەحمەتکێش

ئەم بەیتە و بەیتی دوای ئەمەش گوزارشت لەو باوەڕ و روحیەتە بەرزەی پیاوچاکان دەکات کە لە کاتی مەینەت و بەڵاکاندا رویان نایەت یەکسەر لە خودا بپارێنەوە کە بیماری و مەینەتیەکانیان لەسەر هەڵگرێت وەك (حەزرەتی ئەیوب) کە تا دوایین ساتەکانی مەینەتیەکانی روی نەدەهات لە خوا داوا بکات و پاش ئەمەش راستەوخۆ داوای نەکرد، بەڵکو بە ئەدەبەوە باسی لە نارەحەتییەکانی کرد هەروەك لە قورئاندا هاتوە:"و ایوب اذ نادی ربه انّی مسنی الضر و انت ارحم الراحمین "{ الانبیاء،٨٣}.خواجەش دەڵێ ئەی دۆست، ئەی میهرەبان ترین دۆست گیانی نەخۆش و بیماری من روی داواکردنی لە تۆی نییە و لەروی نایەت کە داوات لێ بکات بە هانایەوە بێیت، ئەی خۆزگە بە حاڵی ئەو نەخۆشە یاخود ئەو زەحمەتکێشەی کە دۆست داواکاریەکانی جێبەجێ دەکات و بە بێ ئەوەی داوا بکات وەڵام دەدرێتەوە.

**٩- کی کند سوی دل خستەی حافظ نظری**

**چشم مستت که به هرگوشه خرابی دارد**

کەی کونەد سویی دلی خەستەیی حافظ نەزەری، چەشمی مەستەت کە بە هەر گوشە خەرابی دارەد.

کەی ئاورێك لە دڵی خەستەی حافز بداتەوە، چاوی مەستت کە لە هەرگۆشەیەکدا عاشقێکی هەیە.

بە هرگوشە: لە هەموو گۆشەیەکدا        خرابی: مەفتونێك، عاشقێك، گرفتارێك

واتە: ئاخۆ کەی بێ چاوانی مەستی تۆ کە لە هەرگۆشەیەکی ئەم دونیایەدا کەسێکی عاشقی خۆی کردوە و گرفتاری جوانیەکەی بووە و داغانی کردوە، ئاورێك لە دڵی بیمار و خەستەی حافظ بداتەوە، چونکە من رووم نایەت داوا بکەم ئاورم لێ بداتەوە ئاخۆ خۆشی کەی ئاور لەم دڵە خەستەیەم بداتەوە و بە چاوێکی میهرەبانیەوە لێم بروانێت.



## غەزەلی سەد و بیست و دووەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی ئەسلەم**

**( فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعِ لن )**

**١- شاهد آن نیست که مویی و میانی دارد**

**بندەی طلعت آن باش کەآنی دارد**

مەحبوبی قەشەنگ ئەوەنییە کە مویەك و کەمەرێکی هەیە بەندەی روخساری جوانی ئەوەبە کە خوێنگەرمی هەیە.

شاهد: مەحبوبی قەشەنگ  مۆێ، مویەك    میان: کەمەر    میانی: کەمەرێك

طلعت: روخساری جوانی

آنی : خوێنەرمی (لەراستیدت وشەی خوێنگەرمی پراو پری — آنی — یە چونکە — آنی — ئەو سەرنجراکێشەیە دەرونی و جوانیە کەیفیەیە کە مرۆڤ یامەعشوق لەدڵدا شیرین دەکات).؟

پێش شەرحکردنی ئەم غەزەلە پێویستە ئەوە بخەینە روو کەغەزەلەکە فەزایەکی عیرفانی سۆفیگەری هەیەو شاعیرزیاتر لە مەعشوقی ئەزەلی و سیفەتەکانی ئەو کاروبری سۆفی و عارفەکان و پەیوەندی جوانی مەعشوقی ئەزەلی و جوانیەکانی دیکەو جیاوازییان دەدوێت.

لەبەیتی یەکەمدا خواجە جیاوازی گەورەی نێوان مەعشوقەکان دەخاتەروو، ئەومەعشوقانەی کە تەنیا جوانی کەمەرو پرچیان بەگشتی تر جوانی لایەنی جەستەییان هەیەو ئەوجوانیە روحی و خوێنگەرمییە دەرونیەیان نییە.

ئەو ئەم جوانانە بەمەعشوقی ئەزەلی نازانێت ئەوخۆی دەڵێ شاهد — مەعشوقی قەشەنگ و ئەزەلی ئەو کەسەن کە جوانییە سروشتی و جەستییەکانی هەیە یاخود ئەسڵەن جەستەی هەیە.

تۆ مەبەرە بەندەی ئەم مەعشوقە جەسەییتە، بەڵکو ببە بە بەندەو غولامی ئەوروخسارە جوانەی ئەوتەلعەتەی کە جوانیە روحیەکان و خوێنگەری هەیە.

**٢- شیوەی حوروپری گرچە لطیف است ولی**

**خوبی آن است و لطافت کە فلانی دارد**

شێوەنازی حۆری و پەری جوان و ناسکە بەڵام جوانی و ناسکی ئەوەیە کە فلان کەس هەیەتی.

حور و پری: پەری — حۆری  فلانی فلان کەس.

خواجه دان بەوراستیەدا دەنێ کە حۆری یاپەری بەنازن و شـێوەیان ناسـك و جوانـە، بـەڵام هەرگیز ئەم جوانی و بەنازی و ناسکییە ناگاتە ئەوجوانی و ناسکییە کە فلانەکەس هەیەتی.

بێگومان فلان مەعشوقی خواجەیە و ئەو لە وەسفی مەعشوقدا دەڵێ جوانی و ناسـکی و بەنازی حۆریەکانی بەهەشتیش کەبەوە ناوبانگیان رۆشـتوە ناگـەن بـە جـوانی و ناسـکی خودی مەعشوق.

**٣- چشمەی چشم مرا ای گل خندان درياب**

**که به امّید تو خوش آب روانی دارد**

ئەی گوڵی دەم بەخەندە (پشکوتوو) ئاوڕ لە سەرچاوەی چاوی من بـدەرەوە کـە بەئومێـدی تۆوە ئاوێکی چاکی سەفابەخشی هەیە.

چشمە: کانی،سەرچاوەن چەشمە  خندان: دەم بەندە  - مەبەست لەپشکوتنەو شادلێوە

ئەم پشکوتنەی گوڵی بەپێکەنینی دەم بە پێکەنین داوەتە قەڵەم.

دریاب: بگە، چارەکە، ئاوڕ بدەرەوە، ئیلتیفات.

خواجە داوا لە مەحبوب دەکات کەئاوڕ لەچاوی گریاناوی پـڕ لـە فرمێـسکی بداتـەوە کـە هەمیـشە بەئومێـدی یـارەوە دەگـری و ئـاوێکی زۆری سـەفا بەخـشی هەیـەو وەك کـانی و سەرچاوەیەك وایە.

ئەو بە مەحبوب دەڵێ: ئەی ئەو مەحبوبەی کە وەك گوڵی بەخەندەیت و یـەك تۆپـە گـوڵی کراوەی ئاوڕێك لەم — سەرچاوەو کانیەی چاوانی بەندە بـدەرەوە، چـونکە بەئومێـدی تـۆوە زۆر دەگری بەئەندازەیەك کە ئاوێکی زۆرو سەفابەخشی هەیە.

لەراستیدا، پەیوەندی نێوان گوڵ و ئاو پێکهاتەیەکی رەوانبێژی جـوانی بەیتەکـە بەخـشیوە بەڵام مەبەستی سەرەکی بەیتەکە ئەم واتایەی سەروەیە.

**٤- خم ابروی تود صنعت تيراندارى  بستد**

**برده ازدست هر آنکس که کمانی دارد**

کەوانی ابرۆی تۆ لە هونەری تیر ئەندازیدا کەوانی لەدەستی هەرکەواندارێك سەندووە.

خم: لار، کەوانی   صنعت: هونەر     تیراندی: تیرئەندازی، تیراوێژی.

بستد: سەندووە  لەهەندێ نوسخە وەك (قزوینی — خرمشاهی)دا لەبری بستد — بردە هاتوە کە ماناکەی هاوشێوەیەو بەمانای (بردوە) دێت.

مانای ئەم بەیتە لەمانای بەیتی یەکەم و دووەمەوە نزیکەو وەسفی یـار دەکـات بێگومـان کەوانی برۆی یار یەکێکە لە سیما جوانەکانی یار کە عاشقان گرفتـاری شـێوەی جـوانی خـۆی



دەکات. شاعیر ئەم کەوانەی برۆی یارو کەوانی پاڵەوانە تیرهاوێژەکانی خستۆتە تای تەرازوو لە دواجاردا کەوان برۆی یاری لە تیرهاوێژی و هونەری تیرهاوێژیدا لەهەمووان بەجەربەزەترو چاکتر داوەتە قەڵەم ئەوبەیار دەڵێ: کەوانی برۆی تۆ لە تیر هاوێژی و هونـەری تـیر ئەندازیـدا هێنـدە هونەرمەندایە کە دەستی پاڵەوانە تیرهاوێژەکانی بەستووەو لەهەموویانی بردۆتەوە.

**٦-گوی خوبی که برد از تو که خورشيد آنجا**

**نه سواريست که در دست عنانى دارد**

کێ گۆی چاکی جوانی لەتۆ دەباتەوە، چونکە لەومەیدانەدا خۆریش ئـەو سـوارە نییـە کـە هەوسار — رەشۆری لەدەستدا بێت.

خوبی: جوانی، چاکی     برد: دەباتەوە     عنان: هەوسار، رەشۆ

بەیتەکە سودی لەباری گۆو مەیدان ورگرتووە بۆ دەربڕینـی مانایـەکی دیکـە لـەباری گـۆو مەیداندا مەیدان هەیـەو گۆوهەیـە و سوراچـاکیش بەگۆچـانەکانیانەوە ئامـادەن، و هەرکـەس گۆیەکی برد، واتە یاریەکەشی بردۆتەوە شاعیر گۆی جـوانی یاچـاکی هێنـاوەو یـەکێ لەسـوار چاکەکانیش هەتاوە، دەڵێ ئەی یار کێ دەتوانێ لەیاری جوانی و مەیـدانی جوانیـدا / چـاکیدا گۆی جوانی لەتۆباتەوە، لەکاتێکدا لەومەیدانەدا تەنانەت هەتاویش هەوساری لەدەستدا نییـەو ناتوانێ یاری بکات؛ واتە تەنیا تۆی کە لە مەیدانی جوانیدا دەتوانی گۆیەکە ببەیتەوە.

هەوسار لەدەستدا نەبوون دەکرێ واتای نەتوانین و بێ دەسەڵاتی بدات یـاخود مانـای هـیچ بەدەست نەبوون کە ئەگەر بەواتای دووەم بێت ئەوا واتـای بەیتەکـە ئەوەیـە کـە لـە مەیـدانی جوانیدا تەنها تۆی هەوسارت لەدەستدایەو تەنانەت هەتاویش هیچی بەدەست نییە.

**٦- دلنشان شد سخنم تا تو قبولش کردی**

**آری آری سخن عشق نشانی دارد**

لەوکاتەوە کە تۆقسەکانت قەبوڵ کردووم لەدڵدا دەچەسـپن و دەچـنە دڵـەوە، ئـەرێ ئـەرێ قسەی عەشق نیشانە (ناونیشان)ی هەیە.

دلنشان: دڵچەسپ، دڵنشین، کاریگەر   ئەوقسانەی کە دەچنە دڵەوە یا لەدڵدا کاریگەر دەبن.

تا: کە، لەوکاتەوە

مانای میسراعی یەکەم روون و ئاشکرایەو خواجە دەڵێ ئەی یار لەوکاتەوە کە تۆقـسەکانی منت قەبوڵ کردوەو پێیان رازیت، بەرەکـەت کەوتووەتـە قـسەکانمەوە لەدڵەکانـدا دەچەسـپێ و دەچنە دڵەوە.

پاش ئەمە لە بەیتی دووەم هاتووە کە دەڵێ: ئەرێ بەراست وایە قسەی عەشق ناونیشانی هەیە یاخود نیشانەی هەیە؟ لای سودی ئەم نیشانەیە کاریگەر نەبونیەتی لەدڵدا؛ واتە کاتێ قسە بچێتە دڵەوە کاریگەری لەدڵدا هەبێت، ئەوا دیارە ئەوقسەیە قسەی عیشقە. {سودی ج٢ل٨٨١}.

د. هرویش هەر ئەم رایەی هەیە، بەڵام د. خرمشاهی پێی وایە کە نیشانەی قسەی عەشق ئەوەیە کە یار قەبوڵ و پەسەندی بکات. ل٥١٢ ج١ خرمشاهی نامە

بەندە پێموایە هەردوو رایەکە دروستە، بەڵام د. خرمشاهی لە فەزای گشتی غەزەلەکە نزیکترە چونکە وەك گوتمان فەزایەکی تایبەت بەمەعشوقی هەیەو دەبێ لێرەشدا مەعشوق لەسەروی گشت شتەکانەوە دانرێت، کەواتە نیشانەی قسەی عیشقیش ئەوەیە کە مەعشوق پەسەندی دەکات و بەم پەسندکردنەش ئیدی کاریگەری لەهەموان دەبێت و دەچێتە دڵیانەوە.

**٧- درره عشق نشد کس بەیقین محرم راز**

**هرکسی برحسب فهم گمانی دارد**

لەرێگەی عەشقدا بەتەواوی کەس نەبووە بەمەحرەمی رازو هەرکەس بەپێی تێگەیشتنی خۆی گومانێکی هەیە.

بەیقین: بەتەواوی، یاخود دەکرێ بەواتای (بێگومان) بێت   برحسب: بەپێی   فهم: تێگەشتن

دەکرێ ئەم بەیتە بەیەکێ لەبیرە جەوهەری و کرۆکیەکانی حافظ لێکدەینەوە، ئەو بیرەی کە هەرگیز حافظی نەگەیاندە دوا مەنزڵگەی عیرفان کە فەنابوون بوو لەمەعشوقدا، ئەوپێی وایە کە کەس بەتەواوی نابێتە مەحرەمی رازو نهێنیەکان و هەموو نهێنیەکانی گەردوون و غەیبی پێ ناگوترێت یاخود رەتکردنەوەی یەکجاری بێت کە لەم لێکدانەوەیەدا (بەیقین) بەواتای (بێگومان) هاتوەو واتای میسراعەکە دەبێتە: بێگومان لەرێگەی عەشقدا کەس نەبوە مەحرەمی رازو نهێنیەکانی پێ نەگوترا لەهەر دوو واتاکە چ بەشێوەیەکی بەشی بێت یاخود بەشێوەیەکی گشتی حافظ دەڵێت: لەنێو تەریقەت و رێگەی عەشقدا کەس نەبووەتە محرەمی رازو نهێنیە غەیبیەکانی پێ نەگوتراوەو هەرکەسێك کە قسە دەکات و باسی نهێنیە غەیبیەکان دەکات گوایە ئەمە رازەکانی خوداو غەیبە، ئەوە گومانی خۆیەتی و لەرێگەی فەهم و تێگەیشتنی خۆیەوە هەڵهێنجاوەو قسەی خۆی زیاتر هیچی دیکە نییە.

بەمپێیە خواجە هەرجۆرە نهێنییەك کە لەرێگەی عەشقدا — عرفان — دا دەگوترێت بەتێگەیشتن و گومانی عارف دەزانێت نەوەك حەقیقەتی غەیبی.



ئەم چەمکە لەگوتە بەناوبانگەکەی فەیلەسوفی یۆنانی گەنەفۆنەوە نزیکەکە سەبارەت بەوێناکردنی خودا لەلایەن مرۆڤەوە دەیگوت: (........)

لەگەڵ هەموو مانا جوانەکانی ئەم بەیتەدا بەیتەکە ئامادەکارییەکی هزرییە بۆبەیتی هەشتەم کە دەڵێ:

**٨- باخرابات نشینان زکرامات ملاف**

**هر سخن وقتی و هرنکته مکانی دارد**

لای خەرابات نشینان لاف کەرامات لێ مەدە، هەرقسەیەك کات و شوێنی خۆی هەیە.

خرابات نشینان: خەرابات نشینان، ئەوکەسانەی کە لە مەیخانەدان عارفە عاشقەکان

ملاف: لاف لێ مەدە

لای ئێمە کەرامات وشەیەکی نامۆنییە بەتایبەتی لەوشوێنانەی کوردستاندا کە تائێستاش پەیرەوانی تەریقەت هەن و تا سەردەمێکی کەمی پێش ئێستاش قافڵەی حاڵ و کەراماتی دەروێشان گوندو شارەکانی کوردستان دەگەڕان و بەکارو هەڵسوکەوتی سەیرو سەرنجراکێشاکانیان هەموانیان سەرسام دەکردو بەوشتانە دەگوترا کەرامات، بۆ نموونە بەندە لەبیرمە لەکاتی هاتنی ئەو ساحێب کەراماتانەدا لەترساندا خۆمان لەکایەندا دەشاردەوە و جارێکیان لەسەر داوای شێخ وبەهاورێیەتی باوکم ئەم دەروێشزداە ترسنۆکە چوومە لای شێخ — کە بەراستی هێندە منداڵ بووم ئێستا نازانم شێخ کە کێ پێم وابێ باوکم لەبەرترسی من بردمی تائەو لەپشتەوە زۆرکێك یا پشکۆیەکم بۆبکاتە دیاری وئەوشاڵەی شێخ کە بەسەر شانیدا دام کەمێ ئارام و دڵنیام بکاتەوە. چونکە دەیانوت ئەوکەسەی شاڵی شێخی لەسەرشان بێت هیچ دەروێشێ دەستی لێ ناوەشێنێ. کەرامات لای ئێمە لەسیحرەوە نزیکە تاوەکو لەئایین و دەستی خوداوە، بەڵام کەرامات لەبنەرەتدا ئەوکارە لەناکاوە ناسروشتییانەیە کە سۆفیەکان و شێخەکان — وەلییەکانی خوا — ئەنجامی دەدەن وەك بەرماڵ بەسەر ئاودان گەڕان، بەسەر ئاگرا رۆشتن و گێرانەوەی کات و شوێن و رامکردنی ئاژەڵی درندەو زرك لەخۆدان...

مەرج نییە هەموو کارێکی ناباو کەرامات بێت، بەڵکو دەکرێ چاوبەست بن، ئەم چاوە بەستە جاران لای سۆفیە درۆزن و ریاکارەکان تەنانەت مەلاو دەروێش و هتدیش زۆر بڵاوبوو، هۆیەکەشی بۆسادەیی خەڵك دەگەڕایەوە، چونکە خەڵکی رەمەکی قسەی زیرەك و زۆڵانەی مەلاو..هتدیان بە کەرامات دەزانی.

هەرچەندە حافظ تارادەیەکی زۆر ئەشعەرییەو ئەشعەریەکانیش باوەڕیان بەکەراماتی ئەولیا هەیە، بەڵام لاف گەزافی درۆزنانە ریاکارانەی کۆمەڵێك لەشێخ و سۆفیە درۆزنەکان وای

لێکردووه هەندێ جار بەنێگەتیڤی بەکاری بهێنێ، لێرەدا کەراماتی بەوفرۆفێڵـە ئـەوان داوەتـە قەڵەم و بەسۆفی ریاکار دەڵێ:

لەگەڵ ئەوەی کە من پێم وایە کەس ناتوانێ بەتەواوی بێتە مـەحرەمی رازو لەتێگەیـشتنی خۆیەوە گومان دەبات (بەیتی پێشو) کەچی تۆ هاتویتـە لای عارفـە عاشـقە پاکـەکان — کـە حـافظ خۆی بە یەکێك لەوانە دەزانێت — و لافی کەرامات لێ دەدەی ئەی نازانی ئەوان ئـەهلی ئەم فرت و فێڵەی تۆنین و تۆناتوانی بەم لاف و گەزافـە فریویـان بـدەی، ئـەی تـۆ نـازانی کـە هەرکات و شوێنێ قسەی تایبەتی هەیـەو ئـەم کـات و شـوێنەهی ئـەولاف لێدانـەی تۆنییـە، میسراعی دووەم لە (لکل مقام مقال عربی وەرگیراوە.)

**٩- مرغ زیرک نزند درچمنش پردەسرای**

**هربهاری کە بە دنبالە خزانی دارد**

باڵندەی زیرەك لەگوڵ زاری بەهارێکدا چادر هەڵنادات کە خەزانی بەدوادا بێت.

پردەسرای: چادر　　　بەدنبالە: بەدوایدا

ئەو چیمەن و مرەی کەپاش بەهار پایزو خەزانی دێت و تیژپەرو کاتییەو زوو بەسەر دەچـێت ودونیایەو مرغ و باڵندەش مرۆڤە، بەڵام باڵندەی زیـرەك ئەوکەسـەیە کـەدونیای فـانی ناکاتـە ماڵی خۆی و دڵ بەعەشقی دونیاو دونیاییەکان نابەستێت، چونکە چاك دەزانێ دونیـاو هەرچـی لەدونیادایە وەك گوڵ و گوڵزاری ئەو بەهارەمان خەزانی بەدوادا دێت.

بەلەبەرچاوگرتنی فەزای گشتی غەزەلەکە دەتوانین بڵـێین مەبەسـت لـە گـولزاری بـەهار عەشقی دونیاییەو مرۆڤی زیرەك و عاقڵ ئەوکەسەیە گیرۆدەی عەشقی دونیا نەبێت، چـونکە کۆتایی دێت.

لەهەندێ نوسەخەدا (وەك سودی) لەجیاتی (پردەسرای) (نغمە سرای) هـاتووە کـە بـەواتای خوێندن دێت و مانای میسراعەکە دەبێتە: باڵندەی زیرەك لە گولزاری بەهارێکدا ناخوێنێ ئـەم شێوەیەش واتای گشتی بەیتەکە ناگۆڕێت.

**١٠- مدّعی گو لغزو نکتە بە حافظ مفروش**

**کلك مانیز زبانی و بیانی دارد**

بەبانگەشەکەر بڵـێ نوکتـە و لـوغز بـەحـافظ مەفرۆشـە، قەڵـەمی ئێمـەش زمانێـك و دەربرینێکی هەیە.

لغز: لوغز، مەتەڵ　　　کلك: قەڵەم



حـافظ لـەم بەیتـەدا دووپـەیامی هەیـە: یـەکێکیان رەتـی قـسەی زل و نوکتـەو مەتـەڵی بانگەشەکەری هیچ لەباردا نەبوو دەداتەوەو دووەمیشیان شانازی بەقەڵەمەکەی خۆیەوە دەکات کە توانای دەربرین و خستنەروی هەیە دەڵێ: بەبانگەشەکەری هیچ لە باردانەبوو بڵێ کە قسەی ازل و لوغز بە حافظ نەفرۆشێ؟ چونکە حـافظ خـۆی ئەوقـسە گـرنگ و لـوغز ئاسـایانە چـاك دەزانێ. دەکرێ ئەم بەیتە ئەو مانایەی لێ بخوازرێت کە حافظ هێنـدەی بەعیـشق و عاشـقی و واتا قوولەکانی عەشقەوە سەرقاڵ بووە سەرقاڵی قسەچنین و گەران بەدوای زاراوەو گوتەو شـتی گران و لوغز ئاسادا نەبووە.





## غەزەلی سەد و بیست و سێ:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی ئەسلەم**

**( فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فِع لن )**

**١- مطرب عشق عجب سازونوایی دارد**

**نقش هر نغمه که زد راه بەجایی دارد**

موترەبێ عیشق عەجەب سازۆنەوایی دارەد، نەق شێ هەرنەغ مێ کە زەد راه بەجائی دارەد

گورانیبێژی عەشق عەجەب سازو ئاوازێکی هەیە، نە هەر ئاوازێك کە لێیدا رێگە دەباتە سەرشوێنێ

مطرب: گۆرانیی بێژ، ئەوکەسەی کەکاری مۆسیقاژەنین و گۆرانی وتنە

ساز: ساز، ئاوازلێدان نغمە زدن: ئاوازلێدان نوا: پەردەی مۆسیقی، مەقام، ئاواز

گۆرانیبێژی عەشق ئەوکەسەی کە عەشق بەگۆرانی دەڵێتەوەو بنچینەی گشت کارەکانی و گشت ئاوازەکانی عەشقە، شاعیر وەسفی سازو ئاوازی ئەم گۆرانبێژەی عەشقەو دەڵێ پەردەی هەرئاوازێك جۆرێکەو ئێمەی جۆرێك و بەرەو شوێنێك رێنمایی دەکات؛ واتە گرنگی سازو نوایی گۆرانیبێژی عەشق لەوەدا هەرئاوازێکی عاشقەکان بەرەو شتێك یا دونیایەکی رەنگاڵەیی حاڵ و حەق رێنوێنی دەکات.

ئەم دەربرینەش ئێمە رێنوێنی دەکات بۆ ئەو مانایەی کە عەشقی ئیلاهی حاڵاتەکانی عەشق هەرجارەو واتای نوێ بە رێبواران دەبەخشێت.

**٢- عالم از نالەی عشاق مبادا خالی**

**کەخوش آهنگ و فرح بخش صدایی دارد**

جیهان لە ناڵەی عاشقان خاڵی نەبێت کە ئاوازێکی خۆش و دەنگێکی شادی بەخشی هەیە.

فرح بخش: خۆشی بەخش، دڵخۆشکەر، شادی بخش صدا: دەنگ.

حافظ دوعا دەکات یاخود ئاواتەخوازەکە دونیا لە ناڵەی عاشقان خاڵی نەبێتەوەو هەمیشە پڕبێت لەو ناڵەو کروزانەوەیە، چونکە ئەوکروزانەوەو ناڵەی عاشقان ئاوازێکی زۆر خۆشی هەیەو رەنگەکەشی دەنگێکە کەشادی و خۆشی دەبەخشێت و مرۆڤ کە گوێی لێ دەبێت دڵ خۆش و شاد دەبێت.

**٣-پیر دُردی کش ماگرچەندارد زرو زور**

**خوش گنجەبجش و خطاپوش خدایی دارد**

پیری مەینۆشی ئێمە گەرچی پارەو دەسەڵاتی نییە، خوایەکی چاکی گوناھ بەخش و تاوانی داپۆشەری هەیە.

دردی کش: می نۆش عارقە (درد) خلّتەی بنی کوپەی شەرابەو هەژارەکان ئەم شەرابە بەخلّتەدارەیان دەخواردەوە. زر: زێر زور: زۆر زروزور: پارەو دەسەڵات

گنجەبخش: گوناھ بەخش لەگوناھ خۆشبوو غەفار، خطا پوش: تاوان داپۆشەر، ستار

پیری شەرابی خلّتەدار نۆشی ئێمە درکەیە لەپیری تەریقەتی عەشق یاخود ئەورەندە عارفانەی کە حافظ لەتەریقەتدا بەپیری رەمزی خیامیان دەزانێت، کە هەندێ جار مەبەست لەشێخی سەنعانە هەرچەندە لێرەدا بەتەواوی ئاشکرا نییە کە مەبەست لەکێیە — هەرچەندە سودی نووسیوەتی پیری می نۆش شێخ مەحمودی گولرەنگە — ج ٢ ل٧٦٨ سودی.

هەرچۆن بێت لێرەدا خواجە سەروەت و سامانەکەی پیر یاخود ئەوشتەی یا ئەو کەسەی کە بووەتە مایەی گەورەیی پیر دەخاتە روو ئەو دەڵێت: پیری عاشقی ئێمە کەلە هەژاریدا خلّتەی شەراب دەخواتەوەو زۆر زوێری نییە، بەڵام ئەوەی مایەی گەورەیی ئەوە کە خودایەکی هەیە گوناهان دەبخشێت و تاوانەکان دادەپۆشێ و حەیای نابات، ئەم دوو سیفەتەی خودای گەورە (غفار، ستار)ن زۆر باسیان لێوەکراوە لە قورئانی پیرۆزدا خودای پیرۆز سەبارەت بە (غفار) یا (غفر) ی خۆی دەفەرموێت ٣٥ / ٥٣ **(قل یاعبادي الذین اسرفوا عل انفسم لاتقنطوا من رحمة الله ان اله یغفر الذنوب میعا انه هو الغفور الرحیم) الزمر/ ٥٣.**

هەروەها پێغمبەر (د.خ) لەچەندین فەرمودەی پیرۆزدا باسی (غفار)ی خودای کردوە تەنانەت گەشتۆتە ئەورادەیەی کەسوێندبخوات ئەگەر گوناه نەکەن خوا لە ناوتان دەبات و میلەتێکی دیکە دەهێنێ تاگوناه بکەن و داوای لێخۆشبون بکەن و خواش لێتان خۆش ببێ وەك فەرموویەتی: **(والذی نفسی بیده لولم تذنبوا لذهب بکم وجاء بقوم یذنبون فیستغفرون الله تعالی فیغفر لهم )**

{رواه مسلم/ لە تەفسیردا ل٥٧٠ نوح ١٠}.

هەروەها خوداش لەفەرمودەی قودسی و لەسەرزاری حەزرەتەوە باسی ئەم مەیل و حەزەی خۆیی بۆ بەخشینی گوناه خستۆتەرو لەکۆتایی ئەم فەرمودەدا دەفەرموێ: **(ومن لقینی بقراب الارض خطیئة لایرک بی شیئا لقیته لمثلها مغفرة)** {رواه مسلم لە تفسیردا ل٤٦٤}

جگە لەم جەختکردنەش (غفر) و دارشتنەکانی لە (١٠٠) جار زیاتر لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە.



هەروەها سەبارەت بە — ستار — ی خوداش پێغەمبەر — د. خ — فەرمویەتی لەرۆژی دواییدا خودا نزیك دەبێتەوە بۆلای ئەو بەندە گوناهبارانەی کە تاوانی ژێربەژێرییان ئەنجام داوەو کەس پێی نەزانیون، هێندە لێیان نزیك دەبێتەوە تادەست دەخاتە سەرشانی و پێی دەڵێ ئەی بەندەکەم لەبیرتە فلانە تاوانتکرد بە بێ ئەوەی کەس پێت بزانێت، لای هیچ کەس مەیلێ و منیش دەیشارمەوەو لێت خۆش بووم، یاخود ئەوحاڵەتەی کەکاتێك تاوانەکانی تاوانابارن دەخوێننەوە یەکێ لەتاوانبارەکان کە تاوانێکی ژێر بەژێری کردووە هەردەترسێ و چاوەرێیە تاوانەکەی بخوێنرێتەوە بەڵام تاوانەکانی تەواو دەبن و ئەوتاوانی تێدا نییە.

بەراستی خودایەکی وا بەم دووسیفەتەوە دەیەها سیفەتی جوانی لەم جۆرە مایەی ئەوەیە کە مرۆڤ شانازی پێوەبکات و بونەبەندەی ئەم خودایە گەورەترین شانازی مرۆڤە، ئیدی بامرۆڤ زێرو زۆر یادەسەڵات و پارە یاهەرشتێکی دیکەی نزم و سوکی دونیایی نەبێت هەرئەمەی بەسەکە ئەوخودایەی هەبێ کە لەبەشێکی دیکەی فەرموودە قودسیەکەدا فەرمویەتی هەرکەس بستێك لێم نزیك بێتەوە باڵێك لێی نزیك دەبمەوە هەرکەس باڵێك لێم نزیك بێتە — باع — ێك لێ نزیك دەمبەوەو، هەرکەس بەرۆشتن بەرەو لای من بێت من بە بەراکردن بەرەوروی دەچم) رواه مسلم.

**٤-متحرم دار دلم کاین مگس قندپرست**

**تا هواخواه تو شد فرّ همایی دارد**

رێز لە دڵم بگرە، چونکە ئەم مەگەزە شەکر پەرستە لەوکاتەوە عاشقی تۆبووە فەر/ رەونەقی هومایەکی هەیە

محترم دار: رێزی بگرە، بەرێز لێی بروانە، مگس: مەگەز قندپرست: شەکرپەرست، عاشقی شەکر

هواخواە : عاشق فرّ: فەر، رەونەق، گەورەیی

مەگەزو هوما لەرەونەق و فەردا و باڵداری جیاوازن مەگەز باڵدارێکی بێ نرخ و سوکەو هوما باڵندەیەکی رەونەقداری پیرۆزو بەسەرسەری هەرکەسەوە بنیشێتەوە پاشایەتی و فەروبەرەکەت دەبێتە خەڵاتی، خواجە دەڵێ دڵم وەك مەگەزێکی شەکر پەرست و عاشقی شیرینی وابوو، بەڵام لەوساتەی کە عاشقی تۆبووە هاتووەتە نێو دەریای عەشقی تۆوە وەك هوما رەونەقدارەو پیرۆز بووە واتە بەهۆی عەشقی تۆوە کە گەورەی دڵی عاشقی منیش گەورە بووە، مادام ئەم دڵە عاشقەی من وابەستەی عەشقی تۆیە رێزی بگرە، چونکە ئیتر بەهۆی عەشقی خۆتەوە هومائاسای لێهاتووە و ئەو مەگەزەی جاران نییە.

خواجە دەیەوێ بڵێت مرۆڤی بچووك بەعەشقی گەورەو ئەزەلی ئەوپیرۆز دەبێت و دەگاتە ئەوپەڕی پیرۆزی وەك هوماو پێویستە ڕێزی لێ بگیرێ.

**٥- ازعدالت نبود دورگرش پرسد حال**
**پادشاهی که به همسایه‌گدایی دارد**

لەدادپەروەری دوور نییە گەر پادشایەك حاڵی دراوسێ هەژارەکەی بپرسێت.

گرش: گەرلێی     همسایه: دراوسێ

لەرێ و رەسمیدا پەروەری و عەدالەت ناچێتە دەرەوە گەربێت و پادشایەك لەدراوسێ هەژارەکەی بپرسێتەوەو حاڵی بپرسێت.

دەکرێ ئەم بەیتە لێکدانەوەی کۆمەڵایەتی بۆبکرێت و دەشکرێ پادشا مەعشوقی گرانقەرو گەداش عاشقی هەژاربێت و بەیتەکە عاشقانە / عارفانە بێت.

**٦- اشک خونین بنمودم به طبیبان گفتند**
**دردعشق است و جگرسوز دوایی دارد**

ئەشکی خوێنینیم پیشانی پزیشکەکانی دا گوتیان: دەردی عەشقە دەرمانێکی جگەرسوتێنی دەوێت.

بنودم: پشاندا، نیشاندا     جگەرسوز دوا: دەوای جگەرسوتێن، مەبەست لە ئارامی و بەرگەگرتنە.

خواجە لەسەرزاری پزیشك و حەکیمەکانەوە دەرمانی عەشق دیاری دەکات کە ئارامی و سەبرو بەرگەگرتنی نارەحەتیەکانی ڕێگەیە کە ئەم ئارامییەش هێندە نارەحەتە وەك جگەرسوتان قورس و نارەحەتە، ئەودەڵێ: کە فرمێسکی خوێنینی خۆم بەپزیشکان نیشاندا گوتیان ئەم نیشانەیە نیشانەی دەردی عیشق و دەرمانەکەشی تەنیا ئارام گرتن و بەرگەگرتنە.

**٧- ستم از غمزه میاموز که در مذهب عشق**
**هرعمل اجری و هرکرده جزایی دارد**

ستەم لە غەمزەوە فێربە، چونکە لە مەزهەبی عیشقدا هەر عەمەلێك و ئەجرێك و هەرکردەوەیەك جەزاو پاداشتێکی هەیە.

میانوز: فێرمەبە     اجر: پاداشت، ئەجر

ئەی یار گەر غەمزەت لێدەکات تۆڵەوەوە ستەم و ستەمگەری فێرمەبە، چونکە لە مەزهەب و ڕێڕەوی عەشقدا هەرکارێك چاك و خراپ پاداشتی هەیە، ئیدی هەر پاداشتەو بەپێی کارەکەیە، کاری چاك پاداشتی چاك و کاری خراپیش جەزای خراپ.



پێموابێ ئەمە لێکدانەوەیەکی سەرزارەکی بەیتەکەیەو دەبێ مانایەکی لەمەقووڵتری هەبێت و لەنێوان پاداشت و فێربوونی ستەمی غەمەزەدا پەیوەندییەکی قووڵتر هەبێ.

یاخود دەیەوێ بڵێ کە غەمزەت ستەمان لێ دەکات بەسزای خۆی دەگات، تۆش بۆ ئەوەی بەسزای خۆت نەگەیت وەك ئەوستەمان لێ مەکە، بەڵام گرفتی ئەم لێکدانەوە لەوەدایە کە ئەم یاسایە یاسای مەزهەبی عەشق نیە مەگەر ئەوەی کە ستەمی غەمزە فریودان بێت.

**٨- نغز گفت آن بت ترسابچه‌ی باده‌پرست**
**شادی روی کسی خورکه صفایی دارد**

ئەو مەحبوبە گاورزادە بت پەرستەی جوان گوتی: بەشادی ڕوی کەسێکەوە بخۆرەوەکە سەفایەکی هەیە.

نغز: چاك، جوان، خۆش  ترسا: گاور  ترسابچە: گاورزادە  بادەپرست، مەی پەرست

شادی: بەخۆش، بەشادی     صفایی دارد: سەفابەخش، کراوەو خۆشی بەخش

یاری ڕێگەی تەریقەت کە دەکرێ هەمان پیربێت یاساقی یاهەر وێنەیەکی جوانی نێوزەینی حافظ کە بە بوتی گاورزادەی بادەپەرستی ڕێگە عەشق بووە قسەیەکی کردوەو لای حافظ زۆر جوان بووە، بۆیە لێرەدا دەڵێ چەندە جوان گوتی: بەشادی ڕوی کەسێکەوە بخۆرەوە کە سەفابەخش بێت، واتە بە شادی ڕوی کەسێکەوە برۆ نێو دونیای عەشق و حالات کە واقعا سەفا بەخش بێت و ئەهلی خۆشی و دڵخۆش بێت.

**٩-خسروا حافظ درگاه نشین فاتحه خواند**
**وز زبان توتمنّای دعایی دارد**

ئەی پادشا حافظی بەردەرگانشین فاتحەی خوێندەوەو تەمەننای دوعاو نزایەکیش لەزمانی تۆوە دەکات.

خیسروا: ئەی پادشا     درگانشین: لەبەر دەرگا دانیشتوو مەبەست لەبەندە یەك کە جێگەی بەردەرگایە نەوەك ناوکۆشك     تمنّا: تەمەنا، هیوا خواز

فاتحە خواند: سورەتی فاتحەی خوێند، کەبۆ پیرۆزی دەخوێنرێت هەرچەندە لە کلتوری ئاینیماندا هێندە لە سەرە مردوو، شتە لە دەست چووەکان دەخوێندرێت لەسەر هەبووەکان ناخوێنرێت.

دعا: دوعا، نزا، سودی پێی وایە ئەم (دعا) بەسەر کێشی هێنراوە ئەگەرنا لەئەسڵدا دەبێ (ئاین) بێت.

بێگومان الفاتحه کەسورەتی ئەلحەمدەو گەورەترین سورەتی قورئانە هەروەك ابو سعدی رافع کوڕی المعلی دەڵێ، پێغەمبەر (د.خ) پێی فەرموو (گەورەترین سورەتی ئایەتت فێرکەم

پێش ئەوەی لە مزگەوت دەربچین؟ پاشان دەستی گرتم، کاتێ ویستمان لەمزگەوت دەرچین گوتم ئەی پێغەمبەری خوا تۆ فەرموت: گەورەترین سورەتی قورئانت فێر دەکەم: فەرمووی: الحمد لله رب العالمین) ئەم سورەتە پیرۆزە بەر سبع المثانی — بەناوبانگ و لەنێو زەینی تەواوی موسڵمانەکاندا کاریگەرییەکی تەواوی هەیەو بۆ پیرۆزی و موبارەکی تەنانەت بۆ رۆحی مردووەکانیش دەخوێندرێت.



## غەزەلی سەد و بیست و چوار :

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی مەحزوف**
**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلن )**

**١- اگر نەبادە غم دل زیاد ما ببرد**
**نهیب حادثە بنیاد ما زجا ببرد**

ئەگەر شەراب غەمی دڵمان لەبیر نەباتەوە، هاواری ترسناکی روداوەکان بونیادی ئێمە لەجێ هەڵدەکەنێت.

زیادبردن: لەبیربردنەوە      نهیب: هاواری ترسناك، ترس و لەرز
حادثە : رووداو      بنیاد: بنچینە      زجابرد: لەجێ هەڵدەکەنێت

هاواری ترسناکی رووداوە جۆراوجۆرەکان یاخود ترسی رووداوی ئەو رووداوە جۆراوجۆرانەی کە رۆژانە رەنگە بەسەرماندا بێن وامان لێدەکات هەمیشە بیریان لێ بکەینەوەو لەنارەحەتیدا بژین تائەو رادەیەی کە رەنگە بە هیلاکدا بچین و لەریشەوە هەڵکێشرێین، دەبێ رێگا چارەیەك هەبێت بۆ دەربازبوون لەم هەموو ترس و ئەم بەباچوونەی تەمەنمان، خواجە رێگە چارەی ئەم حاڵەتە بەعەشق  بادە یاتەریقەت و خۆشویستنی ئەو معشوقە ئەزەلییەی سەرەوە دەزانێت و پێی وایە ئەگەر ئەوبادەوعەشقەی سەرەوە نەبێت کە غەمی دڵمان لەبیر دەباتەوە ترس لەرووداو یاخود هاواری ترسناکی رووداوەکان سەرگەردانم دەکات ولە رەگەوە هەڵمان دەکێشن.

**٢- وگر نەعقل بەمستی فروکشد لنگر**
**چگونە کشتی ازین ورطەی بلاببرد**

وئەگەر عەقڵ لەمەترسیدا لەنگەر نەگرێت، چۆن کەشتی لەم سەرگردانی بەڵاییە دەرکات (تێپەڕێنێ)

فروکشد لنگر: لنگەر بگرێت      چگونە: چۆن      ورطە: سەرگەردانی، نارەحەتی، گرفت، خەتەرناکی

ئەم غەزەلە لەترسناکی دونیاو فرت و فێڵ و داوەکانی و گرانی و خەتەرناکی رێگەی دەربازبوون لێی دەدوێت بەتایبەتی بەیتەکانی سەرەتا بەئاشکرا باسیان لێوە دەکات و بەباوەڕی هەمیشەیی خواجەش رێگەی تەمەن ونارەحەتی و کێشەو داوەخەتەرناکەکانی دونیا بە عەقڵ نابردرێ و پێویستە مرۆڤ هەمیشە پەنا بۆ عەشق و مەستی بهێنێتەوە، لێرەشدا لە خەتەرناکی

بەلاكانی نێودەریای رووداوەکانی دونیا دەدوێت و دەڵێ ئەگەر عەقڵ لەمەستیدا لەنگەر نەگرێ، واتە پشت بەعەشق مەستی نەبەستێ چۆن دەتوانێت ئەم کەشتیە لە گرفتی خەتەرناکەی روداوو بەلاکان بگوزەرێنێ و رزگاری بکات، دەیەوێ ئەوە بخاتە روو کە عەقڵ ناتوانێ رێگەی ژیان و تەمەن تەی کات و مرۆڤ لەم گێژاوە مەترسیی دارەی ژیاندا بەعەقڵ سەرکەوتوو نابێت، بەڵکو پێویستی بەعەشق و ئیمان هەیە.

**٣- فغان کە با همەکس غایبانە باخت فلك**

**کسی بنود کەدستی ازین دغا ببرد**

ئەی هاوار کە فەلەك بەشێوەکی نادیار لەگەڵ هەمووکەسێکدا یاری کردو کەسێ نەبوو کە دەستێ لەم دەغەڵەبباتەوە.

غایبانە: بەشێوەی نادیار، غایبانە غایبانە یاری کردنی شەترەنج و بەشێوەیە کە یاریزانەکە هەرلەسەرتاوە پشت لەبۆردی شەتەرنجەکە دەکات و کەسێك پێی دەڵێت و ئەویش بەکەسەکە دەڵێ ئەم داش بجولێنێ، ئەم جۆرە یاریکردنە زیرەکییەکی لەرادەبەدری دەوێ، چونکە دەبێ یاریزان هەموو جولانەکانی — لەسەرتاوە تاکۆتایی — لەزەیندا بێت.

بۆ ئەم لێکدانەوەیە سود لە د. هروی وەرگیراوەو بەرێزیشیان سودیان لە

١- نفیسی.. فرهنگ ٢- واژە نامەغزلهای حافظ، فری جم {د.هروی ج١ ل٥٤٥}.

باخت :یاری کرد دستی ببرد: دەستێکی لێ بباتەوە

دغا: دەغەڵ، نارێك و ناراست، فریوبازو تەڵەکەباز- بێگومان دەغەل پراوپڕی ماناکە نییە، بەلام لەکوردی چارەکەسەدەیەك پێشی ئێستادا بۆمرۆڤی خراپ و پیس بەکار دەهات و بەفارسیش بەکاردێ، بەلام بەواتای جیاواز.

وشەکانی ئەم بەیتە وشەی تایبەتی یاری شەترەنجی وەك — غایبانە، باخت، دست ببرد

خواجە یاری مرۆڤ و فەلەك یاچارەنوس بە یاریزانی شەترەج دەزانێت و ژیانیش یاریزان، بەلام چارەنوس یاریزانێکی نادیارەو هەمیشە بەنادیاری یاری لەگەڵ مرۆڤدا دەکات، بەلام ئەوەی جێگەی نیگەرانی شاعیرەو دادو هاواری دەوێت کەسێ نییە بۆتەنیا جارێك دەستێ یاری لەم دەغەڵە بباتەوە لەگەڵ ئەوەی کە بە شارەوایی / غایبانە یاری دەکات؛ واتە پشتی لەیاریەیەکەو کەسێك پێی دەڵێت و ئەوتەنیا فەرمان دەدا کە ئەم حاڵەتە لێزانینی و توانایەکی زۆری دەوێت.



لێرەدا حافظ دەسەلاتی گەردون/ جەبر دەخاتە روکە مرۆڤ هەرگیز ناتوانێ بەسەر چارەنووسی خۆیدا زاڵ ببێت، بەڵکو هەمیشە دەسەلاتی جەبری فەلەك لەسەرو هەموو ویست و تواناکانی مرۆڤەوەیە.

**٤- گذار برظلمات است خضر راهی کو**

**مباد کە آتش محرومی آب ما ببرد**

رێگە بە تاریکیدا تێدەپەرێت خضرێکی رێگە لەکۆییە نەوەك ئاگری بێ بەش بوون ئابرومان ببات.

گذار: رێگەی تێپەرین، گوزەر ظلمات: تاریکی محرومی: مەحروم بون ب بەش بون

آب: ئابرو

(خضر) خدری زیندەیە، لە بەیتەکەوە دەردەکەوێت کە پەیوەندی هەیە لە نێوان خدرو رێنمایی کەری رێگەدا. د. خرمشاهی سەبارەت بەخدر لەتێروانینی سۆفی و عارفەکاندا نووسیویەتی: (خدر لای سۆفیەکان خاوەن رێزێکی زۆرەو ئەو بەوەلی و تەریقەت دەژمێرن)..

لای عارفەکان موسا رەمزی عەقڵ و خدر رەمزی عەشقە، هەروەها رەگی خضر لە سەوزاییەوە هاتووە گوایەلە هەرشوێنێکدا دانیشتووە سەوزبووە و جیاوازی نێوان خدرو ئەسکەندەر لەوەدایە کە خدر لە تاریکیدا سەرچاوەی ئاوی ژیانی نەمری دۆزییەوە {ج١ ل٥٣٢ — ٥٣٤ خرمشاهی}

بۆیە جێگەی خۆیەتی کەببێتە رێنومای رێبوارانی تەریقەت.

حافظ ئەم سیفەتەی (رێنومایی کەر.. رێ پیشاندەر) ی خدری زیندوی بەرچاوگرتووە و دەڵێ: گوزەرو رێگەی تێپەرین بەتاریکدایە خدرێك لەکوێیە کەببێتە رێنیشاندەرمان، نەوەك ئاگری مەحرومی لەگەیشتن ئابرومان ببات.

بێگومان رێگەی نێوتاریکی و ترسناك رێگەی پڕمەترسی عەشقە، خواجە دەڵێ: لەم رێگە تاریك و ترسناکەی عەشقدا خدرێك/ پیرێکی ئەزموندار لەکۆییەکە رێمان پیشان بدات و بمانگەیەنێتە مەنزڵ.

چونکە ئەگەر وانەبێ ترسی ئەوە هەیە نەگەینە مەنزڵ (یار یاخود حەقیقەت) و مەحروم یاخود بێ بەشبونیش لەمە وەك ئاگر ئابروومان بسوتێنێ و ئابروومان ببات.

لەم بەیتەوە دەگەینە ئەوراستییەی کە هەرچەندە خواجە شێخ و پیری نەبووە، بەلام بڕوای بەبوونی شێخ و پیر هەیە هەروەك لەجێگەیەکەدا دەڵێ:

**قطع این مرحله بی همرهی خضر مکن**

**ظلماتست بترس از خطر گراهی**

هەروەها گەیشتن بەمەنزڵ لای خواجە زۆر گرنگەو نەگەیشتن بەئابرووچوون دەزانێت.

لەسەر بنەمای هەر ئەم بروایەی حافظیشە کە د. سروش عەشقی حافظ بەعەشقێکی مەسڵحەت ئامێز بەرژەوەندی خوازانە دەزانێت (د. سروش قماری عاشقانە) نەوەك عەشقێك کەتەنیا لەبەر خاتری مەعشوق بێت بەبێ بیرکردنەوە لەسەر کەوتن یاخود شکست.

**٥- دل ضعیفنم از آن می کشد به طرف چمن**

**که جان زمرگ بەبیماری صبا ببرد**

دڵی لاوازم بۆیە پەلکێشی چیمەن دەبێت تاوەکو بەبیماری سروە گیان لە مەرگ دەرکات

ازآن: لەبەرئەوە، بۆیە     می‌کشد: پەلکێش دەبێت، ئارەزوو دەکات     به طرف: بەرەو

بیماری صبا: بیماری سروە / سەبا     بیماری یانەخۆشی سروە و شەماڵ لەوەدایە کە سروە وەك نەخۆش لەسەر خۆو هێواش دەڕوات، یاخود ماوەیەك دەڕوات و پشویەك دەدات.

بیماری سروە بەگشتی مەبەست لە هەڵکردنی هێواش و نەرمی سروەیا شەماڵە.

جان بردن: گیان دەرکردن، گیان رزگارکردن.

بەزۆری سروە و شەماڵ لەچیمەن و باغدا سەفا بەخشە، یاخود هەڵدەکات، خواجەش لەوەوە دەڵێ: بۆیە دڵی لاوازم حەزی لێیە رو لە گوڵزار بکات و پەلکێشی ئەوێ دەبێت بەوهیوایەیە کە بەهۆی هەڵکردنی هێواشی سروەو سەباوە گیان لەمەرگ رزگار بکات و ئاهێکی بەبەردا بێتەوە. دەکرێ پەیوەندی سەباو گیان بەبەردا هاتنەوەی شاعیر لەوەدا بێت کە سەبا هەواڵی یا بۆنی یاری پێیەو بە هەڵکردنی ئەوهەواڵە یابۆنە بەخواجە دەگات و گیانی لەمەرگ رزگار دەکات.

**٦- طبیب عشق منم بادە خور کەاین معجون**

**فراغت آرد و اندیشەی خطا ببرد**

پزیشکی عەشق منم، شەراب بخۆرەوە، چونکە ئەم دەرمانە ئاسودەیی دەهێنێت و بیری هەڵە دەبات.

معجون: دەرمانی گیراوەو تێکەڵاوکراوی چەند ماوەیەك درکەیە لە دەرمانی کاریگەرو شیفا بەخش

فراغت: آسودەیی     آرد: دەهێنێ     خطا: هەڵە



خواجە دەڵێ من پزیشکی عەشقم و چاك دەزانم لەرێگەی عەشقدا چ دەرمانێك بۆ دەردی عەشق چاکە، بۆیە ئامۆژگاریت دەکەم و پێت دەڵێم مەی بنۆشە، چونکە ئەم دەرمانە شیفا بەخشە (مەی) ئاسودە بەخشەو بیری خراپ و هەڵەلەمێشکی مرۆڤدا دەردەکات، بێگومان یادەوەری عەشقەو وخواجە ئامۆژگاری مرۆڤ دەکات کەرێگەی عەشقی مەعشوقی ئەزەلی بگرنەبەر تاوەکو ئاسودەبن.

**٧- بسوخت حافظ و کس حال اوبە یار نگفت**

**مگرنسیم پیامی خدای را ببرد**

حافظ سوتاو کەس حاڵی ئەوی بەیار نەگوت مەگەر سروە لەرێی خوا پەیامێکی بۆببات.

خدارا: لەرێ خوا، لەبەر خاتری خوا

خواجە دەڵێ من لەدوری یار سوتاوم، بەڵام کەس نەبوو حاڵی سوتانم بەیار بڵێ، مەگەر سروە/ شەماڵ هەڵکات و لەرێی خوا هەواڵێکی ئەم سوتان و نارەحەتیەم بۆیار ببات.

## غەزەلی سەد و بیست و پێنجەم :

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی مەحزوف**

**( فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن)**

**١- نیست درشهر نگاری که دل مابرد**

**بختم ار یار شود رختم از ینجا ببرد**

نیگارێك نییە لە شاردا كە دڵی ئێمە ببات، ئەگەر بەخت هاوڕێم بێت بارو بنەم لێرە دەبات.

نیگار: یەكێكە لەناوەكانی یار، نەخش و نیگار

دل مابرد: دڵی ئێمە ببات، دڵی ئێمە برفێنن

رختم: بارگەوبنە، باری سەفەر

شاعیر لەوشارەی خۆیدا هیچ یارێك سەرنجی ڕاناكێشێت و دڵی نارفێنێ، بۆیە لێـی بێـزارەو دەڵێ ئەگەر بەخت هاوڕێ و یارم بێت بارگەوبنەم تێك دەنێـت و لێـرە دەمبـات، واتـە ئەگـەر بەختم هەبێت بارگەو بنەی سەفەر تێكدەنێم و ئەم شارە بەجێ دەهێڵم.

**٢- كو حریفی كَش سرمست كه پیش كرمش**

**عــاشق سوخته دل نـــام تمنّا ببرد**

كوا هاودەمێكی شادان و سەرمەست كە عاشقی دڵسوتاو لەبـەردەم كەرەمیـدا نـاوی تەمـەننا ببات.

حریف: هاودەم، دۆست كش (كـیش) : جـوان، دڵپەسـەند شـادان و نـازدار

كرمش: كەرەمی سوختەدل : دڵ سوتاو

مرۆڤ ناتوانێ داوا و تەمەنا لەهەموو كەسێك بكات، ئەوشارەی كەخواجە حەزدەكات لێـی دەرچێت و نیگارێكی تێدانییە كەشایانی ئەوە بێت مرۆڤ دڵی پێ بدات ئەو عەیبەشی هەیەكـە هاودەمێكی وای تێدا دەست ناكەوێت، هەربۆیە دەڵێ: كوا هاودەمێكی شادان و سەرمەست كە هێندە خاوەن كەرم و بەخشندەیی بێت عاشقی دڵ سوتاو باسی داوا و تەمەنا بكات و شـتێكی لێ بخوازێت.

**٣- باغبانا زخزان بی خبرت می‌بینم**

**آه ازآن روز كه بارت گل رعنا ببرد**

ئەی باخەوان دەبینم لەخەزان بێ خەبەری ئای لەو رۆژەی كە باگوڵی رەعنات دەبات.



از آن روز: لەو رۆژەی رعنا: جوان، خۆپەسەند، ناوی گوڵێكی دوو رەنگەكە نـاوەوەی سورو دەرەوەی زەردە

خواجە باخەوان — كاربەدەستان — مرۆڤ لە سەرجەمی دونیا ئاگادار دەكاتـەوە لـەوەی كـە لەدەستیاندایەو شانازی پێوەدەكەن، بۆ نموونە بەباخەوان دەڵێ: دەتبینـم لەمـەرگ/ خـەزان بـێ ئاگایـت و شـانازی بەگوڵـە جوانەكانتـەوە دەكـەیت لـەورۆژە دەترسـم كـەخزان دێـت گوڵـە رەعناكانت/ جوانەكانەت دەژاكێنێ و دەیانوەرێنێ.

**٤-رهزن دهر نخفتست مشو ایمن ازو**

**اگر امروز نبردست كەفردا ببرد**

رۆژگاری رێگر نەخەوتوە لێی ئەمین مەبە ئەگەر ئەمرۆ نەیبردووە بەیانی دەیبات

رهزن/ راهزن: رێگر، دزی رێگە، تالانكەر نخفتست: نەخەوتووە مشو: مەبە

نبردست: نەیبردووە فردا: بەیانی

ئاگاداركردنەوەكەی بەیتی پێشوو درێـژەی پێـدراوەو بەباخـەوان دەڵـێ: رۆژگـار كـە وەك تالانكەرو رێگرێك وایە نەخەوتووە و لێی دڵنیامەبـە، چـونكە ئەگـەر ئـەمرۆ دزی یـا تـاڵانی نەكردویت بەیانی تالانت دەكات.

لەم دووبەیتەدا هەست بە سێبەری (مەرگ) و ترسی مەرگ و تـەواوبوونی ژیـان دەكـەین و خواجە لەوترسەوە ئەم ئاگادارییە جدیە دەدات.

**٥- درخیال این همه لعبت بەهوس می‌بازم**

**بوكه صاحب نظرعی نام تماشا ببرد**

لەخەیاڵی خۆمدا بەئارەزوی خۆم یاری بەم هەمووە بوكەڵەیە دەكەم، بڵێی خاون تێروانینێك ناوی تەماشا ببات.

لعبت: بوكەڵە، بوكە شوشە می‌بازم: یاری دەكەم بوكە، بود كە : بڵێی ببـێ

نام تماشا ببرد: ناوی تەماشا ببات، باسی تەماشا بكات، بۆتەماشاكردن بانگم بكات

خواجە باس لەو جیاوازییە دەكات كەلـەنێوان نـاخ و دەرونـی مـرۆڤ و دەرەوەو جیهـانی واقیعدا هەیە.

ئەودەڵێ: هەرچەندە من بەخەیاڵ و لەنێو خۆمدا ئەم هەمەوو بوكەڵە/ یارە خەیاڵییەم هەیەو بەئارەزووی خۆم یارییان لەگەڵدادەكەم، بەڵام لەجیهانی دەرەوەمدا شتێ نییـە نـاوی تەماشـاو سەیركردن بێت. بڵێی خـاوەن راوتێـروانینی باسـی ئـەم تەماشـا و سـەیركردنە بكـات و مـن بەدیداری بوكەڵەكانی نێو خەیاڵم / یار شادببم.

سودی ئەم دێڕە بە داننان بەتواناى شیعری خواجە خۆیدا لێكدەداتەوەو وایە حافظ دەڵێ من ئەم هەموو شیعرە بەخەیاڵ دەڵێم، بەیتی ڕێك و پێك دادەنێنم، ڕەنگە ڕۆژێ خاوەن رایەك تەماشایان بکات.

بەڵام ئەم بەیتە هەر ئەو خەیاڵەیە کە شاعیرلە دێرینەکان هەیان بوو، چونکە بەراستی یارەکانی ئەوان هەر بوکەڵە خەیاڵیەکانی خۆیان بوون، ڕەنگە ئەم دێڕەی نالی چاکترین نموونە بێت کە دەڵێ :

**تۆکە حۆری ورە نێو جەنەتی دیدەم چ دەکەی**

**لەم دڵەی پڕ شەرەو سینەی سۆزانمدا**

**٦- علم و فضلی کە بەچل سال دلم جمع آورد**

**تـرسم آن نرگس مستانە بە یغمـا ببرد**

ئەوزانست و فەزڵەی کە دڵم بەچل ساڵ کۆی کردەوە، دەترسم ئەونێرگزە مەستانە بەتاڵان بیبات

فضل: مەعریفەت، فەزڵ، کەماڵ      جمع آورد: کۆی کردەوە    بەیغما ببرد: تاڵانی کات

لەراستیدا هەرچەندە شاعیر لێرەدا دەڵێ دەترسم چاوی مەستی یار زانست و مەعریفەتی چل ساڵەی دڵم تاڵان کات و گیرۆدەی جوانی بکات؛ واتە دەترسم جوانی یار دارو نەداری زانستم تاڵانکات و بمخاتە سەر ڕێگەی عەشق و تەریقەت، بەڵام لەناخدا تەمەنناى ئەوحاڵەتە دەکات و ئەم ترسە وەك گومان یاخود جۆرە دڵنیاییەك خراوەتە روو بۆ نموونە کە دەگوترێت دەترسم فلانەکەس نەیەت جۆرێك دڵنیایی لەنەهاتنی کەسەکەی نەوەك ترس لێی،خواجەش کە مەفتونی جوانییەکانی یاری ئەزەلی و نێرگزە مەستەکانی بووە جۆرە دڵنیاییەکە کە ئەم نێرگزە مەستانە دەسکەوتە زانستییەکانی تاڵان دەکات.

**٧- بانگ گاوی چەصدا بازدهد عشوە فخر**

**سامری کیست کەدست ازید بیضا ببرد**

بانگی مانگایەك چ دەنگدانەوەیکی هەبێت، فریوی مەکرِ مەخۆ، سامری کێیە کە یاریی لە دەستی سپی نورین بباتەوە

گاو: مانگا      صدا: دەنگدانەوە      فخر: مەکرِە    عشوەمخر: مەخەڵەتێ، فریو مەخۆ

دست بردن: لێ بردنەوە، پێش دانەوە، یاری بردنەوە

ید: دەست      ید بیضا : دەستی سپی نوورین، دەستی سپی، مەبەست لە دووەم موعجیزەی حەزرەتی موسایە (د.خ) کە دەستی دەکرد بەنێو جلەکانیداو کاتێ دەری



دەهێنایەوە سپییەکی نورانی تیشکدەر بو ئەڵبەت مەعجیزەی یەکەمی ئەوەبوو کە گۆچانەکەی بەفەرمانی خوا دەبووە مار. " وَنَزَعَ يَدَهُ فَاذا هِيَ بَيْضاءُ للنّـاظِرينَ" {سورەی اعراف ئایەتی ١٠٨}

سامری : ئەو پیاوە مانگا پەرستەبوو کە لەپاش ئەوەی کەیهودیەکان لەدەستی فیرعەون رزگاریان بوو حەزرەتی موسا چوو بۆ دیداری خودا، و ئەو یهودیەکانی هەڵخەڵەتاندو گوێرەکەیەکی لەزێڕ بۆدروستکردن کە بەشێوەیەك بوو کاتێك هەوا بەنێوانیدا تێدەپەڕێ دەنگێکی لێوە دەهات، یهودیەکانیش – کەمێکیان نەبێت – شوێنی کەوتن و دەستیان کردەپەرستنی مانگاکە هتد...

ئەوی جێگەی ئاماژەیەی کارەکەی سامری فێڵ و تەڵەکەبازی و فریوکاری بوو، بەڵام کارەکانی حەزرەتی موسا (د.خ) موعجیزەو پەرتوی خودایی بوون و دووربوون لەفریوکاری و هەمیشەش حەق بەسەر فریوو فریوکاریدا باڵادەست دەبێت، خواجەش دەڵێت: فریوکاری لە بەرامبەر حەقدا هەرگیز ئەنجامی نابێت و ناتوانێت لە بەرامبەریدا راوەستێ و هیچی پێ ناکرێت، فریویان مەخۆ هەروەك چۆن سامری تەڵەکەباز نەیتوانی تاکۆتایی لە بەرامبەر هێزی چاکەو حەقی موسادا کەدەستی سپی نورانی بوو خۆی ڕاگرێت.

"لەوەودا موسا خۆی گەیاند کێوی طور، خوای گەورە لێی پرسی : ئەی موسا بۆچی تۆپەلەت کرد وقەومەکەت بەجێ هێشت. موسا وتی : ئەوان لەسەرڕێبازی من دەڕۆن، (بەڵام من ئارەزوومەندی گفتوگۆت بووم )بۆیە بەپەلە هاتم تاتۆئەی پەروەردگارم لێم رازی بیت. پەروەردگارفەرمووی : بێگومان ئێمە قەومەکەتمان لەدوای هاتنی تۆتاقیکردەوە کەچی سەرکەوتوونەبوون، باوەڕدامەزراونەبوون کابرای سامری گومڕای کردن. پاشان موسا گەڕایەوە بۆناوقەومەکەی، بەتووڕەیی وداخ وخەفەتێکی زۆرەوە، وتی: ئەی قەومەکەم،مەگە پەروەردگارتان بەڵێنی سەرفرازیتان لەدنیا وقیامەتدانەدابوونێ ئایا ئەوبەڵێن وپەیمانە زۆری پێچووە؟ یاخودویستتان خەشم وقین لەلایەن پەروەردگارتانەوە داباڕێت بەسەرتاندا، بۆیە ئیتر ئێوە ئەو بەڵێنەی دابووتان بەمن کەپابەندی یەکخواناسی بن؟! ئەتان بردەسەر..... {جۆزئی شانزدەهەم سورەتی (طه) ئایاتی ٨٣ تا ٨٦ تفسیری ئاسان }. موساڕووی کردەسامری وتی : ئەم کارەخەتەرناکە چی یە کەئەنجامت داوە؟ سامری وتی : ئەوەی من بینیم،ئەوان نەیانبینی، من مشتێکم لە شوێن پێی (ئەسپەکەی) جوبرەئیل هەڵگرت وفڕێمدایە ناوپەیکەرەکەوە،بەو شێوەیە نەفسی بەدکردارم ئەوکارەی پێکردم (کە قەومەکەت فرێو بدەم ). موسا بە سامری وت

دەبڕۆ تاماوی لەژیاندا هەرکەسێك نزیکت کەوتەوە دەبێت بڵێیت : بەهیچ شێوەیەك بەریەککەوتن نی یە (هەرکەس لێ نزیك بیتەوە تۆشی ئازارێکی زۆربووە)".

{جۆزئی شانزدەهەم سورەتی (طه) ئایاتی ٩٥ تا ٩٧ تفسیری ئاسان } .

**٨- جام مینائی می سدّ ره تنگدلیست**

**منه ازدست كه سيل غمت ازجابيرد**

پێکی ڕەنگاورەنگی مینایی مەی بەربەستی ڕێگەی دڵتەنگییە لەدەست دایمەنێ وەگەرنا لافاوی غەم دەتبات

مینا: شوشەی ڕەنگاورەنگی ڕازاوە یاسەوز باوەو بۆجوانکاری بەکاردێت، مینائی: مینایی، پیرۆزەیی سدّ: ڕێگر، بەربەستی منه ازدست: لە دەست دایمەنێ

ازجابرد: هەڵتدەکەنێ، دەیبات

وەك هەموو جارێکی دیکە خواجە عەشق / مەی بە ڕێگەی رزگاری لە غەم و دڵتەنگی و نارحەتی دەزانێت لێرەشدا بەدەربرینێکی دیکە ئەو بۆچوونە دووبارە دەکاتەوە

پێکی ڕازاوەو پیرۆزیی شەراب و عەشقی ئەزەلی وەك بەربەستی سەرێگەی دڵتەنگی وایە کەبەدەستی وەبوو، واتەکە لە ڕێگەی عەشقدا بوویت لەدڵتەنگی پارێزراوی، هەربۆیە پێمان دەڵێ ئەوپێکە دامەنێ، چونکە کەداتنا ئەوبەرستە نامێنێت و غەم وەك لافاو دێت و هەڵت دەکەنێ و دەتبات.

**٩- راه عشق ارچه كمين گاه كمانداران است**

**هركه دانسته رود صرفه از اعدا ببرد**

ڕێگەی عەشق ئەگەرچی شوێنی کەمینی تیرئەندزانە، هەرکەس بەئاگاییەوە بڕوات بەسەر دوژمناندا زاڵ دەبێ.

ارچه: گەرچی كيمين گاه: شوێنی کەمین دانان کمانداران: تیرئەندازان، کەوان بەدەستان دانسته: بەئاگاییەوە، رود/ برود: بڕوات صرفه: فایدە

اعدا: دوژمنان کۆی (عدو)ە صرفه ازاعدا ببرد: بەسەر دوژمناندا زاڵ دەبێ، لەدوژمنان دەباتەوە.

بەیتی پێشوو جۆرە دژایەتیەك لەبیری خواجەدا دروست دەکات، ئەویش باسکردنی ڕێگەی عەشقە بەبێ نارەحەتی و بەربەستەکانی نێوخودی ڕێگاکە، ڕاستە هەمیشە عیشق فەریادرەسە بەڵام ئەوفریادرەسە هەمیشە لێواو لێوە لە نارەحەتی و کەمین. لێرەدا ئەوباوەڕەی خۆی تەواو



دەکاتەوە کە بەڵێ عیشق فەریادرەسە بەڵام گرفتیشی زۆرەو پڕە لە کەمین و لەگەڵ ئەمەشدا هەررێگەی گەیشتن بەئامانجەو ئاگایی و لێزانینی دەوێت، ئەو لەم بەیتەدا دەڵێ:

گەرچی ڕێگەی عەشق پراوپڕە لەشوێنی خۆمەڵاس دان و کەمین گرتنی تیرئەندازان بۆ لەپێخستنی ڕێبواران، بەڵام هەرکەس بەئاگایی و هۆشیارییەوە هەنگاوبنێت سەرکەوتوو دەبێت و لەدوژمنەکانی دەباتەوە.

وەسیەت و ئامۆژگاری حافظ لەم بەیتەدا ئەوەیە کە لەرێگەی عەشقدا هۆشیار بین و بەبێ ئاگایی هەنگاو هەڵنەگرین.

**١٠- حافظ ارجان طلبند غمزەی مستانەی یار**

**خانه ازغير بپرداز و بهل تابيرد**

حافظ ئەگەر غەمزەی مەستانەی یار داوای گیان بکات، ماڵ لە نامۆ چۆڵکەو بهێڵە تابیبات.

طلبد: داوای بکات بپرداز: چۆڵ کە بهل: بهێڵە، وازبهێنە

بەرای بەندە ئەم بەیتە یەکێکە لە بەیتە عیرفانە بڵندەکانی خواجە، ئەو دەڵێ ئەی حافظ ئەگەر غەمزەی مەستانەی یار داوای گیانتی کرد یەکەم جار ماڵەکەی بۆچۆڵ بکەو هەرچی نامۆ هەیە دەری بکە؛ واتە: ماڵی دڵت لە نامۆکان چۆڵکەو هەرچی نامۆوبێگانە هەیە جگە لە یار لەماڵی دڵتدا بکەدەرێ کە پاشان وازبێنەو تابەئارەزووی خۆی گیانت ببات.

لەراستیدا، بەیتەکە لەمەزیاتر پێویستی بەشەرحکردنی نییەو زیاتر قسەی دڵ و دۆستانەی تێدایە کە دەبێ دڵێکی دۆستانە دەرکیان بکات.

## غەزەلی سەد و بیست شەش:

**بەحری هەزەجی شەشی مەقسور**

**(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیل)**

**١- سحر بلبل حکایت با صبا کرد**

**که عشق روی گل با ما چها کرد**

سەحەربولبول حەکایەت باصەبا کەرد، کە عیشق رویێ گول با ما چەها کەرد

کاتی سپێدە بولبول بۆسەبای گێرایەوە کە (زانیت) عیشقی روی گوڵ چی بەئێمە کرد

سحر: سپێدە: بەرەبەیان          باماچها کرد: چی لەگەڵ ئێمە کرد، چی پێ کردین

لەکاتی بەرەبەیاندا بولبول هاورازێکی خۆی پەیدا کردوەو دەیەوێ رازی دڵی خۆی لابکاتەوەو بۆ سروەی دەگێرێتەوە کەدەزانی عەشقی روی دۆست چی لەگەڵ کردین یا چی پێ کردین.

**٢- ازآن رنگ رخم خون در دل انداخت**

**وزین گلشن بەخارم مبتلا کرد**

لەو روخسارە سورو ئاڵەی دڵی پر لە خوێن کردم و لەم گوڵشەن و گوڵزارەشی منی گیرۆدەی درك کرد.

از آن: لەو          خون دردل انداخت: دڵی پڕ لە خوێن کردم، گرفتاری کردم          خار: درك

تەواوکەری بەیتی یەکەمەو قسەو باسی بولبولە لەبارەی گوڵەوە کە بۆ سروەی دەگێرێتەوەو دەڵێ: ئەزانی چی پێ کردم لەرەنگی سورو ئاڵی دڵی گرفتار کردم و دڵی پرکردم لەخوێن و لەم گوڵزارەشیدا تەنیا گیرۆدەی درك کرد؛ واتە لە جوانی و لەگوڵزاری من نیگەرانی و درك بووەتە بەشم، ئەم بەیتە شکاتی عاشقانە لە مەعشوق کە هەمیشە نیگەرانی و درك دەکاتە بەشی ئەمان.

**٣- غلام همّت آن نازنینم**

**کەکار خیر بی روی و ریاکرد**

غولامی هیمەتی ئەو نازدارەم کەکاری خێری بێ ریاو رونامایی کرد.

روی ریا: ریاورونامایی

دەکرێ ئەم بەیتە لەقسەکانی بولبول بێت و لەگەڵ دووبەیتی پێشودا لێکدرێتەوەو بولبول خۆی بکاتە قوربانی عاشقی نازدار کەهێندە بەهیمەتی نازداری خێری خۆی بی ریاورونامایی



ئەنجامدا لێرەشدا بەم جۆرە بەناراستەوخۆ دەڵێ گوڵ/ عاشق زۆربێ وەفا بوو بەرامبەر من و ئەم بێ وەفایی و دڵ رەقیەشی بەئاشکراو بەبێ ریاکرد.

یاخود دەکرێ ئەم بەیتە جیاواز لە دووبەیتی دیکە لێکدرێتەوەو شاعیر خۆی بکاتە قوربانی هیمەتی یاری حەق کە کارەجوانەکانی بۆ ریاو رونامایی ناکات، بەڵکو لەناخیەوە سەرچاوەی دەگرێت و لەپاکی خۆیەوە دێتە دەرێ.

**٤- من از بیگـــانگـــان دیگر ننـالم**

**که با من هرچه کرد آن آشناکرد**

من لە بێگانەکانی دیکە نانالێم، چونکە هەرچی بەسەرمندا هاتووە ئەو ئاشنایە کردوویەتی.

بیگانگان: بێگانەکان     ننالم: نانالێم

دیسانەوە دەتوانرێ ئەم بەیتەش بەقسەی بولبول بدرێتە قەڵەم و شکاتی ئەوبێت لەگوڵ کەدەڵێ هەرچی ستەم لەمن کراوە ئەویارە ئاشنایەکردوویەتی و لەدەستی نامۆو بێگانەکانی دیکە نانالێم، بەڵکو لەدەستی دۆستەوە دەناڵم.

بەڵام ئەم درێژەدانە بەشکاتی عاشق لەمەعشوق زۆربەکەمی لەحافظ دا بەرچاو دەکەوێت، بۆیە لێرەدا واجوانترە کە (من) بەهەر عاشقێکی دیکە بدەینە قەڵەم کە لەلایەن مەعشوقەوە ستەم و دڵرەقی دەرحەق دەکرێ.

**٥-گر از سلطان طمع کردم خطا بود**

**ور از دلبر وفــاجستم جفــا کرد**

ئەگەر بە تەمای شتی سوڵتان بووم هەڵەبووم، ئەگەر لەدولبەر ئومیدی وەفام بوو ستەمی لێکردم.

خطابود : هەڵەبوو     جستم: ویستم، بەتەمابووم     جفا: ستەم

خواجە لێرەدا هەرجۆرە داواکردن و بەتەمابوونی داواکردن لەپاشاو سوڵتان بەهەڵە دەزانێت و پێی وایە هەڵەیە گەر مرۆڤ بەتەمای شت بێ لە پاشاو سوڵتان، دیسانەوە نابێ بەئومێدی وەفاش بین لە دولبەر چونکە ئەویش هەمیشە ستەمان دەرحەق دەکات.

**٦-خوشش باد آن نسیم صبحگاهی**

**که درد شب شــینان را دواکرد**

شاد بێت ئەو سروەیەی بەیانیان کە دەردی شەوبێدارانی دەوا کرد.

خوشش باد: خۆشبێت، شادبێت     شب شینان: شەوبێداران ئەوکەسانەی کــە شــەوناخەون و خەریکی یادو زیکردن دواکرد: دەواکردن تیمار کرد

خواجە ستایشی سروەی بەیان دەکات کە هەڵدەکات و دەردی شــەوبێداران تیمــار دەکــات، ئەوپێی وایە کە شەوبێداران مرۆڤی گەورەو بەهادارن و مادام سروە دەردی ئەوان تیمار دەکـات ئەوا شایانی ستایش کردنن.

**٧- نقاب گل کشید وزلف سنبل**

**گــره بند قبای غنچه واکرد**

پەچەی گوڵی لاداو پرچی سونبول، گرێی بەندی قەبای خونچەی کردەوە.

نقاب: پەچە  گرە: گرێ        واکرد: کردەوە

خواجە لەسەر ئەم چەند کارەی ستایشی سروەی بــەیان دەکــات و بــەم کارانــە کــەدەرمانی دەردی عاشقانی شەوبێداری کردووە، یەکێك لەوانە پەچەو پەردەی سەر روخــساری گــوڵی لاداو گوڵی بۆ عاشقانی شەوبێدار دەرخست و پرچی سونبولیشی لادا، هەروەها گــرێ بەنــدی قــەباو کراسی داخراوی خونچەی کردەوەوە خونچە پشکوت.

بەشێوەیەکی دیکە خواجە ستایــشی ســروە دەکــات کەبووەتــە مایــەی پــشکوتنی گــوڵ و دەرکەوتنی مەعشوق بۆشەوبێداران و تیمارکردنی دەردی ئەوان.

**٨- به هرسو بلبل عاشق درافغان**

**تنعّم ازمیان بـــاد صبا کرد**

بولبولی عاشق بەدادو هــاوار بەهەمەوولایەکــدا دەرِواو لــەم نێوانــەدا بــای ســەبایە کــە بەخۆشی دەژی.

بەهرسو: بەهەمەولایەکدا  تنعّم: بەنازو خۆشی ژیان

بولبول هەمیشە دوورە لە مەعشوق، بەڵام سروەی بەیان هەمیشە یاری بەپرچی مەعشوق / گوڵ دەکات، بۆیە بولبول هەمیشە بەگریان و هاوارەوە بەهەمەوولایەکدا دەروات بەڵام بای سەبا بەخۆشی دەژی لەبەرئەوەی  هەمووکات لە یارەوە نزیکــە، لێــرەدا خواجــە نزیــك لەمەعــشوق بەمەرجی خۆشی ژیان دادەنێ.

**٩- وفــا از خواجگان شهر بـــامن**

**کمــال دولت و دین بوالوفا کرد**

لەگەورەکانی شار کەمالالدین ابوالوفایە کە لەگەڵ مندا خۆشەویستی و وەفاداری کردووە.

خواجە: گەورە      بوالوفا: خواجە کمال الدین سید ابوالوفای شیرازی



بەیتەکە بەئاشکرا ستایشی خواجە کمال الدین ابو الوفای شیرازی دەکات کە لەگەڵ خواجــە حافظ دا وەفادار بووە.

**١٠- بشــارت بــر بــەکــوی می فروشان**

**که حافظ تــوبـــه از زهد ریــاکرد**

مژدە بۆ کۆڵانی مەیفرۆشان کە حافظ تۆبەی لە زوهدی ریاکاری کرد.

بشارت : مژدە

خواجە مژدە بە ئەهلی مەیفرۆشان وبەعاشقانی راســتەقینە دەدات کــە حــافظ تۆبــەی لــە زوهدی درۆزنانە کردووە و دێتە نێوریزەکانی ئێوەوەو ئەویش دەبێتە عاشقێکی راستەقینە.

## غەزەلی سەد و بیست وحەوتەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی ئەسلەمی موسبەغ**
**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع لان)**

**١- بیاکه ترک فلک،خوان روزه غارت کرد**
**هلال عید به دور قدح اشاره کرد**

وەرەکە تورکی فەلەك سفرەی رۆژووی تالآن کردو مانگی دەمەواسی جەژن ئاماژەی بەهیلال ولێواری دەوری پێك کرد.

ترك: تورك   خوان: سفره   روزه: رۆژو   غارت کرد: تالآن کرد   قدح: پێك
هلال: مانگی دەمەداسی، مانگە یەکشەوە

پەیوەندی نێوان تورك و تالآن کردنی سفرە بۆ ئەو دابونەریتە دەگەرێتەوە کە سفرە بە تایبەتی سفرەی بەربانگ تالآن کراو غولامە تورکەکانیش لەم کارەدا دەست پێشخەربوون، سودی دانەپالّی ئەم سیفەتە بۆتورك بۆ ئەو پەیوەندییە مێژووییەی نێوان تورك و تالآنکاری و داگیرکاری ئەوان دەگێرێتەوە نەوەك دابونەریت سفرە تالآن کردن. سودی ج٢ ل٨١٠.

بەیتەکە ئاماژە بە کۆتایی هاتنی مانگی رەمەزان دەکات کە خواجە ئەم کۆتایی هاتنەی بۆ مەسەلە قوولّە عیرفانیەکان توسیف کردووەو لەمەشەوە لەحەقیقەتی رۆژو حەج دەدوێت، لێرەدا حافظ عاشقان و عارفان بۆ عەشق داوەت دەکات ئەمەش دروست لەکاتێکدا سەردەمی عیبادەتی عەوامەکان بەرەوکزی دەچێت، چونکە عەوامەکان هێندە لە رەمەزاندا عیبادەت دەکەن لەمانگەکانی دیکەدا خۆیان خەریك ناکەن، ئەو بەعاشق/ عارف دەلّێ وەرە، چونکە گەردوون وەك تورکێکی تالآنکەر سفرەی رۆژوی تالآنکردوو کۆتایی بەمانگی رەمەزان هێناو مانگی یەکشەوە لەرۆژئاواوە دەرکەوت و ئەم مانگە دەمداسەی جەژن ئاماژەی بەلێواری پەرداخ و پێك یاخود ئاماژەی بەدەوری پێك گێراوە، دەلّێ ئەی عاشقەکان وەرن ئیدی کاتی عەشقی حەقیقییەو عاشقی راستی لێرە بەدواوە دەردەکەوێت، چونکە لەمانگی رەمەزاندا هەمووان مەشغولی عیبادەت بوون.

د. هروی سەبارەت بە (ترك فلك) لێکدانەوەیەکی دیکەی نووسیوە و دەلّێ ترك کە ئەدەبیاتی فارسیدا بەواتای خۆشەویستی جوان دێت، بەوەش کە مانگ رەمزی جوانییە، ترك فلك بەواتای جوانی ئاسمان دێت؛ واتە مانگی جوانی ئاسمان کۆتایی بەرمەزان هێنا.{ج١ د.هروی ل ٥٥٦}.



**٢- ثواب روزه و حجّ قبول آن کس برد**
**که خاك میکدة عشق را زیارت کرد**

پاداشتی رۆژووحەجی قەبولّ ئەوکەسە بردی کە زیارەتی خاکی مەیخانەی عەشقی کرد.

ثواب: پاداشت   زیارت کرد: زیارەتی کرد، سەردانی کردنێك کە بە پیرۆز بزانرێت.

لێرەدا شاعیر بەروون و ئاشکرا جەخت لەسەر بروای هەمیشەیی خۆی دەکاتەوە کە پێی وایە عەشق و خۆشەویستی خودا دەبێتە مایەی پاداشت و قبولّبوونی حەجی مرۆڤ، ئەو بەئاشکرا دەلّێ:

کەسێ پاداشتی رۆژو وەردەگرێت و حەجی قەبولّ دەبێت کە زیارەتی خاکی بەردەرگای مەیخانەی عەشق بکات و قۆناغەکانی عەشقی ئیلاهی تەی بکات.

**٣- مقام اصلی ما گوشەی خرابات است**
**خداش خیر دهاد آن که این عمارت کرد**

جێگەی ئەسلّی ئێمە کونجی مەیخانەیە، خواپاداشتی خێری ئەو کەسە بداتەوە کە ئەم مەیخانەی دروستکرد.

مقام: جێگە   خداش خیر دهاد: خواپاداشتی خێری بداتەوە، خواخێری بنووسێ.
عمارت کرد: دروستی کرد.

خواجە جێگەی ئەسلّی خۆی بە گۆشەی مەیخانەی عەشق دەزانێت و دوعاو نزای خێربۆ ئەوکەسە دەکات کە ئەم تەریقەت و عیرفانەی هێنایە ئاراوەو دەلّێ: خواخێری ئەو کەسە بنووسێ کە ئەم مەیخانەی عەشقەی دروستکرد.

**٤- بهای بادەی چون لعل چیست جوهر عقل**
**بیاکه سودکسی برد کاین تجارت کرد**

بەهای شەرابی وەك یاقوت (سور) چییە؟ گەوهەری عەقلّ، وەرە، چونکە کەسێ قازانجی کرد کە ئەم مامەلّەو بازرگانییەی کرد.

بها: بەها، قیمە، نرخ   جوهر: گەوهەر، جواهیر   سود: قازانج، سود

خواجە دەپرسێ نرخ و بەهای شەرابی ئالّی یاقوتین چییە؟ پاشان وەلآم دەداتەوە کە گەوهەری عەقلّە؛ واتە بۆکرینی عەشق پێویستە عەقلّ بدەین فرۆشیارەکە، دیسانەوە داوەت مان دەکات بۆئەم کرین و فرۆشتنە تا شەرابی عەشق بکرین و عەقلّ لەبەهای دابدەین، ئەوپێمان دەلّێ وەرە ئەم مامەلّەیە بکە، چونکە کەسێ قازانجی کردووە کە ئەم مامەلّەیەی کردبێت؛ واتە وەرە با بەبەهای گەوهەری عەقلّ عەشقی ئیلاهی بکرین، چونکە کەس لەم کرین و فرۆشتنە زەرەر ناکات.

**٥- نماز درخم آن ابروان محرابی**

**کسی کند که بەخون جگر طهارت کرد**

کەسێ دەتوانێ لە کەوانەی ئەو برۆ میحرابیانەدا نوێژ بکات کە بەخوێنی جگەر دەستنوێژی گرتبێ.

نماز: نوێژ خم: چەماو، کەوانەیی طهارت کرد: دەستنوێژی گرت یاخودهەرخۆئامادەکردنێکی وەك دستنوێژو غوسڵ و تەیەموم بۆ نوێژکردن کە نوێژ بەبێ ئەوانە دروست نییە.

خون جگر: ئاماژەیە بە سەختی و نارەحەتی کێشان و دانگرتن بەخۆدا لە بەرامبەر نارەحەتی ڕێگەی عەشقداو نوێژکردنیش لەتاقی برۆی میحرابی یاردا واتە گەیشتن بەئاوات و مەرام و دیداری یارە، خواجە لێرەدا ئاماژە بەسەختی ڕێگەی عەشق دەدات و سەبرو ئارامی گرتنیش لەسەر ئەوسەختیانە بەهۆکاری سەرکەوتن و گەیشتنی لەخۆشەویست و مەعشوق دەداتە قەڵەم، تەنانەت هێندە بەگرنگی دەزانێ بەدەستنوێژو پاکی دەداتە قەڵەم بۆ نوێژ چونکە مرۆڤ بەبێ دەستنوێژ گەرتن نوێژیش بکات نوێژەکەی دانامەزرێ، هەربۆیە دەڵێت کەسێ دەخوازێ لەتاقی برۆی میحرابی یاردا نوێژ بکات کە دەستنوێژی بەسەختی قەبوڵکردن گرتبێ.

**٦- فغان کەنرگس جمّاش شیخ شهر امروز**

**نظر بەدردکشان ازسر حقارت کرد**

هاوار لە چاوانی فریودەری شێخی شار ئەمرۆ بەسوکییەوە لەبادەنۆشان هەژاری ڕوانی.

جماش: فریودەر، فێڵباز

خواجە لەدەست چاوانی شێخی شار یا دەسەڵاتداری شار دەناڵێنی ئەوچاوە فریودەرو فێڵبازانەی کە بە سوکی سەیری عاشق، عارفە هەژارەکان دەروانێت و سوکایەتیان پێ دەکات لەکاتێکدا کە ئەگەر کەسێ هەبێ شیاوی بەسوك سەیرکردن بێت جگە لە شێخی شار کەسی دیکە نییە، چونکە ئەوخەڵکی هەڵدەخەڵەتێنێ.

**٧- حدیث عشق ز حافظ شنو نە از واعظ**

**اگرچە صنعت بسیار در عبارت کرد**

قسەو باسی عەشق لەحافظ ببیستە نەلە واعیز گەرچی جوانکاری زۆریشی لەدەربڕیندا بەکارهێنا.

شنو: بشنو: ببیستە



صنعت: جوانکاری لەقسەدا وەك ڕەوانبێژی و زمان پاراوی، خواجە خۆی بەکەسێکی ئەهلی عەشق دەزانێت و پێشی وایە کە پێویستە هەرشتێ لە ئەهلی خۆیەوە باس بکرێت و دەڵێت قسەوباسی عەشق و عیرفان لەمن ببیستە کە ئەهلی عەشقم نەوەك لەواعیزو ئامۆژگارکەر، چونکە ئەوئەهلی عەشق و عیرفان نییە، ئەگەرچی زمانپاراو جوانکاریش لەدەربڕین و عیبارەتدا بکات، بەڵام ناتوانێ بەدروستی باس عەشق بکات لە ڕاڤەکردندا. میسراعی دووەمیان بە (واعظ) گێڕاوەتەوە، بەڵام دەکرێ بۆ (حافظ)یش بگەڕێتەوەو ئەوکاتە مانای بەیتەکە دەبێتە ئەمە:

قسەوباسی عەشق لە حافظ ببیستە نەوەك لەواعیز ئەگەرچی حافظ بەشیعرو جوانکاری شیعریش دەیانڵێ ئەمە نەبێتە ڕێگر لە بەردەم گوێگرتن و لە حافظ، چونکە حافظ ئەهلی عیشقە.

## غەزەلی سەد و بیست و هەشتەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی ئەسڵەمی موسبەغ**
**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعِ لان)**

**١- به آب روشن می عارفی طهارت کرد**
**علی الصبّاح که میخانه را زیارت کرد**

عارفێك بەیانی کە زیارەتی مەیخانەی دەکرد بەئاوی رۆشن و زوڵاڵی مەی دەستنوێژی گرت.

علی الصبّاح: بەیانی زوو

غەزەلەکە فەزایەکی عارفانی تەواوی هەیەو بەشێوەیەکی راستەوخۆش ناوی (عارف) هاتووە، عارف رێبواری رێگەی تەریقەت و عاشقی راستەقینەو روخساری جوانی یاری حەقە کە خودایە، عارف هەمان ئەو سۆفییە راستگۆیانەن کە لەروکارو توێکڵی سۆفیگەری درۆزنانە دەرچوونە دەرەوەو بەنێو ناخی عیشقی ئەزەلیدا رۆدەچن، لەزاراوەدا عارف کەسێکە لەخودای حەق ئەوەی بەقۆناغی شهودی زات و نێوە پیرۆزو سیفاتە جوانەکانی خۆی گەیاندوەو ئەم پلەوپایەیەشی بەهۆی تەریقەت و حاڵ و موکاشەفەوە پێگەیشتووە نەوەك بەهۆی زانستەوە (کاشانی اصطلاحات بەنقل از سجادی) یاخود دەگوترێت عارف کەسێکە کە بەفەنا لە حەقدا گەیشتووەو هێشتا نەگەشتووەتە بەقا (سجادی)

عارف لای خواجە هەمیشە روخسارێکی نورانی و دەروونێکی پڕ لە مەعریفەتی حەقەو یەکێکە لەو زاراوانەی کەلێڵی تێداناهێڵێتەوە.

لێرەدا خواجە باس لە پیرۆزی مەیخانەو جێگەی عەشق و حاڵ و مەقامەکان دەکات کەلای ئەو تەنیا عارفە — یاخود بەلای ئەو عارف لەهەمووان چاکتر — قەدرو رێزی ئەوحاڵ و مەقامانەی عەشق دەزانێت، هەربۆیە ئەم بەیانییە زوو کاتێ چووە نێو حاڵ و مەقامەکان و وەك پیرۆزی زیارەتی کردن بەعەشق و مەی دەستنوێژی گرت، چونکە ئاوی زوڵاڵ و رۆشنی مەی، عەشقە مرۆڤ هێندە پاك دەکاتەوە کەبتوانێ زیارەتی مەیخانەی عەشق بکات.

**٢- همین که ساغر زرّین خورنهان گردید**
**هلال عید به دور قدح اشارت کرد**

هەر بەوەی کەپێکی زێرینی ون بوو دەمەداسی (مانگی) جەژن ئاماژەی بەدەوری پێك کرد.

همین کە: هەرکە، هەربەوەی کە   زرین: زێڕین   خور: خۆر   نهان گردید: ون بوو، ئاوابوو



مانای چەمکی ئەم بەیتە هەمان مانای بەیتی یەکەمی غەزەلی پێشووە و میسراعی دووەمیشی دووبارە کردنەوەی هەمان میسراعی دووەمی هەمان بەیتی پێشووە، هەرچی میسراعی یەکەمیشە وێنەیەکی جوانی ئاوابوونی هەتاوی دواین رۆژی مانگی رەمەزانە، ئەو هەتاوە زێرینەی کەهەر لەپێکی زێرینیمەی دەچێت، وەك لەغەزەلی پێشوودا روونمان کردەوە مەبەست لەدوایی هاتنی مانگی رەمەزان و ئاماژەکردنی مانگی دەمەداسی یەکشەوەی جەژن بە دەوری پێك، داوەتکردنی عاشقانە بۆ حەقیقەت و تەریقەت پاش ئەوەی کە خەڵکی رەمەکی بەرەو ساردبوونەوە دەچن لە نزیکایەتی لەگەڵ حەقدا.

**٣- خوشانمازونیازکسی که از سردرد**
**به آب دیدەو خون جگر طهارت کرد**

چەند جوانە (خۆزگەم بە) نوێژو دوعای کەسێ کە لە ئازاردا بەئاوی چاو وخوێنی جگەر دەستنوێژی گرتبێ.

خوشا: چەند جوانە، چەند چاکە، خۆزگەیەك بە    نیاز: دوعا، پێویستی و کڕوزانەوە.

گوتمان بەخوێنی جگەر دەستنوێژگرتن بەواتای رەنج بینین و نارەحەتی دێت، خواجە ئەو نوێژو دوعایانە بەچاك دەزانێت کە بەفرمێسك و ئازارو نارەحەتیەوە بکرێن و مرۆڤ تیایاندا ئامادەبێت و لەقاپی حەقدا بەشکستەی دڵییەوە بکروزێتەوە، نەوەك ئەونوێژانەی کە ببێ ئاگاییەوە دەخوێنرێن، ئەمەش هەمان ئەو نوێژانەن کە دەبنە مایەی لادانی مرۆڤ لە خراپەو خراپەکاری، چونکە حەق دەفەرمووێ (ان الصلاة تنها عن الفحشاء والمنکر) لەراستیدا، رەهەندی عیرفانی نوێژ — کەخواجە لێرەدا ئاماژەی پێدەدا — لەمەش لەپێشترو رازو نیازێکی راستەوخۆیە لەگەڵ حەقداو تەنیا لەبەر جوانی و خۆشەویستی روی ئەو دەکرێت نەوەك بۆ پاراستنی مرۆڤ لەخراپە.

ناکرێ ئێمە لە نێوان نوێژکردن و نوێژخوێندندا جیاوازی نەکەین، چونکە نوێژ خوێندن روکارو توێکڵی نوێژەو تەنیا بەزمان دەگوترێت، بەڵام نوێژکردن ناخ و کرۆکی نوێژەو سەرباری لایەنی جەستەیی و سەرزاری بەدڵ دەکرێت لەزمانی کوردیشدا نوێژ دەکرێت و زۆرینەمان دەڵێین نوێژمان کردو ئیقامەی صلاتی عەرەبیش هەمان واتا دەبەخشێت کە ئەمەش کارەو بەدڵ و گیان و جەستە ئەنجام دەدرێت.

**٤- بەروی یار نظر کن زدیده منّت دار**
**که کار دیده نظر ازسر بصارت دارد**

سەیری روی یار بکەو سوپاس گوزاری دیدەن بە، چونکە ئەزمونەدار لەروی داناییەوە کار دەکات.

نظرکن: سەیرکە          منت دار: سوپاسی بکە   کاردیدە: ئەزموندار

بصارت: دانایی، زیرەکیی بەیرو روناکبری

لێرەدا خواجە مەبەستی لەوەیە کە منەتی چاوانی خۆت بزانە کە دەتوانێ روی گەشی یار ببینێ و ئەوسوارچاك و ئەزموندارەو سەرباری ئەم منەت زانینەی چاوی ئەزمونداری خۆت سەیری روی یار بکە.

**٥- امام خواجە کەبودش سرنماز دراز**

**بەخون دختر رز خرقە را قصارت کرد**

ئیمامی گەورەو بەرێز کە نیازی نوێژی درێژی هەبوو بەخوێنی کچی رەزا (شەراب) خرقەکەی شوشت.

بودش سر نماز: نیازی نوێژی هەبوو، قەسدی نوێژی هەبوو   دراز: درێژ   دختر رز: کچی رەز، مەبەست لە دانەی ترێیەو خوێنی کچی رەزیش ئاوی ترێیە کە مەی و شەرابە.

قصارت کرد: شوستی، شۆردی، پاکی کردەوە.

جەختکردنەوەی بەردەوامی خواجەیە لەسەر پەیوەندی نێوان بەندایەتی درێژ خایەن و عەشق، چونکە لای حافظ یەکێك لە پێویستییەکانی نوێژە درێژەکان — کە دەکرێ لێرەدا رەمزو سومبولی نوێژی راست و پاکەکان بێت — عەشقە، چونکە مرۆڤ دەتوانێ بەبێزاریشەوە بێت نوێژی کورت و تەنانەت درۆینەش بکات، بەڵام نەفەسی درێژ نابێت، هەربۆیە لێرەدا ئەمە دەردەبرێت و دەڵێ کە ئیمامی گەورەو بەرێز نیازی ئەوەی هەبوو نوێژی درێژو راستەقینە بکات ریکاری و خرقەکەی بەمەی و شەراب پاککردەوەو چویەوە نێو جیهانی مەلەکوتی عیرفانەوە.

لێرەداو لەهەموو دیوانەکە دا حافظ جەخت لەسەر ئەم راستیە دەکاتەوە کە عەشق راستترین رێگە پەرستش خودای گەورەیە.

**٦- دلم بەحلقە زلفش بەجان خرید آشوب**

**چە سود دید ندانم کە این تجارت کرد**

دڵم لەنێو ئەڵقەی پرچیدا بەگیان ئاشوبیی کری نازانم چ قازانجێکی بەدی کرد کەئەم تیجارەتەی کرد.

بەحلقە: لەنێو ئەڵقەی   خرید: کری   سود: سود، قازانج   ندانم: نازانم

خواجە لە بازرگانی و مامەڵەیەکی دڵی خۆی سەر دەرناکات کە کرینی ئاشوب و فیتنەیە بەقیمەتی گیان یاخود بۆگیانە، چونکە هەرچی لەم تیجارەت و مامەڵەیە ورد دەبێتەوە هیچ سودو قازانجێکی تێدا بەدی ناکات.



**٧- اگر امام جماعت طلب کند امروز**

**خبر دهید کە حافظ بەمی طهارت کرد**

ئەگەر ئەمرۆ ئیمام داوای جەماعەت بکات پێی بڵێن کە حافظ بەمەی دەستنوێژی گرتوە.

بێگومان بەمەی و عەشق دەستنوێژگرتن دەستنوێژی سادەو ئاسایی و خەڵکی رەمەکی و عەوام نییە، بەڵکو دەستنوێژی نوێژێکی درێژی راستەقینەیە کە لەبەیتی پێنجەمدا ئاماژەی پێدراوە، ئەمرۆش ئەگەر هاتوو ئیمام داوای جەماعەتی کرد کە کۆببنەوە بۆجەماعەت پێی بڵێن حافظ دەستنوێژی نوێژێکی راستەقنیەی درێژی گرتوەو ئەوجۆرە دەستنوێژەش بۆنوێژێکی عەوام و سادەی وەك نوێژی جەماعەتی ئەم سەردەمە دەست نادات.

لێرەداو لەم غەزەلەدا حافظ بە ئاشکراو بێ پەردە خۆی بە عارف دەداتە قەڵەم و دەسنوێژی خۆی بە دەستنوێژی عارفەکان دەزانێت. شاراوە نییە کە ئەم غەزەلە فەزایەکی عیرفانی تەواوی هەیەو مەستی و مەی هەمان مەستی و مەی عیرفانین.

## غەزەلی سەد و بیست و نۆهەم :

**بەحری موزاریعی هەشتی ئەخرەبی مەکفونی مەقسور**
**(مفعول فاعلات مفاعیل فاعلان)**

**١- صوفی نهاد دام و سر حقّه بازکرد**
**بنیاد مکر بافلك حقّه بازکرد**

سۆفی داوی داناو سەری فروفێڵی کردەوە بونیادی فروفێڵی لەگەڵ فەلەکی حوقەبازدا کردەوە.

نهاد دام: داوی دانا، داوی نایەوە حقە: فروفێڵ، جادو نوشتە بازکرد: کردەوە

(حقّە بازکرد) بەدوو شێوە دەخوێنرێتەوە، یاخود دوو شێوە و هاودەنگی لەیەکدی جیاوازن لەیەکەمیاندا سەری فروفێڵ کردنەوەیە یاخود سەری قوتوی فروفێڵ لادانە، بەڵام (حقەبازی) ی دووەم بەواتای فێڵباز دێت.

بەیتەکانی سەرەتای ئەم غەزەلە باس لە فێڵ و تەڵەکەی سۆفیەکان دەکات کە دەبنە مایەی فێڵ لە خەڵکی کردن و هەمیشە داو بۆ کەسانی دیکە دەنێنەوەو ئاژاوەو فیتنە دەگێڕن، لەبەیتی یەکەمدا خواجە دەڵێ: سۆفی داوی خەڵەتاندن و فریوکاری نایەوەو سەری فروفێڵی لاداو دەستی دایەوە فروفێل وخۆبەچاك زانین تەنانەت لەگەڵ فەلەکی فێلبازیشدا بووەتە شەریك و لەگەڵ ئەویشدا فێڵ دەکات ئەو فەلەکەی کەخۆشی فێلباز وحوقە چیە.

**٢-بازی چرخ بشکندش بیضه درکلاه**
**زیرا که عرض شعبده با اهل رازکرد**

یاری رۆژگار هێلکەی لەکلاودا دەشکێنێ (ریسوای دەکات)، چونکە لەگەڵ ئەهلی راز (عارفان)دا چاوبەست و فێڵ دەکات:

بشکندش بیضه درکلاه: هێلکەی لەکلاودا دەشکێنێ، هێلکە لەکلاودا شکان بەمانای رسوایی و ئاشکرابوونی عەیب و عارو نەنگیەکی مرۆڤ دێت شعبدە: چاوبەست و جادو

رەنگە فرو فێل کردن لە کەسانی بێ ئاگاو نەزان ترسێکی ئەوتۆی نەبێت، بەڵام فروفێل کردن لەوکەسانەی کەخۆیان زیرەك و چاپوکن کارێکی زۆر گرانەو رۆژێ دێت کە هەموو شتێك ئاشکرا دەبێت و ئەوفێلبازە ریسوا دەبێت، خواجەش لێرەدا ساویلکەیە سۆفی دەخاتە روو کە لای عارفەکاندا یاخود ئەوانەی ئەهلی رازن و ئاگاداری کەشف و کەراماتن باسی کەشف و کەراماتی خۆی دەکات و خەڵکی دەخەڵەتێنێ، هەربۆیە ئەم گەمەیە زۆر ترسناکەو رۆژگار ئابرویان دەبات و ریسوا دەبن.



**٣- ساقی بیا که شاهد رعنای صوفیان**
**دیگر بەجلوه آمدو آغاز نازکرد**

ساقی وەرە کە یاری قەشەنگی سۆفیەکان جارێکی دیکە دەستی کردەوە بەنازو جیلوەی

شاهد: یار، مەحبوب، رعنا: قەشەنگ

خواجە بەتانەوە لەیارو مەحبوبی قەشەنگی سۆفیەکان دەڵێ: ئەی ساقی ئەی یاری حەقیقی و جوانی حەقیقی — وەرە بۆسەیرو تەماشا، چونکە مەحبوبی رەعنای سۆفیەکان! دووبارە بەنازەوە خۆی نمایش کردووە و کەوتە جیلوە گەری.

یاری سۆفیەکان دەکرێ شێخی درۆزن یاهەر رەمزێکی جوانی سۆفیە ریاکارەکان بێت و خواجە تانوتی لێ دەدات یاخود لەمبارەدا — دەرکەوتنی یاری سۆفییان — خواجە ساقی بانگ دەدات تا لەفەزای فروفێڵاوی ئەو رزگاری بکات.

**٤- این مطرب از کجاست کەساز عراق ساخت**
**اوهنگ بازگشت زراه حجاز کرد**

ئەم موتریبە (مۆسیقاژنە) لەوێیە کەئاهەنگێکی لە مەقامی عێراق لێداو لەکاتی دابەزیندا (گەڕانەوە لەمەقامی مۆسیقیدا) بەمەقامی حیجازی دابەزی.

ساز: ئاهەنگ:،ئاواز عراق: ئاهەنگێکی مۆسقییە و یەکێکە لە چواربنەمای بنەڕەتی مۆسیقا

بازگشت: ئاهەنگی گەڕانەوە؛ واتە گەڕانەوە لە مەقامێك بەئاهەنگێ بۆمەقامێکی دیکە وەك دابەزین و گۆڕینی مەقامات حجاز: جۆرە مەقامێکی دیکەی مۆسیقایە.

بەیتەکە باس لە زیرەکی موتریب (مۆسیقاژەن) دەکات کە هێندە وەسەتاو لێزانە بەشێوەیەك زۆرهونەری لەنێوان مەقاماتەکاندا هاتوچۆ دەکات و ئاهەنگی خۆش دەردەهێنێ و لەکاتی دابەزیندا مەقامەکە دەگۆڕێ.

بەهەرحاڵ ئەمزاراوانە مۆسقین و شەرح کردنیان زۆرسود بەخش نییە؛ بەڵام ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە خواجە وەسفی مۆسیقاژەنێکی وەستاو کارامەدەکات کە ئەگەری زۆرراست ئەوەیە مەبەستی لەرێکخەری گەردوون بێت کەزۆر وەستایانەیە، یاخود یەکێك لە رابەرەکانی نێو عەشق کەزۆر کارامەو وەستایانە بەنێو رێگە دژوارەکانی تەریقەتدا گوزەر دەکات. {چاپ پنجم / نشر تنوسیر ١٣٧٨}

**٥- ای دل بیاکه‌ما به‌پناه خدا رویم**

**زانچ آستین کوتاه ودست دراز دارد**

ئەی دڵ وەرە ئێمە پەنا بەخوا بگرین لەوەی کە قۆڵی کورت و دەستی درێژی هەیە.

زانچ: لەوەی کە          آستین: قۆڵ

قۆڵی خێرقەی سۆفیەکان کورت بوو بەڵام ئەوان لەنێو ئەو خیرقە کورتەدا دەستدرێژیان دەکردە سەرخەڵکی، بۆیە خواجە بە قۆڵ کورتی دەستدرێژ وەسفی کردوون و پەنا دەگرێت لەخودا لێیان و بەدڵی خۆی دەڵێت کەئەی دڵ وەرەبا ئێمە پەنا بەخوا بگرین لەو سۆفیە فێڵبازو دوو ڕوانەی کەلەخواناترسن و دەستدرێژی دەکەن، سەر خەڵکی و بەفروفێڵ دزییان لێ دەکەن.

**٦- صنعت مکن که هرکه محبّت نه‌پاك باخت**

**عشقش به روی دل معنی فـــراز کرد**

فروفێڵ مەکە چونکە هەرکەسێ لەخۆشەویستی و عەشقدا پاك و دڵسۆز نەبوو عەشق دەرگای واتای بە ڕوی دڵیدا داخست.

صنعت: دوورویی، فروفێڵ، تەزویر وریا          در: دەرگا          درمعنی: دەرگای واتای نهێنیەکانی عەشق

فرازکرد : داخست (فرازکردن) بەهەردو واتای کردنەوەو داخستن دێت، بەڵام لەم بەیتەدا واتای دووەمیان مەبەستە.

لای خواجە مەرجی سەرەکی کردنەوەی دەرگای نهێنیەکانی عەشق لەسەر عاشق پاکی و دڵسۆزییە کەسێکەکەبەپاکی و دڵسۆزی دڵی خۆی بدات بەمەعشوق و جگە لەم عاشقە دلسۆزانە عیشق دەرگی نهێنیەکانی خۆی بەروی کەسی دیکەدا ناکاتەوە. خواجە لەم بەیتەدا هۆشیاری بەوعاشقانە دەدات کەدەدیانەوێ ببنە مەحرەمی رازو داوایان لێ دەکات لەدوو ڕوویی و ریاکاری و فروفێڵی عەشق — کەمەبەستی لەسۆفییە ساویلکەکانە — دوورکەونەوە، هەربۆیە دەڵێ: واز لە فروفێل دوورویی بهێنە لەعەشقدا، چونکەعەشق دەرگای واتاو رازە قووڵەکانی بەرووی ئەوکەسانەدا دادەخات کەفروفێڵ دەکەن و بەراستی دڵیان دانانێن.

**٧- فردا که‌پیشگاه حقیقت شود پدید**

**شرمنده رهروی که‌عمل برمجازکرد**

بەیانی کەسەرەتایی حەقیقەت دەردەکەوێت ئەو ڕێبوارەی کەکاری مەجازی بووە شەرمەندە دەبێ.

فردا: بەیانی ـــ لێرەدا مەبەست لەرۆژی قیامەتە



پیشگاه : سەرەتایی، سەرەتاو پێەوەی خان، سەروەری مەجلیس          شودپدید: دەردەکەوێ

شرمندە: شەرمەزار          رهرو: ڕێبوار

عمل برمجاز کرد: واتە کاری لەسەر حەقیقەت نەبوو، بەڵکو بەپێی بەرژەوەندی بووەو خەریکی فروفێڵ بووە.

لەبەیتەکەدا باس لەقیامەت و رۆژی حیساب لەگەڵدا کردن کراوەوە (پیشگاه حقیقت) مەبەست لەو کاتەیە کە حەقیقەتەکان ئاشکرا دەبێت و دەردەکەون کە ئەمەش رۆژی قیامەتە خواجە پێی وایە هەرکەسێك لەسەر مەجازو فروفێل کاربکات و ئیشی خەڵەتاندن بێت بەتایبەتی ڕێبوارانی رێگەی تەریقەت لەئاستانەی حەقیقەتی رۆژی دواییدا شەرمەندەو شەرمەزار دەبن.

**٨- ای کبك خوشخرام کجامی‌روی بایست**

**غرّه مشو که گربه‌ی عابد نمازکرد**

ئەی کەوی خۆش ڕەوت بۆکوێ دەڕۆی ڕاوەستە، کاتێ پشیلەی عابد نوێژی کرد فریو مەخۆ.

کبك: کەو          خوشخرام: خۆش ڕەوت، بەناز ڕۆشتن          بایست: بوەستە

غرّەمشو: فریو مەخۆ          گربە: پشیلەو          نماز : نوێژ

خواجە (یار) لە فریوکارەکانی سۆفییە ساویلکەکان ئاگادار دەکاتەوە کە نەکەوێتە داویانەوە، چونکە ئەون کاتێ عیبادەت و خواپەرستی خۆیان نمایش دەکەن درۆ دەکەن و هەر لەو پشیلەیە دەچن کە خۆی بە عابیدو خواناس ئەدایە قەڵەم بۆ ئەوەی کەوەکان هەڵخەڵەتێنێ و تالێی نزیککەونەوەو بیانخوات.

سەبارەت بە (گربە عابد) یا (پشیلەی عابید) چەندرایەك هەیە کە لێرەدا بەکورتی باسیان دەکەین.

چیرۆکی یەکەمی پشیلەی عابید بۆ چیرۆکێکی نێو کلیلەو دیمنە دەگەڕێتەوە کە زۆرینەی مێژوونووسەکان و ڕاڤەکارانی دیوانی خواجە باسیان کردووە کە گوایە پشیلەیەك بۆ خەڵەتاندنی کەوەکان فێڵێکی نوێ دەدۆزێتەوەو رۆژێك تەزبیح لەمل دەکات و دەست دەکات بەخواپەرستی کاتێك کەوێك ئەم حاڵەتە دەبینێت زۆری پێ سەیر دەبێت و فریو دەخوات و وا دەزانێت کە پشیلەکە بەراستی تۆبەی کردووەو خەریکی خواپەرستییەو کەوەکانی دیکە ئاگادار دەکاتەوەو پاش ماوەیەك لە بەردەوامی ئەم زوهدو عیبادەتەی پشیلەکە کەوەکان بەتەواوی باوەڕ دەکەن کە تۆبەی کردوەو بەدڵنیاییەوە لێی نزیك دەبنەوەو ئەویش لەفرسەتێکدا پەلاماریان دەدات و لێیان ڕاودەکات. {سودی ج١ ل٨٢٥}.

یاخود وەك د. هروی باسی دەکات دەکرێ ئەم پشیلەیە چیرۆکی پشیلەکەی (عماد فیقە) بێت کە دەڵێن: خواجە عماد پشیلەیەکی هەبووەو فێری ئەوەی کردووە کە لەکاتی نوێژدا لەپشتیەوە نوێژ بکات و لەبەرئەوەی کە عماد فقیە سۆفییەك بووە خاوەن خانەقاو خەریکی خەڵەتاندن بووە، ئەم کارەی بەمەبەستی فریودان کردووەو کە خواجە ئەم مەسەلەیەی بیستووە ئەم غەزەلەی داناوە {د. هروی ج١ ل٥٦٨}.

بەڵام د. هروی پێی وایە کە ئەم مەسەلەیە ئاماژەیە بە چیرۆکی (مشك وپشیلە)ی عبیدزاکانی کە ئەویش رۆشتۆتە مزگەوت و خۆی بە نوێژکەرو لەخواترس داوەتە قەڵەم هەرچەندە پشیلەو چیرۆکە شیعریەدا درکەیە لە (امیر مبارزالدین){ د. هروی ل ٥٦٩}.

هەرچۆن بێت زۆرینەی راڤەکارانی دیوانی خواجە لەگەڵ رای یەکەمدان و پێیان وایە کە عابد — یاخود لەهەندێ نوسخەدا زاهد — سیفەتە بۆپشیلە کەو (نسبە) نییە بۆ کەسێکی دیکە.

بەم پێیە بێت: خواجە دەڵێت ئەی کەوی خۆش رەوت بە عیبادەتی درۆزنانەی پشیلە فێڵبازەکان کەسۆفییە ریاکارەکانن فریو مەخۆو لەوە زیاتر لێیان نزیك مەبەرەوەو راوەستەو بۆکوێ دەڕۆیت، چونکە ئەو نوێژانە فروفێڵن و بەمەرامی نزیك کەوتنەوەو خواردنت دەیکەن.

**٩- حافظ مکن ملامت رندان که درازل**

**ما را خدا ز زهد ریــا بی نیازکرد**

حافظ سەرزەنشتی رەندان مەکە، چونکە لەئەزەلدا خوائێمەی لەزوهدی ریابێ نیازکرد.

حافظ لێرەدا بەخۆی دەڵێت کە سەرزەنشتی رەندان مەکە، بەڵام مەبەست لەم گوتەیە ئەوەیە تاخەڵکی تر سەرزەنشتی رەندان نەکەن، چونکە حافظ خۆی بە رەند دەزانێت و لەوگروپەیەو هەرگیز سەرزەنشتی رەندان ناکات.

لەبەیتەکەدا (زوهدی ریا) هاتووە کە زوهدی پڕ لە ریاکاری و فروفێڵ درۆیە دەڵێ ئێمەی رەندان هەرلەرۆژی ئەزەلەوە خودای گەورە وای خەلق کردووین کەپێویستیمان بەزوهدی پڕ لە ریاکاری نەبێت و ئیستاش خۆمان بەوشێوەیە دەرناچین، هەربۆیە کەوانین و خەریکی زوهدی پڕ لە ریانین سەرزەنشتمان مەکە، چونکە هەرلەرۆژی ئەزەلەوە خوا ئەمەی لێ سەندوینەتەوەو نەیهێشتووە فێری زوهدی ریاکارانە ببین.



## غەزەلی سەد و سییەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی ئەسڵەمی موسبەغ**

**( فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لان )**

**١- بلبلی خون دلی خوردو گلی حاصل کرد**

**یاد غیرت  به صدش خار پریشان دل کرد**

بولبولێك بەخوێنی دڵ (نارەحەتی) گوڵێکی بەدەست هێنا، بەڵام بای غیرەت و سەد درك دڵی و پەشێوو پەرێشان کرد.

خون دلی خورد: (خوێنی دڵێکی خواردەوە) ئەم درکەیە لەفارسیدا بەکاردێ و بەواتای رەنج و هەوڵدان و شەوخونی زۆردێت لەپێناو کارێکدا، لەکوردیدا دەگوترێت پروکا — توانایی لێ برا.

حاصل کرد : بەدەستی هێنا     باد: با     غیرت: غیرەت، تورەیی و حەسودی

(غیرت) لەبەیتەکەدا بەدوو جۆر لێکدرێتەوەو هەرلێکدانەوەیەکیش دەبێتە دەروازەی دیاریکردنی واتای گشتی بەیتەکە، لەلێکدانەوەی یەکەمدا (غیرت) بەواتای حەسودی و رق دێت و بەیتەکە رەهەندێکی دونیایی مێژوویی وەردەگرێ و بای غیرەت لە بەرامبەر بولبولێکدا کەبەهەزار نارەحەتی و مەینەت گوڵێك بەدەست دەهێنێت حەسودی ورقەو بەسەد جۆرە درك و داڵ پەرێشانی دەکات.

بەڵام لێکدانەوەی دووەمی (غیرەت) غیرەتی عاشقانەی مەعشوقی حەقە کەلەکاتی رووکردنە دونیاو شتە دونیاییەکانی عاشقدا دروست دەبێت و دوچاری مەینەت و عەزابی دەکات تاعاشقی رولە گشت شتە دونیاییەکان وەرگێڕێت و تەنیا رووی لە جوانی معشوق بێت.

گومانی تێدانییە — یاخود گومانی تێانەهێڵراوەتەوە — کە ئەم غەزەلە — یاخود زۆرینەی بەیتەکانی — خواجە لەداخی لەدەستدانی کورەکەیدا گوتراوەو لاواندنەوەو خەفەتباری ئەو مەرگەیە سودی لە شەرحەکەی خۆیداو لەسەرەتای ئەم غەزەلەدا نووسیویەتی: ئەم غەزەلە لاواندنەوەیەکە خواجە بەهۆی مەرگی کورکەی خۆیەوە دایناوە) ج ٢ ل٨٢٧ هرویش لە فرصت شیرازییەوە نقڵی کردووە کە خواجە کوڕێکی هەبووە بەنێوی — شاە نعمان — کە رۆشتووە بۆهیندستان و لە — برهان پور — مردوەو گۆرەکەی نزیکی قەڵای — ئاسیر — ە (ل٥٧٣ بەنقل از فرصت آثار عجم ص٤٧٠).

لەو هەردوو واتای (غیرت)دا ئاماژە بۆراستی ئەم مەسەلەیە دەکرێت، بەڵام جیاوازییان لەخستنەرووی بیری قووڵی خودی خواجەدایە، خواجە چەندین جاری دیکە لە (غیرت) و (بازی

غیرت) دواوەو ئەو ویستە یاعەشقە ئیلاهییەی دەربڕیوە کەخوا خۆشەویستەکانی خۆی بەیەکجاری بۆخۆی پاکدەکاتەوەو یەکلاییان دەکاتەوە هەرئەو غیرەتەیە کەفەرمان بە حەزرەتی ئیبراهیم دەدات تاکوڕە زۆر خۆشەوییتەکەی سەربڕێت و بەهەڵگرتنی چەقۆکەش تەسلیم بوونە بەخوداو لەراستیشدا سەربڕینی ئەو خۆشەویستە لەرابەدەرەیە بۆکوڕەکەی کەخودا لەهیچ وەلییەکی خۆی قەبوڵ ناکات.

عارفەکان پێیان وایە کە غیرەتی ئیلاهی ڕێگە نادات بەوەلیەکان دڵ بەغەیری ئەوبدەن، هەروەها ئەوغیرەتە ئیلاهیە هەمان ئەو دروستکردن و ڕێککردنی بەندەکانە لەلایەن خوداوە کە بۆسەر موسا داهات — علیەالسلام — و خودا ناوی لێناوە دروستکردن و بەموسای فەرموو : واصطفنك لنفس — طە ٤١.

د. خرمشاهی پێی وایە کە (غیرت) لەم بەیتەدا هەمان ئەو غیرەتی ئیلاهییە کە عارفەکان بەترسەوە لێی دەروانن و خودا هەموو ئەوشتانە لەعارفەکان دەسەنێتەوە کەدڵیان بەلای جگە لەودا رادەکێشێ ئەم غیرەتە تەنیا عارفەکان دەگرێتەوە یاخود ڕاستتر ئەوانەی کەدەچنە نێو دەریای بێ ئامان و بێ کەناری عەشقی ئیلاهییەوە.

بەم پێیە بێت لێرەدا خواجە دان بەوەدا دەنێت کە کوڕەکەی خۆی زۆر زۆر خۆش ویستوەو ئەمەش بووەتە مایەی جوڵاندنی غیرەتی حەق، بۆیە لێسەندۆتەوەو دیسانەوە خستویەتیەوە نێو پەرێشانی.

**٢- طوطی  ای را بەخیال شکری دل خوش بود**

**ناگهش سیل فنا  نقش امل باطل کرد**

توتییەك بەخەیاڵی شەکرێکەوە دڵخۆش بوو، بەڵام لەپڕ لافاوی نەمان و وێنەی ئارەزووی سرینەوە و لەناوی برد.

ناگهش: لەپر، ناگەهان      سیل: لافاو      فنا: نەمان، فەناو لەناوچوون
باطل کرد: سرینەوە، لەناوی برد

خواجە خۆی بە توتیەك عاشقی شیرین و شەکر دەداتە قەڵەم کە بەخەیاڵی شەکرو خۆشەویستێك دڵخۆش بووەو بەتەمای بووە، بەڵام لەپر لافاوی مەرگ و لەناوچوون ئەوخۆشەویستییە لەناو بردوەو خەیاڵ و ئاواتە خەیاڵەکەی ئەمیشی باتڵ کردووەو سریویەتیەوە.

**٣- قرّة العین من آن میوة   دل یادش باد**

**کەخود آسان بشدو کارمرا مشکل کرد**

نوری چاوی من ئەم میوەی دڵە یادی بەخێر کەخۆی بەئاسانی ڕۆشت و منی دووچاری کێشەو نارەحەتی کرد.



قرّەالعین: نوری چاوان، نوری چاو      یادش یاد: یادی بەخێر  آسان بشد: بەئاسانی ڕۆشت
مشکل کرد: نارەحت کرد      کارمرا مشکل کرد: منی دوچاری نارەحەتی و گرفتاری کرد

لێرەدا خواجە زۆر بە ئاشکراو ڕاشکاوی باس لە مەرگی کوڕەکەی ـ نوری چاوانی ـ دەکات و هەرئەم بەیتەشە کە بەڵگەی روون و ئاشکرای ئەوەیە کە ئەم غەزەلە لەپرسەو لاوانادنەوەی ئەودا گوتراوە.

خواجە دەڵێ: نوری چاوانم کەمیوەی دڵ و خۆشەویستم بوو یادی بە خێربێت خۆی زۆر بەئاسانی ڕۆشت و کۆچی دوایی کرد، بەڵام منی گرفتارکردو لەپاش ئەو ئارامی لێ هەڵگرتووم پەرێشانم.

**٤- ساربان بارمن افتاد خدا را مددی**

**کە امّید کرمم همرە این محمل کرد**

وشترەوان بارەکەی من کەوت بۆخاتری خوایارمەتییەك، چونکە ئومێدی کەرمم بوو کە منی بەگەڵ ئەم کاروانەداوە.

ساربان: وشترەوان      بار: بار      همرە: هاوڕێ، هاوکاران      **محمل**: کەژاوە، لێرە مەبەست لە تەواوی کاروانەکەیە.

لێرەدا خواجە دەچێتەوە نێو پەناگەی عەشقەوەو هیوای هەمیشەی خۆی بەعەشق(رزگاربوون لەنارەحەتی) دووبارە دەکاتەوە لەکاروانی گەورەی عەشق و جڵەو بەدەستی ڕێگەی عەشق داوا دەکات کە لەم کۆستەدا هاوکاری بکات و یارمەتی دەری بێت، لێرەدا خواجە کاروانی گەورەی عەشقی بەوشترەوان و کۆستەکەی خۆشی بە کەوتنی بار داوەتە قەڵەم و داوا لەوشترەوان دەکات کە لەم کاروان و ڕێیەدا بەهانایەوە بێت و خەمی کۆستەکەی لەسەرشان سوك بکات، چونکە خواجە بەم ئومێدی کەرەمەی عەشقەوە لە دەرگای عەشقی داوەو لەگەڵ ئەم کاروانەدا بووەتە هاوڕێ، ئەمەش یەکێکە لەو ڕەخنانەی کەلە عەشقی خواجە دەگیرێت و دەگوترێت خواجە بەهیوای عەشقێکی بەرژەوەندی خوازانەوە پێی ناوەتە نێودەریای بێ ئاسانی عەشقەوە — سروش -.

**٥- روی خاکی و نم چشم مرا خوارمدار**

**چرخ فیروزە طربخانە ازین کهگل کرد**

ڕووی خاکی و تەڕیی چاوی من بەکەم مەگرە  چەرخی (فەلەکی) پیرۆزەیی خانووی زەماوەندگای خۆی لەم کاوگڵە دروستکردووە

رووی خــاکی: رووی خــاکی ـــ خـۆڵی        نم چــشم: تــەری چــاو، فرمێــسکی چــاو
خوارمدار: بەکەم مەزانە، بەسوکی مەگرە     طربخانە: شوێنی خۆش و شادی — زەماوەندگا
کهگل، قورێك کەکای تێدەکرێت و لەدیوار دروستکردن و سواغداندا بەکاردێت.

بەیتەکە چەند مەسەلەیەکی گەوهەری وروژاندوە، یەکەمیان مرۆڤ و عەشقی حەقیقی مــرۆڤ مایــە رازاندنــەوەی زەماوەنگــای چــەرخ و مەلەکوتــە، دووەمیــان: دژایــەتی هەمیــشەیی ئەشعەرییەکانە و جەبریانەی  بۆ فەلەك کە بە ئەوێکی نادۆست دەیداتە قەڵەم.

خواجە لەم بەیتەدا روی وشکی خۆی کەلــەخاك دەچــێت بەفرمێــسکی چــاوی تــەڕ دەبێــت (کەئەم وێنەیەش واتای خەمباری و گریانی زرە لەداخی مەرگی کوڕکەیدا)و دەبێتە ئەوقوڕە پــڕ لە کایەی خانووی پێ دروست دەکرێت یاخود سواغ دەدرێت، بەڵام لەم نارەحەتیەدا فەلــەك بــەم قوڕە کادارە تیاترۆخانەی شادی خۆی دروست دەکات و دژایەتی ئەم دەکات. ئــەم لێکدانەوەیــە لەئاستی تێگەیشتنی مرۆڤە مێژوویەکاندایەو بەیتەکە هەر لەمەرگی کوڕەکەی خواجە دەدوێ، بەڵام لێکدانەوەی یەکەم عەشقی مرۆڤ مایەی جــوابی چــەرخ و مەلەکوتــە لێکدانەوەیەکــە لــە دەرەوەی مێژوودایە و لە روانگەیەکی عیرفانی عاشقانەوە لە بیەکە دەروانێ.

**٦- آه و فریاد کەازچشم حسود مەچرخ**

**درلحد  ماه کمان ابروی من منزل کرد**

ئاهو فریاد  کەلە چاى حەسودی مانگی فەلەکەوە مانگی ئەبرۆکەوانی من لەگۆڕی کەدە مەنزڵ.
لحد: گۆڕ   منزل کرد: مەنزڵی کرد

مانگی ئەبرۆکەوانی خواجە لەم بەیتەدا کوڕەکەیەتی و پێی وایە هێندە جوان بــووە گــرەوی لەمانگی ئاسمان بردووەتەوە لەجوانیــداو ئــەویش لەحەســودیدیا چــاوی لێکــردوەو خــستویەتیە گۆڕەوە، خواجە ئاهوهاوار دەکات و دان بەم راستیەدا دادەنێ کە مانگی جوانی من بــە چــاوی مانگی ئاسمان مردووەو چووەتە گۆڕەوە.

**٧- نزدی شاه رخ و فوت شد امکان حافظ**

**چەکنم بازی ایـّـام مرا غافل کرد**

سودت لەفرسەت وەرنەگرت وئێستاش چی بکەم تواناییەحافظ یاری رۆژگار فێڵی لێ کردم/ فریوی دام.

نزدی: نەتکرد                    شاه رخ: زاراوەیەکی شەترەنجەو وادەبێ کــە ئەســپێك کشی لە شاو عەسکەرێك بەیەکەوە دەکات و لەکاتی لادانی مەلیکدا عەسکەرەکەوە دەخورێت بەگشتی ئەم زاراوەیە بۆ سود وەرگرتن لە بوارو فرسەتی رۆژانەیە.



فوت شد: بەسەر چوو          امکان: توانا          غافل کرد: فریــوی دام، بێ ئاگای کردم

لــەم بەیتــەدا خواجــە ســەرکۆنەو لۆمــەی خــۆی دەکــات  ـ وەك بڵێــی تــوانیبێتی کارێــك بۆکوڕەکەی بکات، بەڵام نەیکردبێت ـ کەلــەکاتی فرســەتی چــارێکت هــەبوو، بــەڵام نــەتکردو ئێستاش ئیدی بەسەرچووە، ئەوکارە چییە؟ **لە** حافظدا نەهاتووە، بەڵام راڤــەکاران هەریەکــەیان شتێکیان گوتووە بۆ نموونە (د. غـنی) پەیداکردنی دەرمان و چارەسەری نەخۆشی و نەچوونە لای دکتۆر. سودی بەنهێنانی و نەوەخستنەوە پێش مــەرگ دەیداتــە قەڵــەم وادەردەکــەوێت ســودی لەمانای تەواوی (شاە رخ) تێ نەگەشتبێت و بەنیوی کچانە داویەتیە قەڵەم.

لەمیسراعی دووەمدا خواجە ئەم بێ ئاگایی و کەمتەرخەمییەی بۆریای و فروفێڵی رۆژگــار دەگێڕێتەوەو دەڵێ چی بکەم یاری و فروفێڵ رۆژگار غافگلیری کردم.

## غەزەلی سەد و سی و یەکەم :

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی ئەسلەمی موسبەغ**

**( مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعِ لان)**

**١- چُوباد عزم سرِکوی یارخواهم کرد**

**نفس به بوی خوشَش مُشکبار خواهم کرد**

وەك با نیازی سەرکۆلانی یارم هەیەو نەفەس بەبۆنی خۆشی ئەو مسکین دەکەم.

چو: وەك   عزم: نیاز، ویست   خواهم کرد: ئەم ڕێژەیە بۆ داهاتوو بەکاردێت، بـەلام لەکوردیدا ڕێژەی داهاتوو نییەو هەر ڕانەبردوو بەکاردەهێنرێت.

دەکرێ وەك با لەتێپەڕی و خێراییدا بێت یاخود لەچۆنیەتی گەراندا بێت بە کۆلانی حـەریمی یاردا، خواجە نیاز وایە وەك باخێرت بروات حەرەمی بارەوەولەبۆنی خۆشی ئـەو هەناسـەی میسکین و بۆنخۆش بکات، غەزەلەکە بەگشتی فەزایەکی عیرفانیانەی هەیەو تیایـدا لەهەسـتی ئەو ڕێوباری دەدوێت کە جوانیەکانی نێو دونیای عەشقی حەقیقی دەرك کردووەو دەیەوێ بچێتە نێوئەو دونیا ڕەنگالّەییەوە.

**٢- هر آبروی که اندوختم زدانش و دین  نثار خاك ره  آن نگار خواهم کرد**

هەرئابڕو ناوبانگێك کە لە زانست و دین بەدەستم هێناوە دەیکەمە قوربانی خاکی ڕێگـەی ئەو نیگارە (یار)ە.

اندوختم: بەدەستم هێنا، کۆم کردەوە  دانش: زانست   نثار: قوربانی

لێرەدا ئیدی خواجە ئامادەیە هـەموو ئـەو سـەروەتە مەعنەویانـەی کەلەئـەنجامی دیـن و زانستەوە بەدەستی هێناون بیخاتە ژێرپێی یارو خۆشەویـستی حەقیقییـەوەو بیکاتـە قوربـانی خـاکی ڕێگـەی، چـونکە ئـەو زۆرچـاك لەعەشـق تێگەیـشتوەو دلّنیایـە لـەوەی کەهـەموو ئابروکەسایەتیە دینی و زانـستیەکەی لەچـاو عەشـقدا پوشـێکی بابردەلّەیـەو تـەنیا عەشـقی مەعشوقە کە بەهانایەوە دێت و بەفریای دەکەوێت، هەربۆیە جێگەی خۆیەتی بکرێتە قوربـانی خۆلّی سەرەرێی یاران خودی حافظ لە غەزەلێکدا دانی بەم ڕاستیەدا ناوەو دەلّێ:

**عشقت رسد بەفریاد ورخود بسان حافظ**

**قرآن ز بر بخوانی درچارده روایت**

{د.هروی ج ١ ل ٤٢٤ بەیتی ١١}



**٣- بەهرزە بی می و معشوق عمر می‌گـذرد**

**بطالتم بس از امروز کار خواهم  کرد**

تەمەن بێ مەی و مەعشوق بێ هودە تێدەپەڕێت ئیدی تەمەلی و تەزەلی بەسەو لەئەمڕۆوە کاردەکەم.

بەهرزە: باتلّ، بێ هودە بطالتك تەوەزەلی و تەمەلّی   بس: بەسە

خواجە تەمەن بەبێ مەی و مەعشوق بەشتێکی بێ هودە دەداتـە قەلّـەم و پێـی وایـە کـە تەمەنی تائێستا کەبێ مەی و معشوق تێپـەریوە بـێ هودەییـە، بۆیـە ئیـدی لەوتـەوەزەلی و تەمەلّییە بێدار دەبێتەوەو ڕادەپەڕێ و دەلّێ: ئیدی تەمەلّی و تەوەزەلی بەسەو لەئـەمڕۆوە کـار دەکەم؛ واتە لەمڕۆوە کاردەکەم بۆ مانا پێدان بەژیان کەئەویش بەچـوونە نێـو دونیـای مـەی و مەعشوقە فەراهەم دەبێت کارکردنی خوا چوونە نێو دونیای عەشقە.

واتای قولّی بەیتەکە لەوپەیوەندیـەدا دەردەکـەوێت کـە شـاعیر لـەنێوان عەشـق و ژیانـدا دایدەنێت و ژیانی بێ مەعشوقەو مەی بـەبێ هـودە دەزانێـت، لەڕاسـتیدا، نـەبوونی عەشـقی حەقیقی هەموو مانا جوانە قوولّ و ڕاستەکانی ژیان دەدزێت و ژیانی مرۆ بەبێ عەشق لـە بـێ هودەیی زیاتر هیچی دیکە نییە، هاتنەکایەی فەلسەفەی پوچگەرایی و هاوشێوەکانی لەدونیای مۆدیرندا جگە لە ونکردنی عەشق و مەی و مەعشوقەی ئەزەلی هیچی دیکە نەبوو.

**٤- صباکجاست که این جان خون گرفته چوگل**

**فدای نکهت گیسوی یار خواهم کرد**

سەبا لەکوێیە کە ئەم گیانە سەرلەگوێی گۆڕ لەرزیوو وەك گولّ فیدای بۆنی پرچی یار دەکەم

خون گرفته:  سەرلەگوێ گۆڕ لەرزیوو، کەسێ کەوادەی مردنی نزیـك بێـت، یـاخود فتـوای کوشتنی دەرکرابێت، ئەجەل گەیشتوو.   نکهت: بۆنی خۆش

وەك لە بەیتی پێشووتردا گوتمان ئەم بەیتانە هەستی ڕێبوارێکی سەرەتای ڕێگەی عەشـقەو کە لەدوادوایی تەمەنێکی پڕ پوچی و بێهودەیدا هەست بەگەورەیی عەشـق دەکـات و دەیـەوێ لەماوەیەکی کورتدا هەرچی دارو نەداریەتی بیکاتە قوربانی عەشـق ـ ئـەم دوادواییـە تەمەنـە مەرج نییە خودی شاعیر بێت و ئەم بەیتە بەلّگە بێ لەسەر پیری ئەو، بـەلّکو وێنـەی هەسـتی کەسێکی نێو خەیالّی شاعیرە.

لێرەدا ئەو ڕێبوارە سەرباری دەوێت، چونکە نیازی وایە گیـانی سـەرلەگوێی گـۆڕ لـەرزیوو کەنەفتی خۆی وەك گولّ لەبەر پێی بۆنی خۆشی پرچی یاردا بریژێت و بیکاتە قوربانی، دەیـەوێ سەبا پەڕ رزیوو بۆنی گیان بەدیاری بخاتە بەرپێی یارو فیدای خۆشی سیحری پرچـی بکـات کـە

حەیرانی کردووە. بێگومان هەردەبێ لەپرچی پەردەی سەر جوانیەکانی روخساری جەمال هەربۆنی حەیران کەر بێت و رێگە بە عاشقان نەدات بەجیلوەی جەمالی حەق بگەن، بەهەرحاڵ خواجە گیانیشی دەکاتە فیدای بۆی پرچی سەرروخساری یار.

**٥- چوشمع صبحدمم شد زمهراوروشن**

**کەعمر درسراین کاروبار خواهم کرد**

له عەشقی ئەوەوە وەك مۆمی کاتی سپێدە بۆم روون بوویەوە کە تەمەن لەسەر ئەم کاروبارە دادەنێم.

صبحدم: کاتی سپێدە

خواجە کەعەشقی خۆی بۆیار دەبینێ و دەزانێ چەندە عاشقە ئیدی بەتەواوی لای روون دەبێتەوە کەتوانای دەستبەرداری نییە لەم عەشقەو تەمەنی لەپێناودا دادەنێت بۆ ئەم قەناعەتەش ئەم وێنەیەی دروستکردووە.

کە مۆمی سپێدەیەو دەکرێ خودی هەتاوبێت، خواجە دەڵێ وەك هەتاو یاوەك مۆمی بەیانی کەروناکەو ئاشکرایە ئاوا عەشقی یارەوە دڵنیابووم و لێم روونە کە تەمەنم لەپێناو ئەم عەشقەی یاردا دادەنێنم و تەواو دەکەم. دەکرێ تەمەن دانان جگە لەواتای بەردەوامی لەعەشقدا واتای ترسناکی عەشقیش بگەیەنێت؛ واتە هێندە عاشق دەبم کە ئەم عەشقە بۆم دەبێتە مایەی دەردی سەرو تەمەنی ژینمی لەسەر دادەنێنم و لەپێناویدا دەمرم.

**٦- بەیاد چشم توخودرا خراب خواهم ساخت**

**بنای عهد قدیم استوار خواهم کرد**

بەیادی چاوانی تۆوە خۆم مەست دەکەم و پایەی پەیمانی کۆن تۆکمەتر دەکەم.

خودراخراب خواهم ساخت: خۆم مەست دەکەم      استوار: تۆکمە، قایم

(پەیمانی کۆن) کە لە بەیتەکەدا هاتووە رازی نێو بەیتەکەیەو راڤەکاران هیچ ئاماژەیەکیان پێ نەداوە، تەنانەت د. خرمشاهی کە شەرحی غەزەلە گران و رازدارەکانی خواجەی کردووە ئەم غەزەلەی هەرنەهێناوە.

(پەیمانی کۆن) هەمان ئەوپەیمانەیە کە مرۆڤ لەرۆژی ئەزەلا یارۆژی ئەلەستدا بەخودایان داوە، ئەو رۆژەی کە مرۆڤانی بەخودایەتی ئەوداناو پەیمانیان بۆ بەندایەتی ئەوبەست، وەك لەئایەتی (١٧٢) ی سورەتی (اعراف)دا خودا دەفەرموێ: ( وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنْ بَنِي آدَمَ مِنْ ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا بَلَى شَهِدْنَا أَنْ تَقُولُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَذَا غَافِلِينَ).



خواجە لێرەدا دەڵێت بەیادی تۆو چاوانی شهودی تۆوە ئەی مەعشوقی ئەزەلی و جەمالی حەق خۆم مەست و مەدهۆش دەکەم و دێمە نێوانی پلەکانی عەشقی تۆوەو بەمەش پلەو بونیادی ئەوپەیمانەی ئەزەل کە تۆبەخوداو مەعشوق دەزانم تۆکمەو مەحکەم تر دەکەم.

**٧- نفاق و زرق نبخشد صفای دل حافظ**

**طریق رندی و عشق اختیار خواهم کرد**

دووڕوویی و ریاکاری سەفاو خۆشبەختی بەدڵ نابەخشێت حافظ رێگەی رەندی و عەشق هەڵبژێرم.

زرق: ریاکاری، دووڕوویی      بنخشد: نابەخشێت      اختیار فواهم کرد: هەڵدەبژێرم

وەك هەمیشە خواجە لە دووڕوویی و ریاکاری سۆفیە درۆزنەکان بێزاردەبێت و پێی وایە ئەم دورووییە سەفاو خۆشبەختی بەدڵی مرۆڤ نابەخشێت، بەڵکو عەشق و رێگەی رەندی سەفاو خۆشی ئەداتە دڵی مرۆڤ، هەربۆیە بەخۆی دەڵێ رێگەی رەندی و عەشق هەڵدەبژێرم.

# غەزەلی سەد و سی و دووەم :

**بەحری ڕەمەلی هەشتی مەخبونی ئەسڵەمی موسبەغ**
**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لان)**

**١-دست در حلقەی آن زلف دوتا نتوان کرد**
**تکیە  برعهد تو و باد صبا نتوان کرد**

ناتوانرێ دەست بخرێتە ئەڵقەی ئەو زوڵفە دووتاوەو ناتوانرێ پشت بە پەیمانی تۆو سەبا ببەسترێت.

دوتا: دوتا، دوپەلکە، لول     تکیە: پشت بەستن، اعتما کردن
نتوان کرد: ناتوانرێ بکرێت

بێگومان ئەم بەکارهێنانە لەکوردیدا نییەو لەفارسیشدا بەپێی ڕستەکان واتاکەی دەگۆڕێت خواجە لە نارەحەتی دەست خستنە پرچی لولی دوتایی یارەوە دەدوێت و کە ئەم نەتوانینە بەگشتی بوارنەرەخسانە بۆ بەیەك گەیشتنی؛ واتە نارەحەتی بەیەکگەیشتنی لەگەڵ یاردا یاریش ئەویارە عەیارو فیتنە ئەنگێزەیە کە وێنەی سەبایەو ناتوانرێ پشت بە وەعدو پەیمانی هیچکامیان ببەسترێ.

**٢- آنچە سعی است من اندر طلبت بنمایم**
**این قدر هست کە تغییر قضا نتوان کرد**

ئەوەی هەوڵە من لەپێناو بەدەستهێنانتدا دەیکەم، بەڵام ئەمەندە هەیەکە ناتوانرێ قەزاو قەدەر بگۆڕدرێ.

آنچە: ئەوەی کە     سعی: هەوڵ، کۆشش     اندر: لەپێناو     بنمایم: دەیخەمەروو، دەیدەم
این قدرهست: ئەمەندە هەیە، ئەم ڕاستییە هەیە

لێرەدا ڕوبەڕووی یەکێکی دیکە لەبەیتە جەبرییەکانی حافظ دەبینەوە کە هەمان بیروبۆچوون و جیهانبینی بەیت و غەزەلەکای پێشووەو جیهانبینی ئەشعەرییەکەی سونی مەزهەبەو پێی وایە کە — رفعت الاقلام وجفت الصحف — تەواوبووەو چارەنووسەکان نووسراونەتەوە — پێش شەرحکردن بەیتەکە — دەمەوێ ئەوراستیە بخەمە ڕوو کە ئەم دونیابینییە زۆر دورە لەدونیابینی عیرفانییەوەو خواجە لەم جۆرە بەیتانەدا لەعیرفان و قەناعەتە عیرفانیەکان دێتە دەرەوە، چونکە عارفەکان بڕوایان وایە کەخودا لەبەرخاتری بەندە چاکەکانی یا وەلییەکانی خۆی قەزاو قەدەر دەگۆڕێت،



هەروەها لەبیریشدا ئەم گۆڕانە بوونی هەیە واتە دەکرێ قەزاو قەدەر گۆڕانی بەسەردا بێت (بڕوانە حدیث بندگی دلبرگی — سروش — ل ١٨٢ — ١٣٧٥ تهران صراط لەسەرچاوە عیرفانییەکاندا ئەم فەرموده قودسیە، دوبارە دەکرێتەوە کە خوا دەفەرموێت (یاعبدي کن لی کما ارید اکن لك کماترید) کەخودا بۆی بفەرموێت بەوشێوەیە دەبێت کە تۆ دەتەوێ ئیدی ئەمە واتای گۆڕانی قەزاو قەدەرە بەویستی وەلییەکان، بەڵام حافظ لێرەدا پێچەوانەی ئەم بنەمایە عیرفانیە ڕەفتار دەکات و دەڵێ: لەپێناو بەدەستهێنانی تۆو گەیشتن بەتۆدا هەرچی هەوڵ و کۆششە داومە، بەڵام ئیدی نازام ئەوەی نەگۆڕە و هەیە ئەمەیە کە ناتوانرێ قەزا و قەدەر بگۆڕدرێت واتە من هەوڵی خۆمداوە، بەڵام ناتوانرێ هەرچی نووسراوەو لەچارەماندا نەخشێنراوە گۆڕانی بەسەردا بهێنین.

لێرەدا هەر ئەوەندە دەتوانین بڵێین کە حافظ خۆی نەیویستووە لەم بنەما ئەشعەرییە دەربچێت، چونکە ئەم (زیار) ـە بنەمایە لەگەڵ چەرمەسەری و کەوتنی و هەستانەوەکانی ژیاندا یەکدەگرێتەوە تاوەکو بنەمای باوەڕکردن بە گۆڕانی قەزاو چارەنووس.

**٣- دامن دوست بەصد خون دل افتاد بەدست**
**بە فسوسی کە کند خصم رهانتوان کرد**

بەسد دەردی سەری و زەحمەت دامەنی دۆستم کەوتەدەست بەلۆمەو سەرزەنشتی دوژمن ناتوانرێ بەربدرێت وبەرەڵا کرێت.

بەصد خون دل: بەسەد دەردی سەری و زەحمەت     افتاد دست: کەوتە دەست
فسوس : لۆمەو سەرزەنشت، گاڵتەپێکردن     خصم: ڕەقیب، دوژمن
رها نتوان کرد: ناتوانرێ بەرەڵا کرێت، ناتوانرێ بەربدرێت، وازی لێ بهێنرێت.

بەدەست هێنانی داوێنی دۆست، واتە بەیەکگەیشتن و وەسڵی یار و گەیشتن بەئاستانەی مەحبوب. خواجە ئەم بەدەستهێنانە بەکارێکی زۆرگران دەداتە قەڵەم و دەڵێ بەسەد دەردی سەری و نارەحەتی بەدەستم هێناوە، هەربۆیە هێندە گرانبەهایە ناکرێ لەبەرخاتری سەرزەنشت و لۆمەی دوژمن و ڕەقیب دەستی لێ هەڵگرم و وازی لێ بهێنم؛ واتە ئەسڵی دولبەر هێندە بەهادارو گرانبەهایە کەناکرێ لەبەر لۆمەی لۆمەکەر وازی لێ بهێنێت.

**٤- عارضش را بە مثل ما فلك نتوان گفت**
**نسبت یار بەهربی بی سروپا نتوان کرد**

ناتوانرێ بگوترێ ڕوخساری وەك مانگی فەلەکە، چونکە ناتوانرێ یار بە هەربێ بەهایەك بچوێنرێت.

عارضی : روخسار     نسبت: چواندن

بی سروپا: بێ بەها، بێ ئەرزیش، سیفەتی مرۆڤی بێ قیمەت و سوکە

خواجە مانگ لە بەرامبەر روخساری جوانی یاردا بەکەسێکی سوکی بێ بەها دەداتە قەڵەم و ئەسڵەن پێی وایە کەنابێ ئێمە لەنێوان روخساری یارو مانگدا لێکچواندن بکەین، چونکە مانگ بێ بەهایە لەچاویارداو ماقوڵ نییە ئێمە یار بە هەر بێ بەهایەك بچوێنین.

(بی‌سروپا) جگە لە واتای زاراوەیی واتای زمانیشی واتە (بێ سەور قاچ) لەم رەوشەوە هەر دەبێتە سیفەتی مانگ چونکە مانگ خڕەو وەك مرۆڤ سەروقاچی نییە.

**۵- سرو بالای من آنگه که درآید به سماع**

**چه محل جامه‌ی جان را قبا نتوان کرد**

ئەوکاتەی یاری بەژن رێکی من دەست بکات بەرەقس و سەماع چ بەهایەی هەیە گەر گیان نەتوانێ یەخەی دادرێت.

سرو: سەرو، یار    بالا: بەژن رێك    آنگە: ئەوكاتە

درآید: دەست بکات، بکەوێتە.

سماع: سەماع ـ حاڵ و سەمای درەوێشانە، حاڵگرتن

(سەماع) کەزاراوەیەکی سۆفیگەرانەیە لەرووی زمانەوانییەوە (لغا) بەواتای (بیستن) گوێگرتن دەنگی خۆش، دەنگی مۆسقی دێت، لەزاراوەی سۆفیگەری و عیرفانیشدا سەماعی سۆفی و دەورێشان (حاڵی دەروێشانەی کوردستانی خۆمان) کە بریتییە لە خوێندنەوەی شیعر بەئاوازو مۆسیقاوەو هەروەها جوڵەو سەماکردرن (حاڵگرتن) بەمەبەستی حاڵ و وەجدی سۆفیانە لە سماع عرفان و سودی سەماعی تەواو لەسەر چوار رەگەزی بنەرەتی هەیە وەستاوە کە بریتین لە (١-شیعر ٢-ئاواز ٣-مۆسیقا دەف، نای، تەپڵ ٤=جوڵە (سەماو هەڵپەرکێ).

لەمێژووی سۆفیگەری ئیسلامیدا لەسەدەی سێیەمەوە سەماع لەنێو سۆفیەکاندا باوبووەو کەسانی وەك (ذوالنون مصری و جونەیدی بەغدادی) باوەریان پێی هەبووە.

لەسەماعدا زیادەرۆیی زۆرکراوە، بۆیە رای عارف و سۆفییەکانی جیهانی ئیسلام سەبارەت بەسەماع جیاوازەو دەبنە سێ گروپ.

گروپی یەکەم: زۆر داکۆکی لەسەماع دەکەن و تا فەرزنزیکی دەکەنەوەو پێیان وایە کە سەماع سۆفی و عارفان پێویستەو تەنانەت کەسێکی وەك (شەمسی تەبریزی) بە واجب (قرّة العین) ی دەزانێت و پێی وایە جیلوەو تەجەلی خودا لە سەماعدا زیاترە. دەکرێ ئەم گروپە بە ئەو پەرگیرەکان — افراطی — بناسرێن کە تادوایین ئاست سەماع بەپێویست و تەنانەت



پیرۆزیش دەزانن و بەهیچ شێوەیە گومان لە ناجایزی ناکەن، شەمسی تەبرێزی و مەولانا جلال الدین رۆمی و فخرالدین عەوای و اوحددین کرمانی لەناودارەکانی ئەم گروپەن، هەروەها تەریقەتی قادری کوردستانی خۆشمان تارادەیەکی زۆر هاوران لەگەڵ ئەم گروپەدا.

گروپی دووەم گروپی میانەرەوکانە ئەم گروپەش دیسانەوە سەماع بەچاك دەدەنە قەڵەم، بەڵام وەك گروپی یەکەم زێدەرۆیی و ئەوپەرگیری تێداناکەن و ناگەینە ئاستی فەرزو تارادەیەك بەتوێشووی دەردەران و بێچارەکانی رێگەی تەریقەتی دەزانن و بۆقۆناغێکی عارف بەپێویستی دادەنێن گوس سەبارەت بەسماع گوتویەتی: سەماع توێشووی بێ چارانە، ئەوکەسەی بەم رادەگەیشت — وەسڵ — پێویستی پێی نامێنێ.

گەورەکانی وەك شەهاب الدین سهروردی، غەزالی، هجویری، گوس، جونەیدی بەغدادی لەسەر ئەم بیروڕایەن.

گروپی سێیەم/ بەتەواوی سەماع رەتەدەکەنەوە و بەخراپی دەزانن، سەردەستەی ئەم گروپە عارفی گەورە محی الدین عربی (ابی عربی) یە کە ئەسڵەن سەماع بەشتێکی هەرزە دەداتە قەڵەم ئەم دووجۆرە سەماعی جیاکردوتەوە:

١- سەماعی رەها کەسەماعی ئیلاهی و روحانییەو مرۆڤ لە بێدەنگیدا دەبێت و چێژ لە ئونس دەبات.

٢- سەماعی ل پابەند — مقیدیا سنووردار: ئەوسەماعەیەکە تیایدا چێژ لە مۆسیقا دەربردرێت و کاریگەری لەسەر نەفس هەیە نەوەك روح و هۆکارێکە بۆ دورکەوتنەوەی مرۆڤ لە حق. ٢٠٩ س

ناودارترین سۆفی — لەکوردستاندا تەریقەتی بەربوی هەیە — کە سەماع رەت بکاتەوە بهاء الدین نەقشبەندەو تەریقەتی (نەقش) یش سەماعی تێدانییە، هەرچۆن بێت سەماع نە بەیەکجاری رەتکراوەو نەبەتەواویش قبوڵکراوە، بەڵام حافظ بەزۆری بەپۆزەتیڤ لە سەماع- کە بەرەقسیش ناوی دەبات) دەروانێت و زیاتر لەگروپی دووەمدا دەگیرسێتەوە — هەرچەندە دەکرێ هەندێ جار تانەلە سەماعی درۆزنانە بدات.

بۆزانیاری زیاتر بروانە سید محمد علی مدرسی (طباطبائی) سماع، عرفان و مولوی چاپ اول، ١٣٧٨، تهران انتشارات / یزدان

محل: بەهار ئیعتبار:،ەرزش

جامەقباکردم: یەخەادین، یەخە دادرین نەریتێکی کۆمەلایەتی/ سۆفیگەرییەو لەودوو حاڵەتەدا ئەنجام دەدرێت.

یەکەمیان لەکاتی بیستنی هەواڵێکی دڵتەزێندا یاخود روداوێکی دڵتەزێندا، دووەمیان تەواو پێچەوانەیەو ولەکاتی خۆشی و شادی لەرادەبەدەردایەو سۆفیەکان لەکاتی حالّدا ئەنجامی دەدەن، یەخە دادڕینی یەکەمیان لەکۆمەڵگەی کوردیدا تایبەتە بەژنان و پرسەوە هەرچەندە دەکرێ پیاویش یەخەی دادڕێت.

بەڵام ئەو یەخە دادڕینەی لە بەیتەدا هاتووە لەجۆری دووەمەو لەخۆشی و شەوق و شوری عیشقدایە، یەخە دادڕینی گیانیش درکەیە لەگیانداکردن.

دەبێ یاری بەژن رێکی باڵابەرز کێ بێت کەکاتێ هەڵدەستێ بۆ رەقس و سەماع شایانی ئەوەبێت یەخەی گیانی بۆدادڕیت و گیانی بۆبکرێتە قوربانی، بێگومان یاری عیرفانییە کە شایانی ئەم قوربانییەیە، بەم پێیە بێت دەستکردنە سەماعی یاری عیرفانی جیلوەکردنیەتی لەکۆڕی زیکرداو گەیشتنە بەقۆناغی شهود واتە خواجە دەڵێ گەریار جیلوە بکات و لەکۆڕی سەماعدا دەرکەوێت ئێمە بگەینە قۆناغی شهود جێگەی خۆیەتی لەخۆشیدا یەخەی گیانمان دادڕین و بیکەینە قوربانی، یائەوگیانە چ بەهایەکی هەیە کە نەتوانێ لەخۆشیدا یەخەی دادڕێت و خۆی بکاتە قوربانی دەرکەوتنی یار.

**٦- نظر پاك تواند رخ جانان دیدن**

**که در آئینه نظر جز به صفا نتوان کرد**

چاوی پاك دەتوانێ رووی یار ببینێ، چونکە لەئاوێنەدا جگە بەپاکی ناتوانرێ هیچ ببینرێت.

جز: جگە.

خواجە بۆ دیتنی رووی یار — کە ئەم رووە دیداری ئیلاهی یاپەی بردن بەنهێنی و رازەکانە — مەرجی پاکی دەهێنێتەوەو دەڵێ یار تەنیا دڵپاکان و عارفان ئەوانەی دیدەیان بەنوری ئەورونە دەتوانن بەدیداری ئیلاهی بگەن یاخود پەی بەرازو نهێنیەکان ببەن، چونکە مەرجی بینین لە ئاوێنەدا پاکییە؛ واتە گەر ئاوێنە غوبارو تۆزی لەسەر بنیشی ناتوانرێ تیایدا ببینرێت، هەروەهاش دڵەکان، دیدەکان گەرپاك نەبن، ناتوانن بەدیداری یاری حەق بگەن.

**٧- مشکل عشق نەدر حوصلەی دانش ماست**

**حل این نکته بدین فکر خطا ناتوان کرد**

مەسەلی عەشق لە تاقەتی زانستی ئێمەدا نییە ناتوانرێ چارەسەری ئەم خاڵە بەم بیرە هەڵەوە بکرێت.

مشکل عشق: مەسەلی عەشق     حوصله: تاقەت، توانان     ماست: ئێمە دایە



مشکل و مەسەلی عەشق، رازو نهێنییەکانی عەشقی ئیلاهییەو دانش و زانستی ئێمەش عیلم و فەلسەفەی مرۆییەو لێرەدا حافظ جەخت لە پەیوەندی نێوان عەشق و عەقڵ دەکاتەوەو پێ لەسەر ئەو خاڵە دادەگرێت کەعەقڵ و زانست توانای دەرککردنی مەسەلی عەشق و عیرفانی نییەو بەم شێوە بیرکردنەوە هەڵەیە ناکرێت چارەی مەسەلی عەشق بکرێت، ئەو دەڵێ: مەسەلی عەشق لەدەرەوەی توانای زانستی ئێمەی مرۆڤەوەیەو بیری پڕ لە هەڵەی مرۆڤ ناتوانێ مەسەلەو نهێنیەکانی عەشق و عیرفان بکاتەوە، ئەم بەیتە جەختکردنەوەیەکی دیکەیە لەوەی کە عیرفان و عەشقی ئیلاهی بەعەقڵ و زانستە دونیاییەکانی وەك فیقە و فەلسەفەو.. هتد تەفسیر دەکرێت و ئەم زانستانە لەتوانایاندا نییە ئەرازانە ئاشکرا بکەن.

**٨- غیرتم کشت که محبوب جهانی لیکن**

**روزو شب عربده باخلق خدا نتوانی کرد**

غیرەت کوشتمی کە خۆشەویستی جیهانی، بەڵام ناتوانرێ رۆژوو شەو دەمەقاڵەی شەڕ لەگەڵ هەموو خەڵکدا بکەم.

غیرت: حەسودی و غیرە، بەڵام ئەم سیفەتە بۆعاشقان سیفەتێکی چاکەو پەسەندە (غیرە)

عربدە: دەمەقاڵەو شەڕەقسە، هات و هاوار

خواجە لەوەی کە یار مەعشوق و مەحبوبی هەمووجیهانە غیرەی هەیەو پێی ناخۆشە کە بەتەنیا مەعشوقی خۆی نییەو ئەم غیرەیە بەردەوام دەیکوژێت، بەڵام دەڵێ چی بکەم خۆ ناکرێ شەوو رۆژ شەڕو دەمەقاڵەم لەگەڵ خەڵکدا بکەی تۆیان خۆش دەوێت و تەنیا خۆشەویستی من نیت.

**٩- من چ گویم کەترا نازکی طبع لطیف**

**تابە حدیست کە آهستە دعانتوان کرد**

من چی بڵێم کەنازکی و سروشت و نەرم و نیانی تۆ تائاستێکە کە ناتوانرێ بەهیوایەتیش هیچ بگوترێت و نزا بکرێت.

تا بەحدیست: تائاستێکە، تائەندازەیەکە     آهستە: هێواش، لەسەرخۆ

دعا: داواو گلەیی

واتای دوعا لە بەیتەدا مانای بەیتەکە بەدوو ئاراستەی جیاوازدا دەبات لە میسراعی یەکەمدا خواجە باس لە نەرم و نیانی و ناسکی سروشتی لە رادەبەدەری یار دەکات تائەو ئاستەی کە ناتوانرێ بەهێواشیش (دعا) بکرێت، گەر (دعا) بەواتای قسەوباس و گلەیی و دەردی شەرحی حاڵ بێت، ئەوا مەبەست لە نازکی سروشتی یار ناسکی و بەنازییەتی کە تاقەتی بیستنی

قسەوباسی عاشقانی نییەو خواجە دەڵێ من چی بڵێم تۆ هێندە نازك و بەنازی توانای بیستنی قسەوباست نییەو بێزار دەبیت تەنانەت گەر زۆر بەهێواشیش قسەوباس بکرێت بێزار دەبیت، بەڵام دەکرێ واتای دووەمی (دوعا) لەبەرچاوبگرین کە نزاکردنە، بەڵام لێرەدا مەعشوق لەو سیفاتە عیرفانیانە دادەنرین کە عارفەکان پێی دەدەن و دەبێتەوەبەخودای بەخشندەی نەرم و نیانی میهرەبان؛ واتە من چی بڵێم تۆ هێندە نەرم و نیانی مرۆڤ ناتوانێ بەهێواشیش دوعا بکات تۆ نزاکەی بۆجێبەجێ دەکەیت، بەڵام وەك گوتمان ئەم لێکدانەوەیە لەفەزای گشتی غەزەلەکە دەردەچێت و زۆر لەگەڵ مەشرەبی ئەشعەریانەی حافظدا یەکناگرێتەوە.

**١٠- بجزآبروی تو محراب دل حافظ نیست**

**طاعت غیرتو در مذهب مانتوان کرد**

بجز: بێجگە، جگە    طاعت غیرتو : گوێرایەڵی کەسی دیکە بکرێت

خواجە جەخت دەکاتەوە کە دڵی خۆی جگە لە میحرابی برۆی یار لە هیچ میحرابێکی دیکەدا نوێژی عەشق دانابەسترێ و لەوئاین و مەزهەبەشدا کە ئەم هەڵبژاردووە جگە لە تاعەت و پەرستشی یار هیچ کەسێکی دیکە ناپەرسترێت و ئیتاعەتی ناکرێت.

عارفەکان هەمیشە لەوبروایەدا بوون کە نابێت هەرگیز جگەلە یاری حەق هیچ کەسێکی دیکە تێکەڵاو بەعەشق و بەبەندایەتی بکرێت، د. هروری لەشەرحی ئەم بەیتەدا بەسەرهاتێکی سوڵتان مەحمودی غەزنەوی و شێخ لە ئەبولقاسمی هێناوەتەوەو نووسیویەتی: کاتێ سوڵتان ویستی بێتە دیداری، ترسا رازی نەبێت و گوێ بە داواکەی نەدات، بۆیە گوتی گەر نەهات ئەم ئایەتەیان بۆ بخوێنن: (اطیعوا الله وطیعوا الرسول واولول الامر منکم) کاتێ داوەتەکە رۆشتن و ئەم ئایەتەیان بۆخوێنن

وە شێخ وەڵامیدانەوەو گوتی پێی بڵێن کە لە (اطیعوا الله) دابەشێوەیەك نغرۆ بووم کە خەجاڵەتی (اطیعوا الرسول) بووم تا بگات بە (اولول الامر){ هروی ج١ ل٥٨٢ بە نقل نفیس – سرچشە قصوف درایران ص١٨٥} .

ئەم بەسەرهاتە ئەوە تاعەت و گوێرایەڵیە تۆخ دەکاتەوە کە عارفەکان تەنیا بۆ مەعشوقی حەق هەیانبووەو جگە لەو گوێیان بەهیچ کەسێکی دیکە نەداوە.



## غەزەلی سەد و سی و سێیەم:

**بەحری هەزەجی شەشی مەقسور**

**(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)**

**١- دل ازمن بردو روی ازمن نهان کرد**

**خدا را باکە این بازی توان کرد**

دڵی لە من رفاندو رووی لە من شاردەوە بۆ خاتری خودا لەگەڵ کێدا ئەتوانرێ ئەم یاریە بکرێت.

برد: بردی، رفاندی، سەندی    نهان کرد: شارەوە، داپۆشی    بازی: بیاری، فێڵ

حافظ لەیار دەدوێت کە فێڵێکی لێکردووە یاخود یارییەکی سەیری لەگەڵدا کردوەو دڵی لێ سەندوەو روشی لێ شاردوەتەوە، دەڵێت بۆخاتری خوا کێ یاری وا یافێڵی وای لێکراوە.

**٢- شب تنهائی ام در قصد جان بود**

**خیالش لطف‌های بی کران کرد**

شەوی تەنیایی نیازی گیانی منی هەبوو کە خەیاڵی نەرمی و لوتفی بێ سنووری کرد.

در قصد جان بوو: نیازی گیانی هەبوو دەیویست گیانم لێ بسەنێ

بی کران: بێ سنوور، بێ کەنار، زۆرو بێ شومار

واتە تەنیایی لەیارو شەوی تەنیایی لەمعشوق هێندە سەخت و نارەحەت بوو وەك ئەوەی کە نیازی وابوو بەعەزابی تەنیایی و دوری بکوژێێت، بەڵام خەیاڵی ئەو لوتفی زۆری لەگەڵ کردم و لەوتنیاییە کوشندەیە رزگاری کردم؛ واتە لەکاتێکدا کەدورم لەیار بەخەیاڵی ئەو دەژین.

**٣- چرا چون لالە خونین دل نباشم**

**کە بامانرگس او سرگران کرد**

بۆچی وەك گوڵاڵە دڵخوێنین نەبم کە نێرگزی یار گوێ بەئێمە نادات وگوێ پێ نەداین و ئیهمال کردین.

خونین دل: دڵخوێنین، خەمبار    سرگران: سەرخوارکردنەوە مەبەست لەگوێ پێ نەدان و ئیهمال کردنە.

واتە چۆن وەك گوڵاڵە کەهەمووگیانی سورەو لەداخ و خەفەتدا دڵم نەبێتە خوێن کە نێرگزی یار گوێمان پێ نادات و سەیرمان ناکات.

**٤- كه را گويم كه‌با اين درد جانسوز**

**طبيبم قصد جان ناتوان كرد**

به‌كێ بڵێم كه به‌م حاڵه‌وه كه ده‌ردی گیان سوتێنه‌رم هه‌یه، دكتۆره‌كه‌م نیازی كوشتنی گیانی بێ هێزی منی هه‌یه.

كه‌راگویم: به‌كێ بڵێم    جانسوز: گیان سوتێنه‌ر    طبیب هه‌مان نێرگز و چاوانی یاره، یاخود خودی یاره، خواجه ده‌ڵێ: به‌كێ بڵێم و هاوار بۆكێ به‌رم كه له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ی خۆم ده‌رده‌درام و ده‌ردم كارییه، ته‌بیبه‌كه‌م كه ده‌بێ چاكم بكاته‌وه‌و ده‌رمانم بۆ بنووسێ نیازی كوشتنی منی هه‌یه‌و قه‌سدی گیانی بێ هێزی من ده‌كات و ده‌یه‌وێت بمكوژێت.

واته چاوانی یار كه ته‌بیبن له‌جیاتی ده‌وا زیاتر ده‌ردم كاری ده‌كات.

**٥- بران سان سوخت چون شمعم كه برمن**

**صراحی گريه و بربط فغان كرد**

به‌جۆرێك منی وه‌ك مۆم سوتاند كه‌سوراحی بۆم گریاو به‌ربه‌ت هاواری لێ هه‌ستا.

بران سان: به‌وجۆره به‌جۆرێك    سوخت: سوتاند، سوتا  له‌فارسیدا كۆمه‌ڵێك كار هه‌ن كه پێیان ده‌گوترێت — ذووجهین — واته له هه‌مانكاتدا تێپه‌رو تێنه‌په‌ریشن و به‌پێی رسته ئه‌ركێكیان ده‌بینن، لێره‌دا سوخت تێپه‌ره‌.

برمن: بۆمن  بربط: جۆره سازێكی ده‌سك كورته وه‌ك عود.

خواجه ده‌ڵێ: یار به‌جۆرێك منی سوتاند و هێنده سامناك بوو كه وه‌ك مۆم سوتام و سوراحی بۆمن گریاو له‌تاو من به‌ربه‌ری دایه هاوارو فغان.

واته عه‌شقی ئه‌و هێنده سوتاندمی شه‌راب و به‌ربه‌تم گرت به‌ده‌سته‌وه.

**٦- صباگر چاره‌داری وقت وقت است**

**كه درد اشتياقم قصد جان كرد**

سه‌با گه‌ر چاره‌ت هه‌یه كاتیه‌تی، چونكه ده‌ردی تاسه‌و ئاره‌زوو نیازی كوشتنمی هه‌یه.

چاره‌داری: چاره‌ت هه‌یه، چاره‌ت پێده‌كرێ    وقت وقت است: كات كاتیه‌تی و له‌باره    اشتیاق : ئاره‌زوو، تاسه‌ی دووری.

خواجه له‌سه‌با داوا ده‌كات كه ئه‌گه‌ر چاره‌یه‌كت هه‌یه بۆ رزگاربوونم له‌م ده‌ده‌ری هیجرانه ئێستا كاتیه‌تی، چونكه تاسه‌ی دووری یارو ئاره‌زووی یار واده‌مسوتێنی هه‌رده‌ڵێی نیازی كوشتنمی كردووه، بۆیه‌ئه‌گه‌ر ئێستا رزگارم نه‌كه‌یت ئیدی چاره به‌سه‌رده‌چێت، بێگومان ئه‌و



چاره‌یه‌ی كه‌سه‌با پێیه‌تی هه‌واڵی یاره یا بۆنی یاره، واته ئه‌ی سروه هه‌ڵكه‌و بۆن یا هه‌واڵی یارم بۆبهێنه ئه‌گه‌ر ناده‌ردی دووری ده‌مكوژێت.

**٧- ميان مهربانان كی توان گفت**

**كه‌يارما چنين گفت و چنان كرد**

له‌نێو میهره‌باناندا كه‌ی ده‌توانرێ بوگوترێ كه یاری ئێمه وای گوت و وای كرد.

میان: له‌نێو، له‌كۆری    چنین و چنان: واو وا له‌راستیدا له‌كوردیدا ئه‌م ده‌ربرینه‌مان نییه، چونكه (ئه‌مه، ئه‌وه)مان هه‌یه‌و له‌بری (این وآن) به‌كاردێت و له‌بری (چنین و چنان) زاراویه‌كی پراوپرمان نییه. یار هه‌رچه‌نده بێ به‌زه‌یی بێت و رووی خۆی له‌عاشقان بپۆشێت و عه‌زاب و ده‌رده‌ی سه‌ری بداته عاشق ئه‌ده‌بێ هه‌یه له‌نێو عاشقاندا كه‌هه‌رگیز باس له یارو بێ میهرییه‌كانی یار ناكرێت، خواجه ده‌ڵێ:

**٨- عدو با جان حافظ آن نكرد**

**كه تير چشم آن ابرو كمان كرد**

دوژمن له‌گه‌ڵ گیانی حافز ئه‌وكاره‌ی نه‌ده‌كرد كه تیری چاوی یاری ابرو كه‌وانه كردی.

عدو : دوژمن    تیرچشم : خه‌مزه وناز، ئاماژه به برژانگ وموژه‌ی چاوی یاره كه به تیر چویندراوه.

**١- يادباد آن كه زما وقت سفرياد نكرد**

**به‌وداعی دل غمديده‌ی ماشاد نكرد**

به‌یادبهینه‌وه ئه‌وكه‌سه‌ی كه له‌كاتی سه‌فه‌ركردن ئێمه‌ی له‌بیرنه‌بوو، ودڵی غه‌مدیده‌ی ئێمه‌ی به خواحافیزیه‌ك شاد نه‌كرد

یادباد : به‌بیرهینانه‌وه، یاد كردن، یادت بێت  آن كه: ئه‌وكه‌سه‌ی كه  زما: له ئێمه، ئێمه‌ی  وقت سفر: له‌كاتی سه‌فه‌ركردن، له‌ساتی سه‌فه‌ركردن  به‌وداعی: به‌خواحافیزیه‌ك، به‌یه‌ك خواحافیزی

**٢- آن جوانبخت كه می زد رقم خيروقبول**

**بنده‌ی پير ندانم زچه آزاد نكرد**

ئه‌و خۆش ئیقبال وخۆش به‌خته‌ی كه ئاسه‌واری چاكه وباشی له كاره‌كانی ئاشكراوروون بوو، نازانم بۆچی ئه‌م غولامه پیره‌شی ئازاد نه‌كرد.

خوانبخت : خۆش ئیقبال،خۆش به‌خت، به‌خت بڵند    رقم زدن: نووسین، نه‌خش كردن "می زد رقم خیروقبول" واته ئاسه‌واری كاری چاكه ورازی كردنی خه‌ڵك له‌ئه‌و په‌یداده‌بوو.

زچه : لەبەرچی،بۆچی، لەبەرخاتری چی

**۳-کاغذین جامه به خوناب بشویم که فلک**

**رهنمونیم به پای علم داد نکرد**

کراسی کاغەزینی بەرم بە فرمیسکی خویاوی چاوەکانم دەشوم،لەبەرئەوەی کە ئاسمان /فەلەك بۆژێر ئالآی داد منی رینمایی نەکرد.

کاغذین جامە: کراسیکە کە زولم لێکراو لەبەردەکرد ودەچووە لای حاکم وەحاکمیش بەبینینی دەیزانی کە ئەو سکالایەکی هەیە. واپێ دەچێت کە ئەگەرکەسێك نیتوانی بێت سکالای خۆی بەدەست حاکم بگەێنێت سکالاکەی لەسەرکاغەز دەنووسی ولەبەری دەکرد پاشان دەچووە ژێرئەو ئالآیەی کە لەسەردەرگای مالی حاکم هەلکراوە ولەوی سکالاکەی بانگەشەدەکرد تاکوو حاکم بیبینی وبەدەم سکالاکەیەوەبێت.

مانای بیتەکە : بەچاولێکردن لەم دابوونەریتەکە ئاماژەی پێکرا مانای بەیتەکە بەم جۆرە دەبێت کە : لەگەلَ ئەوەش کە کراسی کاغەزین لەبەرکردووە وسکالاوگلەیەکانی خۆمم لەسەری نووسیوە، بەلاَم رۆژگارمنی بۆژێر ئالآی داد رێنمایی نەکرد تاوەکووگوێ بیستی سکالاکەم بن.بەناچاری دەبێ بەفرمیسکی خویناوی چاوەکانم ئەوەی لەسەرکراسە کاغەزیەکە نووسیمە بشوم.

**٤- دل به امّید صدائی که مگردرتو رسد**

**نالەها کرد درین کوه که فرهاد نکرد**

دڵی من بەهیوای ئەوەی کەدەنگدانەوەی دەنگم بگاتە تۆ، ئاواهاوارەکاتلەم گەردوونەداکە فەرهادی کۆکەن هاواری نەکردووە

صدا: دەنگ، عکس الصوت، دەنگدانەوە دەنگ درتورسد: بگاتە تۆ، بە تۆ بگات

نالە: فوغان،هاوار، نالە نالَ

**٥- سایه تابازگرفتی زچمن، مرغ سحر**

**آشیان درشکن طرّەی شمشاد نکرد**

لەوکاتەوە کە سێبەرخۆت لەسەرچیمەن لادا، چیترمەلی سەحەرش(بولبول) لەنێوان چلەشمشادەکان هیلانەی نەکرد

مرغ سحر : مەلی سەحەر، بولبول آشیان : هێلانە



لێرەد بەیارومەحبوبی خۆی دەلێت : لەو کاتەوە کە تۆ ناچێتەناو چیمەن وسێبەرخۆت ناخەیتە سەرچیمەنەوە،چیمەنەکەش لە رەنگ وروخسارکەوتووە وچیتر بولبول رووی ناداتی وبۆلای ناچێت.

**٦- شایدارپیک صبا ازتو بیاموزدکار**

**زانکه چالاکتر ازاین حرکت بادنکرد**

واشایستەیە کە پەیکی سەبا کار لەتۆوە فێربێت چونکە لەمە چالاکتر نەجولاَوەتەوە

شاید: شایستەیە، جێگەی خۆیەتی ار: ئەگەر بیاموز: فێر ببێ

لەکاتێکدا (با) رەمزی خێرا رۆشتنەو (سەبا — سروە)ش رەمزی هێمنی و لەسەر خۆییە.
خواجە وەسفی رەوتی خێرای یار دەکات و دەلێ: واچاکە یا جێگەی خۆیەتی کە نامەوبەرو قاسیدە سەبا کاری خێرارۆشتن لەتۆوە فێرببێت چونکە تۆ لە (با) ش خێراتر بەرێگادا دەرۆیت و (با)ت پێ ناگات.

**٧-کلك مشاطەی صنعش نکشد نقش مراد**

**هرکه اقرار بدان حسن خداداد نکرد**

قەلەمی جوانکاری ئافەرینەشی نەخشی موڕادی ناکێشێ، هەرکەسێ کە دانی بەوجوانییە خودا بەخشە (سروشتی)دا نەنێت.

کلك: قەلەم مشاطە: شانەکەر، ژنێ کە کاری ئارایشکردنە، رازێنەرەوە
صنع: ئافەرینیش

اقرار کردن: دان نان خداداد : خودابەخش، سروشتی.

خواجە مەرجی خۆشبەختی داننان بەجوانی خواپێداوی یارەوە دەبەستێتەوەو دەلێ: هەرکەسێ دان بەجوانی سروشتی مەعشوقی حەقدا نەنێت، خوای قەلەم بەدەست و ئارایشتگری گەردوون نەخشەی ئاواتەکانی بۆ رەسم ناکات و بەئاوات ناگات.

لێرەدا حافظ لەگەورەیی یار دەدوێت، یارێك کەقەلەمی جوانکاری گەردوون بەویستی ئەودەبێ جوانیێ کە بەخۆشبەختی بەستراوە بەداننان بەجوانی ئەودا دەکرێ لە غەیری خودی جەمال و جەمیل جوانێکی دیکەی دەسەلآتدار هەبێت کە ئەم سیفەتەی تێدابێت؟!

**٨- مطربا پرده بگردان و بزن راه عراق**

**که بەاین راه بشد یارو زما یادنکرد**

ئەی مۆسیقاژەن ئاوازەکە بگۆرە و ئاوازی عێراق لێدە، چونکە یار بەم رێگایەدا رۆشت و یادی ئێمەی نەکرد.

مطربا: ئەی موتریب      پردە: پەردەو ئاوازی مۆسیقییە پردە      بگردان: پردە بگۆڕە
بزن: لێدە      راه عراق: ئاوازی ڕێ عێراق، کە یەکێکە لە مەقام مۆسیقاییەکان (راه)
ی دووەم بەوتاتای ڕێگە هاتووە      بشد: ڕۆشت.

خواجە لەنێوان (عراق) و (راه)دا — کەرهەدووکیان دوو واتا دەگەیەنن — یارییەکی زمانی دروست دەکات جارێك (راه) بمانای پەردەو عێراق بەمانای مەقامی مۆسیقی بەکار دەهێنێ و جارێکی (ئەم ڕێگەیە) یە بە واتای ڕێگای عێراقی عەجەم (ئەسفەهان) بەکاردەهێنێ و دەڵێ: ئەی مۆسیقاژەن لە هەر مەقامێك یا ئاوازێکدای بیگۆڕە بۆمەقامی عێراق، چونکە یار بەرێگەی عێراقی عەجەمدا — ئەسفەهان = دا سەفەری کردو ئێمەی لەیاد نەبوو.

**۹- غزلّیان عراقیست سرود حافظ**

**که شنیداین ره دلسوز که فریاد نکرد**

سرودی حافظ غەزەلیاتی عێراقییە، کێ ئەم ئاوازە دڵسۆتێنرەی بیست و فەریادی نەکێشا.

عراقی: دەتوانرێ سێ واتای لەم وشەشەیە هەڵهێنجرێت

۱- عارفەکانە کە ناوی (ابراهیم)ەو نازناوی (فخرالدین)ەو تەخەلوسی (عێراقی)یەو لە هەمەدان ژیاوە لە ساڵی (٦٨٨) داکۆچی دوایی کردووە.

۲- مەقامی عێراق.

۳- شێوازی عێراقی کە یەکێکە لە شێوازەکانی شیعری فارسی و حافظ بەوشێوازە شیعری گوتووە، بەڵام ئایا ئەم ناولێنانە لەو سەردەمەدا بووە یاخود پاشتر دروستبوو نازانرێت، هەربۆیە ئەگەر سێیەم بەڵگەی تەواو نییە.

۱- فخرالدین عێراقی (کۆچکردووی ٦٨٨هـ) شێخ فخرالدین ابراهیم بن بزر جمهر بن عبداغفار همدانییە یەکێکە لە شاعیرە عارفە پلە بەرزو ناودارەکانی سەدەی حەوتەمی کۆچی، ناوی (ابراهیم ) ەو نازناوی (فخر الدین)ەو تەخەلە لوسی (عراقی)یە لەهەمەدان ژیاوە (خرمشاهی ل٥٧) ئەگەر (عراقی) بەواتای یەکەم بێت ئەوا حافظ دەیەوێ گەورەیی فخرالدین عێراقی بخاتە روو، هەروەها دان بەو کاریگەریەشدا بنێت کە ئەولەسەر شیعرەکانی هەیەتی و دەڵێ: سرودی حافظ غەزەلیاتی فخرالدین عێراقییە، هەربۆیە هێندە پڕ لە سۆزە زەهەر کەسێك گوێی لەم مەقامە هەڵویستێنەرە بێت فریاد دەکێشێ و هاوار دەکات.

بەهێنانی (این ره) و (شنیدن)دا لەم واتایە دور دەکەوینەوە، چونکە ئەوەی دەبیسترێت و ڕێگە (ئاواز)ە مەقامە نەوەك شیعرو بە مەش واتای دووەمی بەیتەکە بەدەست دەهێنرێت کە



مەبەست لە مەقامی عێراقەو دەڵێ: لەبەر ئەوەی شیعرەکانی حافظ بەمەقامی عێراقی دەگوترێن هەرکەس گوێی لەم مەقامە دڵسوتێنەرە دەبێت بانگ و سەڵا هەڵدەدا.

مانای سێیەمیش کە ئەگەرێکی دوورە دەڵێ لەبەرئەوەی شیعری حافظ بەشێوازی عێراقی نووسراوە.

## غەزەلی سەد و سی و چوارەم:

**بەحری موزاریعی هەشتی ئەخرەبی مەکفونی مەحزوف**
**(مفعول فاعلات مفاعیل فاعلن)**

**١- رو بررهش نهادم و برمن گـذر نکرد**
**صد لطف چشم داشتم و یک نظر نکرد**

رووم خستە سەرخاکی سەرەڕێ و بەسەر تێنەپەڕی چاوەڕێی سەد جۆرە لوتفی بووم و لای لێ نەکردنەوە

بررهش: لەسەر رێگەی نهادم: دانا برمن: بەسەرما
چشم داشتم: چاوەڕێ بووم نظرنکرد: لای نەکردەوە: سەیری نەکرد، گوێی پێ نەدا

عاشقەکان زۆرجار سەریان دەکەنە بەردەبازی مەعشوق یاخود سەریان دەخەنە سەرەڕێی یارتاوەکو پێیان پێدابنێت و پێی موشەرەف بن، بەم هەموو جارێك بەرهەمی ئەم کارەیان گوێ پێنەدانی یاری بەنازپەروەردە، لێرەشدا شاعیر دەڵێ سەرم خستە سەر رێگەی تێپەڕینی یار تاوەکو بەسەرما تێپەڕێت، بەڵام بەسەرما تێنەپەڕی و چاوەڕێی سەدان لوتف و چاکەبووم لێی و کەچی هەر ئاوڕیشی لێ نەدامەوەو گوێی پێ نەدام، لەم دەربڕینەدا جەخت لەسەر گەورەیی و بێ نیازی مەعشوق دەکرێتەوەو کەهیچ کاتێ پێویستی بەعاشق نییە.

**٢- سیل سرشك ما زدلش کین بدر نبرد**
**درسنگ خارە قطرەی باران اثر نکرد**

لافاوی ئەشکی ئێمە کینەی لەدڵ دەرنەکرد، دڵۆپە باران کاریگەری لەبەردی (خارا) نەکرد

سرشکك ئەشك، فرمێسك، سروشك کین: کینە، رق، قین بدرنبرد: دەرنەکرد، نەیبر دەدەرەوە سنگ: بەرد سنگ خارە: بەردی خارا، ئەوبەردە رەقەی کە دلۆپەی باران کاریگەری لەسەری نییە. اثرنکرد: کاریگەری نەبوو.

دڵی یار لەرەقی و سەختی دا هەر لەبەردی خارا دەچێت و هیچ جۆرە فرمێسك و گریانێك کاریگەری لەسەری نابێت، خواجە دەڵێ: کاتێ دڵی یار رقی لەئێمە هەڵگرتبوو، یاخود کینەوە رق ببوو، ئێمە زۆر گریایین و لافاوی فرمێسکمان باراند تائەو رقوکینەیە بشۆینەوەو لەدڵی دەرکەین، بەڵام دڵی ئەو لەبەردی خارا دەچوو، هەروەك چۆن باران کار لە بەردی خارا ناکات، لافاوی فرمێسکی ئێمەش کاری لە دڵی یار نەکردو کینەی لەدڵدا دەرنەکرد.



**٣- یارب تواین جوان دلاور نگاه دار**
**کز تیر آه گوشە نشینان حذر نکرد**

خودایە تۆ ئەم لاوە دلێرە بپارێزە کە لەتیری ئاهی گۆشەنشینان نەترسا و خۆی نەپاراست.

جوان: لاو،گەنج دلاور: دلێر، دلاوەر نگاه دار: بپارێزە
حذرنکرد: نەترسا، خۆی نەپاراست حەزی نەکرد

خواجە دوعا بۆ ئەو دلێرو لاوەوە دەکات کە هیچ گوێ بە تیری ئاهی گۆشەنشینان و بێ نەوایان نادات و بەمەعزوری دەگوزەرێ و دەڵێ خوایە بی پارێزە ئەم بەیتەش لە بێ نیازی یار دەدوێت.

**٤- ماهی ومرغ دوش نخفت از فغان من**
**وان شوخ دیدە بین کەسر ازخواب برنکرد**

دوێنی شەو ماسی و باڵندە لەناڵەو هاواری من نەخەوت و بڕوانە ئەو شۆخەعەیارە کە سەری لەخەو بەرز نەکردەوە.

ماهی: ماسی مرغ: باڵندە ـ بەشێوەیەکی گشتی - خفت: نەخەوتن (نخفت) بۆکەسی سێیەمی تاکە، بەڵام لێرەدا بۆتۆ بەکارهاتووە.

شوخ دیدە: شۆخی عەیار بین : ببینە سربرنکرد: سەری بەرز نەکردەوە

دیسانەوە باس لە بێ نیازی یارو گوێ پێنەدانی ئەوە بەعاشق دەکات، شاعیر باس لە ناڵەو هاواری دوێنی شەوی خۆی دەکات لەدەستی عەشقی یار کە چۆن تەواوی گیاندارانی لەخەوراپەڕاندووە بەماسی بنی دەریاوە تاباڵندەی ئاسمانیش کەئەم ناڵەو هاوارە ئەو شۆخە عەیارە/ مەعشوقەی بەئاگا نەهێناو لەخەو هەڵنەستاند، یاخود خۆی لەگێلی داو سەری بەرنەکردەوە.

**٥- می خواستم کەمیرمش اندر قدم چوشمع**
**او خودگـذر بەماچو نسیم سحر نکرد**

دەمویست لەبەر پێ دا وەك مۆم گیانفیدا کەم، بەڵام ئەو وەك شەماڵی بەیان بەلای ئێمەدا تێنەپەڕی.

می خواستم : دەمویست میر: مردن، فانی بوون اندر قدم : لەبەرپێی دا

خواجە وەك بڵێی کە بیەوێ تەواوی ئەم غەزەلە بۆ بێ مروەتی یارو ئاوڕنەدانەوەکانی ئەو تەرخان بکات، لەگشت بەیتەکاندا واتایەکی روون یاخود شاراوەی لەم جۆرە دەخاتە روو، لێرەشدا دەڵێ من کە خۆم ئامادەکردبوو لەبەر پێی دا بتوێمەوەو گیانم فیداکەم و دەمویست

وەك مۆم ببمە قوربانی خاكی رێی بەڵام ئەو وەك سروەی بەیان تێپەری وبەلای ئێمەدا گـوزەری نەكردو ئاوڕی نەدایەوە.

**٦- جانا كدام سنگدل بی كفایت است**

**كوپیش زخم تیغ تو جان را سپرنكرد**

گیانـەكام دڵرەقـی بـێ عـەقڵ و نالایقەكەلەبـەردەم شمـشێری تۆگیـانی قـەڵغان نكـات ونەیخاتەبەرشمشێری‌تو.

كدام: كام   بی كفایەت: نالایق، نەزان   سپر: قەڵغان   جان راسـپركردن، گیان كردنە سوپەر، گیان خستنەبەرشمشێر.

خواجە یاری بەهەموو لەیاریی و بەهەموو مەینەت و عەزابكانیەوە خۆش دەوێ و خـۆلادان لەشمشێرو تیغی یاربەبێ عەقڵ و بێ لیاقەتی دەزانێت و دڵـێ ئەوكەسـەی كـەگیانی نەخـستە بەردەمی شمشێری تۆ كام دڵرەقی بێ عەقڵ بوو، واتە ئەوەی شایان و عاقڵ بێت گیـان دەخاتـە بەرشمێری تۆو هەموو عەزابەكانی دەردی دووری تۆ و عیشوە و نازەكانت قەبوڵ دەكات.

**٧- كلك زبان بریدەی حافظ درانجمن**

**باكس نگفت رازتو تا ترك سرنكرد**

قەڵەمی زمان براو (درێژ ـ عیوضی ) ی حافظ لەكۆڕدا رازی تۆی بەكەس نەگوت تا سەری خۆی دانەنا.

بریدە: براو   كشیدە: درێژ   انجمن: كۆڕو كۆمەڵ   ترك سـرنكرد: سـەری دانـەنا وازی لەسـەر نـەهێنا، مەبەسـت لـە سـەردانانی قەڵـەم،دانانی قەڵەمـە كـەتاوەكو دانـەدرێت نانووسێت و خواجە ئەم دانانەی بەسەردانان و سەربرین داوەتە قەڵەم.

لەنوسخەی(رشید عیوضـی)دا لەبری زمان براو ـ زبان بریدە ـ زمان درێژ ـ زبـان كـشیدە ـ هاتووەو لەهەر دوو بارەكەدا زەمی زمان دەكەن، چونكە زمانبراوی و زمان درێژی هـەردووكیان سیفەتی خراپی مرۆڤن.

بەهەرحاڵی خواجە زەمی قەڵەمە كەی خۆی دەكات كەباسـی رازی یـارو عەشـقی لـەكۆرو كۆمەڵدا نووسیوەو كردووە، بەڵام جەخت لەسەر ئەوە دەكاتـەوە كـە هاتـاوەكو سـەری دانـەناو نەیانكوشت هیچ رازێكی نەدركاندو لەوپێناوەدا سەری دانا.



# غەزەلی سەد و سی پێنجەم:

**بەحری موزاریعی هەشتی ئەخرەبی مەكفونی مەقسور**

**(مفعول فاعلات مفاعیل فاعلن)**

**١- دلبر برفت و دلشدگان را خبر نكرد**

**یاد حریف شهرو رفیق سفر نكرد**

دولبر رۆیشت بەدلپێكراوانی نەگوت یادی هاودەمی شارو هاورێی سەفەرەی نەكردەوە.

برفت: رۆشت   دلشدگان: (دلرۆشتوان) دلپێكراوان، عاشقان و دلسوتاوان

خبر نكرد: پێی نەگوتن، ئاگاداری نەكردنەوە   حریف: هاودەم

ئـەم غەزەلـەی خواجـە چ لـە رووی روخـساری شـیعرو وشـەكانەو دەربـرین و وێنـە شیعرەكانەوەو چ لەرووی ناوەرۆك و واتاوە تێكەڵاوییەكە لەدوو غەزەلی پێشوو، هەربۆیـە بەكورتی شەرحی دەكەین.

یاری رۆشت و دلپێكراوانی بەجێهێشت و كەسی ئاگادارنـەكردەوەو بـیری بـەلای هـاودەم و هاورێی شارو هاورێی سەفەرەوە نەبوو.

**٢- یابخت من طریق مروّت فرو گـذاشت**

**یااو بەشاهراه طریقت گـذرنكرد**

یا بەختی من رێگەی پیاوەتی و چاكەی بەجێهێشت یائەو بەشارێی تەریقەتدا گوزەری نەكرد.

مروّت: پیاوەتی، چاكە، مروەت، ئینساف  فروگـذاشت : بەجێ هێشت   شاهراە: شارێ

خواجە دەزانێت لەتەریقەتدا مرۆڤ بەیار دەكات و هەرهیچ نەبێ بۆنی یاری بەسەردا دێـت و ریعایەتی ئەم بنەمایە دەكرێت، بەڵام خواجە ئەم بۆنەی یاری پێ ناگـات ئـەو هۆكارانـەی ئـەم دیاردەیە بۆیەكێ لەم دوانە دەگێڕێتەوە: بەختی خەوتووی خـۆی یـا نـەهاتنی یـارو دەڵـێ: یـا ئەسڵەن بەختی من رێگەی ئینسان وپیاوەتی لەگەڵ خۆمدا شـارەزانییەو بـەجێی هێـشتووە یـا ئەوەتا ئەو بەشارێی تەریقەتدا تێنەپەڕیوە، چونكە گـەر تێپەریبایـەو بـەئادابی لالێكردنـەوەی ئەورێگەو شێوازە لای لێدەكردەوە مەگەر ئەوەی كە بەخت لەخەوێكی قووڵدا بێت.

**٣- من ایستادە تاكنمش جان فدا چوشمع**

**اوخود گـذر بەما چونسیم سحر نكرد**

من وەستاوم تاوەك مۆمی گیانم بكەمە فیدای، بەڵام ئەو وەك سروەی بەیان بـەلای ئێمـەدا گوزەری نـەكرد؛ واتـە تەنانـەت وەك سـروەش تێنەپـەری بەلامانـدا تـاوەكو مـۆم بمانكوژێـت (تالەپێشی داگیان بەخت بكەم).

**٤-گفتم مگر بەگریە دلش مهربان کنم**

**درنقش سنگ قطرەی باران اثرنکرد**

گوتم مەگەر بەگریان دڵی میهرەبان بکەم، بەڵام لەهەڵکۆڵراوی سەربەرد باران کاریگەری نەبوو

نقش سنگ : هەڵکۆڵراوی سەربەرد مەبست لەدڵی یارە کە وەك بەرد رەقە.

**٥- دل را اگرچە بال و پر ازغم شکستە شد**

**سودای دام عاشقی ازسر برنکرد**

ئەگەرچی دڵم لەغەمدا پەڕوباڵی شکاێنراوە، بەڵام بیری دوای داوی عاشقی لەسەر دەرنەکرد.

بال و پر: پەڕوباڵ شکستە شد: شکێنرا سودا: سەودا، بیر ازسربرنکرد: لەسەر دەرنەکرد

دڵی عاشق بە هەموو شکست و نسکۆکانیشەوە هەر لەبیری داوی عەشق و عاشقی دایەو لەسەری دەرناچێت.

**٦- هرکس کەدید روی تو بوسید چشم من**

**کاری کەکرد دیدەی من بی نظر کرد**

هەرکەس کەرووی تۆی بینی چاوی منی ماچ کرد، چونکە کارێ کە کە چاوی من کردویەتی بەبێ ئاگایی نەبووە.

بوسید: ماچی کرد بی نظر: بەبێ ئاگایی، بەبێ وردبونەوە، عاقڵانە

خواجە لێرەدا باس لەزەوق و چێژی جوانناسی چاوانی خۆی دەکات و ئەم جوانناسیەش لەیاردا قەتیس دەکات و دەڵێ: هەرکەس رووی تۆی بینی چاوی من ماچ کرد لەسەری ئەوەی کە عاقڵانە تۆی هەڵبژاردووە، واتە تۆهێندە جوانی هەرکەس دەزانێ من عاشقی جوانێکی وەك تۆ بووم چاوم ماچ دەکات، نەوەك زۆرینەی مەعشوقەکان کەتەنیا لەچاوانی عاشقدا جوانن، ئەم بەیتە جوان روخساری دەرەوەش بەیاری عیرفانی دەدات و خواجە پێی وایە کەیاری ئەزەلی و حەق لە روخساریشدا — هەرچەندە زۆرێك پێیان وایە روخساری نییە — لەسەر تپی جوانانەو بگرە هەرلەوێنەی نییە.

تێکەڵاوی نێوان ئەم سێ غەزەلەی دوایی بەرادەیەکە کە سەرباری دووبارەبونەوەی وشەو دەربڕین و تەنانەت میسراعیش بەیتەکانیان تێکەڵابووەو لەشەرحی سوودیا دوابەیتی غەزەلی پێشوولێرەدا هاتووە، هەرچەندە ئێمە لەبەر ئەوەی لە زۆربەی سەرچاوەکاندا شێوەی پێشوو



هاتبوو پەیڕەویمان لەسودی نەکردووە — بەڵام رای سودی دروستتر دێتە بەرچاو، چونکە ئەم غەزەلە لەم شێوەیەی بەپێ بەیتی تەخەلوسی تەواو بووە، هەروەها لە حافظی (سیودهی)شدا بەیتی تەخەلوسی غەزەلی پێشوو لێرەدایەو لەپێشی بەیتی تەخەلوسی غەزەلی پێشوو بێت:

**حافظ حدیث عشق تو ازبس کە دلکش است**

**نشنیدکس کە ازسر رغبت زبرنکرد** ل (موهدی)

سودیش لە غەزەلی پێشوودا هەمان ئەم بەیتەی سەرەوەی هێناوەتەوە، بەڵام لەبری (عشق) (نغز)ی نووسیوە{ ج ٢ سودی ل٨٤٨}.

بەهەرحاڵ ئەم دیاردەی — دیاردەی تێکەڵاوی بەیت و وشەو میسراع و هاوشێوەی غەزەلەکان — دەمانگەیەنێتە ئەوگومانەی کە رەنگە ئەم دوو یا سێ غەزەلە هەریەك غەزەل بن و لەئەنجامی زۆر دووریی نوسخەکان لەیەکترییەوە کرابنە دوو یاسێ غەزەل یابەیتی جیاوازو جێگۆڕکێ، چونکە ناکرێ شاعیرێك دوو غەزەل یازیاتر بەهەمان واتاو دەلالەت وهەمان فۆرم و بەیت و وشە و میسراعەوە دابنێت.

## غەزەلی سەد و سی شەشەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی مەقسور**

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلان)**

**١- دیدی ای دل که غم عشق دگربار چه کرد**

**چون بشد دلبرو بایار وفادار چەکرد**

بینیت ئەی دڵ کەغەمی عەشق جارێکی دیکه چی کرد، دولبەر چۆن رۆشت و چی بەیاری وەفادارکرد.

دگربار: جارێك دیکه    چەکرد: چی کرد    چون شد: چۆن رۆشت

ئەم غەزەلەش لە فەزایەکی هاوشێوەی غەزەلەکانی دیکەدایە، بەڵام لێرەدا خواجە قووڵتروجیاوازتر لەوان کار لەگەڵ وشەو واتاکاندا دەکات و زیاتر بەئاشکرا رۆدەچێتە نێو عیرفانەوە. دولبەر هەمان ئەو دولەبەرەیە کە پێویستی بەکەس و بەهیچ نییەو باکی نییە لە مانەوەو رۆشتن دڵراگرتن و دڵشکاندنی عشقان، خواجە لای دڵی خۆی شکات لەیار و لەغەمی عەشق دەکات کەیار دەروات و عاشقان تووشی غەمی عەشق دەکات.

**٢- آه از آن نرگس جادو که چه بازی انگیخت**

**آه ازآن مست که بامردم هشیار چەکرد**

وای لەو چاوە جادوگەرە کە چ یارییەکی بەرپاکرد، ئای لەو مەستە کە چی لەگەڵ خەڵکی هۆشیاردا کرد.

آه : وای ـ بۆ سەرسورمانەـ    انگیخت: بەرپاکرد، هەڵگیرساند    هشیار: هوشیار کەسێ کەمەست و سەرخۆش نییە.

خواجە سەرسورمانی خۆی لە چاوی مەستی جادوگەری یار دەردەبرێت کە بەمەستی خۆیەو چ کارێك بە خەڵکی هۆشیار دەکات، خواجە لەو حەیران بوونەی خۆی و عارفەکان دەدوێ کەچاوی مەست و فیتنە ئەنگێزی یاری ئەزەلی دوچاریان دەکات، حافظ دەڵێ: وای لەو چاوە مەستانەی کە لە نێرگز دەچن و چاو بازن و خەڵکی فریو دەدەن و فروفێڵ و یارییەك بەرپادەکەن ئای لەو مەستە ـ چاوانی یار ـ کەچی بەمرۆڤی هۆشیار دەکات.

**٣- اشك من رنگ شفق یافت زبی مهری یار**

**طالع بی شفقت بین کەدرین کارچەکرد**

ئەشکی‌من‌لەبێ میهری یارەوە رەنگی شەفەقی وەرگرت سەیری بەختی بی بەزەیی‌کەلەم کارەداچی‌کرد.



شەفق: ئاسۆی سوری پاش خۆرنشین    مهر: خۆشەویستی،خۆر، هەتاو

طالع: بخت    شفقت: بەزەیی

دەکرێ (مهر) مانای خۆشەویستی یاخود هەتاو بگەیەنێت لە مانای یەکەمیاندا خواجە مەبەستی لەبێ میهری یارە، بەڵام لەمانانی دووەمیاندا خودی یارە.

ئەو دەڵێ: لەتاو بێ میهری یارەوە فرمێسکی من وەك خوێن سور بوە و رەنگی شەفەقی گرتووە، یا خود لەتاو ئاوابوونی یارەوە (سەفەرکردنی یاخود ونبوونی لەبەرچاوم) فرمێسکی من وەك شەفەق سور بووە؛ واتە لە دوای رۆشتنی یار هێندە گریاوم فرمێسکم رەنگی شەفەقی گرتووەو بووەتە خوێن، سەیری بەختی بێ بەزەیی بکە چی لەمن کردووە.

**٤- برقی از منزل لیلی بدرخشید سحر**

**وه که باخرمن مجنون دل افگار چەکرد**

بەرەبەیان تیشکێ لەماڵی لەیلاوە درەوشایەوە وای کەچی لە خەرمانی گیانی مەجنونی دڵ بریندارکرد.

برق: تیشك  بدرخشید: درەوشایەوە  دل افگار: دڵ بریندار

بەرەبەیان، ئەوکاتەی کەعاشقان بەیادی مەحبوب و مەعشوقەوە نغرۆی دەریای یادو زیکرن، تیشکێ لەماڵی یارەوە درەوشایەوە بەرەو عاشقان هات و خەرمانی ئارامی و سەبری عاشقانی دڵ برینداری ئاگرداو کارێکی وای بەسەر هێنان کە جێگەی گێڕانەوەی نییە.

حافظ لەیلا بەرەمزی مەحبوب و مەجنونیش بەرەمزی عاشقان دەداتە قەڵەم.

**٥- ساقیا جام میم ده که نگارندەی غیب**

**نیست معلوم کەدر پردەی اسرار چەکرد**

ئەی ساقی پێکی مەیم بدەرێ کە ئاشکرانییە نووسەری غەیب لە پەردەی نهێنییەکاندا چی نووسیوە

دە: بدەرێ    نگارندە: نوسەر، وێنەکێش/ نیگارکێش    نیست معلوم: ئاشکرانییە

حەیرانی خواجە لە گەردون و لەقەزاو لەچارەنووس و لەوێنە جوانەکان و نووسینە نازدارەکانی پشتی پەردە هەرگیز کۆتایی نایەت و تەنیا رێگا چارەش هەڵبژاردنی مەی و ساقییەو خۆدانەدەست عەشقە.

نیگارکێش نووسەری غەیب خودی پەروەردگاری جوانکارە کە مەحاڵە عەقڵی تەسکی ئێمە لەکارەکانی پشتی پەردەی ئەو تێ بگات کە چ نارێکی کێشاوە یاخود چی نووسیوە، خواجە

بەدەرکی ئەم راستییەوە بەساقی دەڵێ جامی مەیم بدەرێ و بمخەنە دەریای عەشقەوە، چونکە ئاشکرا نییە کە نیگارکێش/ نووسەری غەیب لەپشت پەردەوە چی بۆ کێشاوین.

**٦- آن كه پر نقش زد اين دايره‌ى مينائى**

**كس ندانست كه در گردش پرگار چه‌كرد**

ئەوکەسەی کە ئەم بازنە مینایی شینەی پڕ لە نیگارکرد کەس نازانێ کە لەسوڕانی پرگاڵدا چی کردووە.

پرنقش زد: پڕ لە نیگار دروستی کرد، مەبەست لە ئەستێرە زۆرەکانی ئاسمانە کە بوونەتە نیگاری رەنگاورەنگ.

دایرە: بازنە، مەبەست لە ئاسمانە    مینائی: مینایی، شین    گردش: سوڕانەوە

پرگار: پرگاڵ

دیسانەوە حەیرانی خۆی بە جوانی لەرادەبەدەرو هونەرو جوانکاری و وردی وەستاو ئافەرینی گەردوون دەدوێ و کە ئەو (خودای جوانکار) کە ئەم هەموو نیگارە جوانەی لەم ئاسمانە مینایی و شینەدا دروستکرووە، کەس نازانێ کە چۆن و بەچ شێوەیەك دروست کردووەو چی لە دەورانی پرگالیدا هەیە.

واتەکەس پەی بەنهێنییە خوداییەکان نابات.

**٧- فكر عشق آتش غم دردل حافظ زدو سوخت**

**يار ديرينه ببينيد كه بايار چه‌كرد**

بیری عەشق ئاگری خەمی بەردایە دڵی (حافظ) و سوتاندی سەیری یاری دێرین بکەن کەچی لەیاری خۆی کرد.

دیرینە: دێرین، قەدیمی

وەك هەمیشە گوتراوە حافظ بۆ رزگاری گیانی لەحەیران و دووری مەعشوقی ئەزەلی رێگەی عەشق و عیرفانی گرتەبەر ئەو عیرفان و عەشقەی کەهەر لە دێرینەوە لەناخیدا بوو ـ وەك هەموومرۆڤێك کە بەرهەمی عەشقی ئیلاهییە ـ بەڵام هەمیشە لەنێوەندی ئەو عیشقەدا دوچاری سوتانێك دەبێت کە لە حەیرانی یەکەمجار سەختترە.

لێرەدا دەڵێ: بیری بە عەشق گەیشتن و بە ئەو (یاری ئەزەلی) مەعشوقی حەق منی هێنایە نێو دەریای بێ کەناری عەشقەوە، بەڵام لەبری کەنار ئاگری غەمی بەردایە دڵی حافظ و سوتاندی. سەیرکە عەشق (یاری دێرین) چی بەیاری خۆی دەکات، لەبری رزگارکردنم لەحەیران سوتاندمی ئەمە هەمان ئەو چاوەڕوانییەی کە حافظ لەسەرەتادا لەعەشق هەیبووە (کە عشق



آسان نمود اوّل...) بەڵام دواتر گرفت دێتە کایەوە هەمان ئەو جیاوازییەیە کە عەشقی حافظ لەعەشقی عارفانی راستەقینەی دیکە جودا دەکاتەوە، چونکە خواجە چاوەڕوانی لەعەشق هەیە لەکاتێکدا عارفە گەورەکان هیچ جۆرە چاوەڕوانیەکیان لەعەشق نییە، بەگوتەی د. سروش: (حافظ سەرەتا پێی خستە ئاوەوەو سەری لە ئاگرەوە دەرهێنا، بەڵام مەولەوی پێی خستە ئاگرەوەو سەری لەئاوەوە دەرهێنا) ص**٢٢** قمار عاشقانی سروش.

ئەم پێ خستنە نێو ئاوەی حافظە کە پاشان دووچاری (صدمە)یەکی گەورەی دەکات و تادوایین دڵۆپە فرمێسکەکانی پێ دەرژێت و گەر لە حەیرانیشی دەریانبهێنێت دەیخاتە نێو ئاگری دورییەوە.

## غەزەلی سەد و سی حەوتەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی ئەسلەم**

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لن)**

**١- دوستان دختر رزتوبه زمستوری کرد**

**شدبر محتسب وکاربه دستوری کرد**

دۆستان کچی رەز تۆبەی لەخۆداپۆشین کرد، رۆیشتە لای موحتەسیب و کارەکەی یاسایی کرد.

دختر رز: کچی رەز، مەبەست لەشەرابە مستوری: خوداپۆشین، خۆشاردنەوە، خۆحەشاردان

شدبر: چوەلای لە هەندێ نوسخەدا لەبری (شدبر محتسب) (شد سوی محتسب) هاتووە کە لەواتادا هیچ جیاوازییەکیان نییە.

بەیاساکردن یاخود بەدەستوری کردن مۆڵەتێکە کە فەرمانڕەواش یاساییەکان بەیاسایەك رەوادەکات و لەزمانی پێشوو هەڵدەوەشێنێتەوە.

خواجە باس لە ئازادبوونی مەی و عەشق دەکات و هەواڵی بەدۆستان دەدات کەدەورانی قەدەغەبونی مەی بەسەرچوو، مەی شەراب تۆبەی لە خۆحەشاردان و خۆداپۆشین کردو خۆی دەرخستوە و رۆشتەلای فەرمانڕەواش و ئەم کاری تۆبە لە خۆشاردنەوەیەی کردەکارێکی یاسایی و مۆڵەتی لەو وەرگرت.

مەبەستی بەیتەکە ئەوەیە کە عەشق و مەی ئازادبوو، بووەشتێکی یاسایی و مۆڵەت پێدراو. دەکرێ ئەم حاڵەتە ئاماژە بێت بەرووداوێکی مێژوویی.

**٢- آمد ازپرده بەمجلس عرقش پك كنيد**

**تابگويد بەحريفان كەچرا دوری كرد**

لەپەردە دەرهات و هاتە نێو کۆڕەوە، عارەقی بسرن، تابەهاو دەرمانی بادە نۆش بڵێ بۆچی ماوەیەك دورکەوتنەوە.

عرقشك : عارەقی پاك كنيد: بسرن چرادوری کرد: بۆچی دوورکەوتەوە.

تەواوکەری بەیتی پێشوەو لەگەڵ دۆستاندا دەدوێت و پێیان دەڵێ ئەوا مەی و عەشق — کە لەم غەزەلەدا وەك گیانەلەبەرێك تەوسیفی کردووە — لەپەردە دەرهات و هاتە کۆڕی عاشقانەوە، عارەقی بسرن، چونکە لە رێی دوورەوە هاتووە باپێتان بڵێ بۆچی ماوەیەکە دورکەوتوەتەوەوە دورە پەرێزە.



(عەرەق مەی) دەکرێ عارەقی دووری رێگەی سەفەر بێت یاخود عارەقی شەرمی ئەوەی کە ماوەیەکی زۆرە لە یاران دابڕاوە، بەڵام واتا یەکەمیان جوانترە.

**٣- مژدگانی بده ای دل كه دگر مطرب عشق**

**راه مستانه زدو چارەی مخموری کرد**

مژدانە بدە ئەی دڵ کەجارێکی دیکە موتریبی عەشق ئاوازی مەستانەی لێداو چارەی مەخموریی کرد.

مژدگانی: مژدانە راە: ئاوا مستانە: مەستانە، جۆرێکە لەئاوازی مۆسیقی

راە مستانەزد: ئاوازی مەستانەی لێدا وەك مەستان بەشادی مۆسیقای ژەند

مخموری: سەرخۆشی، لێرەدا بەواتای دەردەی سەری دێت.

خواجە داوای مژدانە لەدڵی خۆی دەکات کەجارێکی دیکە موتریب و مۆسیقاژەنی عەشق ئازادبووەو بەئاوازی مەستانە یاخود بەئاوازی شادی بەخشی وەك مەست نارەحەتی و ناخۆشی خستەلاوە.

لەم سێ بەیتەدا بەئاشکرا نەمانی دیاردەیەکی ناخۆش و بێزارکەر هەست پێدەکرێت.

**٤- نەشگفت ارگل طبعم زنسیمش شکفت**

**مرغ شبخوان طرب ازبرگ گل سوری کرد**

سەرسورهێنەر نییە گەر گوڵی تەبعم لەشەماڵی ئەوەوە بشکوێت چونکە بولبولی سەحەر لە خۆشی پەڕەی گوڵەوە کەوتە نەشئە.

نەشگفت: سەرسورهێنەر نییە طبع: هەست و زەوق بشکفت: پشکوێت

مرغ شبخوان: باڵندەی شەوخوێن

برگ گل سوری: ئەوگوڵەباخەی کە گوڵاوی لێ دەگیرێت.

هەستەکانی شاعیر لە شەماڵ و سروەی یار دەپشکوێت تەبعی ئەم زمانی غەیبە زیاتر کراوەترو پڕرازە ماناداتر دەبێت خواجە خۆی بەو بولبولە دەزانێت کە بەبینینی بۆنکردنی گوڵە باخەکان چوست و چالاکترو ئاواز خوێنتر دەبێت و یەك دوونیا نەشئەو نەشاد وەردەگرێ و دەڵێ: سەیر نییە گەر منیش بە شەماڵی ئەو زمانم بپژێت و بکەومە شیعرگوتن و نوسین چونکە منیش بولبولی رووی یارم و شەوانە بۆی دەخوێنم و نزاو زاریمە، هەربۆیە چالاکیی و واتاو وشەکانم لەسروەی ئەوەوە دەپشکوێن.

**٥- نەبەهفت آب کە رەنگش بەصد آتش نرود**
**آنچە باخرقەی زاهد می انگوری کرد**

نەك بەحەوت ئاو رەنگی بەسەد ئاریش ناڕوات ئەوەی کە مەیی ترێ (میی دونیایی) بەخرقەی زاهیدی کرد.

هفت آب: حەوت ئاو، بەپێی مەزهەبیی شافعی شتی پیس بەحەوت جار شوشتن و گڵاوی دەرکردن پاك دەبێتەوە.

نرود: ناڕوات      انگوری: ترێی

لێرەدا خواجە تانە لە زاهیدی درۆزنەکان دەکات کەمەیی دونیا دەنۆشن و جیاوازە لەمەیی عەشقی عارفان و بەسەر خرقە درۆزنانەکانیانەوەیەو دەڵێ: ئەو خراپەکاریانەی زاهیدو سۆفیە درۆزنەکان نەك بەحەوت ئاو بە سەدجار سوتندنیش لەئاگردا ناڕوات و کاڵ نابێتەوە وا ئەگەر ریسوای زاهیدەکان درۆزنەکان بەسەد ئاگریش بسوتێنرێت و هەر پاك نابێتەوەو ناڕوات.

**٦- حافظ افتادگی ازدست مدە زان کە حسود**
**عرض و مال و دل و دین درسرمغروری کرد**

حافظ تەوازوع (خۆبەکەم زانین) لەدەست مەدە چونکە ئەوانەی کە حسودی بەتۆدەبەن ئابرو ومالٚ و دلٚ و دینیان کردوەتە قوربانیی مەغروری.

افتادگی: خۆبەکەم زانین — تەوازوع      ازدست مدە: لەدەست مەدە

عرضی: شەرەف، ئابرو      سر مغروری: هەوای مەغروری

خواجە پێی وایە کە غرورو خۆبەزل زانین دەبێتە مایەی لەدستدانی ئابرو و ماڵ و دڵ و دین و مرۆڤە خۆبەکەم زانەکان هەرگیز ئەم چوار پیرزۆییە لەدەست نادەن بۆیە هەمیشە گروپی یەکەم حەسودی بەگروپی دووەم دەبەن ئەمیش بە خۆی دەڵێ: حافظ ئەم تەوازوعە بەفیرۆمەدە چونکە بەلەدەستدانی ئم خۆبەکەم زانینە ماڵ و دڵ و دین و ئابروت لەدەست دەچێ و وەك حەسودانت لێ دێت و هەرچواریان لەرێی هەواو هەوەسی غروردا دەکیتە قوربانی.



## غەزەلی سەد و سی و هەشتەم :

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی ئەسلەم موسبەغ**
**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لان)**

**١- سالها دل طلب جام جم ازمامی کرد**
**وانچە خود داشت زبیگانە تمنّامی کرد**

سالآنێك دلٚ داوای جامی جەمی لەئێمە دەکرد، ئەوەی خۆی هەیبوو لەبێگانەی داوا دەکرد.

جام جم: جامی جەمشید، جامی جیهان، جامی ئاوێنە نهێنی و رازەکان

ئەم غەزەلەی خواجە یەکێکە لە غەزەلە زۆر بەرزو قووڵە عیرفانیەکانی ئەوو هەربۆیە هەروشەیەکی پێویستی بەلێکدانەوەی وردی عیرفانیانە هەیە سەرەتا (دلٚ) دلٚ لە زاراوەی عیرفانیدا واتای جیاوازی هەیە، دلٚ بریتییە لەنەفسی ناطقە و لە مەخزەنی نهێنیە خوداییەکان، لای (کاشانی) دلٚ ئەو خاڵەیە کە بازنەی بوون بەسوران بەدەوری ئەودا دروست بوو، کاشانی دلٚ بەسەرەتاو کۆتایی شتەکان دەزانێت هەر ئەو دلٚ بەعەرشی رەحمان و مەنزڵی قورئان و فورقان دەداتە قەڵەم (ئەنساری) دڵیش کردۆتە چوار پەردە کە یەکەمیان جێگەی ئیلهام و (دووەم جێگەی نوری ئیمان و سێیەم سەراپەردەی موشاهەدەی حەق و چوارەمیان نەزڵی عەشق و خۆشەویستی ئەو چوار پەردەیە تایبەتمەندییان هەیەو خودا لە هەر پەروەیەکیاندا جۆرە تێروانینێکی هەیە.

(دلٚ) نەرم و رەق دەبێت و عارف و خواناسان پێیان وایە کەدلٚ بە خواردنی حەڵاڵ نەرم دەبێت و بەخواردنی حەرام رەق دەبێت.

عارفەکان دڵی موسڵمان بەمولٚکی ئیلاهی دەزانن هەربۆیە کاتێ خودا لەقورئاندا دەفەرموێ (ان الله اشتری من المؤمنین انفسهم واموالهم) باس ل دلٚ ناکان چونکە (قلب المؤمن بین اصبعین من اصابع ارحمن یقبها کیش یشاء) (فرهنگ اصطلاحات دل) بەرای عارفەکان نەفس و ماڵی موسڵمانان وبەندەکانە بەڵام دڵی مسوڵمان هی خودایە دلٚ ئەو ئاسۆدەیە کە خودای جەمال لێیەوە هەڵدێت و دەبێتە خەڵوەتانەی خۆشەویستی ئەو هەرکاتێ لەدونیاو شتە بچوکەکان پاك ببێتەوە نوری خودا تیایدا جیلوە دەکات.

جام جم: لەزاراوەی عیرفانیدا جام جم یاجامی جهنمان دڵی عارفە لەقۆناغە پێشکەوتووەکانی عیرفاندا کەنهێنییە خوداییەکانی تێدا ئاشکرا دەبێت، جامی جەم لەم

بەیتەدا لەدڵ لەپێشترە، گەردڵ هێشتا دەرکی بەونهێنییە خوداییانە نەردبێت ئەوا جامی جەم نهێنیەکانی دەرك کردوە.

ما: ئێمە (ئێمە) لەم بەیتەدا مەبەست لەمرۆڤی خاکییەو ئەو بوونە بێگانەو بیانییەی کەلەدەرەوەی دڵ و نهێنییە خوداییەکانی پەیوەست بەدڵەوەیە.

دڵی عارفی حافظ لە قۆناغە سەرەتاییەکاندا داوای دڵی غەیب نین و نهێنی ئاشکراکەری بەرزو بلندی قۆناغە پێشکەوتوەکانی عیرفان لەئێمە (مرۆڤ) دەکات، لەکاتێکدا ئەم داواکردنە زۆر نابەجێیە چونکە ئەو (جام جەم)ە لەخودی خۆدایەو خۆی هەیەتی کەچی لە بێگانەی داوا دەکات.

**٢-گوهری کز صدف کون و مکان بیرون است**

**طلب از گمشدگان لب دریا می کرد**

داوای ئەوگەوهەرەی لە ونبوانی کەنار دەریا دەکرد کە لەدەرەوەی سەدەفی کەون و مەکانە.

صدف: سەدەف     کون: گەردوون، کەون     مکان: شوێن

گمشدگان: ونبوان     لب دریا: کەناردەریا

گمشدگان لب دریا: واتە ئەوکەسانەی کە لە کەناردەریادا نغرۆ دەبن و مەلوانی نازانن درکەیە لە نەزان و بێگانەی دەرەوەی کار.

ئەم بەیتە شەرح و درێژەپێدەری بەیتی پێشووە (گوهر) لەم بەیتەدا هەمان (جام جم)ی بەیتی پێشووەو (گمشدگان لب دریا)ش (ماو بیگانە).

سدف کون مکان: مەبەست لە جیهانی مادیات و گەردوونە ئەو جیهانەی کە شوێن و مەکانی تێدایە بەڵام ئەو نهێنی خوداییانەی کە تەنیا لەدڵی عارفادان هەرگیز لەچوارچێوەی کون و مکاندا جێگەیان نابێتەوەو گەر مرزاری و گەروهەریش بن لە سدەفی کون و مکاندانین، حاجی قادری کۆیی سەبارەت بە مکان و زەمان خودا دەڵێ:

**لیل و نهار هی تۆیە و بێ لیل نەهاری**

**جێ و مکان هی تۆیە بێ جێ و بێ مکانی**

ئاشکرایە کە مرواری لەسەدەفدایەو دەریاوانە ئەزموندارەکان دتوانن پەی پێ ببەن و بەئاسانی دەستگیر نابێت چ جای بگات بە ونبوانی کەنار دەریا ئەوانەی لەپیالەیەك ئاودا دەخنکێن و بەتەواوی بێ گانەن بەو مرواریەی کە تەنانەت لەنێو سەدەفسیشدا نییە.

خواجە بۆزیاتر رونکردنەوەی مەبەستەکەی دەڵێ: دڵی من داوای ئەوگەوهەرەی لە بێگانەو ونبوانی کەنار دەریا دەکرد کە ئەسڵەن لە سەدەفی گەردون و شوێن بەدەرە، دەکرێ ئەم دووبەیتە



زەمی عەقڵ بن و بێگانە بەنهێنییە خوداییەکان هەمان عەقڵ بێت واتە دڵ دەیوسیت لەرێگەی عەقڵەوە بەو نهێنیانە بگات بێ ئاگا لەوەی کەعەقڵ بێگانەیەو ونبوویەکی کەنار دەریای عەشق و عیرفان و رازەکانەو هەرگیز رێگە نابات سەر رازەکان.

**٣- مشکل خویش برپیرمغان بردم دوش**

**کو به تایید نظر حل معمّای کرد**

دوێنی شەوکێشەی خۆمم بردەلای پیری موغان کە ئەو بەهێزی روانینی خۆی مەتەڵەکەی (کێشەکەی) حەل کرد.

خویش: خۆم  بر: بۆلای  کو: کە ئەو  تایید: هێزەپێدان، وردی و دیقەت

گەورەیی پیرە موغان دەدوێت کە دوێنی شەو خواجە کێشەی گرانی خۆی کەعەشق عیرفانە بردوەتە لای ئەو ئەویش بە وردی روانینی و دیدی بەهێزی خۆی گشت کێشەکانی بۆ ورن کردوەتەوەو نهێنیەکانی بۆ ئاشکرا کردووە.

**٤- دیدمش خرّم و خندان قدح بادەبەدست**

**وندران آینیە صدگونە تماشا می کرد**

بینیم شادو خوشحاڵ و پێکی بادە بەدەستەوەو لەوئاوێنەی شەربەدا بەسەد جۆر تەماشای دەکرد

دیدمش: بینیم     خرّم: شاد     خندان: لێو بەخەندە،خۆشحاڵ

صدگونە: سەدجۆر

بەیتەکە باس لە حاڵی پیری موغان — عارف — دەکات کاتێ خواجە دوێنی شەو بۆ چارەسەری کێشەکەی چووەتە لای، دەڵێ: پیری موغانم لەحاڵێکی شادی و خۆشحاڵیدا بینی کەپێکی مەیی — عەشقی — بەدەستەوە بوو لەو ئاوێنەی راز بینەی عەشقی ئیلاهیدا (مەی) بەسەد شێوە جیلوەی عەشقی ئیلاهی و رازو نهێنی دەدی.

واتە: پیری موغان بەهۆی عەشقی ئیلاهییەوە لەلایەکەوە شادو لێو بەخەندە بوو لەلایەکی دیکەشەوە سەرقاڵی تەماشا — تەماشای مەعنەوی — کردنی جیلوەی جوانیەکانی حەق بوو لەو عەشقەدا.

کەواتە ئەو ئاوێنە — جام — ەی کە رازەکانی تێدانمایش دەکرێت ئاوێنەی عەشقی ئیلاهییەو بەبێ ئەو هەرجۆرە هەوڵێك بێ ئەنجامەو گەران لەداوی گەوهەری دەرەوەی سەدەفی کەون و مکانە.

**٥- گفتم این جام جیهان بین بەتوکی داد حیکم**

**گفت آن روز کەاین گنبد مینا می کرد**

گوتم: حەکیم کەی ئەم جامی جیهان بینەی بەتۆ بەخشی، گوتی: ئەورۆژەی کە ئەم گومەبتە پیرۆزییەی دروست دەکرد

حکیم: حەکمی، شارەزا، یەکێکە لە ناوە پیرۆزەکانی خوداو لەم بەیتەشدا هەربەو مانایە هاتووە.

آن روز: ئەورۆژەی      گنبد: گومبەت،مەبەست لە ئاسمان و گەردوونە      مینا: مینای، پیرۆزەیی شین

خواجە لە درێژەی گوتەکانیدا دەڵێ: گوتم بەپیری موغان کەخودای حەکیم کەی ئەم جامە راز بینی بەتۆبەخشی، ئەویش لەوەڵامدا وتی لەورۆژەوەی کەگەردوونی دروست دەکرد واتە هەر لەرۆژی ئەلەستەوە ئەم دڵە عاشقەی پێ بەخشیوم.

ئەم بەیتە چەند ئاماژەیەکی تارادەیەك روونی تێدایە کە بەکورتی بەم شێوەیەن:

١-خواجە رای وایە کە پیری موغان خاوەنی دڵی (جامی جهان بین) عاشق و عارفەو ئەولەو پلە بەرزو بڵندەی عیرفاندایە کە نهێنییە خوداییەکان لەدڵیدا جیلوە بکەن.

٢- (داد) پێدان، ئەم پێدانە ئاماژەیەکی روونە کە عارفی و عیرفان یاخود دڵێکی راز داری عیرفانی و عاشق بە هەوڵی مرۆڤ نییە بەڵکو بەبەخشین و هەعەگای ئیلاهییە، هەربۆیە لەپیری موغان ناپرسێت کە کەی ئەم دڵە غەیب نمایەت بەدەست هێنا بەڵکو لێی دەپرسێت کەی ئەم دڵە غەیب نمایت پێ بەخشرا.

٣- حەکیم کە خودای جوان و بەرزە دڵی غەیب نما بەمرۆڤ دەبەخشێت نەوەك کەسی دیکە– شێخ – یا هەرکەسێکی دیکە چونکە تەنیا حەکیمە کەتوانای بەخشینی ئەو پلە بەرزەی هەیە.

٤-هەروەها ئاماژە بە جەبریەتی سەرەتای گەردوون دەکاتەوە کە ئەم دڵانە لەرۆژی دروستکردنی تاقی مینایی ئاسمان و گەردوونەوە دابەشکراون نەوەك بەو تازەیی.

**٦- بیدلی درهمه احوال خدا بااوبوو**

**اونمی دیدش و ازدور « خدارا » می کرد**

شەیدایەك لەهەموو بارێکدا خودا لەگەڵ ئەودا بوو، ئەو خودای کە لەگەڵی بوونەیدەبینی و لەدورەوە لەرێی خوای دەکرد.

بیدل: دڵپێدان، شەیدا و پەشیۆ، ترسنۆك و نەزان      بااوبود : لەگەڵ ئەودابوو



نمی دیدش: نەیدەبینی

ازدور: لەدورەوە      خدارا: خودا خودا   لەرێی خوداو بۆنی تری خودا

ئەم بەیتە لەهەموو نەسخەکاندا ناهاتووە بۆ نموونە – خانلری رشید عیوضی – لەو نوسخانەشدا کە هاتووە لە هەندێکیاندا لەبری (خدارا) (خدایا) هاتووە بەهەرحاڵ واتای بەیتەکە دوبارەیەو هەمان واتای بەیتی یەکەم دووەمە.

(بیدل) بەواتای یەکەمی بەکارهاتووە کە عاشق و شەیدایە، لەکاتێکدا خودا هەمیشە لەگەڵ ئەمەعاشقە شەیدایەی سەرەتا رێگەی عیرفانە دایە، بەڵام ئەولەبەر ناپوختەیی خۆی نەیدەبینی و لەدورەوە خوداخودای بوو، واتە ئەوکە خودا لە رەگی ملی لیی نزیکتربوو لەدور بۆی دەگەڕیا.

**٧- این همه شعبدەی خویش کەمی کرد اینجا**

**سامری پیش عصا و ید بیضا می کرد**

ئەم هەمووە جادوەی خۆی کەسامری دەیکرد لە بەردەم گۆچان و دەستی درەوشاوەدا دەیکرد.

شعبدە : جادو، فریوکاری      عصا: گوچانەکەی حەزرەتی موسا      ید: دەست

بیضا: درەوشاوە، تیشکدەرە

عصاو ید بیضا: دو معجیزە گەورەکەی حەزرەتی موسایە کەکاتێ گۆچانەکەی فرێدادا دەبوە مارو کاتێ دەستیشی دەخستە ژێربالی و دەری دەهێنایەوە دەدرەشایەوە.

لەچیرۆکی حەزرەتی موساو جادو بازەکاندا ئەو روون بوویەوە کە مارەکەی حەزرەتی موسا جادونییەو هەرچی جادوش هەیە پوچەڵێدەکاتەوە، هەربۆیە ئیدی پاش ئەو رووداوە گێلیەتیەکی گەورەبوو کە کەسێك دیسانەوە جادوبازی بکات و بیەوێ خەڵکی فریوبدات – ئەڵبەت لەوگێلتر بەنی ئیسرائیل بوون کە باوەڕیان پێ دەکردو پەندیان لەو هەموو روداوو تاقیکردنەوە خوداییانەوە وەنەردەگرت – سامری جادوبازی کاتی هێندە گێل بوو کە لەبەردەم ئەو تەجروبەیەدا دەهات جادوبازی دەکرد.

ئەم بەیتە باس لە دوبارەکردنەوەی ئەزموونی گێلانەی سامری دەکات لەلایەن کەسێکەوە سودی و هەندێ بەرێزی دیکە ئەوکەسە بە (عەقڵ) دەدنە قەڵەم و تەنانەت لەبری (خویش)ی میسراعی یەکەم (عقل) ی هێناوە{ ج٢ ل٧٨٠ }بەڵام هندێکی دیکە (وەك هروی) ئەم کەسە بە (بیدل)ی بەیتی پێشوو دەزانێت، بەڵام ئەوەی راستی بێت بەیتەکە سەربەخۆیەو بەهەر کەسێکی وك سامری دەگوترێت کە لەئامادەیی ئەزمونێکی پێشوودا هەمان هەڵە دوبارە بکاتەوە.

**٨- گفت آن یار کزوگشت سر دار بلند**

**جرمش این بود که اسرار هویدا می‌کرد**

گوتی: ئەویارەی کەسەری دار بەهۆیەوە بەرێزبوو تاوانی ئەمەبوو کە نهێنییەکانی ئاشکرا دەکرد.

جرم: تاوان    هویداکردن: ئاشکراکردن

لەنێو عارفاندا ئەویارو دۆست ـ ەی کە لەدار دارو سەری دار بەهۆی لەداردانی ئەوەوە بەرێزو بەرز بوو تەنیا عارفی گەورەی نیوەی دووەمی سەدەی سێیەمەو سەرەتای سەدەی چوارەمەی کۆچی (حسین کوری مەنسوری حەللاج)ە.

حەللاج لە (٣٠٩)ی کۆچیدا بەفەرمانی خەلیفەی عەباسی (مقتدر) لەداردراو لە هەندێ سەرچاوەدا هاتووە کە پاش لەداردانی پارچەپارەکراو پاشان سوتێنراو خۆڵەمێشەکەشی درا بەئاوی دیجلەدا.

یەکێ لە هۆکارە گرنگەکانی لەداردانی حەللاج ئەوەبووکە گوتەکانی دەبووە مایەی هاندانی خەڵکی رەمەکی و هەژار لەدەسەلاتداران ئەو دەسەلاتدارانەی کە ئاڵتونیان کردبووە خودایەك و دەیانپەرست.

بەسەرهاتی حەزرەتی موسا کاریگەرییەکی زۆر زۆری لەسەر حەللاج هەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا کەحەلاج لەعارفەکانی ئەهلی مەستی و سەکرە.

لەمێژووی ئیسلامیدا رەنگە کەمتر کەسێك هەبێت هێندەی حەللاج بەئەفسانە نەکرابێت ئیدی چ لەلایەك دۆستەکانییەوە یاخود لەلایەن دوژمنەکانیەوە بێت ئەم بەئەفسانەکردنەی حەللاج لەسەردەمی خۆشیدا هەبووە چونکە ئەوخۆی لەیەکێ لە نامەکانیدا دەڵێ من نەئەو فریشتەیەم دۆستەکانم وێنەیان کێشاوم، نەئەوشەیتانەشم دومژنەکانم وێنەیان کێشاوم.

وەك گوتم حەللاج زۆر لەژێر کاریگەری بەسەرهاتی حەزرەتی موسادابووەو منێوی (طواسین) کتێبەکە بەناوبانگەکەشی هەر لە سەرەتای ئەو سورەتانەوە وەرگیراوە کە بەزۆری باسی حەزرەتی موسا دەکەن و رەنگە گەر ئەوبەسەرهاتەش نەبوایە بیری حەللاج بەم شێوەیەی ئێستای نەدەبووچونکە (انا الحق) حەللاج تەواو جیاوازە لە حلول یا اتحادیا هتد حەللاج پێی وابوو کاتێ خودا لەسەرزاری درەختێکەوە قسە لەگەڵ حەزرەتی موسادا دەکات و درەختێك هەڵدەبژێرێت تالێیەوە ببێت زمان وەك خودا لە سورەتی (القصص)دا کە بە گمس دەست پێدەکات — دەفەرموێت: (فَلَمَّا أَتَاهَا نُودِي مِنْ شَاطِئِ الْوَادِي الْأَيْمَنِ فِي الْبُقْعَةِ الْمُبَارَكَةِ مِنَ الشَّجَرَةِ أَنْ يَامُوسَى إِنِّي أَنَا اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ) ٣٠١.



خودا گەر لەدرەختێکەوە (انا الله) بڵێت چۆن لە مرۆڤێکی وەك ئەمیشەوە (انا الحق) نالێت.

حەللاج پێی وابوو کە ئەوەزاتی حەقە وجودی ئەم داگیر دەکات و هەمیشە پێی دەتوایەوە ئەو (انا الحق) ی بەگوتەی خۆی نەدەزانی بەڵکو بەگوتەی خودای دەزانی کاتێ حەللاج خۆی لە (طواسین)دا دەفەرموێ: (نمونەی من، وەك نمونەی ئەودارەیە..) مەبەستی لە هەمان ئەو (شجرەیە) کە خودا لێیەوە لەگەڵ موسادا قسەی کرد، عارفەکان ئەم انا الحق گوتنەی حەللاج بەگەورەترین توحیدو یەکتاپەرستی دەزانن، چونکە پێیان وایە کە کاتێ کەسێك دەڵێ من خودای تاقانە دەپەرستم، دان بەخۆیی و خودادادەنێت بەلام کە حەللاج (انا الحق) دەڵێت تەنیا بووی ئەم دەسەلمێنێ نەوەك دسی دیکە، لێرەدا ئەم تەنیا دان بەبوونی خودادا دەنێت و جگە لە ئەوهەمووشتێ بەعەدەم دەزانێت.

عارفەکان سەبارەت بەداردانی حەللاج پێیان وایە کە ئەوداری بەرزوپیرۆزکردووە و چوونە سەر داریش مەرجێکە بۆ بونە (سەرداری) هەروەك عارفێکی گەورەی وەك مەحوی دەڵێ:

**لە ئولکەی عیشقدا بێ چوونە سەردار    بە ئاسانی مەزانە چوونە سەردار**

بە هەرحاڵ حەللاج بە لەداردانی هێندەی تر گەورەتر بوو، ئەو لە بنەرەتدا خەڵکی بیضای فارسە و قوتابی جونەید و ابوالحسین نوری و سەهلی توستەری و عمرو بن عثمان مکی بووە و ماوەیەك لە توستەر و لە بەسرە و لە بەغداد و لە مەککە ژیاوە و دوجار حەجی کردووە و ماوەیەکی زۆر لە دەوروبەری بەیتدا دەمایەوە، پیاوێکی پر تەقووا نوێژبووە پاش ئەوەی ماوەیەکی زۆر لە زیندانا عەزاب و ئازاردرا و هەڵهات و گیرایەوە دەسیسەی دوژمنانی و بەتۆمەتی کافربوون و زەندیقی و هتدو لەسەر دەستی ( حامدی کوری عباس) و لەسەرەمی خەلیفە ئەو سەردەمە (مقتدر) و لەساڵی (٣٠٩) ی کۆچیدا لەداردرا.

حافظ جگە لەوەی کەپێیوایە سەری دار بەوەی کە ئەوپیاوە بەرێزەی بێ گوناە و تاوانەی تێچوەو لەداردراوە موشەرەف و بەرێز بووە، دان بە بێ تاوانی حەللاجدا دەنێ و لەهەمان کاتیشدا لەسەر زاری پیری موغان دەڵێ: تەنیا تاوانی ئەوە بووکە نهێنیەکانی عەشقی ئیلاهی ئاشکرا دەکرد، کە ئەم تاوانە لای عارفەکان گەورەترین تاوانەو ئەوان پێیان وایە کە ئاشکراکردنی نهێنی عیرفان و رازە خوداییەکان دەبێتە مایەی غیرەتی ئیلاهی و لەسەر زاری (ابوبکری شبلی نقل کراوە کە لەخەودا بانگی ئیلاهی لە قیامەتدا گوێ لێ بووە کە بۆیە ئەمەری پێکرد چونکە نهێنی ئێمەی لای بێگانە (غیر) درکاند) تەذکرە الاولیاء {بە نقل از حافظ نامە خرمشاهی ج١ ل٥٧١} هەروەها عارفەکان پێیان وایە کەئاشکراکردنی رازە خوداییەکان کوفرە.

هەربۆیە گەر ببێتە نێو کۆرو کۆڵانی ئەوان (مەیفرۆشان) کەس بەپێکێکی شەراب هەڵی ناگرێتەوەو نایەوێت.

لەمیسراعی دووەمدا خواجە تانە لەو بەرماڵەی تەقوایە دەدا ـ کەمەبەستی لەتەقوای درۆزنانەو تەڵۆکەبازی زاهیدو سۆفیلکەکانە ـ کەبەهای پێکێکی نییە.

**٣- رقیبم سرزنشهاکرد کزاین باب رخ برتاب**

**چە افتاد  این سرما را کە خاك درنمی ارزد**

رقیب سەرزەنشتی کردم و گوتی لەم دەرگایە روت وەرگێرە (برۆ) ئەم سەرەی ئێمە چی بەسەرهاتووە کەبەهای خاکی بەردەرگاشی نییە.

رقیب: چاودێر، پاسەوان، لەشیعری کلاسیکیدا بەبەردو یا چەند کەس عاشقی هەمان مەعشوق بن رەقیبی یەکترن، بەڵام د. خرمشاهی دەڵێ رەقیب لە حافظ و بەر لەئەویشدا بەم واتایە نییە، بەڵکو بەواتای پاسەوان و چاودێرو ئیزعاج کەر (مولازم) دێت. {ل٥٩٤ ج ١ حافظ نامە}.

رخ برتاب: رو وەرگێرە مەبەست لەوەیە کە برۆو بەجێی بهێڵە.

چە افتاد این سرمارا: چ بەسەر ئەم سەرەی ئێمەدا هاتووە.

مولازم و رەقیبی حافظ داوای لێدەکات کە بەردەرگای مەعشوق بەجێ بهێڵی و بروات، ئەمە ئیدی سەری خۆیی و خاکی بەردەرگای مەعشوق بەراورد دەکات و دەڵێ: ئەبێ چی بەسەر سەری ئێمەدا هاتبێ کە بەهای خاکی بەردەرگای مەعشقویشی نییەو لەبەر دەرگای ئەو دەری دەکەن.

**٤- شکوە تاج سلطانی کە بیم جان درو درج است**

**کلاهی دلکش است امّا بەترک سرنمی ارزد**

شکۆی تاجی سوڵتانی کەترسی گیانی تێدایە کڵاوێکی (پلەیەکی) سەرنجراکێشە، بەڵام بەهای لەدەستدانی سەری نییە.

شکوە: شکۆ  سلطانی: پاشایەتی، سوڵتانی  بیم: ترس

درودرجست: لەودایە، تیایدایە.  دلکش: سەرنجراکێش، دلگەش

ترك: خودە یاجۆرێك لەکڵاوکە وەك خودە بێت و زیاتر سەربازەکان لەسەری بکەن، لەدەستدان.

(ترك) بەم دوو واتایەی سەرەوە لێڵی دروست دەکات و واتای بەیتەکە دەگۆرێت، بەڵام بەگومانی زۆرینەی راڤەکاران لەبەرئەوەی حافظ لەشوێنی دیکەدا (ترك سر)ی بەلەدەستدانی



سەر هێناوە واتای دووەمی (ترك) واتە لەدەستدان رەچاوکراوە، لەواتای یەکەمدا (ترك سر) دەبێ پاراستنی سەربێت واتە گەرچی کڵاوی پاشایەتی تاج و شکۆیەکی سەنجراکێشە، بەڵام بەهای خودەیەکی نییە کە سەرپپارێزێت.

بەڵام بەواتای دووەم (لەدەستدانی سەر) راڤەو شرۆڤەی بەیتەکە بەم شێوەیە:

بێگومان سەردەمی حافظ سەردەمی کوشت و کوشتاری سوڵتان و پاشاکان بووە لەپێناو کڵاوو تاجی پاشایەتی دا هەربۆیە تاجی پاشایەتی لەسەرنان خۆی لەخۆیدا هەنگاوێك بوو بەرەو ترس و مەرگ، بۆیە (حافظ)یش دەڵێ: راستە شکۆی تاجی پاشەیەتی بەتێبینی ئەوە کە ترسی تێدا شاردراوەتەوەو هاورێیە لەگەڵ ترسیشدا کڵاوێکی (پلەیەکی) سەنجراکێشەو دڵ بۆ خۆی رادەکێشی، بەڵام ئەم کڵاوە بەهای لەدەستدانیە سەری نییەو پارێزگاری کردن لەگیانی خۆی لە تاجی پاشایەتی باشترە.

**٥- بس آسان می نمود اوّل غم دریا بەبوی سود**

**غلط  گفتم کەاین طوفان بەصدو گوهرنمی ارزد**

سەرەتا بەئومێدی سودو قازانجەوە غەم و ترسی دەریا ئاسان دەهاتە بەرچاو، بەڵام هەڵەم کرد، چونکە ئەم تۆفانە بەسەد گەوهەریش ناکردرێت.

می نمود: دەهاتە بەرچاو، دەردەکەوت  بەبوی سود: بەئومێدی قازانجەوە

غلط گفتم: هەڵەم کرد،هەڵەم گوت  نمی ارزد : ناکردرێت.

وەك هەمیشە خواجە سەرسورماوی و ترساوی خۆی لەدەریای عەشق و غەمی دەریای عەشق دەخاتەروو ئەو سەرەتا کە هاتە نێو ئەم دەریایەوە بەئومێدو هیوای سودو قازانجەوە پێی تێ ناو ترسەکانی پشتگوێ خست، بەڵام هەرخۆی دان بەوەدا دەنێ کە هەڵەبووە و ترسی تۆفانی دەریای عەشق هێندە قورسە کە بەسەروەت و سامانی دونیا ناکردرێت؛ واتە دەریای عیشق ترسناکەو، هێندە ترسناکە لەوەی کە بەقازانج و سودەکانی (یاقوت و گەوهەرەکانی) ناوی دڵخۆش بیت.

لەهەولی بەمێژوویکردنی ئەم غەزەلەدا و بەتایبەتی ئەم بەیتەدا نووسراوەکە کە: دەڵێن شام مەحمود والی دکن (هند) حافظی بۆ ئەوێ بانگهێشت کردووە سەرەتا حافظ رازی بووە ـ کە دەبووا بەنێو دەریادا سەفەرە بکات ـ بەڵام پاشان کە نارەحەتییەکانی رێگەی دەریای بیردەکەوێتەوە ئەم غەزەلە بۆشا مەحمود دەنوسێت و ناروات ج١ ل٥٩٣ خرمشاهی بەهەرحاڵ جەنابی د. غنی ئەم رووداوو بەسەرهاتە بەئەفسانە دەزانێت.

**٦- ترا آن بەکە روی خود زشتاقان بپوشانی**

**کە شادی جهانگیری غم لشکر نمی ارزد**

بۆتۆ وا چاکترە کەرووی خۆلە موشتاقان بپۆشی، چونکە شادی جیهانیگری بەهای غەمی لەشکری نییە.

ترا آن بە: بۆ تۆ واچاکە مشتاقان: موشتاقان، عاشقان بپوشانی: بپۆشی

جهانگیری: جیهانگیری، دەسەڵاتی جیهان گرتنە دەست

خواجە بەمەعشوق دەڵێ کەوا چاکترە تۆ رووی خۆت لەعاشقان و موشتاقانی رووت بشاریتەوە، چونکە گەر نەیشارێتەوە عاشقت هێندە زۆر دەبێت کەهەموو دونیا داگیردەکەن و ئەوکاتە غەمی رێکخستن و پاراستنی ئەولەشکرە بێ شومارەی عاشقان لەدەوروبەرت لەوە زیاترە کەلەشادی و خۆشی جیهانگیریەکەتدا دەیچێژی.

واتە مرۆڤ گەر نادیار بێت و بەرجەسەو بەناوبانگ نەبێت ئاسودەتردژی تا بەناو بانگ بێت، چونکە هەمیشە لە خەمی ناوبانگەکەیدایەو ئەوشادیەی نامێنێ.

یاخود مەبەستی لەوەیە کە یار بەبێ جیلوەگەری ئەم هەموو عاشقەی هەیە گەر جیلوەگەری بکات ئەوا دونیا پڕ دەبێ لەعاشق.

**٧-چو حافظ درقناعت کوش وازدنیای دون بگذر**

**کەیك جومنّت دونان بەصد من زرنمی ارزد**

وەك حافظ رازی و قانع بەوە واز لە دونیای دون بهێنە، چونکە سەد مەنی زێریشت هەبێ ئەوە ناهێنێ کە زەرەیی منەتی هیچ و پوچەکان هەڵگری.

درقناعت کوش: قانع بە،رازی بە دون: سوك و هیچ و پوچ، نزم، دنیایی

جو: زۆرکەم، زەرەیی بەیك جونمی‌ارزد: بێ بەهابوون، بێ قیمەت بوون

من: مەن،یەك من سێ کێلۆیە، بەیەکەی پێوانە بەرامبەر سێ کیلۆیە.

زر: زێڕ، ئاڵتون مرۆڤ هەرچی هەیە ئەوەندە ناهێنێ کە بەبەشی خۆی رازی بێت، چونکە گوتراوە قەناعەت کە نزێکە/ گەنجێکە کە هەرگیز کۆتایی نایەت، مرۆڤ کاتێ ئەم قەناعەتەی نەبوو، ئەوا منەتی هەموو کەسێکی سوك هەڵدەگرێ تا دەوڵەمەند ببێ کە ئەم دەوڵەمەندییە لای حافظ هیچ بەهایەکی نییە.

ئەو چاك دەزانێ کە بێ قەناعەتی چاوشۆڕی و سەردانەواندنی سوك و هیچ و پوچانی دونیایی تێدایە، بۆیە دەڵێ: وەك حافظ قانع بەو شوێن دونیای هیچ و پوچ و سوك مەکەوە، چونکە لەوێدا منەتی سوك و هیچ و پوچەکان هەڵدەگرێ و گەر ئەمەشت کرد ـ منەتت هەڵگرتن ـ سەد مەن ئاڵوتونیش هەبێ پولێ ناهێنێ.



# غەزەلی سەد و چل وحەوتەم :

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی ئەسلەم**

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لن)**

**١- در ازل پرتو حسنت زتجلّی دم زد**

**عشق پیداشدو آتش بەهمە عالم زد**

لەئزەلدا کە پرتەوی جوانیت باسی جیلوەی کرد، عەشق پەیدابوو ئاگری بەردایە هەموو عالەم.

ازل: ئەزەل، بێ سەەرتا رۆژی ئەزەل کە تایبەتە بەخوداوەو لەسنووری کات (بۆسەرەتا) تێدەپەڕێت لە بەرامبەر (ئەبەد) دا دێت کە دەرچوونە لەسنووری کات (بۆکۆتایی).

پرتو: روناکی، تیشکی حسن: جوانی

تجلّی: جیلوەکردن، خۆنیشاندان دم زد: باسی کرد، قسەی لێوەکرد پیداشد: پەیدابوو، دروست بوو آتش بەعالم زدن: ئاگر بەردانە هەمووعالەم.

ئەم غەزەلەی خواجە حافظ بەیەکێ لە غەزەلە گەورە عیرفانیەکانی ئەوو تەنانەت دونیای عیرفانی ئیسلامیش دادەنرێت و لەیەکێ لە گەورهەری و بونیادی ترین مەسەلەکانی عیرفان دەدوێت کە هۆکاری دروستبوونی مەخلوقات و پەیوەندی نێوان خوداو مرۆڤە لەروانگەی عەشقەوە.

بێگومان ئەوپرسیارە کە هەتا ئەمڕۆکەش وەڵامێکی تەواوی نەدروەتەوە ئەوەیە کە ئایا خودا بۆچی گەردوونی دروستکرد — بەندە پێم وایە کە مەحاڵە بەعەقڵ رێمان لەوەڵامی ئەم پرسیارە بکەوێت، زۆر دڵنیاش نیم لەوەی کە وەڵامی یەك جارەکیمان درابێتەوە -.

ئێستاش دەکرێ بپرسین خودا بۆچی ئەم گەردوونە پان و بەرینەی دروست کرد، بۆچی مرۆڤی دروستکرد ؟

وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە بەهەر لۆژێکێکی فەلسەفی و عەقڵی لاوازو بەئەنجام نەگەیشتووە، بەڵام وەڵامە لەسەر لۆژیکی عەشق و عەقڵ بیناکراوەکان تارادەیەك بەئەنجام گەیشتوون، عارفەکان — وەك ابن عربی — هەر لەسەرتاوە گومان لە دروستکردن دەکات و ئەسڵەن باوەڕی بەوە نییە کە گەردوون لە عەدەمەوە خەلق دروستکرابێت، ئەوان پێیان وایە ئەمە لەزاتی حەقی دور دەخاتەوەو باوەڕی بە دوالیزمەی خالق و مەخلوق وەك دووبوون نییە، عارفەکان بوون و گەردوون بە جیلوەی حەق دەزانن و هیچی دیکە.

بێگومان ئەم جیلوەو تەجەلییە چەند جۆرێکە کە ئەم جۆرە تەجەلییەی سەرەوە جیلوەی سیفاتەکانی خودایە، نەوەك جیلوەی خودی حەق، تائێستا وەڵامی پرسیاری (بۆچی؟) نەدراوەتەوە، بەڵکو لەوەڵامە نزیك بووینەتەوە کە بوون و گەردوون چییە؟ کە جیلوەی سیفاتە، هەمان پرسیارەکەی سەرەوە ئەمەیە کە ئەم جۆرە لە جیلوە گەرییە بۆچی؟ عارفەکان بنەمای ئەم جیلوەگەرییە بۆ عەشق — عەشقی ئیلاهی — دەگێڕنەوە واتە عەشقی خودا بۆ جیلوەگەری و دەرکەوتن دەگێڕنەوە، ئەم عەشقەی خودا بۆ دەرکەوتن و ناسین کەلای عارفەکان شێوە دەگرێت و فۆرمەلە دەبێت لەم فەرمودە قودسیەوە وەرگیراوە کە خودا دەفەرموێ: (کنت کنزا فمقیا فاحببت ان اعرق فخلقت الخلق لکی اعرف) { ١٣٧ تماشاگەراز مظهری } ؛ واتە خودا گەوهەرێکی شاراوەبوو حەزی کرد بناسرێت، بۆیە بوون و گەردوونی دروستکرد تابناسرێت (حەز) لەم فەرموودەیەدا هەمان ئەوعەشقە ئیلاهیەیەو هێزی نێو خەلقیش ئەوهێزەیە کە عەشقە، عەشقیش (بەگوتەی د. مطهری) ئەو هێزە بزۆزکۆتاخوازەیە کە هەمیشە پێچەوانەی عەقڵە کەهێزێکی پارێزگار خوازە، ئەو دەڵێ: (هێزی عەقڵ هێزێکی پارێزگارە، کە فەیلەسوف زۆر پشتی پێ دەبەستێ، بەپێچەوانەوە هێزەکەی جوڵاوەو هەمیشە هەوڵ دەدات لەخۆی بچێتە دەرەوەو لە زاتی حەقدا جیلوە بکات یاخود لە مەخلوقاتدا کە دەیەوێ بەرەو ئەو بجوڵێت، هەڵفرێت، ئەمەیە کە عارف پشت بە هێزی عەشق دەبەستێ کە هێزێکی کۆتاییە نەوەك عەقڵ کەهێزێکی پارێزگارەو دەڵێ عەشق جیهانی دروستکردووە نەوەك زانست و عەقڵ). { ل١٦٠ تماشاگەراز ومطهری } .

بێگومان جیلوەی ناووسیفاتەکان جیاوازە لەجیلوەی زاتی حەق چونکە ئەم جیلوەیەی دووەمیان مەحاڵە لەدونیای دی لە کات و شوێندا بێتەدی، هەڵگیراوە بۆ بەهەشت کە خودا لەوێ خۆی پیشانی موسڵمانانی نێو بەهەشت دەدات.

عارفەکان کاتێ کە بوون بە جیلوەی ناوو سیفاتەکانی حەق دەزانن هەمووشتێکیان لاجوان روەو لەسەر بونیادی عەشق پەیوەندیەکان دادەمەزرێنن کە بەم پێیەش تەنیا جوانیەکان دەبینن و هەمووشتێکیان لاجوان دەبێت.

خواجە لەم بەیتەدا پەیدابوونی عەشقی بەجیلوەی یەکەم جاری خواوە بەستۆتەوە کە ئەم عەشقەش ئاگر بەردەداتە هەمووجیهان و هەمووجیهان گیرۆدەی خۆشەویستی دەکات.

ئەودەڵێ:

لەرۆژی ئەزەلدا کاتێ تیشکی جوانی و حوسنت ویستی تەجەلا بکات و خۆی دەربخات ئەوکاتە عیشق پەیدابوو (هێشتا عەقڵ پەیدا نەبووە) سەرنجی هەموو دونیای راکێشا.



د. خرمشاهی پاش شەرحێکی دووردرێژی تەجەلی و جۆرەکانی مانای بەیتەکەی بەم شێوەیە لێکداوەتەوە:

لەسەرەتای بێتەکەدا (ازل) خودا کە جوانی بێ کۆتای هەیە، بەهۆی خۆشەویستی و حەزی خودی و جوانی جیلوە خوازی کەئاوێنەی دەویست و دەیویست لەگەوهەری شاراوەوە بەقۆناغی ناسراوی بگات،بۆیە تەجەلی زاتی کرد، لافاوی فەیزی پیرۆزیش هەمووو مومکینێکی دروست کرد لەوانە عەشق پاشان بە جیلوەی دووەم عەشق پەیدابوو؛ واتە لەبوونی نادیاری مومکینی هاتە دەرەوەو بوونی دەرەکی و هەستپێکراوی هاتەئاراو بەهەموو بووندا بلاوبویەوەو یەکسەر ختسیە نێو ئاگری — عەشق — خۆیەوە، بەڵێ جوانیی بەدیهێنەرو دایکی عەشقە.. { ج١ ل٦٠٢ خرمشاهی } .

بەکورتی بەیتەکە باسی لەسەرەتاو دایکی عەشق دەکات لە تەواوی بووندا، خواجە جوانی و حوسنی یار بە مانای عەشق دەزانێت و کاتی ئەم لەدایکبوونی عەشقەش بۆ ئەزەل دەگێڕێتەوە.

**٢- جلوەای کرد رخت دید ملك عشق نداشت**

**عین آتش شد ازین غیرت و برآدم زد**

روخسارت جیلوەیەکی کردو زانی فریشتە عەشقی نییە لەغیرەتدا بووبە ئاگرو بەربووە گیانی ئادەمەوە

ملك: فرشتە  عین آتش شد: بووە ئاگر  بر آدم زد: بەربوە ئامدەم (مرۆڤ)

فریشتە و تەواوی مەخلوقاتی دیکەی جگە لە مرۆڤ — لەبەرئەوەی کە عەشقیان نەبوو — خۆیان نەدایە بەر جیلوەی جەملی حەق، بەڵام مرۆڤ لەبەرئەوەی عەشقی هەبوو جیلوەی جەمالی حەق بووە ئاگرو بەربووە گیانی.

واتە بوونێك جیلوەگەری دەبێتە ئاگرو گیانی دەسوتێنێ کەعەشق لەزاتیدا بوونی هەبێت ئەوبوونەش تەنیا مرۆڤە.

ئەم بەیتە یادخەرەوەی ئایەتی — الامانە — یە کە باس لەوە دەکات خودا ئەمانەتی خۆی — پەرستش و خۆشەویستی خۆی — بۆ ئاسمان و زەوی و کێوەکان نمایش کرد، بەڵام نەیانتوانی شان بدەنەژێری و خۆیان لە هەڵگرتن پاراست و مرۆڤ رازی بوو بەهەڵگرتنی، خودا بۆخۆی ئەم کردارەی مرۆڤ بۆ نەزانی و ستەمکاری مرۆڤ دەگێڕێتەوە، چونکە هەڵگرتنی ئەم ئەمانەتە خەتەرێکی گەورەیە ئەو ئایەتەی ئاماژە بەم رازی بوونەی مرۆڤ دەکات ئایەتی (٧٢)ی سورەتی (الاحزاب)ە کە دەفەرموێ: (إِنَّا عَرَضْنَا الأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَنْ يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الإِنْسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُومًا جَهُولاً).

هەرچەندە گەر ئەم کارەی مرۆڤ بەویستی خۆی ئەنجامی دابێت و پێی رازی بووبێت گەورەترین نیشانەی نەزانی مرۆڤە، بەڵام خواجە لەم بەیتەدا ئەم ویستە لەمرۆڤ دەسەنێتەوەو بەتەواوی دەیداتەوە بەخالق، چونکە جیلوەی رووی ئەوە لەغیرەتی بێ موبالاتی و نەبوونی عەشقی فریشتەو ئاسمانەکان دەبێتە ئاگرو بەردەبێتە گیانی مرۆڤەوە، نەوەك مرۆڤ خۆی بەویستی خۆی بەمەرازی بێت.

**۳- عقل می خواست کزان شعله چراغ افروزد**

**برق غیرت بدرخشیدو جهان برهم زد**

عەقڵ دەیویست کەلەو گڕی (عەشق) چرادابگیرسێنێ، هەورە بروسکەی غیرەت هات و دونیای بەسەریەکدا تێکدا

می خواست: دەیوست   چراغ افروزد: چراهەڵگات، چراداگیرسینێ   برق: هەورە بروسکە   بدرخشید: درەوشایەوە   برهم زد: تێکی دا.

خواجە هەمیشە عەقڵ بە نامەحرەمی دونیای عەشقی ئیلاهی دەزانێت و هەرکاتێ ئەم نامەحرەمەش لەسنووری ئەو دونیایە نزیك دەبێتەوە غیرەتی عەشق دەبێت، لێرەدا قسە لەهەمان عەشق و سنووری عەشقە، خواجە دەڵێ: عەقڵ دەیوست شتێك لە عەشق تێ بگات و پەی بە نهێنییەکانی ئەودونیایە بەرێت، بەڵام هەورە بروسکەی غیرەت هەر لەئەزەلەوە وا ئەو دونیایەی بەیەکدا شێواندووە کە عەقڵ پەی بەنهێنیەکەی نەبات و هەمیشە لەئاستیدا کلۆڵ بێت.

جەوهەری بەیتەکە ئەوەیە کە دونیاو بەتایبەتی دونیای عەشق هێندە ئاڵۆزە کە عەقڵ تیایدا کلۆڵە.

**٤-مدّعی خواست که آید بەتماشاگه راز**

**دست غیب آمدو برسینەی نامحرم زد**

مودەعی  ویستی بێت بۆ شوێنی دیتنی رازو نهێنی، دەستی غەیب هات و کێشای بەسنگی نامەحرەمدا

مدّعی: بانگەشەکەر، دەکرێ لێرەدا عەقڵ بێت، یاخود هەرمەحرەمێکی دونیای عەشق.

آید: بێت   تماشاگە: شوێنی تەماشاو سەیرکردن   سینە: سنگ

رازەکانی عەشق و نهێنیەکانی دونیای کەشف و شهود تەنیا تایبەتن بەمەحرەمەکانی حەرەمسەرای عەشقەوەو جگە لەوان کەس توانای چوونە نێو ئەو حەرەمسەرایە نییە، بەڵام مودەعی ویستی بچێتە نێو ئەو حەرەمسەرایەوە کەشوێنی سەیرکردنی رازو نهێنیەکان و بێ ئاگابوون لە یاریەکانی دەستی غەیب.



خواجە دەڵێ: مودەعی — کە دەکرێ لێرەدا هەمان عەقڵی بەیتی پێشوو بێت — ویستی بێتە نێو حەرەمسەرای عەشق و شوێنی سەیرکردنی نهێنیەکانەوە بەڵام دەستی غەیب کەوتەکارو کێشای بەسنگیداو بووە رێگر لەبەردەمی ئەو نامەحرەمەدا.

**٥- دیگران قرعەی قسمت هم برعیش زدند**

**دل غمدیدەی مابود که هم برغم زد**

ئەوانی تر قورعەی بەشیان هەمووی لە خۆشی و شادیدا بوو، دڵی غەمدیدەی ئێمەبوو کە غەمی بۆدەرچوو.

دیگران: ئەوانی دیکە   قرعە: قورعە، تیروپشك، بەش و پشك   عیش: خۆشی و شادی

(دیگران) کە ئەوانی دیکەیە لەم لغزەدا دەکرێ مەخلوقاتی جگە لە مرۆڤ بن، دروستکراوەکانی دیکە لەبەرئەوەی ئیرادەیان نییەو باری گرانی عەشقەوەو لەغەمدایە یاخود دەکرێ (دیگران) ئەو مرۆڤە نەزانانە بن کە ئاگایان لەنهێنی و حەقیقەتەکانی نییەو باریان سوکەو دوورن لەدەریای پروەیشومەی عەشق هەرکامیان بێت.

خواجە ئەوانە بە بارسوك دەداتە قەڵەم — هەروەك لەغەزەلی یەکەمدا لەترسی رێبوارانی نێودەریای عەشق و بارسوکەکانی کەنار دەدوێت — و ژیان و بەشیان خۆشییە، بەڵام ژیانی عاشقان هەمیشەپڕ لە غەم و ترسی نەگەیشتن و لەدەستدانی مەعشوقە.

**٦- جان علوی هوس چاه زنخدان توداشت**

**دست در حلقەی آن زلف خم اندر خم زد**

گیانی بەرز ئارەزووی چاڵی چەناگەی تۆی هەبوو، بۆیە دەستی خستە نێو ئەڵقەی ئەو زوڵفە لول و پێچاوپێچە.

علوی: بەرز   چاه زنخدان: چاڵی چاناگە   خم اندرخم: پێچ لەناو پێچ

خواجە لەم بەیتەدا پەیوەندی لەنێوان چاڵی چەناگەو زوڵفی پێچاوپێچ و لولدا دروست کردووە، دەڵێ بۆ ئەوەی گیانی بەرزم بگاتە چاڵی چەناگەت دەستی خستە نێو ئەڵقەی زوڵفت تاوەکو شۆڕی بکاتەوە بۆنێو لەزەتی چاڵی چەناگەت.

لەزاراوەی عیرفانیدا (چەناگە) جوانی و جێگەی لەزەت و چێژو وەرگرتنە لەموشاهەدەو ئەوحاڵەتە روحیانەیە کە دەکرێ عارف تیایدا چێژ وەربگرێت و (چاڵی چەناگە)ش گرفتەکانە، بەڵام لێرەدا بەگشتی بەواتای چێژوەرگرتنەهاتووەو (زلف)یش نهێنی و رازەکانی عیرفان و تەریقەتە.

خواجه دەڵێ: گیان ئاسمان و بەرزم بەهیواو ئارەزووی چێژوەرگرتن بوو لە ئـونس و ئولفـەتی حەق، بۆیە ڕێگەی نهێنییەکانی گرتەبەرو هاتە نێو ئەڵقەی عیرفانەوە.

**٧- حافظ آن روز طربنامەی عشق تونوشت**

**کەقلم برسر اسباب دل خرّم زد**

حافظ ئەو ڕۆژە تەرەبنامەی عەشقی تۆی نووسی کە قەڵەمی بەسەر ئەسبابی شادی دڵی خۆیدا هێنا.

آن روز: ئەورۆژە   طرب: خۆش و شادی   نامە: کتێب   طربنامە: کتێبی شادی

نوشت: نووسی   اسباب: ئەسباب، هۆکار

خرم: شاد   قلم برسر زدن: قەڵەم بەسەرداهێنان، زەربی بەسەردا هێنان؛ واتە دانەدواوەی شتێك و ڕەفزکردنی.

خواجە نوسینەوەی کتێبی شادی عەشقی ئیلاهی بە ڕەفزکردن و زەرب بەسەر دل دا هێنان دەبەستێتەوەو پێی وایە کاتێ دەتوانێ لە نووسینەوەی کتێبی عەشقی ئیلاهی بدوێین کەدەست لە شادی دڵی خۆمان هەڵگرین، هەربۆیە گوتویەتی:

حافظ ئەورۆژە توانی کتێبی شادی عەشقی تۆ بنووسێتەوە کە شادی دڵی خۆیی خستەلاوە،کە کتێبی شادی عەشق نوسینەوەش چوونە نێودونایی بەرفراوانی عیرفانەو عەشقی ئیلاهییە.



## غەزەلی سەد و چل و هەشتەم :

**بەحری هەزەجی هەشتی تەواو**

**(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)**

**١- سحر چون خسرو خاور علم برکو هساران زد**

**بەدست مرحمت یارم در امّیدواران زد**

بەیانی کاتی پاشای ڕۆژهەڵات ئاڵای لەسەرکۆساران هەڵکرد، یارم بەدەستی مەرحەمەتی لەدەرگای ئومێدەوارانی دا.

سحر: بەیانی،   چون: کاتێ، کە   خسرو: پادشا   خاور: ڕۆژهەڵات

کوهساران: کۆساران   درزدن: لەدەرگادا

ئەم غەزەلە لەغەزەلە سادەکانی حافظ کە پێم وایە هاتنی لەنوسخە دێرینەکاندا بووەتە هۆی ئەوەی لەلایەن ڕەخنەگران و ساغکەروەکانی دیوانی حافظەوە لە دیوانەکەیدا نەسرێتەوە.

خسرو خاور: پادشای ڕۆژهەڵات، مەبەست لە پادشای ڕۆژهەڵات هەتاوە.

غەزەلەکە باسی لە یار دەکات سیفەتەکانی یار دەخاتەروو کە لە بەیتەکانی کۆتاییدا دەبێتە وەسفی پادشاکانی ئال مظفر.

لێرەدا ئەودەڵێ کەبەیانی هەتاو دەرکەوت و لەسەرکۆساران ئاڵای هەڵکرد یار بەدەستی میهرەبان و مەرحەمەتی خۆی ئاوری لەئومێدەواران دایەوەو لەدەرگای دان.

**٢- چوپیش صبح روشن شد کە حال مهر گردون چیست**

**برآمد خندەای خوش برغرور کامگاران زد**

کاتێ لای بەیانی ڕونبووەوە کە حاڵی میهرو نەرمی گەردوون سەبارەت بەمرۆڤ چییە، دەرهات و بە خۆ بەزلزانی مرۆڤە بەختیارەکان پێکەنی و خەندەیەکی خۆی کرد.

پیش: لای   برآمد: دەرهات، هەڵهات   کامگاران: خۆشبەختان، هەبوان بەختەوەران

وەك هەمیشە خواجە بێ میهری و بێ وەفایی و بێ ڕەحمی دونیاو گەردوون سەبارەت بەمرۆڤ دەخاتەروو دەڵێ: کاتێ بەیانی هەتاو هەڵهات و بۆی ڕونبوویەوە کە وەفاو میهری گەردوون لەگەڵ مرۆڤدا چۆنە — چۆن پاش ماوەیەك نابوتیان دەکات — بەغروری ئەوکەسانە پێکەنی کەئێستا بەختەوەرن و میهری دونیارووی لەوانە، واتە بەعەقڵی ئەوان پێکەنیی — پێکەنینێکی گاڵتەئامێز — کە دنیا تاسەر رووی خۆشی لە هیچ کەسێك نابێت، بۆیە نابێ دڵی پێ خۆش بکەین و پێی مەغرور بین.

۳–نگارم دوش درمجلس بەعزم رقص چون برخاست

**گره بگشود ازگیسوو بردلهای یاران زد**

دوێنی شەو کە نیگارم لەمەجلیسدا بۆسەماکردن هەستا، گرێی پەلکەی کردەوەو دڵی یارانی پێ گرێدا

نگارم: یارم، مەعشوقم بەعزم رقص برخاستن: هەستانەوە بۆ سەما گره: گرێ
بگشود: کردەوە

دوێنی شەو کاتێ یار ویستی هەستێتەوە سەما بکات، گرێی پرچەکەی کردەوەو بەمەش گرێیەکی لەدڵی دۆستاندا، واتە دڵی دۆستان بەم هەستانەوە وە پەخشان کردنی پرچە ئەسیرو شەیدای یاربوو، یاخود دۆستان ئەم هەڵستانەوە یان پێ ناخۆش بوو.

**٤– من از رنگ صلاح آن دم بەخون بششتنم دست**

**کەچشم بادە پیمایش صلابر هوشیاران زد**

مـن ئەوکاتە بەخوێنی دڵ دەستم لەرەنگی سەلاح و تەقواشوشت کەچاوی مەستی (بادەنۆشی) بانگی هۆشیارنی کرد.

صلاح: سەلاح و تەقوا بششتم دست: دەستم شوشت؛ واتە: وازم لێهێنا
بادە پیمای: بادەنۆش، مەست صبا: بانگ، داوەتکردن

خواجە دەڵێ: ئەوکاتەی کە چاوی مەستی یار هۆشیارانی داوەتکرد، بانگی دەکردم بۆعەشق و مەستی، ئیدی من رەنگی سەلاح و تەقوام واز لێهێناو بەنارەحەتی و رەنج بەدوی داواکانی چاوانی مەستی یارەوە چووم.

**٥– کدام آهن دلش آموخت این آئین عیّاری**

**کز اوّل چون برون آمد رە شب زندەداران زد**

کام دڵ ئاسنین ئەم داب و نەریتەی عەیارییەی فێرکرد کە یەکەم جار کە هاتەدەرەوە رێگەی لەشەو بێداران گرت.

آهن دل: دڵ ئاسنین — دڵرەق آئین: رێ و رەسم، داب و نەریت
عیّاری: عەیاری و گوێ نەدان بە هیچ دابونەریتێکی کۆمەڵگە برون آمد: هاتەدەرەوە
رەزدن: رێگەگرتن شب زندەداران: شەوبێداران، ئەو زاهیدانەی کەشەوان بەخەبەرن و یادی خوا دەکەن.

لەگەڵ ئەوەشدا کەغەزەلەکە نەسراوەتەوە لەرەخنەو جیاوازی بەیتەکان رزگارنەبووە.



لەنوسخەی فەرەیدەن میرزای تەیموریداو لەپەراوێزی ئەم غەزەلەدا تێبینی ئەوە دراوە کە لە هەندێ نوسخەدا ئەم غەزەلە بەقەسیدە دانراوە ل٥٤٨ بەمەش هەموو یاخود زۆربەی مەرجەکانی قەسیدەی بەسەردا دەسەپێ کە سادەیی و مێژوویی بوونی و وەسفی بەرجەستەو یەکیەتی بابەتەو..هتد.

هەروەها لەژمارەی بەیتەکان و پێش و پاش پێکردنیشیاندا جیاوازی هەیە بە جۆرێ کە:

لە نوسخەی قەزینی و د.هەروی تیموری (١٣) بەیتەو لەنوسخەی تەیموریدا (١٤) بەیت و لەنوسخەی د. عیوضی دا تەنیا (١) بەیتە.

سەرباری جیاوازی ژمارەی بەیتەکانیش جێگۆرکێی بە بەیتی تەخەلوس کراوەو لە نوسخەی قزوینی و عیوضی و هروری دا بەیتی نۆیەمە، بەڵام لە تەیموری و لیموری دا دوایین بەیتی غەزەلەکە / قەسیدەکەیە.

خواجە پێی سەیرە کە چ دڵرەقێك ئەم یارەی فێری عەیاری و شەوکوتی کردووە کەزۆر لەعەیارانی دیکەش پێ پاکترەو لەیەکەمین دەرکەوتنیدا دڵی شەوبێدارانی بەتاڵان برد، واتە یار هەربەیەکەم دەرکەوتنی دڵی شەو بێدارانی رفاندو ئەوانی بۆلای خۆی کەمەندکێش کرد.

**٦– خیال شهسورای پخت و شدناگە دل مسکین**

**خداوندا نگەدارش کەبرقلب سواران زد**

بەخەیاڵی شاسوارییەوە دڵی هەژارم لەناکاو رۆشت، خوداوەندا ئاگات لێی بێ کەئێستا هێرشی کردۆتە سەر ناوجەرگەی دڵی سواران.

شهسواری: شاسواری پخت: کردە لێدا شد: رۆشت ناگە: لەپڕ،
ناگەهان، لەناکاو بەقلب سواران زد: هەڵێکوتایە سەر ناوجەرگەی سوارچاکان

خواجە لای خوداوەند نزا بۆدڵی رۆشتووی خۆی دەکات کە بەخەیاڵی بوونەسوارچاکێکی مەیدانەوە ئاوزەنگی لەئەسپەکەی داوە، بۆیە بەم خەیاڵەوە دەبێ ئێستا لەناوچەگەری سوارچاکاندا بێت و کێبەرکێی عەشق بکاتە بۆیە دەڵێ: خوایە بیپارێزەو ئاگات لەدڵی هەژارم بێت.

**٧– درآب و رنگ رخسارش چەخون خوردیم و جان دادیم**

**چونقشش دست داد اوّل رقم بر جانسپاران زد**

لەجوانکردنی (رەنگ کردنی) روخساریدا چەنارەحەتیەکان کێشا، کەچی کە نیگارەکە تەواو بوو یەکەم جار خەتی بەسەر فیداکاراندا هێنا.

آب و رنگ دادن: ڕەنگکردن و جوانکردنی تابلۆ      خونی خوردن و جان دادن: خوێنی خواردن و گیاندانی، ئەم دەربڕینە درکەیە لەهەوڵ و ماندووبوونی زۆر لەپێناو کارێکدا وەك لەکوردیا دەگوترێ گیانم دەرچوو لە گەڵیدا.

چو: کاتێ، کە      نقشش دست داد: نیگارەکە تەواو بوو، ئەوەی دەیوسیت بۆی کرا، یاخود بەواتای سەرکەوتن بێت

جانسپارن: فیداکاران      وتم بزرچیزی زدن: خەت بەسەرشتێکدا هێنان

خواجە باس لە یار/ کەسێك دەکات کەهەوڵی ماندووبوونێکی زۆریان لەگەڵ کێشاوە، بەڵام کاتێ سەرکەوتووە پشتگوێی خستوون، ئەو ئەم مەبەستەی لەزاراوەی وێنەکێشاندا دەربڕیوە و دەڵێ: گیانمان دەرچوو تا تابلۆی کارەکانیمان ڕەنگ کردو ڕازاندەوە، بەڵام کەتەواو بوو یەکەمجار خەتی بەسەر ئەوناوانەداهێنا کەخۆیان فیداکردبوو.

**٨- منش باخرقەی پشمین کجاالندرکمند آرم**

**زرەمویی کەمژگانش رەخنجرگزاران زد**

من بە خرقەی خورییەوە چۆن دەتوانم کەسێ بەخەمە کەمەندەوە، کەموی وەك (کوللەنەبر)ەوە برژانگی ڕێگەی لە خەنجەروەشێنان گرتووە.

پشمین: (پشم) خورییە و پەشمین هەر جلوبەرگێکە لەخوری دروست بکرێت. کمند: کەمەند

آرم: بهێنم، بیخەم      زرە: ئەو جلە بێ قۆڵە ئاسنینیەی کە شمشێرنەیدەبڕی و جاران لەکاتی شەڕدا لەبەردەکرا گوللەنەبر      خنجرگزاران: خەنجەروەشێنان.

خواجە یار بەو پاڵەوانانە دەزانێت کە مووی وەك شمشێر نەبڕاوەیەو لەبەریدایەو برژانگی ڕێگە لەپاڵەوانە خەنجەر بەدەستەکان دەگرێت و ئەوانی بەگیرهێناوە، لەهەمان کاتدا خۆشی بەسۆفییەکی هەژاری و لاوازی خیرقەی خوۆری لەبەر دەداتە قەڵەم و دەڵێ من چۆن دەتوانم ئەوبخەمە کەمەندەوەکە ئەو هێندە بەهێزو من هێندە لاوازم.

**٩- شهنشاه مظفر فر شجاع ملك و دین منصور**

**کەجود بی دریغش خندە برابربهاران زد**

شاهەنشایەك کە گەورەیی و فەری ئال مظفری هەیە (مەنوسر) شوجاعی لەکاری دین و سەڵتەنەتدا کەپیاوەتی و کەرەمی بێ درێغی گاڵتەی بەهەورەی بەهاران دێت.

شاە منصور: دوایین پادشای ئال مظفر کە لە (٧٢٣ — ٧٩٥) لە فارس و کرمان و یەزدو و ئیسفەهان و هەندێ بەشی خوزستاندا حوکمیان کردووە شاە مەنسور کە لە (٧٥٠)ی کۆچی



مانگیدا لەدایکبووەو برازاوای شاشوجاعەو کوری مظفر بن محمد (امیر مبارزالدین)ە وەك گوترا دوایین پادشای ئال مظفر ەوە لە بەرامبەر هێرشی تەیموری لەنگا جەنگاو تەنانەت خۆی دووجار بەشمشێر هێرشی کردۆتە سەر تەیمور، بەڵام دواجار بەکوشتنی خۆیی و هەفتا کەسی لەشازادەکانی ئال مظفر بەفەرمانی تەیموری لەنگ لەساڵی (٧٩٥)ی کۆچی مانگی؛ واتە لە تەمەنی (٤٥) ساڵیدا زنجیرەی دەسەڵاتی ئال مظفر کۆتایی پێهات.

حافظ دووساڵی پادشایەتی شامەنسوری بینیوەو زۆرخۆشی ویستووە، لەدیوانەکەیدا (٩)جار بە ئاشکرا وەسفی کردووە تەنانەت خواجە هیچ پاشایەکی دیکەی وەك ئەم پادشایە وەسف نەکردووە {بروانە حافظ نامە ج٢ ل١٠٧}.

جود: چاکە، پیاوەتی، کەرەم      بی دریغ: بێ درێخ، بێ قسور

خندە برابربهاران زد: بەهەوری بەهاران پێکەنی، بێگومان لەگاڵتەپێکردندا؛ واتە هێندە بەکەرەم بوو لەهەوری بەهارانیش زیاتر تەنانەت گاڵتەی بەویش دەهات.

هەوری بەهاران بەسەر هەموو شتێکدا دەبارێت و چاکەوپیاوەتی لەگەڵ هەمووشتێکدا دەکات، بەڵام خواجە لەم بەیتەشداو لەوەسفی شاەمەنسوردا دەڵێ شاەمەنسوری ئال مظفر کە ئازاو پاڵەوانی دین و دەوڵەت بوو هێندە خاوەن چاکەو پیاوەتی بوو کە جودو پیاوەتی ئەو گاڵتەی بەهەوری بەهاران دەهات و لەهەوری بەهارانیش زیاتر بوو.

**١٠- ازآن ساعت کە جام می بەدست اوشرف شد**

**زمانە ساغر شادی بەیاد مگیساران زد**

لەوکاتەوە کە جامی مەی بەدەستی ئەو پیرۆزبوو (بەرێزبوو) زەمانەپێکی شادی بەیادی مەی خواردنەوە هەڵدا.

میگساران: مەینۆشان، مەیخۆران.

بەیتەکە وەسفی شامنسور دەکات کە لەوکاتەوە ئەوپێکی مەی گرتەدەست و مەی بەدەستی ئەو پیرۆزبوو زەمانەش بەیادی مەینۆشانەوەپێکی گرتە دەست و هەڵیدا.

**١١- نظربر قرعەی توفیق و یُمن دولت شاە است**

**بدەکام دل حافظ کەفال بختیاران زد**

چاوم لە تەوفیق و بەرەکەتی دەوڵەتی پاشایە، ئارەزووی دڵی حافظ بەجێ بێنە کەفاڵی بەختیارانی گرتۆتەوە.

فال بەختیاران: فاڵی چاك، فاڵی خێر.

خواجە لەم بەیتەدا داوای سەرکەوتن و بەرەکەتی دەوڵەتی پاشا دەخوازێت.

## غەزەلی سەد و چل و نۆیەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی ئەسلەم**

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعِ لن)**

**١- در ازل پرتو حسنت زتجلّی دم زد**

**عشق پیداشدو آتش بەهمه عالم زد**

لەئزەلدا کە پرتەوی جوانیت باسی جیلوەی کرد، عەشق پەیدابوو ئاگری بەردایە هەموو عالەم.

ازل: ئەزەل، بێ سەرتا رۆژی ئەزەل کە تایبەتە بەخوداوەو لەسنووری کات (بۆسەرەتا) تێدەپەرێت لە بەرامبەر (ئەبەد) دا دێت کە دەرچوونە لەسنووری کات (بۆکۆتایی)

پرتو: روناکی، تیشکی حسن: جوانی

تجلّی: جیلوەکردن، خۆنیشاندان دم زد: باسی کرد، قسەی لێوەکرد پیداشد: پەیدابوو، دروست بوو آتش بەعالم زدن: ئاگر بەردانە هەمووعالەم.

ئەم غەزەلەی خواجە حافظ بەیەکێ لە غەزەلە گەورە عیرفانیەکانی ئەوو تەنانەت دونیای عیرفانی ئیسلامیش دادەنرێت و لەیەکێ لە گەوهەری و بونیادی ترین مەسەلەکانی عیرفان دەدوێت کە هۆکاری دروستبوونی مەخلوقات و پەیوەندی نێوان خوداو مرۆڤە لەروانگەی عەشقەوە.

بێگومان ئەوپرسیارە کە هەتا ئەمرۆکەش وەڵامێکی تەواوی نەدروەتەوە ئەوەیە کە ئایا خودا بۆچی گەردوونی دروستکرد — بەندە پێم وایە کە مەحاڵە بەعەقڵ رێمان لەوەڵامی ئەم پرسیارە بکەوێت، زۆر دڵنیاش نیم لەوەی کە وەڵامی یەك جارەکیمان درابێتەوە -.

ئێستاش دەکرێ بپرسین خودا بۆچی ئەم گەردوونە پان و بەرینەی دروست کرد، بۆچی مرۆڤی دروستکرد؟

وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە بەهەر لۆژیکێکی فەلسەفی و عەقڵی لاوازو بەئەنجام نەگەیشتووە، بەڵام وەڵامە لەسەر لۆژیکی عەشق و عەقڵ بیناکراوەکان تارادەیەك بەئەنجام گەیشتوون، عارفەکان — وەك ابن عربی — هەر لەسەرتاوە گومان لە دروستکردن دەکات و ئەسڵەن باوەری بەوە نییە کە گەردوون لە عەدەمەوە خەلق دروستکرابێت، ئەوان پێیان وایە ئەمە لەزاتی حەقی دور دەخاتەوەو باوەری بە دوالیزمەی خالق و مەخلوق وەك دووبوون نییە، عارفەکان بوون و گەردوون بە جیلوەی حەق دەزانن و هیچی دیکە.

بێگومان ئەم جیلوەو تەجەلییە چەند جۆرێکە کە ئەم جۆرە تەجەلییەی سەرەوە جیلوەی سیفاتەکانی خودایە، نەوەك جیلوەی خودی حەق، تائێستا وەڵامی پرسیاری (بۆچی؟)



نەدراوەتەوە، بەڵکو لەوەڵامە نزیك بووینەتەوە کە بوون و گەردوون چییە؟ کە جیلوەی سیفاتە، هەمان پرسیارەکەی سەرەوە ئەمەیە کە ئەم جۆرە لە جیلوە گەرییە بۆچی؟ عارفەکان بنەمای ئەم جیلوەگەرییە بۆ عەشق — عەشقی ئیلاهی — دەگێرنەوە واتە عەشقی خودا بۆ جیلوەگەری و دەرکەوتن دەگێرنەوە، ئەم عەشقەی خودا بۆ دەرکەوتن و ناسین کەلای عارفەکان شێوە دەگرێت و فۆرمەلە دەبێت لەم فەرمودە قودسیەوە وەرگیراوە کە خودا دەفەرموێ: (کنت کنزا فمقیا فاحببت ان اعرق فخلقت الخلق لکی اعرف) { ١٣٧ تماشاگراز مظهری } واتە خودا گەوهەرێکی شاراوەبوو حەزی کرد بناسرێت، بۆیە بوون و گەردوونی دروستکرد تابناسرێت (حەز) لەم فەرموودەیەدا هەمان ئەوعەشقە ئیلاهیەیەو هێزی نێو خەلقیش ئەوهێزەیە بە عەشقە، عەشقیش (بەگوتەی د. مطهری) ئەو هێزە بزۆزکۆتاخوازەیە کە هەمیشە پێچەوانەی عەقڵە کەهێزێکی پارێزگار خوازە، ئەو دەڵێ: (هێزی عەقڵ هێزێکی پارێزگارە، کە فەیلەسوف زۆر پشتی پێ دەبەستێ، بەپێچەوانەوە هێزەکەی جوڵاوەو هەمیشە هەوڵ دەدات لەخۆی بچێتە دەرەوەو لە زاتی حەقدا جیلوە بکات یاخود لە مەخلوقاتدا کە دەیەوێ بەرەو ئەو بجولێت، هەڵفرێت، ئەمەیە کە عارف پشت بە هێزی عەشق دەبەستێ کە هێزێکی کۆتاییە نەوەك عەقڵ کەهێزێکی پارێزگارەو دەڵێ عەشق جیهانی دروستکردووە نەوەك زانست و عەقڵ). { ل١٦٠ تماشاگەراز ومطهری }.

بێگومان جیلوەی ناووسیفاتەکان جیاوازە لەجیلوەی زاتی حەق، چونکە ئەم جیلوەیەی دووەمیان مەحاڵە لەدونیای دی لە کات و شوێندا بێتەدی، هەڵگیراوە بۆ بەهەشت کە خودا لەوێ خۆی پیشانی موسڵمانانی نێو بەهەشت دەدات.

عارفەکان کاتێ کە بوون بە جیلوەی خواو سیفاتەکانی حەق دەزانن هەمووشتێکیان لاجوان وەو لەسەر بونیادی عەشق پەیوەندیەکان دادەمەزرێنن کە بەم پێیەش تەنیا جوانیەکان دەبینن و هەمووشتێکیان لاجوان دەبێت.

خواجە لەم بەیتەدا پەیدابوونی عەشقی بەجیلوەی یەکەم جاری خواوە بەستۆتەوە کە ئەم عەشقەش ئاگر بەردەداتە هەمووجیهان و هەمووجیهان گیرۆدەی خۆشەویستی دەکات.

ئەودەڵێ:

لەرۆژی ئەزەلدا کاتێ تیشکی جوانی و حوسنت ویستی تەجەلا بکات و خۆی دەربخات ئەوکاتە عیشق پەیدابوو (هێشتا عەقڵ پەیدا نەبووە) سەرنجی هەموو دونیای راکێشا.

د. خرمشاهی پاش شەرحێکی دوروردرێژی تەجەلی و جۆرەکانی مانای بەیتەکەی بەم شێوەیە لێکداوەتەوە:

لەسەرەتای بێتەکەدا (ازل) خودا کە جوانی بێ کۆتای هەیە، بەهۆی خۆشەویستی و حەزی خودی و جوانی جیلوە خوازی کەئاوێنەی دەویست و دەیویست لەگەوهەری شاراوەوە بەقۆناغی ناسراوی بگات،بۆیە تەجەلی زاتی کرد، لافاوی فەیزی پیرۆزیش هەمووو مومکینێکی دروست کرد لەوانە عەشق پاشان بە جیلوەی دووەم عەشق پەیدابوو؛ واتە لەبوونی نادیاری مومکینی هاتە دەرەوەو بوونی دەرەکی و هەسپتێکراوی هاتەئاراو بەهەموو بووندا بلاوبویەوەو یەکسەر خستیە نێو ئاگری — عەشق — خۆیەوە، بەلێ جوانیی بەدیهێنەرو دایکی عەشقە..{ ج١ ل٦٠٢ خرمشاهی}.

بەکورتی بەیتەکە باسی لەسەرەتاو دایکی عەشق دەکات لە تەواوی بووندا، خواجە جوانی و حوسنی یار بە مانای عەشق دەزانێت و کاتی ئەم لەدایکبوونی عەشقەش بۆ ئەزەل دەگێڕێتەوە.

**٢- جلوەای کرد رخت دید ملك عشق نداشت**

**عین آتش شد ازین غیرت و برآدم زد**

روخسارت جیلوەیەکی کردو زانی فریشتە عەشقی نییە لەغیرەتدا بووبە ئاگرو بەربووە گیانی ئادەمەوە.

ملك: فرشتە  عین آتش شد: بووە ئاگر  بر آدم زد: بەربوە ئامدەم (مرۆڤ)

فریشتە و تەواوی مەخلوقاتی دیکەی جگە لە مرۆڤ — لەبەرئەوەی کە عەشقیان نەبوو — خۆیان نەدایە بەر جیلوەی جەملی حەق، بەلام مرۆڤ لەبەرئەوەی عەشقی هەبوو جیلوەی جەمالی حەق بووە ئاگرو بەربووە گیانی.

واتە بوونێك جیلوەگەری دەبێتە ئاگرو گیانی دەسوتێنێ کەعەشق لەزاتیدا بوونی هەبێت ئەوبوونەش تەنیا مرۆڤە.

ئەم بەیتە یادخەرەوەی ئایەتی — الامانە — یە کە باس لەوە دەکات خودا ئەمانەتی خۆی — پەرستش و خۆشەویستی خۆی — بۆ ئاسمان و زەوی و کێوەکان نمایش کرد، بەلام نەیانتوانی شان بدەنەژێری و خۆیان لە هەلگرتن پاراست و مرۆڤ رازی بوو بەهەلگرتنی، خودا بۆخۆی ئەم کردارەی مرۆڤ بۆ نەزانی و ستەمکاری مرۆڤ دەگێڕێتەوە، چونکە هەلگرتنی ئەم ئەمانەتە خەتەرێکی گەورەیە ئەو ئایەتەی ئاماژە بەم رازی بوونەی مرۆڤ دەکات ئایەتی (٧٢)ی سورەتی (الاحزاب)ە کە دەفەرموێ: (إِنَّا عَرَضْنَا الأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَنْ يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الإِنْسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُومًا جَهُولاً).



هەرچەندە گەر ئەم کارەی مرۆڤ بەویستی خۆی ئەنجامی دابێت و پێی رازی بووبێت گەورەترین نیشانەی نەزانی مرۆڤە، بەلام خواجە لەم بەیتەدا ئەم ویستە لەمرۆڤ دەسەنێتەوەو بەتەواوی دەیداتەوە بەخالق، چونکە جیلوەی رووی ئەوە لەغیرەتی بێ موبالاتی و نەبوونی عەشقی فریشتەو ئاسمانەکان دەبێتە ئاگرو بەردەبێتە گیانی مرۆڤەوە، ئەوەك مرۆڤ خۆی بەویستی خۆی بەمەرازی بێت.

**٣- عقل می خواست کزان شعله چراغ افروزد**

**برق غیرت بدرخشیدو جهان برهم زد**

عەقڵ دەیویست کەلەو گڕی (عەشق) چرادابگیرسێنێ، هەروەها بروسکەی غیرەت هات و دونیای بەسەریەکدا تێکدا

می خواست: دەیویست  چراغ افروزد: چراهەلکات، چراداگیرسێنێ  برق: هەورە بروسکە  بدرخشید: درەوشایەوە  برهم زد: تێکی دا.

خواجە هەمیشە عەقڵ بە نامەحرەمی دونیای عەشقی ئیلاهی دەزانێت و هەرکاتێ ئەم نامەحرەمەش لەسنووری ئەو دونیایە نزیك دەبێتەوە غیرەتی عەشق دەبێت، لێرەدا قسە لەهەمان عەشق و سنووری عەشقە، خواجە دەڵێ: عەقڵ دەیویست شتێك لە عەشق تێ بگات و پەی بە نهێنییەکانی ئەودونیایە بەرێت، بەلام هەورە بروسکەی غیرەت هەر لەئەزەلەوە وا ئەو دونیایەی بەیەکدا شێواندووە کە عەقڵ پەی بەنهێنیەکەی نەبات و هەمیشە لەئاستیدا کلۆڵ بێت.

جەوهەری بەیتەکە ئەوەیە کە دونیاو بەتایبەتی دونیای عەشق هێندە ئالۆزە کە عەقڵ تیایدا کلۆڵە.

**٤-مدّعی خواست که آید بەتماشاگه راز**

**دست غیب آمدو برسینەی نامحرم زد**

مودەعی ویستی بێت بۆ شوێنی دیتنی رازو نهێنی، دەستی غەیب هات و کێشای بەسنگی نامەحرەمدا

مدّعی: بانگەشەکەر، دەکرێ لێرەدا عەقڵ بێت، یاخود هەرمەحرەمێکی دونیای عەشق.

آید: بێت  تماشاگە: شوێنی تەماشاو سەیرکردن  سینە: سنگ

رازەکانی عەشق و نهێنیەکانی دونیای کەشف و شهود تەنیا تایبەتن بەمەحرەمەکانی حەرەمسەرای عەشقەوەو جگە لەوان کەس توانای چوونە نێو ئەو حەرەمسەرایە نییە، بەلام

مودەعی ویستی بچێتە نێو ئەو حەرەمسەرایەوە کەشوێنی سەیرکردنی رازو نهێنیەکان و بێ ئاگابوون لە یاریەکانی دەستی غەیب.

خواجە دەڵێ: مودەعی — کە دەکرێ لێرەدا هەمان عەقڵی بەیتی پێشوو بێت — ویستی بێتە نێو حەرەمسەرای عەشق و شوێنی سەیرکردنی نهێنیەکانەوە بەڵام دەستی غەیب کەوتەکارو کێشای بەسنگیداو بووە رێگر لەبەردەمی ئەو نامەحرەمەدا.

**٥- دیگران قرعەی قسمت هم برعیش زدند**

**دل غمدیدەی مابود کە هم برغم زد**

ئەوانی تر قورعەی بەشیان هەمووی لە خۆشی و شادیدا بوو، دڵی غەمدیدەی ئێمەبوو کە غەمی بۆدەرچوو.

دیگران: ئەوانی دیکە    قرعە: قورعە، تیروپشك، بەش و پشك    عیش: خۆشی و شادی

(دیگران) کە ئەوانی دیکەیە لەم لغزەدا دەکرێ مەخلوقاتی جگە لە مرۆڤ بن، دروستکراوەکانی دیکە لەبەرئەوەی ئیرادەیان نییەو باری گرانی عەشقەوەو لەغەمدایە یاخود دەکرێ (دیگران) ئەو مرۆڤە نەزانانە بن کە ئاگایان لەنهێنی و حەقیقەتەکانی نییەو باریان سوکەو دوورن لەدەریای پروەیشومەی عەشق هەرکامیان بێت.

خواجە ئەوانە بە بارسوك دەداتە قەڵەم — هەروەك لەغەزەلی یەکەمدا لەترسی رێبوارانی نێودەریای عەشق و بارسوکەکانی کەنار دەدوێت — و ژیان و بەشیان خۆشییە، بەڵام ژیانی عاشقان هەمیشەپڕ لە غەم و ترسی نەگەیشتن و لەدەستدانی مەعشوقە.

**٦- جان علوی هوس چاه زنخدان توداشت**

**دست در حلقەی آن زلف خم اندر خم زد**

گیانی بەرز ئارەزووی چاڵی چەناگەی تۆی هەبوو، بۆیە دەستی خستە نێو ئەڵقەی ئەو زوڵفە لول و پێچاوپێچە.

علوی: بەرز    چاه زنخدان: چاڵی چانەگە    خم اندرخم: پێچ لەناو پێچ

خواجە لەم بەیتەدا پەیوەندی لەنێوان چاڵی چەناگەو زوڵفی پێچاوپێچ و لولدا دروست کردووە، دەڵێ بۆ ئەوەی گیانی بەرزم بگاتە چاڵی چەناگەت دەستی خستە نێو ئەڵقەی زولفت تاوەکو شۆڕی بکاتەوە بۆنێو لەزەتی چاڵی چەناگەت.

لەزاراوەی عیرفانیدا (چەناگە) جوانی و جێگەی لەزەت و چێژو وەرگرتنە لەموشاهەدەو ئەوحاڵەتە روحیانەیە کە دەکرێ عارف تیایدا چێژ وەربگرێت و (چاڵی چەناگە)ش



گرفتەکانە، بەڵام لێرەدا بەگشتی بەواتای چێژوەرگرتنەهاتووەو (زلف)یش نهێنی و رازەکانی عیرفان و تەریقەتە.

خواجە دەڵێ: گیان ئاسمان و بەرزم بەهیواو ئارەزووی چێژوەرگرتن بوو لە ئونس و ئولفەتی حەق، بۆیە رێگەی نهێنییەکانی گرتەبەرو هاتە نێو ئەڵقەی عیرفانەوە.

**٧- حافظ آن روز طربنامەی عشق تونوشت**

**کەقلم برسر اسباب دل خرّم زد**

حافظ ئەو رۆژە تەرەبنامەی عەشقی تۆی نووسی کە قەڵەمی بەسەر ئەسبابی شادی دڵی خۆیدا هێنا.

آن روز: ئەورۆژە    طرب: خۆش و شادی    نامە: کتێب    طربنامە: کتێبی شادی    نوشت: نووسی    اسباب: ئەسباب، هۆکار

خرم: شاد    قلم برسر زدن: قەڵەم بەسەرداهێنان؛ زەربی بەسەردا هێنان، واتە دانەدواوەی شتێك و رەفزکردنی.

خواجە نوسینەوەی کتێبی شادی عەشقی ئیلاهی بە رەفزکردن و زەرب بەسەر داهێنان دەبەستێتەوەو پێی وایە کاتێ دەتوانێ لە نووسینەوەی کتێبی عەشقی ئیلاهی بدوێین کەدەست لە شادی دڵی خۆمان هەڵگرین، هەربۆیە گوتویەتی:

حافظ ئەورۆژە توانی کتێبی شادی عەشقی تۆ بنووسێتەوە کە شادی دڵی خۆیی خستەلاوە،کە کتێبی شادی عەشق نوسینەوەش چوونە نێودونایی بەرفراوانی عیرفانەو عەشقی ئیلاهییە.

## غەزەلی سەد و پەنجایەم:

**بەحری هەزەجی هەشتی تەواو**

**(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)**

**١- سحر چون خسرو خاور علم برکو هساران زد**

**بەدست مرحمت یارم در امّیدواران زد**

بەیانی کاتی پاشای ڕۆژهەڵات ئاڵای لەسەرکۆساران هەڵکرد، یارم بەدەستی مەرحەمەتی لەدەرگای ئومێدەوارانی دا.

سحر: بەیانی، چون: کاتێ، کە خسرو: پادشا خاور: ڕۆژهەڵات

کوهساران: کۆساران درزدن: لەدەرگادادا

ئەم غەزەلە لەغەزەلە سادەکانی حافظ کە پێم وایە هاتنی لەنوسخە دێرینەکاندا بووەتە هۆی ئەوەی لەلایەن ڕەخنەگران و ساغکەرەوەکانی دیوانی حافظەوە لە دیوانەکەیدا نەسرێتەوە.

خسرو خاور: پادشای ڕۆژهەڵات، مەبەست لە پادشای ڕۆژهەڵات هەتاوە.

غەزەلەکە باسی لە یار دەکات سیفەتەکانی یار دەخاتەروو کە لە بەیتەکانی کۆتاییدا دەبێتە وەسفی پادشاکانی ئال مظفر.

لێرەدا ئەودەڵێ کەبەیانی هەتاو دەرکەوت و لەسەرکۆساران ئاڵای هەڵکرد یار بەدەستی میهرەبان و مەرحەمەتی خۆی ئاوڕی لەئومێدەواران دایەوەو لەدەرگای دان.

**٢- چوپیش صبح روشن شد که حال مهر گردون چیست**

**برآمد خندە‌ای خوش برغرور کامگاران زد**

کاتێ لای بەیانی ڕونبووەوە کە حاڵی میهرو نەرمی گەردوون سەبارەت بەمرۆڤ چییە، دەرهات و بە خۆ بەزلزانی مرۆڤە بەختیارەکان پێکەنی و خەندەیەکی خۆی کرد.

پیش: لای برآمد: دەرهات، هەڵهات کامگاران: خۆشبەختان، هەبووان بەختەوەران

وەك هەمیشە خواجە بێ میهری و بێ وەفایی و بێ ڕەحمی دونیاو گەردوون سەبارەت بەمرۆڤ دەخاتەروو دەڵێ: کاتێ بەیانی هەتاو هەڵهات و بۆی ڕونبوویەوە کە وەفاو میهری گەردوون لەگەڵ مرۆڤدا چۆنە — چۆن پاش ماوەیەك نابوتیان دەکات — بەغروری ئەوکەسانە پێکەنی کەئێستا بەختەوەرن و میهری دونیارووی لەوانە، واتە بەعەقڵی ئەوان پێکەنیی —



پێکەنینێکی گاڵتەئامێز — کەدونیا تاسەر ڕووی خۆشی لە هیچ کەسێك نابێت، بۆیە نابێ دڵی پێ خۆش بکەین و پێی مەغرور بین.

**٣-نگارم دوش درمجلس بەعزم رقص چون برخاست**

**گره بگشود ازگیسوو بردلهای یاران زد**

دوێنی شەو کە نیگارم لەمەجلیسدا بۆسەماکردن هەستا، گرێی پەلکەی کردەوەو دڵی یارانی پێ گرێدا

نگارم: یارم، مەعشوقم بە عزم رقص برخاستن: هەستانەوە بۆ سەما

گره: گرێ بگشود: کردەوە

دوێنی شەو کاتێ یار ویستی هەستێتەوە سەما بکات، گرێی پرچەکەی کردەوەو بەمەش گرێیەکی لەدڵی دۆستاندا، واتە دڵی دۆستان بەم هەستانەوە وە پەخشان کردنی پرچە ئەسیرو شەیدای یاربوو، یاخود دۆستان ئەم هەڵستانەوە یان پێ ناخۆش بوو.

**٤- من از رنگ صلاح آن دم بەخون بشستنم دست**

**کەچشم بادە پیمایش صلابر هوشیاران زد**

مـن ئەوکاتە بەخوێنی دڵ دەستم لەڕەنگی سەلاح و تەقواشوشت کەچاوی مەستی (بادەنۆشی) بانگی هۆشیارنی کرد.

صلاح: سەلاّح و تەقوا بشستم دست: دەستم شوشت؛ واتە: وازم لێهێنا

بادە پیمای: بادەنۆش، مەست صبا: بانگ، داوەتکردن

خواجە دەڵێ : ئەوکاتەی کە چاوی مەستی یار هۆشیارانی داوەتکرد، بانگی دەکردم بۆ ئەشق و مەستی، ئیدی من ڕەنگی سەلاّح و تەقوام واز لێهێناو بەنارەحەتی و ڕەنج بەدوی داواکانی چاوانی مەستی یارەوە چووم.

**٥- کدام آهن دلش آموخت این آئین عیّاری**

**کز اوّل چون برون آمد ره شب زندەداران زد**

کام دڵ ئاسنین ئەم داب و نەریتەی عەیارییەی فێرکرد کە یەکەم جار کە هاتەدەرەوە ڕێگەی لەشەو بێداران گرت.

آهن دل: دڵ ئاسنین — دڵڕەق آئین: ڕێ و ڕەسم، داب و نەریت

عیّاری: عەیاری و گوێ نەدان بە هیچ دابونەریتێکی کۆمەڵگە برون آمد: هاتەدەرەوە

رەزدن: ڕێگەگرتن شب زندەداران: شەوبێداران، ئەو زاهیدانەی کەشەوان بەخەبەرن و یادی خوا دەکەن.

لەگەڵ ئەوەشدا کە غەزەلەکە نەسراوەتەوە لە رەخنە و جیاوازی بەیتەکان رزگارنەبووە.

لە نوسخەی فەرەیدەن میرزای تەیموریداو لەپەراوێزی ئەم غەزەلەدا تێبینی ئەوە دراوە کە لە هەندێ نوسخەدا ئەم غەزەلە بەقەسیدە دانراوە ل٥٤٨ بەمەش هەموو یاخود زۆربەی مەرجەکانی قەسیدەی بەسەردا دەسەپێ کە سادەیی و مێژوویی بوونی و وەسفی بەرجەستەو یەکیەتی بابەتەو..هتد.

هەروەها لەژمارەی بەیتەکان و پێش و پاش پێکردنیشیاندا جیاوازی هەیە بە جۆرێ کە:

لە نوسخەی قەزینی و د.هەروی تیموری (١٣) بەیتەو لەنوسخەی تەیموریدا (١٤) بەیت و لەنوسخەی د. عیوضی دا تەنیا (١) بەیتە.

سەرباری جیاوازی ژمارەی بەیتەکانیش جێگۆرکێی بە بەیتی تەخەلوس کراوەو لە نوسخەی قزوینی و عیوضی و هروری دا بەیتی نۆیەمە، بەلاّم لە تەیموری و لیموری دا دوایین بەیتی غەزەلەکە / قەسیدەکەیە.

خواجە پێی سەیرە کە چ دلڕەقێك ئەم یارەی فێری عەیاری و شەوکوتی کردووە کەزۆر لەعەیارانی دیکەش پێ پاکترەو لەیەکەمین دەرکەوتنیدا دڵی شەوبێدارانی بەتالاّن برد، واتە یار هەربەیەکەم دەرکەوتنی دڵی شەو بێدارانی رفاندو ئەوانی بۆلای خۆی کەمەندکێش کرد.

**٦- خیال شهسورای پخت و شدناگه دل مسکین**

**خداوندا نگەدارش کەبرقلب سواران زد**

بەخەیاڵی شاسوارییەوە دڵی هەژارم لەناکاو رۆشت، خوداوەندا ئاگات لێی بێ کەئێستا هێرشی کردۆتە سەر ناوجەرگەی دڵی سواران.

شهسواری: شاسواری   پخت: کردە لێدا   شد: رۆشت   ناگە: لەپر، ناگەهان، لەناکاو   بەقلب سواران زد: هەڵیکوتایەسەر ناوجەرگەی سوارچاکان

خواجە لای خوداوەند نزا بۆدڵی رۆشتووی خۆی دەکات کە بەخەیاڵی بوونەسوارچاکێکی مەیدانەوە ئاوزەنگی لەئەسپەکەی داوە، بۆیە بەم خەیاڵەوە دەبێ ئێستا لەناوچەگەری سوارچاکاندا بێت و کێبەرکێی عەشق بکاتە بۆیەدەڵی: خوایە بیپارێزەو ئاگات لەدڵی هەژارم بێت.

**٧- درآب و رنگ رخسارش چەخون خوردیم و جان دادیم**

**چونقشش دست داد اوّل رقم بر جانسپاران زد**

لەجوانکردنی (رەنگ کردنی) روخساریدا چەند نارەحەتیەکان کێشا، کەچی کە نیگارەکە تەواو بوو یەکەم جار خەتی بەسەر فیداکاراندا هێنا.



آب و رنگ دادن: رەنگکردن و جوانکردنی تابلۆ   خونی خوردن و جان دادن: خوێنی خواردن و گیاندانی، ئەم دەربرینە درکەیە لەهەوڵ و ماندووبوونی زۆر لەپێناو کارێکدا وەك لەکوردیا دەگوترێ گیانم دەرچوو لە گەڵیدا.

چو: کاتێ، کە   نقشش دست داد: نیگارەکە تەواو بوو، ئەوەی دەیویست بۆی کرا، یاخود بەواتای سەرکەوتن بێت

جانسپارن: فیداکاران   وتم بزرچیزی زدن: خەت بەسەرشتێکدا هێنان

خواجە باس لە یار/ کەسێك دەکات کەهەوڵی ماندووبوونێکی زۆریان لەگەڵ کێشاوە، بەلاّم کاتێ سەرکەوتووە پشتگوێی خستوو، ئەو ئەم مەبەستەی لەزاراوەی وێنەکێشاندا دەربریوە و دەڵێ: گیانمان دەرچوو تا تابلۆی کارەکانیمان رەنگ کردو رازاندەوە، بەلاّم کەتەواو بوو یەکەمجار خەتی بەسەر ئەو ناوانەدا هێنا کەخۆیان فیداکردبوو.

**٨- منش باخرقەی پشمین کجااندرکمند آرم**

**زرەمویی کەمژگانش رەخنجرگزاران زد**

من بە خرقەی خورییەوە چۆن دەتوانم کەسێ بەخەمە کەمەندەوە، کەموی وەك (کوللەنەبر)ە وە برژانگی رێگەی لە خەنجەروەشێنان گرتووە.

پەشمین: (پەشم) خورییە و پەشمین هەر جلوبەرگێکە لەخوری دروست بکرێت.

کمند: کەمەند

آرم: بهێنم، بیخەم   زرە: ئەو جلە بێ قۆڵە ئاسنینیەی کە شمشێرنەیدەبری و جاران لەکاتی شەڕدا لەبەردەکرا گوللەنەبر   خنجرگزاران: خەنجەروەشێنان.

خواجە یار بەو پاڵەوانە دەزانێت کە مووی وەك شمشێر نەبراوەیەو لەبەریدایەو برژانگی رێگە لەپاڵەوانە خەنجەر بەدەستەکان دەگرێت و ئەوانی بەگیرهێناوە، لەهەمان کاتدا خۆشی بەسۆفییەکی هەژاری و لاوازی خیرقەی خوری لەبەر دەداتە قەڵەم و دەڵێ من چۆن دەتوانم ئەوبخەمە کەمەندەوەکە ئەو هێندە بەهێزو من هێندە لاوازم.

**٩- شهنشاه مظفر فر شجاع ملك و دین منصور**

**کەجود بی دریغش خندە برابربهاران زد**

شاهەنشایەك کە گەورەیی و فەری ئال مظفری هەیە (مەنوسر) شوجاعی لەکاری دین و سەڵتەنەتدا کەپیاوەتی و کەرەمی بێ درێغی گاڵتەی بەهەورەی بەهاران دێت.

شاه منصور: دوایین پادشای ئال مظفر کە لە (٧٢٣ — ٧٩٥) لە فارس و کرمان و یەزدو و ئیسفەهان و هەندێ بەشی خوزستاندا حوکمیان کردووە شاە، مەنسور کە لە (٧٥٠)ی کۆچی

مانگیدا لەدایکبووەو برازاوای شاشوجاعەو کوری مظفر بن محمد (امیر مبارزالدین)ە وەك گوترا دوایین پادشای ئال مظفر ەوە لە بەرامبەر هێرشی تەیموری لەنگا جەنگاو تەنانەت خۆی دووجار بەشمشێر هێرشی کردۆتە سەر تەیمور، بەڵام دواجار بەکوشتنی خۆیی و هەفتا کەسی لەشازادەکانی ئال مظفر بەفەرمانی تەیموری لەنگ لەساڵی (٧٩٥)ی کۆچی مانگی؛ واتە لە تەمەنی (٤٥) ساڵیدا زنجیرەی دەسەلاتی ئال مظفر کۆتایی پێهات.

حافظ دووساڵی پادشایەتی شامەنسوری بینیوەو زۆرخۆشی ویستووە، لە دیوانەکەیدا (٩)جار بە ئاشکرا وەسفی کردووە تەنانەت خواجە هیچ پاشایەکی دیکەی وەك ئەم پادشایە وەسف نەکردووە {بروانە حافظ نامە ج٢ ل١٠٧}.

جود: چاکە، پیاوەتی، کەرەم  بی دریغ: بێ درێخ، بێ قسور

خندە برابربهاران زد: بەهەوری بەهاران پێکەنی، بێگومان لەگاڵتەپێکردندا؛ واتە هێندە بەکەرەم بوو لەهەوری بەهارانیش زیاتر تەنانەت گاڵتەی بەویش دەهات.

هەوری بەهاران بەسەر هەموو شتێکدا دەبارێت و چاکەوپیاوەتی لەگەڵ هەمووشتێکدا دەکات، بەڵام خواجە لەم بەیتەشداو لەوەسفی شاەمەنسوردا دەڵێ شاەمەنسوری ئال مظفر کە ئازاو پاڵەوانی دین و دەوڵەت بوو هێندە خاوەن چاکەو پیاوەتی بوو کە جودو پیاوەتی ئەو گاڵتەی بەهەوری بەهاران دەهات و لەهەوری بەهارانیش زیاتر بوو.

**١٠- ازآن ساعت کە جام می بەدست اوشرف شد**

**زمانە ساغر شادی بەیاد مگیساران زد**

لەو کاتەوە کە جامی مەی بەدەستی ئەو پیرۆزبوو (بەرێزبوو) زەمانەپێکی شادی بەیادی مەی خواردنەوە هەڵدا.

میگساران: مەینۆشان، مەیخۆران.

بەیتەکە وەسفی شامنسور دەکات کە لەوکاتەوە ئەوپێکی مەی گرتەدەست و مەی بەدەستی ئەو پیرۆزبوو زەمانەش بەیادی مەینۆشانەوەپێکی گرتە دەست و هەڵیدا.

**١١- نظربر قرعەی توفیق و یُمن دولت شاە است**

**بدەکام دل حافظ کەفال بختیاران زد**

چاوم لە تەوفیق و بەرەکەتی دەوڵەتی پاشایە، ئارەزووی دڵی حافظ بەجێ بێنە کەفاڵی بەختیاران گرتۆتەوە.

فال بختیاران: فاڵی چاك،  فاڵی خێر.

خواجە لەم بەیتەدا داوای سەرکەوتن و بەرەکەتی دەوڵەتی پاشا دەخوازێت.



# غەزەلی سەد و پەنجا و یەکەم:

**بەحری موزاریعی هەشتی ئەخرەب**

**(مفعول فاعلاتن مفعول فاعلاتن)**

**١- راهی بزن کە آهی بر ساز آن توان زد**

**شعری بخوان کە با او رطل گران توان زد**

ئاوازێك لێدە کە بتوانرێت بەئاهی ئەوئاهێك هەڵکێشرێ، شعرێك بخوێنە کەبتوانرێت لەگەڵ ئەوا پێکی گەورەی شەراب بنۆشرێت.

راە: رێگە  ئاوا،  لێرەدا مەبەست لەئاوازی مۆسیقییە    با او: لەگەڵ ئەو

رطل گران: پێکی گەورە و قورس.

(رطل گران زد) واتە پێکی قورس و پڕ هەڵگرتن و نۆشین، کە بکەر لێرە ئاشکرایە کەسی سێیەمی تاکە (ئەو) بەڵام بە هێنانی (توان) رطل گران توان زد: دەتوانرێ پێکی قورس و پڕ هەڵگیرێت و بنۆشرێ، تەنیا بکەرە و لەکەسێکی ئاشکرای سێیەمی تاکەوە بەنائاشکرا و نادیار دەگۆڕدرێت.

خواجە داوا لە موتریب دەکات کە ئاوازێك لێبدات کە هێندە بە سۆزبێت بتوانرێ بەئاهەنگی ئەو ئاهێك هەڵگیرێت، هەروەها شیعرێك بخوێنێ و بچڕێ کە بتوانرێ لەگەڵیدا پێکی گرانی شەرب هەڵگیرێت و بنۆشرێ.

**٢- بر آستان جانان گر سر توان نهادن**

**گلبانگ سربلندی بر آسمان توان زد**

ئەگەر بتوانرێ سەربخرێتە سەر ئاستانە و بەردەرگای یارەوە  دەتوانرێ لەئاسمانەدا هاواری سەربەرزی بکرێت.

سرنهادن: سەردانان، سەرختسنەسەر    گلبانگ، ئاوازی خۆش، هاوار و بانگ

(توان) لەگەڵ هەرکارێکدا بێت دەبێتە مایەی گۆڕینی حاڵەتەکەی و ئەگەرنا هیچ گۆڕانێك لە واتای بنەرەتیدا دروستناکات.

وەك هەمیشە خواجە وەسڵی یاروجانان بەمایەی سەربەرزی و سەرکەوتن دەزانێت و ئەم بیرە بەچەندین شێوە و لەچەندەها رێژە و حاڵەتی زمانیدا دەردەبڕێت، لێرەشدا بەگۆڕینی حاڵەتی رستەکان دووبارەی دەکاتەوە کە بوونەنۆکەری یار سەربەرزییە.

ئەودەڵێ: کەسێ کە بتوانێ سەری بخاتە سەرئاستانە و بەردەرگای یار و لەبەردەم ئەودا بچەمێتەوە هێندە بەرێز دەبێت کە دەتوانێ لەئاسماندا هاواری شادی و سەربڵندی بەرزبکاتەوە.

**٣- قدّ خمیدەی ما سهلت نمایدامّا**

**برچشم دشمنان تیر ازین کمان توان زد**

گەرچی باڵای چەماوەی ئێمەت بێ نرخ دێتە بەرچاو بەڵام لەم کەوانەوە دەتوانرێ تیر بگیرێتە چاوی دوژمنان.

قد: باڵا خمیدە: چەماوە سهل: ئاسان و بێ نرخ

خواجە باڵای چەماوەی خۆی بەکەوانی تیرهاوێشتنی بۆچاوی دوژمنان دەزانێت بەیار دەڵێ گەرچی تۆ باڵای چەماوەی ئێمەی لاوازت بەلاوە کەم بەهایە، بەڵام هەرلەم کەوانەی باڵای چەماوەی ئێمەوە دەتوانرێ تیر لە دوژمنان بگیردرێت واتە گەرچی لاوازین بەڵام تیری چاوی دوژمنانین و ئێمە پارێزگاریت لێدەکەین و دەتپارێزین یاخود گەرلەم پیرییەشدا لەگەڵماندا بیت چاوی پڕ لە حەسادەتی دوژمنان دەتەقێ.

**٤- درخانقه نگنجد اسرار عشقبازی**

**جام می مغانه هم با مغان توان زد**

نهێنییەکانی عەشقبازی لەخانەقادا ناگونجێ (جێی نابێتەوە) پێکی مەیی موغانە هەرلەگەڵ موغاندا دەتوانرێ هەڵدرێی.

نگنجد: ناگونجێ، جێی نابێتەوە.

جامی مغانە: جامی مەیی موغانە، جامی پڕی وەك جامی موغان.

سۆفیە ساویلکە و رواڵەتییەکان لەخانەقادان و ئاگایان لەئەسراری عەشقی ئیلاهی نییە و پێویستە کارێکیش لەگەڵ ئەهلی خۆیدا ئەنجامبدرێت. تەریقەت و عەشقی ئەزەلین ئاگادارین لە نهێنییەکانی عەشق، ئاگایان لەعاشقان و رێوەڕەسمی عەشق هەیە.

تەریقەت و عەشقی حەقیقی ئەزەلین و ڕەمزی ئاگادارین لە نهێنییەکانی عەشق، ئاگایان لە عاشقان و رێوڕەسمی عەشق هەیە.

خواجە هەمیشە لەم ڕاستییەی نێو عەشق دەدوێت کە پێویستە لەگەڵ مەحرەماندا باس لە عەشق و لە قۆناغەکانی و چێژەکانی و نهێنییەکانی بکرێت.

لێرەشدا وەك هەمیشە ڕەفزی خانەقا دەکاتەوە وەك جێگەی ئەسرار و نهێنییەکانی عەشق و عەشقبازی دەڵێ: نهێنییەکانی عەشقبازی لە خانەقادا جێیان نابێتەوە و ناکرێ لەگەڵ



نامەحرەمانی وەك سۆفییاندا دایان بنێی بەڵکو دەبێ لەگەڵ مەحرەماندابن هەر وەك چۆن عەشق و جامی پڕی موغانەش هەر لەگەڵ عاشقان و موغاندا دەتوانرێ بنۆشرێت.

**٥ — درویش را نباشد برگ سرای سلطان**

**مائیم و کهنه دلقی کآتش در آن توان زد**

دەروێش ئارەزووی ماڵی سوڵتانی نییە، ئێمەین و کۆنە دڵقێ کە ئەتوانرێ ئاگری تێ بەردرێت.

برگ: ئارەزوو، بەرگی جارانی سۆفی و دەروێشان (برگ) لە شیعری خواجەدا جگە لە ئارەزوو بە دوومانای دیکە هاتووە، کە یەکێکیان بەرگ و پەڕی گوڵ و گیایە و دووەمیان بەواتای توێشوو تەدارەك توانایە.

سرا: ماڵ، سەرا مائیم: ئێمەین دلق: خیرقە، دلق

لەم بەیتەدا ئەکرێ (بەرگ) بەواتای ئارەزوو یاخود بە واتای (توانا و توێشوو) بێت، خواجە دەڵێ: ئێمەی دەروێش کە تەنیا کۆنە کراسێکی خوریمان هەیە کە ئەکرێ ئاگری تێ بەردەیت و بیسوتێنی ئارەزووی ماڵی سوڵتانمان نییە یاخود، توانا و توێشووی چونە ماڵی سوڵتانمان نییە.

کە دنیایەك تەدارەکی دونیایی دەوێت و ئێمەش تەنیا کراسێکی کۆنەی خوریمان هەیە.

**٦ — اهل نظر دو عالم در یک نظر ببازند**

**عشق است و داو اول بر نقد جان توان زد**

ئەهلی نەزەر ساحیبنظران هەر دوو عالەم بە نیگایەك ئەدۆڕێنن، عیشقە و تیایدا لە یەکەم نۆرەدا ئەتوانرێ شەرتی نەقدی گیان بکرێت.

داو: سەرە، نۆبەت، داو لە کوردیشدا بەم واتایە یاخود نزیك لەم واتایە لە یاری منداڵاندا هێشتا هەرماوە، بۆ نموونە لە چاوشارێکدا بە دۆڕاو ئەگوترێ (داو) واتە سەرەی تۆیە چاو داخەی. داو اول: سەرەی یەکەم

خواجە باسی لە پیرانی ڕێگەی عەشق، یاخود عاشقانی حەقیقەت هەردوو دونیا ئەکەنە قوربانی یەك بینینی یار و مەعشوق، هەر خۆی ئەم قوربانی کردنە بەشەرتی عیشق دەزانێ و دەڵێ ئیدی عەشقە و لە نۆرەی یەکەمدا گیان دائەنرێت و شەرت لەسەر بە فیداکردنی ئەو دەکرێت.

ئەرێ ئەمە قوماری عەشقە و ئەتوانرێ هەریەکەم جار گیان بخرێتە بانقەوە.

**٧ — گر دولت وصالش خواهد دری گشودن**

**سرها بدین تخیل بر آستان توان زد**

گەر بەختی ویساڵی دەرگایەك بەڕووی عاشقاندا بکاتەوە، بەم خەیاڵەوە ئەتوانرێ کۆمەڵێکی زۆر سەر بخەینە سەر بەردەرگای و بیکەینە قوربانی.

دری گشودن: دەرگایەك كردنەوە        بدین تخیل: بەم خەیاڵەوە.

ئێمەی عاشق گەر تەنیا ئومێدی كردنەوەی دەرگایەكی وەسڵی ئەومان واتە گەر ئومێدمان بەویساڵ و پێگەشتنی ئەو مەعشوقە ئەزەلییە هەبێت ئەوا ئامادەی فیداكاری و سەردانەواندنی زۆرین لەبەر ئاستانەكەیدا.

**٨ — عشق و شباب و رندی مجموعەی مراد است**

**چون جمع شُد مَعانی، گوی بیان توان زد**

عەشق و لاوی و رەندی تەواوی ویست و مرادە، گەر ماناكانیش كۆبوونەوە ئەتوانرێ لە گۆی بەیانكردن بدرێت.

مجموعەی: كۆمەڵە، تەواو، هەموو        معانی: ماناكان - یاخود علم معانی

گوی بیان توان زد: لە گۆی بەیانكردن و خستنەڕوو دان، دەبڕین.

خواجە دەڵێ: ئاوات و ویستی هەر كەسێك عەشق و لاوی و رەندییە، مەرجی كۆبوونەوەی واتایە لای هەركەسێ كەدەتوانێ قسەكەرێكی چاك بێت.

خواجە لەم بەیتەدا دو شتی زۆر گرنگ دەخاتەڕوو یەكەمیان ئاواتی ساحێبدڵان كە عەشق و گەنجی و رەندییە. كە لەڕاستیدا ئەم سێ خاڵە لە هەركەسێكدا هەبێت، بەڕاستی بە ئاوات گەیشتووە.

هەروەها پێی وایە كاتێ مرۆڤ واتای هەبوو یاخود واتاكان لە هزریدا كۆبوونەوە ئیدی قسەكەرێكی زۆر چاك دەبێت و گۆی بەیانكردن دەباتەوە ئەو واتایانەش ئەكرێ هەمان مەرجەكانی پێشەوە بن.

**٩ — شد رهزن سلامت زلف تو وین عجب نیست**

**گر راهزن تو باشی صد كاروان توان زد**

زولفت بووە رێگری سەلامەتی و ئەمەش سەیر نییە، چونكە گەر تۆ رێگر بیت ئەتوانرێ سەد كاروان تاڵان بكرێت.

رهزن: رێگر، چەتە        سلامت: سەلامەتی        وین: وەئەمەش

تو باشی: تۆ بیت        كاروان زدن: كاروان تاڵانكردن.

خواجە پرچی یار بە تاڵانكەری سەلامەتی دەزانێت و ئەمەشی پێ سەیر نییە، چونكە یار لە تاڵانكردنی سەلامەتیدا زۆر ئازایە و گەر ئەو تاڵانكەر و رێگر بێت ئەتوانێ سەد كاروانیش تاڵانكات.



سەلامەتی لەبەیتەكەدا ژیانی ئارام و كۆمەڵایەتی دوور لە كێشە و نارەحەتییەكانی عەشقە، بەڵام نهێنییەكان یا پرچی یار كە نهێنی عەشقن ئەم خۆشگوزەرانییە كۆمەڵایەتییە لە عاشقان ئەستێنێت هەروەك چۆن رێگرەكان كاروان تاڵان دەكەن.

**١٠ — حافظ بەحقّ قرآن كز شَید و زرق بازآی**

**باشد كە گوی عیشی دراین جهان توان زد**

حافظ تو حەقی قورئان واز لەم فریو و ریاكارییە بێنە، بەڵكو بتوانی لەم جیهانەدا گۆی (عەیش)ێك ببەیتەوە.

بە حقّ قرآن: توحەقی قورئان        شید: فریو، مەكر، فڕوفێڵ        زرق: ریاكاری و دووڕیی.

وەك جارێكی دیكەش واتای عیرفانی وشەی (عیش)مان خستەڕوو (عیش) لە زاراوەی عیرفانیدا لەزەت و چێژی خۆگرتن و هاودەمییە لەگەڵ حەقدا. ئەم چێژەش لەگەڵ ریاكاری و فڕوفێڵدا هەرگیز یەكناگرێتەوە، بۆیە خواجە خۆی سوێند دەدات كە توحەقی قورئان واز لەم فڕوفێڵ و ریاكارییە بهێنە و بەڕاستی رووبكەرە عەشقی ئیلاهی، چونكە بەڕاستگۆیی مرۆڤ دەتوانێ لەزەت و چێژ لە هاودەمی حەق ببینێ، مرۆڤ بە عەشقی پاكی ئیلاهی و دووركەوتنەوە لە فڕوفێل و ریاكاری ئەتوانێ لە چێژی بەردەوامدا ژیان بەسەر بەرێت.

## غەزەلی سەد و پەنجا و دووەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی ئەسڵەم**
**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع لن)**

**١ ـ اگر رَوَمْ ز پی اش فتنەها برانگیزد**
**ور از طلب بنشینم بەکینە برخیزد**

ئەگەر برۆم بەدوایدا فیتنە و ئاشوب هەڵدەستێ   ئەگەر وازیشی لێ بێنم دەست دەداتە رق و کینەوەرزی

روم: برۆم   زپیش: بە دوایدا
برانگیزد: هەڵدەستێنێ، بەرپا دەکات.
از طلب بنشینم: واز لە داوا بێنم، وازی لێ بێنم   برخیزد: پێی هەڵدەستێ

ئەم غەزەلە کە لە لوتکەی سادەیی و ناسکی و جوانیدا نووسراوە و لە سیفەتەکانی مەعشوقی ئەزەلی یا مەعشوقی نێو غەزەلیاتی عیراقی ئەدوێت و زۆرێك لە سیفەتەکانی دەخاتەڕوو، ئەو مەعشوقەی کە هەمیشە بۆشاییەك لە نێوان خۆی و عاشقدا دەهێڵێتەوە و ناهێڵێ عاشق لەو دوورابییە دوورتر و نزیکتر بکەوێتەوە و چێژ لەم هەڵوێستە وەرگرێت.

واتە مەعشوق ناهێڵێ عاشق لەو ماوەیە نزیکتر ببێتەوە و گەر عاشق بیەوێ نزیك بێتەوە هەڵدێ و خۆی حەشار دەدات یاخود ئاشووب و فیتنە بەرپا دەکات و گەر عاشقیش بیەوێ واز لە عەشق بهێنێت و لەو ماوەیە دوور کەوێتەوە ئەوا دیسانەوە رازی نابێت و لێی نزیك دەبێتەوە. گەر ئەم دوو حاڵەتە دوورکەوتنەوە و نزیك کەوتنەوەی تەواو لە عەشقی حەقدا رووبدات ئەوا ئاشووب فیتنە بەرپا دەبێت. حەللاج لە ئەنجامی زۆر نزیك کەوتنەوەی لە مەعشوق سوتا.

خواجە لەم بەیتەدا باس لە سیفەتی پاراستنی ئەو ماوە و دوورابییە دەکات لەلایەن مەعشوقەوە و دەڵێ: گەر بەدوایدا برۆم و لێی نزیك ببمەوە فیتنە و ئاشوب بەرپا دەکات - وەك عەشقی حەللاج - هەروەها گەر بێدەنگ بم و وازی لێ بهێنم دیسانەوە رازی نابێت و رقی لێم دەبێتەوە.

مەحوی رەحمەتی لەسەر ئەم واتایە دووبەیتی بەرزی داناوە کە دەڵێ:

**بەدەردی خۆمەوە گۆشەیەك دەگرم بە بێدەنگی**
**بەلامادێ بە خەشم و دەڵێ خۆنەقشی دیوارە**



**٢ - وگر بە رهگذری یك دم از هواداری**
**چو گرد در پی اش اُفتم چو باد بگریزد**

وە گەر بە ڕێبواری یەك سات لە تاسە و ئارەزوودا وەك تۆز بە دوای کەوم وەك با هەڵدێ.

دم: سات، لەحزە، هەناسە   هواداری: حەز و تاسە، ئارەزوویی   گرد: گەرد و تۆز
افتم: بکەوم   بگریزد: هەڵدێت.

دیسانەوە باسی لە دوورکەوتنەوەی مەعشوق خواجە دەڵێ گەر لەڕووی حەز و تاسەوە بۆتەنیا ساتێکیش وەك گەرد و تۆز بەدوای کەوم و بمەوێ لێی نزیك ببمەوە ئەوا وەکو با هەڵدێت و رادەکات.

**٣- وگر کنم طلب نیم بوسە صد افسوس**
**زحقّەی دهنش چون شکر فروریزد**

وەگەر داوای نیو ماچ بکەم، سەد ئەفسوس وەك شەکر لە قوتووی دەمیەوە دێتە خوارەوە دەڕژێ.

نیم بوسە: نیو ماچ   حقە: قوتووی بچووکی گەنج و جەواهیر، لێرەدا وەسفی دەمی بچووکی یارە.
دهن / دهان: دەم   فروریزد: دێتە خوارەوە، دەڕژێ.

خواجە دەڵێ: گەر جارێ داوای نیو ماچی لێ بکەم ئەوا وەك چۆن شەکر لە قوتوو دێتە خوارەوە لە دەمی یارەوە سەد ئەفسوس شیرینی دێتە دەرێ، واتە: گەر داوای نیو ماچی لێ بکەم ئەوا بەقسەی خۆش و شیرینی دەمی سەد جار دەڵێ ئەفسوس کە نابێت و رەفزی دەکات. لێرەدا هەست بە راگرتنی بۆشاییەکە دەکەینەوە.

**٤ - من آن فریب کە درنرگس تو می بینم**
**بس آبروی کە باخاك رە برآمیزد**

من کە ئەو فریوکارییە لە چاوانی تۆدا دەبینم   دەزانم کە ئابڕوێ زۆرێك تێکەڵ بە خاکی ڕێگە دەکات.

**آبرو:** ئابڕوو، ئاوی ڕوو (فرمێسك)   برآمیزد: تێکەڵاو دەبێت.
(آب رو) بە هەردوو مانای سەرەوە   ئابڕو، فرمێسك بەکاردێت و نابێتە مایەی تێچکوونی واتاکە.

خواجە دەڵێ: من کە جوانی و فریوکاری چاوانی مەستی تۆ دەبینم دەزانم ئەم چاوانە دەبنە مایەی ئەوەی کە کەسانێکی زۆر لە خشتە بچن و عاشقی تۆ بن و ئابڕویان تێکەڵاوی خاکی

ڕێگە بێت و بڕژێت، یاخود ئەزانم کە کەسانێکی زۆر عاشقی خۆی دەکات و ناشیەڵی پێت بگەن بۆیە فرمێسکی زۆرت بۆ دەڕێژن و ئاوی ڕویان (فرمێسکیان) تێکەڵاوی خاکی ڕێگە دەبێت.

**٥ - فراز و شیب بیابان عشق دام بلاست**

**کجاست شیردلی کز بلا نپرهیزد**

هەڵبەز و نشێوی بیابانی عەشق داوی بەڵایە   شێرێك لە کوێیە کە خۆی لە بەڵا لانەدات.

فراز و شیب: هەڵبەز و نشێو.   دام: داو.   شیر دلی: شێر دڵێك، کەسێ کە دڵی وەك شێر وایە.

نپرهیزد: خۆی لانەدات.

خواجە وەك هەمیشە عەشق بە خەتەرناك دەداتە قەڵەم ئیدی دەریایەکی ترسناك یاڕێگەیەك یا بیابانێك، لێرشدا بە بیابان ئەیداتە قەڵەم کە پڕە لە ترس و تاقیکردنەوە، پیاوی ئازای دەوێت. هەر خۆشی دەڵێ: شێردڵێ لە کوێیە کە لەمانە نەترسێت و بیابانی عەشق تەی بکات.

**٦ - تو عمر خواه و صبوری کە چرخ شعبدەباز**

**هزار بازی ازین طرفەتر برانگیزد**

تۆ تەمەن و ئاسایش داواکە، تا بزانی کە فەلەکی جادووگەر   هەزار فێڵ لەمە سەیرتر دەکات.

عمر: تەمەن   شعبدەباز: جادوگەر، فریوباز   بازی: فێڵ   طرفەتر : سەیرتر
برانگیز: دەخاتە گەڕ.

خواجە دیسانەوە فڕوفێڵی چەرخی چەپگەرد دەخاتەڕوو دەڵێ گەر تەمەن باقی بێت یەك دنیا فڕوفێڵی دیکەی لێ دەبینین و هەرگیز چاك نابێ.

دەڵێ: تۆ داوای تەمەنی درێژبکە و سەبرت هەبێ بزانە چەرخی چەپگەردی جادووباز هەزار فڕوفێڵی لەوانەی ئێستای سەیرتر ناکات و نایبینن. واتە: چەرخ هەرگیز بەمەرامی مرۆڤ نابێ.

**٧ - بر آستانەی تسلیم سر بنە حافظ**

**کە گر ستیزە کُنی روزگار بستیزد**

حافظ سەربنێ سەر ئاستانەی تەسلیم بوونەوە   چونکە گەر عینادی بکەیت ڕۆژگاریش عینادیت لەگەڵ دەکات.

سربنە: سەرنجە، سەربنێ.

ستیزە / ستیز: عینادی اینکاری (لەم بەیتەدا بەم واتایە بەکار هاتووە)، کێ هەیە گرەو لە ڕۆژگار بباتەوە و دواجار سەری تەسلیم بوون لەبەرامبەریدا دانەنوێنێت.



ئەم دایە یەکێکە لە بنەماکانی جەبرییەت لە ژیانیدا و ئیختیاری لە مرۆڤ دەستێنێتەوە.

خواجە بە خۆی دەڵێ: گەر عومرت درێژ بێت فڕوفێڵی ڕۆژگار زۆر زیاتر دەبینی، هەربۆیە حافظ تۆ هاوشانی ئەونیت و توانای کێبەرکێت لەگەڵیدانییە و گەر بتەوێ عینادی بکەیت ئەویش عینادی دەکات و دواجار هەر بەسەرتدا زاڵدەبێت هەر بۆیە هەر لەسەرەتاوە سەری تەسلیم بوون دانەوێنە و واز لە عینادی بهێنە.

## غەزەلی سەدو پەنجا و سێیەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی مەحزوف**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلن)**

**١ – بەحسن و خلق و وفا کس بە یار ما نرسد**

**ترا درین سخن انکار کـار ما نرسد**

بە جوانی و رەوشت بەرزی و وەفا کەس بەیاری ئێمە ناگات تۆ لەم قسەیەدا انکاری کاری ئێمەت پێ ناکرێت.

حسن و خلق: جوانی و رەوشت بەرزی نرسد: ناگات سخن: قسە.

خواجە یاری خۆی بە جوانترین رەوشت و وەفادارترین دەداتە قەڵەم و ئەم قسەیەشی بە بێ چەند و چون دەزانێت و دڵنیایە کە هیچ کەسێ شایانی ئەوە نییە کە ئەم قسەیە بەرپەرچ بداتەوە.

ئەو دەڵێ: لە جوانی و رەوشت و وەفادا کەس ناگاتە یاری ئێمە تۆ ئەی مودەعی لەم قسەیەدا شایانی بەرپەرچدانەوەی ئەم قسەیە نیت، چونکە ئاگات لەم مەسەلەیە نییە.

**٢ – اگر چە حسن فروشان بە جلوە آمدەاند**

**کسی بە حسن و ملاحت بە یار ما نرسد**

ئەگەر چی جوانی فروشان دەستیان داوەتە خۆ نمایش کردن، بەڵام کەس لە جوانی و خوێنگەرمیدا ناگاتە یاری ئێمە.

حسن فروشان: جوانان، ئەوانەی جوانی دەفرۆشن و خۆیان و خەڵك بە جوانیان دەزانن.

بە جلوە آمدەاند: خۆیان نمایش دەکەن ملاحت: خوێنگەرمی

جەختکردنەوەیە لەسەر جوانی یار کە هیچ کەسێ بە جوانی ئەو ناگات گەرچی جوانانیش خۆیان نمایش دەکەن.

**٣ – بە حقّ صُحبت دیرین کە هیچ محرم راز**

**بە یـار یک جهت حقّ گُزار ما نرسد**

سوێند بە حەقی دۆستایەتی دێرینە کە هیچ مەحرەمی رازێك ناگاتە یاری ڕووڕاست و یەکدڵ و حەقناسی ئێمە.

صُحبت: دۆستایەتی، هاودەمی یەك جهت: ڕووڕاست و پاك.



حق گزار: حەق بەجێ هێنەر، حەقناس، قەدرزان.

خواجە سوێند بە هاودەمی و دۆستایەتی دێرین دەخوات کە هیچ مەحرەمی رازێك ناگاتە یاری سەرڕاست و دڵپاك و قەدرزانی ئەو. لەڕاستیدا بەیتەکە سادەیە و بە چاکترین زانینی یارە، بەڵام (صحبت دیرین) ئاڵۆزییەك دروستدەکا ئایا دۆستایەتی لەمێژەینە هەر دۆستایەتییەکی دێرینەی مرۆڤە یاخود هاودەمی دێرینەی عاشقان و مەعشوقی حەقە ؟ کە ئەمەی دواییان زیاتر شایانی سوێند پێ خواردنە.

**٤ – هزار نقد بە بازار کائنات آرند**

**یکی بە سکّەی صاحب عیار ما نرسد**

هەزار جۆر پارە بهێننە بازاڕی بوونەوە یەکێکیان ناگات بەسکەی عەیارداری ئێمە.

نقد: پارەی رایج، سەرمایە کائنات: بوونەوەران، کائنات مەبەست لە (بازاڕی کائنات) بوونە. آرند: بهێنن سکە: سکە، پارەی وردە کەلە کاغەز نەبێت.

صاحب عیار: عیاردار، بێ غەش و تەزویر.

(صاحب عیار) جگە لە واتای زمانی نازناوی (قوام الدین محمد بن علی صاحب عیار)ە کە وەزیری شاە شوجاع بوو، وەك باپیرانی پیشەی (صاحب عیار)ی بوو کە گرنگترین کاری دیوان بوو، بەزاراوەی ئەمڕۆ وەزیری دارایی و خەزێنە بووە. لەبەر ناوبانگی حەسودان لای شاە شوجاع داویان بۆ دەتەنی و سەرئەنجام لە ساڵی (٧٦٤)ی کۆچی مانگیدا شاە شوجاع فەرمانی کوشتنی دەرکرد.

حافظ لە چەند جێگەیەکدا وەسفی حاجی قوام دەکات، لەم بەیتەشدا(صاحب عیار) ئەم مانایەش دەبەخشێ: خواجە لە وەسفی یار/ قوام الدین صاحب عیاردا دەڵێ گەر هەزار جۆر سەرمایە و پارە بهێننە بازاڕی بوون و وجودەوە تەنیا یەکێکیان ناگات بە سکەی عەیارداری ئێمە کە یارە یاخود ناگات بە قوام الدین صاحب عیار.

**٥ – هزار نقش براید ز کلك صنع و یکی**

**بـە دلپـذیری نقش نگار ما نرسد**

هەزار وێنە لە قەڵەمی دروستکردنەوە دەنەخشێنرێت یەکێکیان ناگات بە وێنەی دڵپەسەندی نیگاری ئێمە.

براید: دێت دەردەکەوێت، دەنەخشێنرێت کلك: قەڵەم

صنع: دروستکردنەوە، سونع دلپـذیر: دڵپەسەند.

دیسانەوە خواجە وەسفی یار دەکات لە تەواوی مەخلوقاتی دەستی قەڵەمی دروستکردن زیاتر لە دڵدا دەچەسپێ و پەسەندە ئەکرێ (نیگار)ی ئەم بەیتە هەمان (صاحب عیار)ی بەیتی پێشوویێت.

خواجە دەڵێ: قەڵەمی دروستکردن هەزار وێنە دروستدەکات، بەڵام یەکێکیان وەك وێنەی یاری ئێمە پەسەند نییە.

**٦ - دریغ قافلەی عمر کانچنان رفتند**

**که گردشان به هوای دیار ما نرسد**

ئەفسوس بۆ قافڵەی تەمەن بەشێوەیەك ڕۆیشت کە گەردیان بە هەوای هەواری ئێمە ناگات.

دریغ: ئەفسوس    کانچنان: بەجۆرێك، وا    هوا: هەوا    دیار: دیار، هەوار

خواجە ئەفسوس بۆ قافڵەی تەمەن دەخوازێت کە هێندە خێرایە و ئەوەندە بەپەلە دوور دەکەوێتەوە کە لە پڕ گەردی شوێن پێیان بە ئێمە ناگات و بە هەوای شار و هەواری ئێمە ناگات. بەگشتی بەیتەکە ئەو بیرە باڵایە دەخاتەڕوو کە تەمەن تیژپەڕە و زوو دەگوزەرێ.

**٧ — دلا ز طَعن حَسودان مَرنج و واثق باش**

**که بد به خاطر امّیدوار ما نرسد**

ئەی دڵ لە تانەی حەسوودان مەرەنجێ و دڵنیابە کە بەد و خراپە بە دڵی ئومێدواری ئێمە ناگات.

طعن: تانە، تەشەر    واثق باش: دڵنیابە.

خواجە لێرە دڵی خۆی دڵنیا دەکاتەوە کە دڵی ئومێدەوار و هیوادار هەرگیز دووچاری خراپە و نارەحەتی نابێت بۆیە دەبێ لە تانەو تەشەری حەسوودان نەترسێ، نەڕەنجێ.

**٨ — چنان بزی که اگر خاك ره شوی،کس را**

**غبار خاطری از رهگذار ما نرسد**

وا بژی کە گەر مردی بوویتە خاکی سەرەڕێ، غوباری ڕەنجاندن لە خاکی ئێمەوە بە هیچ ڕێبوارێك نەگات.

بزی: بژی    خاك رەشوی: ببیتە خاکی ڕێگە    واتە: بمری.

خواجە لە بەیتی پێشوودا ئامۆژگاری دڵی خۆیی کرد کە گوێ بەقسەی حەسوودان نەدات و ئومێدەوارانە ژیان بەسەر بەرێت، لێرەشدا داوای ژیانێکی لێدەکات کە بەشێوەیەك بێت پاش مەرگیش نەبێتە مایەی نارەحەتی و عەزاب بۆ ڕێبواران و هیچ کەسێك نەڕەنجێنێ.

واتە: ئاوا بژی کە پاش مەرگیش تۆ نەبیتە مایەی ناخۆشی لە نێوان خەڵکیدا.



**٩ — بسوخت حافظ و ترسم که شرح غصەی او**

**به سمع پادشه کامگار ما نرسد**

حافظ سووتا و ئەترسم کە شەرحی غەمی ئەو بەگوێی پادشای بەختەوەری ئێمە نەگات.

سمع: گوێ

کامگار: کامیار، بەختەوەر.

ترسی حافظ لە سووتانی خۆی نییە بەڵکو لەوەیەکە ئەم سووتان و خەفەتەی بە گوێی پادشای بەختەوەر نەگات، لێرەدا ئەکرێ پاشا (وەك هەروی نووسیویەتی) شاە شوجاع بێت، چونکە لە پێشەوە باس لە وەزیری ئەو دەکات.

## غەزەلی سەد و پەنجا و چوارەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی ئەسلەم**

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لن)**

**١ – هر كه را باخطّ سبزت سر سودا باشد**

**پای ازین دایره بیرون ننهد تا باشد**

هەر کەس سەری سەودای لەگەڵ روخساری تازە خەتی کۆدا هەبێ، تـاوەکو زینـدووبێ پـێ لەم بازنەیە ناخاتە دەرەوە.

خط سبز: رووخساری تازە خەتداو، تازە پێگەشتوو   سر سودا: سەری سەودا، خـەیاڵ و ویستی مامەڵە   پای: پێ   بیرون ننهد: ناخاتـە دەرەوە   تـا باشـد: تـا هیـچی، تـا زیندوو بێت.

عەشق و تازەخەتی سەر روخساری یاری هەمیشە بە هاری ئەو بازنەیەك کە تـەنیا رێگـای چوونە ژوورەوەیان هەیە و ئیدی هیچ عاشقی بە زیندووی لێیان دەرناچێت. خواجەش هەر ئەمە دەڵێ: هەر کەسێ بیەوێ و خەیاڵی مامەڵەی لەگەڵ روخـساری تـازە و جـوانی تـۆدا هـەبێ و بەنیازی عەشقبازی بێت پێ لەو دایرە و بازنـەی عەشـقە یـا خەتـە سـەوزەی رووخـسارت بـە زیندوویی ناخاتە دەرەوە.

**٢ – من چو از خاك لحد لاله صفت برخیزم**

**داغ سودای توام سرّ سُوَیدا باشد**

من کاتێ کە لە خاکی گۆڕەوە گوڵاڵە ئاسـا هەڵدەسـتمەوە، داغـی ئـارەزووی تـۆ نهێنـی (سوەیدا)م دەبێت.

لحد: گۆڕ   لاله صفت: گوڵاڵە ئاسا   برخیزم: هەڵدەستمەوە، سەوزدەبمەوە

داغ: داخ، غەم و مەراق   توام: تۆم

سویدا: بچووککراوەی رەش، خاڵی رەشی سـەر دڵ کـە خـوێنی پتـوی سـەر دڵـە لـە دڵـدا خـاڵێکی رەش هەیـە و (سـویدا)ی پێـدەگوترێت، لای خواجـە ئـەو خاڵـە لەمـەراقی تاسـە و ئارەزووی وەسڵی یارەوە دروستبووە، ئەو داغکردنەی سەر دڵی خواجە بەسـەر پـەڕەی گوڵاڵـە شەوە هەیە، خواجە لێرەدا بەراوردی خۆی و گوڵاڵـە دەکـات و دەڵـێ: مـن کـاتێ وەك گوڵاڵـە لەسەر خاکی گۆڕەکەمەوە هەڵدەستمەوە و سەوز دەبمەوە خاڵێکی رەش بەسەر دڵمـەوە دەبێـت.



ئەی یار دەزانی نهێنی و سڕی ئـەو خاڵـە رەشـەی سـەردڵم چییە؟ بێگومـان سـڕەکەی داغ و خەفەتی حەسرەت و تاسەی تۆیە و هیچی دیکە.

**٣ – تو خود ای گوهر یكدانه كجایی آخر**

**كز غمت دیدەی مردم همه دریا باشد**

ئاخر تۆ لەکوێی ئەی کە خۆت گەوهەری تاقانەی گرانبەها کە لە غەمتدا دیـدەی خـەڵکی هەموو بووەتە دەریا.

گوهریكدانه: دریتم، گەوهەری تاقانە، جـۆرە مرواریییەکـە کـە بەتـەنیا لـە نێـو سـەدەفدا دروستدەبێ واتە: لە نێو سەدەفەکەدا تەنیایەکدانـە مـرواری هەیـە نـەوەك چـەندانە کـە زۆر گرانبەها و بەنرخە.

خواجە بەیار دەڵێ ئاخر تۆ لەکوێی تۆ کە خۆت تاقانەی لە جوانیـدا و گەوهـەری تاقانـەی نێو سەدەفی ئەی یار تۆلەکوێی کە چاوانی خەڵکی لە خەمی فیراقی تۆدا هێنـدە فرمێـسکیان رشتووە وەك دەریایان لێ هاتووە.

**٤ – از بُنِ هر مژەام آب روان است بیا**

**اگرت میلِ لبِ جوی و تماشا باشد**

لەبن هەر برژانگێکمدا ئاوی رەوانە وەرە گەر مەیلی کەناری جۆگە و تەماشات هەیە.

ازبن: لەبن   لب جوی: قەراغ جۆگەلە، کەناری جۆگە.

خواجە فرمێسکی چاوی خۆی کە بەبن برژانگەکانیدا دێنە خوارێ و لە دووری یـار هـەرگیز ناپەیدا دەیانبارێنێ بەجۆگەلەیەکی جوان ئەداتە قەڵەم و بەیار دەڵێ گـەر حـەزت لـە کـەناری جۆگەلە و تەماشای گژوگیا و گوڵە وەرە نێو چاوانی من.

**٥ – چون دل من دمی از پرده برون آی و درای**

**كه دگربـاره ملاقات نه پیدا باشد**

وەك دڵی من ساتێك لـە پـەردە وەرە دەرەوە و دەرکـەوە کـە رەنگـە ئیـدی سـەردان و مولاقات نەبێت.

از پرده برون آی: لە پەردە وەردەرەوە، دەرکەوە، درکەیەلە شەرم خستنە کەنار.

درای: دەرکەوە   ملاقات: پێشگەیشتن و سەردان   حافظ بەیاری شاراوە دەڵێ ساتێك شەرم بخەرەکەنار و وەك دڵی من بکە و وەردەرەوە واتە چۆن دڵی من شەرمی بە هیچ شتێ نایـەت و عاشقی تۆیە تـۆش سـاتێ دەرکـەوە چـونکە رەنگـە جـارێکی دیکـە ئیـدی ئـاوا سـەرەدان و پێکگەیشتن فەراهەم نەبێت.

وەك لەم بەیتانەدا دیارەکە مەعشوق نایەوێ لەپەردە دەرکەوێت و چاوی عاشقان بە نوری خۆی سورمە بدات هەروەك چۆن ناشیەوێ دڵیان بە جێ بهێڵێت و بەیکجاری بڕوات ئەمەش هەمان سیفەتی مەعشوقی ئەزەلییە کە دوورایییەکانی نێوان خۆی و عاشقان نابەزێنێ.

**٦ – ظُلِّ ممدودِ خم زلفِ توأم برسر باد**

**کاندرین سایه قرارِ دلِ شیدا باشد**

سێبەری درێژی پێچی زوڵفی تۆ لەسەر بێ چونکە ئارامی دڵی شەیدا لەم سێبەردایە.

ظل: سێبەر   ممدود: درێژ و فراوان   برسر باد: بەسەرمەوە بێت   سایه: سێبەر   قرار: ئارام.

(ظل ممدود) لە ئایەتی پیرۆزی (وظل ممدود)ی ئایەتی (٣٠) ی سورەتی (الواقعە) دەفەرموێ: ﴿ وظل مَمْدُودٍ﴾ وەرگیراوە کە باس لە سێبەری موسڵمانانە لە نێو بەهەشتدا.

خواجە دەڵێ سێبەری فراوانی (ظل ممدود) بۆ من سێبەری پرچی لوولی یارە، واتە ئەی یار یاخود من لە سێبەری چڕی پرچی لوولی تۆدابم، چونکە دڵی شەیدام تەنیا لەم سێبەرەدا ئارام دەگرێت.

بێگومان دڵی عاشقی خواجە سێبەری جوانی و پرچی لوولی مەعشوقی ئەزەلی لە سێبەری درەختە چڕەکانی بەهەشت پێ چاکترە، چونکە ئەم دڵە شەیدایەی عاشقان تەنیا بۆ خاتری مەعشوقی حەق ئاوارەن و بە سێبەری ئەویش لە پەنای جوانی ئەویشدا ئارام دەگرن و بەهەشت و سێبەرە چڕەکانی بەبێ مەعشوق نابێتە مایەی ئارامییان.

**٧- چشمت از ناز به حافظ نکند میل آری**

**سرگرانی صفت نرگس رعنا باشد**

چاوانت لەڕووی ناز و کبرەوە مەیلی حافظیان نییە، ئەرێ خۆبەزلزانین سیفەتی چاوانی جوانە.

ناز: ناز و کبر   نکنه میل: سەیری ناکات، مەیلی لێ نییە   سرگرانی: خۆبە گەورە زانین، خۆبەزلزانین   رعنا: جوان

نێرگز سیمبولی چاوانی جوان و مەستی یارە، خواجە ئەم چاوە جوانانە بە متکبر و لەخۆرازی و خۆبەگەورەزان دەزانێت بەیار دەڵێ بۆیە چاوانت مەیلی ئێمەی نییە، چونکە لەڕووی کیبرەوەیە ئەرێ حتمەن وایە، چونکە چاوانت نێرگزی رەعنایە و خۆ بەگەورە زانینیش سیفەتی ئەو نێرگزە رەعنایەیە.



## غەزەلی سەد و پەنجا و پێنجەم

### بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی ئەسلەم

### (فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لن)

**١ – من و انکار شراب این چه حکایت باشد**

**غالباً این قدرم عقل و کفایت باشد**

من و رەتدانەوەی مەی ئەمەچ قسەیەکە ؟! بە زۆری ئەوەندە عەقڵم هەیە کە کفایەت بێ.

انکار: ڕەتدانەوە رەفز کردن   غالباً: بەزۆری   کفایت: کفایەت، بەس.

خواجە دەڵێ: من بم و شەراب رەتدەمەوە و رەفزی کەم ئەمە چ قسەیەکی بێ مانایە ؟! حەتمەن من ئەوەندەش عەقڵم هەیە کە ئەم کارە نابەجێیە نەکەم.

خواجە زۆری پێ سەیرە کە رۆژگارێك مەی (رەمزی عەشقی عیرفانی و ئیلاهی) رەفزبکاتەوە، چونکە پێی وایە هێندە تێگەیشتووە کەنابێ واز لەم عەشقە بهێنرێت.

**٢ – من که شبها ره تقوی زده‌ام با دف و چنگ**

**این زمان سر به ره آرم چه حکایت باشد**

من شەوانێکی زۆر بە دەف و چنگ ڕێگەم بە تەقوا گرتووە ئێستا بێمە سەرڕێ، چ قسەیەکە!؟

ره تقوی زده‌ام: ڕێگەم بەتەقوا گرتووە،   چنگ: جۆری سازێکە،   این زمان: ئێستا لەم کاتەدا، سر بەره آوردن: هاتنە سەر ڕێگە، چاکبوون و روو لە تەقوا کردن.

خواجە دەڵێ من شەوانێکی زۆر بەرەسمی عیشق بازی دەروێشان (دەف و ساز) خەریکی عەشق بووم و بەمەش ڕێگەم لە تەقوا گرتووە و دار و نەدارم تالان کردووە (تەقوا لێرەدا ڕەمزی دینداری سەرزارەکی و ریابازانەی زاهیدە وشکەکانە) گەر ئێستا واز لەو عەشقەم بهێنم و دیسانەوەی بێمەوە سەر ڕێگە و مل بۆ تەقوا و خۆبەچاکزانینی درۆزنانە کەچ بکەم چ قسە و باسێکە، واتە: هەرگیز ئەم کارەناکەم.

**٣ – زاهد ار راه بەرندی نبرد معذورست**

**عشق کاریست که موقوف هدایت باشد**

گەر زاهد ئاگای لە جیهانی رەندی نییە گوناهی نییە، عیشق کارێکە کە پەیوەستە بە هیدایەتەوە.

راە نبرد: ڕێگەی دەبردە سەر، سەر لێ دەرکردن، ئاگادار نییە لە، نازانێ، شارەزا نییە.

موقوف: پەیوەستە، تایبەتە.

خواجە وەك هەمیشە عەشق بە فەیضێکی ڕەحمانی و ئیلاهی دەزانێت و لە ئەزموون و تەجروبەی دادەماڵێت. زاهد نیشانەی ئەزموونێکی بەردەوامی خوداناسی و بەندایەتییە، بەلام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا لە عەشق تێناگات و سەری لێ دەرناکات، خواجە ئەم بیانووە بۆ ئەم سەر لێ دەرنەکرنەی زاهد دەهێنێتەوە و دەڵێ: حەقیەتی سەری دەرنەکات، چونکە عەشق پەیوەستە بە هیدایەت و فەیزی ڕەحمانییەوە کە زاهید تەنیا ئەزموونی هەیە و بۆ ئەم دونیای فراوانی عەشق هیدایەت نەدراوە.

لەم بەیتەدا خواجە ئەو ڕایە ڕەتدەکاتەوە کە پێیان وایە عەشقی ئیلاهی ئیکتسابییە و لە ڕێگەی ئەزموونەوە دەستدەکەوێت، لە قوولاییەکانی ئەم بەیتەدا جەبرییەتیی ئیجابی بەدی دەکرێت.

**٤ — بندەی پیر مغانم کە ز جهلم برهاند**

**پیر ما هرچە کند عین ولایت باشد**

بەندەی پیری موغانم کە لە نەزانی ڕزگاری کردم، پیری ئێمە هەرچی بکات گەورەیی و ڕابەرییە.

برهاند: نەجاتی دام، ڕزگاری کردم، ولایت: خۆشەویستی و گەورەیی، دەسەڵات پەیدا کردن لە تەسەوف و شەرعیشدا بەواتای پێشەوایی و ڕابەری کەسانی دیکەیە و پلەیەکە تەنیا وەلییەکان پێی دەگەن و مەقامی ولایەتە ئەم پلەیەش پاش مەقامی نبوەت و پێغەمبەرایەتییە بێگومان ئەمڕۆ ئەم مەقامە لەلایەن ئایدیۆلۆژیستەکانەوە بۆ مەرامی سیاسی سوودی لێ وەردەگرێت.

خواجە خۆی بە غوڵام و بەندەی پیری موغان دەزانێت، چونکە ئەو لە نەزانی ڕزگاری کردووە و ڕێگەی عەشقی پێ ناساندووە. ئەرێ خواجە دڵنیایە لە پیری خۆیی و پێی وایە هەرچی بکات لە گەورەیی و پیرۆزی مەقامی ولایت و ڕابەرییەوە دەیکات و شیاوی پێشەوایێتییە و هەڵە ناکات و پێویستە یەکسەر، بەگوێ بکرێت و قسە لە قسەیدا نەکرێت.

**٥ — زاهد و عُجْب و نماز و من و مستی و نیاز**

**تا تُرا خود ز میان با کە عنایت باشد**

زاهد و بەخۆدانازین (لە خۆرازی بوون) و نوێژ و من و مەستی و نیاز تا بزانین خۆت لەم نێوانە عینایەت و پشتگیریت بۆ کامیان بێ.

عجب: بەخۆدانازین، مەغرور بوون    نماز: نوێژ



نیاز: داوا کردن و پاڕانەوە و خۆ بەکەم زانین    عنایت: پشتگیری و ئاوڕ لێدانەوە.

پێویستە بەر لە شەرحکردنی بەیتەکە ئەوە بخەینەڕوو — هەرچەندە دەبوایە لەسەرتای غەزەلەکەوە ئەم ڕوونکردنەوەمان بدایە — کە ئەم غەزەلە غەزەلێکی عیرفانی تەواوە و باس لە بنەماکانی عیرافان و عەشقی ئیلاهی و بەراوردی ئەوە بە پەرستشی ڕووکەشی زاهیدەکان، لەم بەیتەدا چەند زاراوەیەکی هاتووە کە لێکدانەوەیان پێویستە.

حافظ خۆی و زاهید بەراورد دەکات کە هەریەکەیان دوو سیفەتیان تێدایە زاهید (عجب و نوێژکردن)ە و عارف / حافظ یش (کڕوزانەوە و مەستی)یە ئەو نوێژی لەبەرامبەر کڕوزانەوەی خۆیدا هێناوە و خۆپەسەندی زاهیدیش لە بەرامبەر مەستی خۆیدا هێناوە.

عجب: خۆپەسەندی و غرور، یەکێکە لە خراپترین ئەو سیفەتانەی کە لە هەر کەسێکدا هەبووە ئاگرێکە و لە خەرمانی خوداناسی ئەو بەر دەبێت و خواجە زۆر جەخت لەسەر نەهێشتنی ئەم سیفەتە دەکاتەوە تەنانەت لەناو سۆفییەکاندا دەستەی (حەلامەتییە) دروستبوون کە بۆ کوشتنی ئەم خۆپەسەندییە کرداری خراپیان ئەنجامئەدا تاوەکو خەڵکی نەفرەتیان لێ بکەن و لۆمەیان بکەن بۆ ئەوەی هەرگیز تووشی خۆپەسەندی و غرور نەبێ.

نوێژ کردنیش سیمبولی ڕووکەشی ئایینە نەوەك گەوهەر و بنەڕەتی، ئەم دوو سیفەتە هەردووکیان نێگەتیڤن و لە زاهیددا بوونیان هەیە.

مستی: حاڵەتی مەستی کە بەسەر ڕێبوارانی ڕێگەی تەریقەتدا دێت و تیایدا جگە لە مەعشوق لە هەمووشتێکی دیکەی بێ ئاگا دەبن و جیلوەی مەعشوقیش تەنیا لەم حاڵەتەدا دەبێت. لێرەدا بەگشتی ڕەمزی دونیای عیرفانە.

نیاز: کوڕوزانەوە و داواکردن لە خودا، کە گەوهەری ئایینە، خۆ بەکەم زانینە لە بەرامبەر زاتی حەقدا و هەمیشە پاڕانەوە و دەست بەرزکردنەوەیە بۆ دەرگای حەق.

لای عارفەکان مەستی و نیاز دوو سیمبولی پۆزەتیڤن.

عینایەت: بە واتای پشتگرتن و ئاوەڕ لێدانەوەیە، عینایەتی ئیلاهی بۆ بەندە چاکەکانی ئەو هەمیشە لەکاردایە، بە بەخشندەیی خوداوەندیش دەگوترێت.

خواجە لەم بەیتەدا دونیای عیرفان بە مەستی نیازەوە لەگەڵ دونیای ڕووکەشی شەریعەت بە خۆپەسەندی و نوێژ و بەراورد دەکات و لە خۆی دەپرسێ کە ئایا خودای گەورە ئاوڕ لە کام جۆرە ئایینداریانە ئەداتەوە و کامیانی بەلاوە پەسەندە، بێگومان خواجە لێرەدا بەم چنینە لێزانانەوە جۆری دووەم (مەستی و نیاز) بەپەسەند دەزانێت.

**٦ — دوش از این غصه نخفتم که رفیقی می گفت**

**حافظ ار مست بود جای شکایت باشد**

دوێنێ شەو لەم خەفەتەدا نەخەوتم کە مەکتمێ دەیگوت گەر حافظ مەست بێ جێگەی شکاتە.

نخفتم: نەخەوتم     رفیقی: هاوڕێیەك

خواجە دوێنێ شەو لە قسەی هاوڕێیەك نارەحەت و دڵگران بووە، قسەکەش ئەوەیە کە هاوڕێیەکە ڕەخنەی لە مەستبوونی حافظ گرتووە و گوتوویەتی گەر مەست بێ جێگەی شکات و ڕەخنەیە.

ئەمەش لای خواجە بووەتە خەفەت کە هاوڕێ و ڕەفیقی ئەم ڕەخنەیەی گرتووە، واتە ڕەخنەی لە عارف بوونی خواجە گرتووە.

لە نموونەکانی دیکەدا لەبری (رفیق) (حکیم) هاتووە و لە نوسخەی (خ ـ فلنی) دێرین و قەزوینی و خرشاهیدا رفیقیش هاتووە.



## غەزەلی سەد و پەنجا و شەشەم:

**بەحری ڕەمەلی هەشتی مەخبونی ئەسلەم**

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لن)**

**١ — نقد صوفی نەهمە صافی بی غش باشد**

**ای بسا خرقە کە مستوجب آتش باشد**

سکە نەقدەکانی سۆفی هەمموویان بێ غەش نین ئای چەندەها خرقەی زۆر هەیە کە شایانی بە ئاگر سووتاندنن:

نقد: سکە، پول     صاف: پاك، بێ غەش     بی غش: بێ غەش بێ خیانەت مستوجب: شایان.

خواجە دیسانەوەی باس لە سۆفی و غەش و خیانەتەکانی سۆفی دەکات کە لە ژێر خیرقە و جلوبەرگی پاکیزەیدا یەك دونیا فروفێڵ و خیانەتی حەشارداوە، ئەو ئەم هۆشیارییەی داوەتە خوێنەران و پێیان دەڵێ کە نەقد و سکەکانی سۆفی کە کردارەکانیەتی هەمموویان پاك و بێ غەش و خیانەت نین، بەڵکو بە پێچەوانەوە زۆربەیان پڕن لە درۆ و دەلەسە و تەزویر و ریاکاری بە جۆرێ کە زۆر خیرقەی بەری سۆفیان یا خودی سۆفیان هەیە کە شایانی بە ئاگر سووتاندنن.

**٢ — صوفی ما کە ز ورد سحری مست شدی**

**شامگاهش نگران باش کە سرخوش باشد**

سۆفی ئێمە کە لە ویردی بەیانیاندا مەست دەبوو نیگەرانی ئێوارەی بە کەسەر خۆش ئەبێت.

ورد: ویرد و تەسبیحات     شامگاه: ئێوارە، پاش مەغریب.

نگران باشی: نیگەرانت بە، یاخود سەیرکە     سرخوش: سەرخۆش.

حافظ بۆ رایەکەی سەرەوەی کە پێی وایە کارەکانی سۆفی بێ غەش نین یەکێ لە کارەشاراوەکانی ئەخاتەڕوو، بە ئێمە دەڵێ: ئەو شوێنەی کە هەمموومان بە چاکی دەزانین و سەرحەرگاهان لە ویرد و تەسبیحاتدا مەست دەبێت و خەریکی زیکر و پاڕانەوەیە لە شەو و ئێوارەدا خەریکی شەڕاب خواردنەوەیە و سەرخۆشە.

لەم بەیتەدا مەست بوون بە زیکر و تەسبیحات واتای پۆزەتیڤی عیرفانی یاخود خوا زراوی (مەستی) هێنراوە، بەڵام (سەرخۆش) بوون بە واتای نێگەتیڤی و دونیایی هاتووە.

٣ — **خوش بُوَد گر محكِ تجربه آيد به ميان**

**تا سيه‌روى شود هەركه دروغش باشد**

چاكە گەر سەنگی مەحەكی هەڵساندن بێتە ناوەوە تا ڕووڕەش بێت هەر كەس غەشی تێدایە.

خوش بو: چاكە، چاك بوو   محك: سەنگی مەحەك   تجربە: ئەزموون، هەڵسەنگاندن

آيد بەميان: بێتە ناوەوە، بێتە ئارا، دانرێ   سيە رووى: ڕووڕەش، ريسوا

سەنگی مەحەك: جۆرە بەردێكە كە ئاڵتون پێ تاقی دەكرێتەوە و ئاڵتونی پاك لە پيس جيا دەكرێتەوە و كاتێ بە ئاڵتونەكەدا دەهێنرێت ماددە پيسەكانی ناوی ڕەش هەڵدەگەڕێ.

خواجە پێی وایە كە كارێكی زۆر چاكە و تەنانەت پێویستە كە ڕۆژگار و ئەزموون ببێتە سەنگی مەحەك و مرۆڤەكان بدات لەمەحەك تا ئەو كەسەی كە پارچەی غەش و خیانەتی تێدایە ڕەش هەڵدەگەڕێ و ڕسوا ببێت.

بێگومان هەڵسەنگاندن و ئەزموون گەورەترین سەنگی مەحەكە تاوەكو مرۆڤی لێ بدرێت و چاك و خراپی پێ جودا بكرێتەوە، بەڵام لە پێش سەردەمی خواجە و لەو سەردەمە و تا ئێستا و بە دڵنیاییشەوە تا ڕۆژگارێكی درێژی دیكەش ئەو سەنگی مەحەكە دانانرێت، چونكە چەرخ سوفلە پەروەر و دونیا هیچ و پوچ پەرستە و مەحاڵە لە دەستی ئەوان دەربهێنرێت تا لەمەحەك بدرێن.

٤ — **ناز پرورد تنعّم نبرد راه به دوست**

**عاشقى شيوەى رندان بلاكش باشد**

بەناز پەروەردەی نێو نیعمەت ناگات بە دۆست، عاشقی بە شێوەی ڕەندانی زەحمەت كێش دەبێت.

ناز پرورد: بەناز پەروەردە   تنعم: نیعمەت   راه بردن: ڕێگە بردنەوە، گەیشتن، بلاكش: زەحمەت كێش.

ڕێگەی گەیشتن بە دۆست ڕێگەیەكی سەخت و پڕ لە دەردەسەری و زەحمەتە وەك ئەو فەرموودەیەی كە سەروەر دەفەرمووێ: بەهەشت بە نارەحەتی و زەحمەت دەورە دراوە.

ڕێگەی دۆستیش لای خواجە ڕێگەیكی پڕ لە زەحمەت و ڕەنجە و سۆفییە بەناز پەروەردەكانی نێو ناز و نیعمەتی ڕۆژگار پیاوی ئەو مەیدان و ڕێگەیە نین و ڕێگە نابەنەوەسەر دۆست و ناگەن بە دۆست، عاشقی ئەبێت بە شێوەی ڕەندانی زەحمەت كێش بێت و عاشق زەحمەتەكانی ڕێگەی گەیشتن بە دۆست بكێشێ.



٥ — **غم دنيىّ دنى چند خورى باده بخور**

**حيف باشد دلِ دانا كه مشوّش باشد**

چەند غەمی دونیای پوچ دەخۆی بادە بنۆشە   حەیفە دڵی دانا پەرێشان و مشەوەش بێت

دينى: دونیا   دنىء: دەنییء، هیچ و پوچ، بێ نرخ   مشوّش: مشەوەش، پەرێشان.

دیسانەوە حافظ لە دونیای پوچ ئەدوێت و بیرمان ئەخاتەوە كە غەمی دونیای پوچ نەخۆین، ئێمەی دانا و عارف نابێت غەم بخۆین بەڵكو پێویستە لە بری غەم شەڕابی عەشقی ئەزەلی بنۆشین، چونكە دڵی دانا بە غەم پەرێشان و مشەوەش دەبێت.

٦ — **خطِّ ساقى گر از اين گونه زند نقش بر آب**

**اى بسا رُخ كه به خونابه منقّش باشد**

گەر خەتی ڕووی ساقی بەم شێوەیە ڕەسم لەسەر ئاو بكات، ئای چەند ڕووخسار هەیە كە بە خوێناو (فرمێسكی خوێنین) ڕەنگین دەبێت.

ازين گونە: بەم شێوەیە   زند نقش بر اب : ڕەسم لەسەر ئاو بكات، (نیگار لەسەر ئاو بكێشێ)، ئەم دركەیە كە لە زمانی فارسیدا هەیە و لە كوردیدا دەرناكەوێت بە مانای لەناو بردن و كاری بێ هودە كردن دێت.

وەك: فرشاهی ئاماژەی پێداوە ئەم دركەیە لێڵی تێدایە و ئەكرێ بەواتای زمانی بەكار هاتبێت و بە واتای شێوەگرتنی خەتی عوزار لەسەر ڕووخساری وەك ئاوی ساقی.

رخ: ڕووخسار   خونابە: خوێناو، فرمێسكی خوێنین   منقش: نیگارین

خەتی ڕووی ساقی كە هەمیشە ئاواتی بادەنۆشانی جامی ئەزەل بووە گەر بەم شێوە لە سەر ڕووخساری وەك ئاو ڕۆشتنی دەكەوێت یاخود گەر خەتی ڕووی ساقی ئاوا بەم شێوەیە كارەكان بێهودە بكات و لەناویان بەرێت و خەڵكی ڕەنج بە خەسارا بكات، ئای كە چەندەهای ڕووی زۆر لە بێنین كە لە ئەنجامی زۆر ڕشتنی فرمێسكی خوێنینەوە (لەڕووی خەتی ڕووی عوزاری ساقی) لەسەر ڕوویان نێگاری جوان دروستدەبێت.

واتە: ئەگەر خەتی عوزاری ساقی وابكات، عاشقان هێندە دەگرین فرمێسكی خوێنین دەڕێژن خوێناو لەسەر ڕوویان نێگار دروستدەكات و ڕووخساریان نێگارین دەبێت.

٧ — **دلق و سجّادەى حافظ ببرد بادە فروش**

**گر شراب از كفِ آن ساقى مهوش باشد**

بادەفرۆشن خرقە و بەرماڵی حافظ دەبات گەر شەڕاب لە دەستی ئەو ساقییە مانگئاسایەوە بێت.

دلق: خرقە    سجادە: بەرماڵ    کف: دەست    مهوش: مانگ ئاسا

خواجە دڵنیایە لەوەی کە ئەگەر بێت و شەڕاب و مەی لە دەستی ئەو ساقییە، مانگئاسایە وەرگرێت و نۆشی بکات ئەوا تەواوی شتە رووکارییەکانی خۆی (خرقە و بەرماڵ)ە دەداتە مەیفرۆش و شەڕابی پێ دەکڕێت.

واتە: گەر عیرفان و عەشق لە رێگەی ئەو ساقی و پیرەوە بێت حافظ بە تەواوی دەچێتە نێو عەشق و وا مەستی بادەی ئەزەلی عەشق دەبێت کەهەموو رەمزی رووکارییەکانی دەخاتە لاوە.



## غەزەلی سەد و پەنجا و حەوتەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی ئەصلەم**
**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع لن)**

**١ — خوش است خلوت اگر یار یارِ من باشد**
**نە من بسوزم و او شمعِ انجمن باشد**

خۆشە خەڵوەت ئەگەر یار یاری من بێت    نەوەك من بسووتێم و ئەو چرای دیوەخان بێت.

انجمن: دیوەخان، مەجلیس.

لەسەرتای ئەم غەزەلەدا حافظ بنەمایەك بۆ عاشقی (کە زیاتر لە عەشقی دونیاییدا خۆی دەنوێنێ) دادەڕێژێت کە ئەویش خۆشەویستی دووسەرەیە، ئەو پێی وایە خەڵوەت و تەنیایی عەشقێ خۆشە کەیاریش هاودەمی ئەو عەشقە بێت نەوەك من بسووتێم و ئەو چرای دیوەخانی خەڵکی بێت و هیچ گرنگییەك بەم سووتانە نەدات، لەم بەیتە و بەیتی دووەمدا خواجە بە نائاشکرا وێنەی غیرەتی عاشقمان بۆ دەکات کە هەرگیز نایەوێت مەعشوق دوور لەم بێت و رازی نییە مەعشوق جگە لە دیوەخانی خۆی چرای هیچ دیوەخانێکی دیکە بێت.

**٢ — من آن نگین سلیمان به هیچ نستانم**
**که گاه گاه براو دستِ اهرمن باشد**

من ئەو ئەنگوستیلەیەی سولەیمان بە هیچ ناکڕم    کە جار و بار لە دەستی ئەهریمەندا بێت

نگین: ئەنگوستیلە    نستانم: ناکڕم، ناسەنم    اهرمن: ئەهریمەن، شەیتان، دێو.

ئاشکرایە کە جارێك ئەهریمەن و دێوان ئەنگوستیلەی حەزرەتی سولەیمانیان دزی و لە دەستیان کرد و ئەو ئەنگوستیلەیەش هیچ هەڵوێستێکی نەبوو بۆیە خواجە ئەنگوستیلەیەکی لەم جۆرە بە هیچ ناکڕێت. یارێکیش کە چ لە دەستی عاشق و چ لە کۆڕی رەقیباندا بێت هەمان هەڵویستی هەبێت لای خواجە وەك ئەنگوستیلەکەی حەزرەتی سولەیمانە و بەپولێك ناکڕێ. لێرەدا حافظ یار و عەشقێ ڕەتدەکاتەوە کە بەتەنیایی موڵکی عاشق نەبێت.

**٣ — روا مدار خُدایا که در حریم وصال**
**رقیب محرم و حرمان نصیبِ من باشد**

خوایە بەڕەوای مەزانە کەلە حەرەمی پێگەیشتندا    رەقیب مەحرەم بێت و دووری هیجرانیش بەشی من بێت.

روا مدار: بەرەوای مەزانە، قەبووڵی مەکە، هەڵیمەگرە.

حریم، حەرەم، سنووری هەرشتێ        حرمان: دووری و بێ بەشی.

خواجە لێرەدا لە خودا دەپاڕێتەوە کە لە دونیای بە یەکگەیشتنی یاردا دووچاری هیجـران و دووری نەبێت.

لە شێوەی نزایەکدا دەپاڕێتەوە خوایە ئەوە هەڵنەگرێ و پێی رازی نەبی کە رەقیب حەرەمی حەرەمسەرای ویساڵی جانان بێت و بێ بەشی لەو حەرەمەش نسیبی من بێت.

**٤ — هُمای گو مفکن سایەی شرف هرگز**

**بر آن دیار کە طوطی کم از زغن باشد**

بڵێ بە باڵندەی هوما بڵێ هەرگیز سێبەری گەورەیی و شەرەفت بەسەر ئەو دیـارەوە مەکـە کە توتی لە باڵندەی گەند، خۆری (زەغەن) کەم بەهاتر بێت.

هما: هوما، باڵندەی هوما کە رەمزی گـەورەیی و شـەرەفە و سـێبەر سـەر هـەر کـەس و شوێنێکەوە بکات بە رێز و شەرەفمەندی بکات.

مفکن: بلاومەکەرەوە، مەکە     سایە: سێبەر     بران: بەسەر ئەو

زغن: زەغەن، باڵندەیەکە لە تیرەی باز کە مشك و خشۆکە بچکۆلەکان راو دەکات.

لێرەدا خواجە توتی بە رەمزی مرۆڤی چاك و قسەزان و خانەدانەکان داناوە و زەغەنیشی بە هێمای مرۆڤە هەڵپەرست و چڵکاو خۆرەکـان. بـە باڵنـدەی پـیرۆز و ئەفسانەیی هومـا دەڵـێ هەرگیز سـێبەر بەسـەر ئـەو وڵات و کۆمەڵگـەوە مەکـە — کـە سـێبەرت مایـەی شـەرەف و سەربەرزییە — کە تیایدا مرۆڤە هەڵپەرست و چڵکاو خۆرەکان لـە مرۆڤـە چـاك و جدییـەکانی گەورە و بەرێزترن و لەو کۆمەڵگەیەدا بەهای مرۆڤە چاکەکان لە زەغەڵەکان کەمترە.

**٥- بیانِ شوق چە حاجت کە حال آتش دل**

**توان شناخت ز سوزی کە در سخن باشد**

دەرخستنی شەوق و تامەزرۆیی چ پێویستە کاتێ ئەتوانرێ حاڵی ئاگری دڵ لەو سـووتانەوە بناسرێتەوە کە لە قسەدا هەیە.

بیـان: بـەیان، دەرخسـتن، خسـتنەڕوو     چـەحاجت: چ پێویسـتە، چ حاجـەت

توان شناخت: ئەتوانرێ بناسرێت، ئەتوانرێ دەرککرێت     سوزی: سووتانێك

لە کوردەواریدا دەگوترێت قسە بۆنی هەیە، بێگومان قسە تەنیا ئەو چەند حەرف و دەنگـە نییە بەڵکو گیانێکی هەیە کە قسەناسان دەرکی دەکەن، خواجەش پێی وایە کە پێویست ناکات



ئارەزوو و تامەزرۆیی نێو دڵ و ئاگری دڵ بەیان بکەین، چـونکە لـە سـووتانی نێـو قـسەوە بـە ئاسانی هەستیان پێدەکرێت.

**٦ — هوای کوی تو از سر نمیرود آری**

**غریب را دل سرگشتە با وطن باشد**

ئارەزووی کۆڵانی تۆ لە سـەرم دەرناچـێت، ئـەرێ (بێگومـان) دڵـی سـەرگەردانی غـەریب هەمیشە لای نیشتیمانە .

هوای: ئارەزووی      از سرنمیرود: لەسەر دەرناچێت     سرگشتە: سەرگەردان

خواجە ئارەزوویەتی کە بە کۆڵان و کوچەی یار بگات وەك ئـەو غەریبەیـەی کـە هەمیـشە دڵی سەرگەردانی لای نیشتیمانەکەیەتی. لێرەدا حـافظ گـەرەك و کـولانی یـار بـە نیـشتیمان دەزانێت ئەو نیشتیمانەی کە غەریبییەکان هەمیشە بە ئاواتەوەن رۆژێ لـە رۆژان تیایـدا ئـارام بگرن و دڵی سەرگەردانیان هەمیشە لە سۆزی ئەودایە. خواجە عەشق و جێگەی عەشقی یار بە نیشتیمانی عاشقان دەزانێت.

**٧ — بسان سوسن اگر دە زبان شود حافظ**

**چو غنچە پیش تواش مُهر بە دهن باشد**

گەر حافظ وەك سەوسەنیش دە زمانی هەبێت لەبەردەم تۆدا وەك خونچە مۆر بەدەم دەبێت.

بسان: وەك      دهن: زار، دەم

سوسن: گوڵی سەوسەن،    مهر: مۆر     مهر بە دهن باشد: مۆری بەدەمەوەبێت، سـەر بـە مۆر بوون واتە نەکرانەوە، لێرەشدا هەر ئەو مانایەی مەبەستە کە دەم ناکاتەوە و قسە ناکات.

سەوسەن لە شێوەکەیەوە دەردەکەوێ کە پێنج پەڕە و پێنج کاسـەپەڕەی درێـژی نووکتیـژی هەیە وەك زمان بە گوڵی فرەزمان و رەمزی زۆر قسە کردن و قسەزانی هێنراوەتەوە. خونـچەش بە هۆی نەکرانەوەی هێمای بێدەنگییە.

خواجە دەڵێ: گەر حافظ وەك سەوسەن دە زمانی هەبێت و توانـا و لیاقـەت و شایـستەگی تەواوی قسەکردنی هەبێت، کە هاتە بەردەم تۆ و حەرەمی تۆ لە شەرم و خەجاڵەتدا وەك خونچە زاری دەبەسترێت و هیچی بۆ ناگوترێت، هەروەك ئەوەی مۆری بێدەنگی لە زاری درابێت.

# غەزەلی سەد و پەنجا و هەشتەم:

**بەحری هەزەجی شەشی مەحزوف**

**(مفاعیلن مفاعیلن فعولن)**

**١ — خوش آمد گل، وزان خوشتر نباشد**

**که در دستت بجز ساغر نباشد**

گوڵ بە خێر بێت، لەوە خۆشتر نابێ کە لە دەستتدا جگە لە پێك نەبێ.

گوڵ هات و لەگەڵ خۆی جوانی و سەفای هێنا، لەم مەوسیم و وەرزی گوڵەشدا هیچ شتێ لەوە چاکتر نییە کە پێك بگرینە دەست و شەڕاب بنۆشین. واتە: لەم مەوسیمی عەشق و جوانییەدا کە گوڵەکان جوانی مەعشوقی ئەزەلیمان دەهێننە بەرچاو هیچ لەوە چاکتر نییە پێکی عەشقی ئەزەلی بگرینە دەست و ساتێ لە عەشقی ئەو مەحبوب و جەمالەدا بسووتێین و مەست بین.

**٢ — زمان خوشدلی دریـــاب و دُر یاب**

**که دائم در صدف گوهر نباشد**

سوود لە سەردەمی دڵخۆشی وەرگرە و دوڕ و گەوهەر بەدەست بهێنە، چونکە هەمیشە گەوهەر لە سەدەفدا نابێت.

دریاب: سوود وەربگرە، تێ بگە    دُریاب: گەوهەر و دوڕ بەدەست بهێنە.

صدف: سەدەف ئەو قاوغەی کە مرواری تێدایە.

خواجە سەردەمی دڵخۆشی و شەوق و چالاکی بە گەوهەری نێو سەدەف دەزانێت، بێگومان مەرج نییە هەمیشە سەدەف گەوهەری تێدا بێت، زۆرجار بەتاڵە، ئەمیش لەو راستییە بە ئاگایە و دەڵێ: کە کاتێ دڵخۆشیت و لە سەردەمی دڵخۆشی ژیاندایت سوودی لێ وەربگرە و گەوهەری جوانی عەشق و جوانی کۆبکەرەوە، چونکە مەرج نییە هەمیشە سەدەفەکانی ژیان پڕ لە مرواری و گەوهەری دڵخۆشی بن و رەنگە ئیدی سەدەفی ژیانی تۆ خاڵی بێت لە مرواری فرسەت و چانس. ئەم دڵخۆشییە کورتە دەگمەنەی خواجە باسی دەکات سەردەمی گوڵ و بەهاری کورتی جوانییە، وەك لە بەیتی سێیەمدا روونی دەکاتەوە.

**٣ — غنیمت دان و می خور در گلستان**

**که گُل تـا هفتەی دیگــر نباشد**



بە فرسەتی بزانە و لە گوڵزاردا مەی بنۆشە، چونکە گوڵ تا هەفتەیەکی دیکە نامێنێ

غنیمت دان: بەفرسەتی بزانە

سەردەمی جوانی گوڵ سەردەمێکی کورتە بۆیە شاعیر بیرمان دەخاتەوە کە بەفرسەتی بزانین لەم جوانییەدا لە گوڵزار و لالەزاردا بەردەوام خەریکی عەشق و مەستی بین چونکە تەمەنی کورتی گوڵ ئاسامان رەنگە تا هەفتەیکی دیکە نەمێنێ.

**٤ — ایا پُر لعل کرده جامِ زرّین**

**ببخشا بر کسی کش زر نباشد**

ئەی ئەو کەسی پێکی زێڕینت لێوانلێو کردووە لە شەڕابی سوور ببەخشە بە کەسێ کە زێڕی نییە.

ایا: ئەی    ببخشا: ببەخشە

خواجە بەوکەسە کە جام و پێکی زێڕینی پڕ لە شەڕابی سووری یاقوتی کردووە دەڵێ: بیدە بەو هەژارەی کە هیچی نییە.

ئەکرێ ئەم بەیتە هاندانی دەوڵەمەندان بێ بۆ بەخشین یاخود تانە بێ لەوان کە ئەی ئەو کەسەی ئەتەوێ بە پێکی زێڕین و نیعمەتەوە بچیتە نێو عەشقی ئەزەلی و باڵە و شەڕابی ئەزەلی بنۆشی ئەوە کاری تۆ نییە بیدە بەو هەژارەی کە زێڕی نییە، چونکە ئەو قەدری ئەو شەرابەی عەشقی ئەزەلی دەزانێ نەوەك تۆ. چونکە حافظ دەوڵەمەندی و عەشقی ئەزەلی بە پێچەوانەی یەکتر دەزانێ وەك: لە بەیتی (٤) غەزەلی پێشوودا نووسیویەتی:

**ناز پرورد تنعم مبرد راه به دوست**

**عاشقی شیوه رندان بلاکش باشد**

**٥ - بیا ای شیخ و در خمخانەی ما**

**شرابی خور که در کوثر نباشد**

ئەی شێخ وەرە و لە مەیخانەکەی ئێمەدا شەڕابێ بخۆرەوە کە لە کەوسەردا نەبێ.

خواجە شێخ داوەت دەکات بۆ مەیخانەی عەشقی حەقیقی و پێی دەڵێ وەرە واز لەو شێخایەتییە رووکاری و سەرپێیە بهێنە و شەرابێکی وا بخۆرەوە کە ئاوی حەوزی کەوسەری پێ ناگات.

عارفەکان بەهەشت و ناز و نیعمەتەکانی زۆر بە بچووك و بێبەهاتر دەزانن لە عەشق و خۆشەویستی زاتی حەق، هەر بۆیە لەم سۆنگەیەوە حافظیش پێی وایە کە ئاوی حەوزی کەوسەر هەرگیز ناگات بە مەستی و عەشقی عاشقان. بۆیە شێخ کە لە بەندی ئاوی کەوسەردایە داوەت دەکات بۆ عەشقی حەقیقی .

**٦ — بشوی اوراق اگر همدرسِ مائی**

**کــه علم  عشق در دفتر نباشد**

پەڕەکان بشۆ گەر هاودەرسی ئێمەی، چونکە زانستی عەشق لە دەفتەردا نییە.

بشوی: بشۆ     ماۆی: ئێمەی

عارفەکان پێیان وایە کە عەشق و مەسەلەی عەشقی ئیلاهی لەڕێگەی پەڕە و دەفتەرەوە نییە، بەڵکو نورێکی ئیلاهییە و دەکەوێتەوە دڵی عاشقانەوە، هەربۆیە خواجە دەڵێ گەر وەك ئێمەیت و هاوپۆلی عاشقانی ڕێگەی حەقیت، دەفتەر و مەدرەسە پشتگوێ بخە و لاپەڕەکان بخەرە نێو ئاوەوە، چونکە دڵنیابە زانستی عەشق لەو ڕێگەیەوە بە دەست نایەت.

**٧ — ز من بنیوش و دل در شاهدی بند**

**کـه حسنش بستەی زیور نباشد**

گوێ لە من بگرە و دڵ بە یارێك بدە   کە جوانییەکەی وابەستەی زێڕ و زیو نەبێت.

بنیوش: گوێ بگرە - ببیستە     نێو شبەن: گوێ گرتن، بیستن، بەگوێ کردن

شاهد: یار، مەعشوق

بستە: وابەستە     زیور: زێڕ و زیو، جوانکاری

خواجە پەند و قسەیەکی بەنرخ بۆ دڵداران و عاشقان دەکات و ئاگاداریشیان دەکاتەوە کە بە گوێی بکەن و پێیان دەڵێ: دڵ مەدەن بە یارێك کە جوانییەکەی ناسروشتی بێت و بە جوانکاری بێت و خودایی نەبێت، بەڵکو دڵ بدەنە ئەو یارەی کە هەر لە ئەزەلەوە قەڵەمی خوادیی بەرێکی و جوانی نەخشاندوویەتی، یاخودی ئەو یارەی کە لە بوونیدا جوانی داڕژاوە.

**٨ — شرابی بی خمارم بخش یارب**

**که بـا وی هیچ دردِسر نباشد**

خودایە شەڕابی بێ مەستیم پێ ببەخشە، چونکە بەو شەڕابە هیچ دەردەسەری و مەینەتێك نایەتەدی.

بی خمارم: بێ مەستی،  شەرابێك کە سەرخۆش نەکات وی: ئەو

دردسر: دەردەسەری و مەینەتی.



شەڕابێك کە مرۆڤ مەست نەکات و پێی سەرخۆش نەبێت تەنیا شەڕابی عەشقی ئەزەلی و مەحبوبی ئەزەلییە، ئەو شەڕابەیە کە لەبری مەستی مرۆڤ بێدار ئەکاتەوە و ئیدی هەرچی مەینەتی و دەردی سەر هەیە لێی هەڵدێن، خواجە دەڵێ خوایە عەشقی حەقیقی کە شەڕابێکە و سەرخۆشم ناکات بەم بەندەیەت لوتف بفەرموو، ئەو شەڕابەی کە بە بوونی هیچ دەردەسەری و مەینەتێ نامێنێ لەم بەیتەدا خواجە ئەو رایە دەخاتەڕوو کە عەشقی ئیلاهی مایەی نەمانی مەینەتی و دەردەسەرییەکانی ژیانە.

**٩ — من از جان بندەی سلطان اویسم**

**اگر چە یـادش از چـاکر نباشد**

من لە دڵ و گیانەوە بەندەی سوڵتانی وەسیم   گەر چی ئەو یادێکی بەندە ناکاتەوە (بەندەی لە یاد نییە)

از جان: بەگیان، بە دڵ و گیان     سلطان اویس: مەبەست لە سوڵتان وەیسی ایلخانییە کە یەکێکە لە پاشاکانی ئیلخانی و (لە ساڵی ٧٣٩ - ٧٧٦ ژیاوە) {هروی، ج١، ل٦٨١}.

چاکر: بەندە، خزمەتکار

لەم بەیتەدا حافظ مەدحی سوڵتان وەیس دەکات و بە دڵ و گیان خۆی بەبەندەی ئەو دەزانێ هەرچەندە ئەو هەر ئەمیش لە بیری نییە.

**١٠ — بە تاج عالم آرایش کە خورشید**

**چنین زیبنـدەی افســر نباشد**

بە تاجی جیهان ڕازێنەری، خۆر ئاوا سڵاوی ڕازێنەری پاشایەتی نابێ.

بە: بۆ سوێندە     عالم آرای: ڕازێنەرەوەی جیهان     زیبندە: ڕازێنەر

افسر : کڵاو هەر وەسفی سوڵتان وەیسە سوێند بە تاج و سەڵتەنەتەی دەخوات کە ڕازێنەری جیهانە کە خۆریش ئاوا کڵاوی جوانی و ڕازێنەری نابێ.

**١١ — کسی گیرد خطا بر نظم حافظ**

**کە هیچش لطف در گوهر نباشد**

کەسێ ڕەخنە لە شیعری حافظ دەگرێت، کە هیچ پاراویی و زەوقێ لە سروشتیدا نەبێ.

گیرد خطا: ڕەخنە دەگرێت     نظم: شیعر     لطف: زەوق و پاراوی

گوهر: گەوهەر، سروشت.

خواجە شانازی بە شیعری خۆیەوە دەکات و پێی وایە کەسێ رەخنەی لێدەگرێ کە هیچ زەوق و سەلیقەیەکی نەبێ.

بەگوتەی د. غنی دوور نییە کە ئەم کەسە مەبەست لە سەلمانی ساوجی بێت کە شاعیری دەرباری ئیلخانییەکان بووە.



## غەزەلی سەد و پەنجا و نۆیەم:

**بەحری هەزەجی شەشی ئەخرەبی مەقبوزی مەحزوف**
**(مفعول مفاعلن فعولن)**

**١ — گل بی رخ یار خوش نباشد**
**بی بادە بهار خوش نباشد**

گوڵ بێ رووی یار خۆش نابێ، بەهار بێ بادە خۆش نابێ.
خوش نباشد: خۆش نابێ، پەسەند و دڵگیر نابێ.

خواجە لەم غەزەلەدا هەماهەنگی و بەگشت کردنی جوانی و خۆشییەکان وا دەخاتەڕوو دەیانبەستێتەوە بەجوانی جوانانەوە کە یارە و چێژو و لەزەتی چێژەکانەوە کە عەشقە، ئەو پێی وایە جوانی و خۆیەکان بێ یار و بێ عەشق مانای تەواویان نییە. هەر لەم فەلسەفە و بیرە قووڵەوەیە کە ئەم بەیتە بە رووخسار سادە و بە ناوەڕۆك قووڵ و بونیادیانە سەرچاوە دەگرن، ئێمە لە بەیتەکانی پاشتردا تەنیا بەیتەکان وەردەگێڕین، چونکە بیری نوێ و گران لە بەیتەکاندا نین کە پێویست بە لێکدانەوە بکەن.

**٢ — طرفِ چمن و طوافِ بستان**
**بی لالەعذار خوش نباشد**

کەناری چیمەن و گەڕان و پیاسەی باخ بێ گوڵ و رووخسارێك خۆش نابێ.
طرف: کەنار، لای طواف: گەڕان، پیاسە بستان: باغ بی: بێ
لالە عذار: گوڵ و رووخسار، یارێك کە رووخساری وەك گوڵە.

**٣ — رقصیدن سرو و حالت گل**
**بی صوت هزار خوش نباشد**

سەمای سەرو مەستی گوڵ بە بێ دەنگی بولبول خۆش نابێ.
رقصیدن: سەما کردن حالت: مەستی و سەرخۆشی هزار: بولبول

**٤ — با یار شکر لب گل اندام**
**بی بوس و کنار خوش نباشد**

لەگەڵ یاری شەکر لێوی گوڵ ئەندام بووندا بێ ماچ و لەباوەش گرتن خۆش نابێ.
شکر لب: شەکر لێو، لێو شیرین گل اندام: گوڵئەندام، ئەندام وەك گوڵا
بوس، بوسە: ماچ کنار: باوەش.

واتە ئەگەر لەگەڵ یارێکی شەکر لێوی جواندا بیت و ماچی نەکەیت و لە باوەشی نەگریت خۆش نابێت، لێرەدا بە پێویستی دەزانم کە خوێنەری بەڕێز بۆ مانا عیرفانییەکانی یار و ماچ و باوەش بگەڕێیتەوە کە لە غەزەلەکانی پێشوودا شەرح کراون.

**٥ — باغ و گل و مل خوش است لیکن**

**بی صُحبت یار خوش نباشد**

باغ و گوڵ و شەراب خۆشە، بەڵام بێ هاوڕێیەتی یار خۆش نابێ.

مل: شەراب

**٦ — هر نقش که دست عقل بندد**

**جز نقش نگار خوش نباشد**

هەر نیگارێك کە بەدەستی عەقڵ بکێشرێت جگە لە نیگاری (نیگار)جوان نابێ.

واتە هەر خەیاڵ و نیگارێ کە عەقڵ دەیکێشێ جگە لە وێنە و نیگاری یار ئیدی هیچی جوان نابێ.

**٧ — جان نقد محقّرست حافظ**

**ا ز بهر نثار خوش نباشد**

حافظ گیان پولێکی قەڵبە بۆ قوربانی کردن چاك نییە

نقد: پارە، پول محقر: قەڵب، بێ بەها و نرخ از بهر: بۆ، لەبری نثار: قوربانیی

خواجە لەم بەیتەدا گیانی خۆی بەشایانی قوربانیی ڕێگەی یار نازانێت.



## غەزەلی سەد و شەستەم:

**بەحری هەزەجی هەشتی ئەخرەب**

**(مفعول مفاعیلن مفعول مفاعیلن)**

**١ — کی شعر تر انگیزد خاطر که حزین باشد**

**یک نکته ازین معنی گفتیم و همین باشد**

کەی شیعری تەڕ و پاراو دەگوترێت کاتێ کە بیر و مێشك خەمبار بێت کورتەیەکمان لەم بارەیەوە گوت و بەسە.

شعر تر: شیعری تەڕ، پاراو انگیزد: دەجووڵێت، دەگوترێت، دێت ، لە چاوگی (انگیختن)ەوە هاتووە بە واتای جولاندن و هاندان خاطر: بیرومێشك حزین: خەمبار

خواجە پێی وایە گەر مێشك و خەیاڵی مرۆڤ حەزین و خەمبار بێت ئەوا ناتوانێت شیعری جوان و پاراو بنووسێت یاخود بڵێت و گوتن و نووسینی شیعری پاراو وابەستەیە بە مێشك و خەیاڵی ئارام و شادەوە.

بێگومان ئەم رایە بە تەواوی پێچەوانەی رای ڕەخنەگرە نوێیەکانە، چونکە شاعیرەکان هەمیشە لە نارەحەتی و مەینەتییەکاندا شیعرە جوانەکانیان نووسیوە. جیاوازی ئەم رایەشی لەوەدایە کە خواجە مەبەستی لە شیعری عیرفانییە و ئەویش دەروونی ئارامی دابڕاو لە دونیا و خەم و ناخۆشییەکانی دونیای دەوێت میسراعی دووەم دەرچووەنە لەم بیر و باسە و دەچێتە سەر مەسەلەیەکی گرنگی دیکە کە عیرفان و سەرەتای بوون و ئیرادە و ئیختیاری مرۆڤە.

لەگەڵ ئەوەی کە شیعری خواجە و غەزەلیات بە گشتی یەکێتی بابەتی تێدا نییە، بەڵام د. خرمشاهی گوتەنی ئەم غەزەلە یەکێتی بابەتی تێدایە و بیری جەبریەتی ئەو پیشانئەدات. {د.خرمشاهی،ج ١، ل ٦٢٥}

ڕەنگە ئەم یەکێتییە بابەتە بەو شێوە زۆر زەقەش نەبێت کە جەنابی خرمشاهی باسی دەکات، بەڵام بەگشتی غەزەلەکە لە ئاستێکی قوڵ و واتایی بەرزی ئەدەبیدایە و پێویست دەکات لەسەر بەیتەکان راوەستین.

سیراعی یەکەمی ئەم بەیتە ئەکرێ بە دوو شێوە بخوێنرێتەوە کە واتا دەگۆڕێت، جاری یەکەم ئەکرێ لە پاش (انگیزد) راوەستین ئەم مانایە دەبەخشێت کە خرایەڕوو، بەڵام گەر لە پاش (خاطر) راوەستین ئەوا مانایەکی دیکە بەدەستەوە دەدات.

(کەی شیعری تەڕ بیر و مێشك دەجوڵێنێ کە حەزین بێت) واتە لە لێکدانەوەی یەکەمدا بیر و خەیاڵ بکەرە و سەرچاوەی شیعری تەڕە، بەڵام لـە لێکدانـەوەی دووەمـدا بـەرکارە و دەبێتـە کارتێکراوی شیعری تەڕ، بەڵام لێکدانەوەی یەکەمیان راست ترە.

**۲ — از لعل تو گر یابم انگشتریِ زنهار**

**صد مُلك سلیمانم در زیرِ نگین باشد**

گەر لە لێوی تۆوە ئەنگوستیلەی پەنام دەستکەوێ، سەد موڵکی سـولەیمان ئەکەوێتـە ژێـر فەرمانی پەنجەمەوە.

لعل: یاقوت، لێرەدا مەبەست لە لێوی یاقوتییە.

یابم: دەستم کەوێ، بەدەست بهێنم.

انگشتر: ئەنگوستیلە   زنهار: پەنای پیشتوانی، ئەمان.

انگشتری زنهار: ئەنگوستیلەی پەنادان، ئاماژەیە بەو نەریتەی کە کاتێ پادشـایان پـەنای کەسێکیان ئەدا ئەنگوستیلەیەك یا تیرێکیان وەك نیشانە پێ دەدان بـۆ ئـەوەی خـەڵکی بـزانن لەلایەن پادشا یا فەرمانڕەواوە ئەمان دراوە.

زیر نگین باشد : لە ژێر فەرماندا بێت.

خواجـە بـە یـار دەڵـێ گـەر لـە لێـوی یـاقوتینی تـۆوە ئەنگوسـتیلەی ئـەمان و پـەنام دەستدەکەوێت و بەدەست بهێنم سەد موڵکی سولەیمان لـە ژێـر فـەرمانڕەوایی منـدا دەبێـت و موڵکی من سەد هێندەی موڵکی سـولەیمان دەبێـت. لێـوی یـاقوتینی یـار لوتـف و کـەرەمی مەعشوقە و خواجە ئەم لوتفەی ئەو لەسەر موڵکی سولەیمان بە چاکتر ئەداتە قەڵەم.

**۳ — غمناك نباید بود از طعن حسود ای دل**

**شاید که چو وابینی خیرِ تو درین باشد**

ئەی دڵ نابێ لە تانەی حەسوود عەمبار بیت، چونکە رەنگە گەر بـە وردی سـەرنج بـدەیت خێری تۆ لەمەدا بێت.

طعن: تانە، سەرزەنشت   وابینی: سەرنج بدەیت، بەوردی بڕوانی، بڕوانیتەوە.

خواجە لێرەدا لەبەرامبەر تانە و سەرزەنشتی حەسووداندا بە دڵی خـۆی دەڵێـت  ئـەی دڵ نابێت تۆ لەبەرامبەر ئەو تانە و سەرزەنشتانەدا خەمبار و غەمگین بیت، چـونکە رەنگـە گـەر بەوردی سەرنج لەم کارە بدەیت بۆت دەرکەوێت بەرژەوەندی تۆ لەم تانـە لێدانـەی حەسـوودان‌دا بێت نەوەك پیاهەڵدان و چاکەیان.



د. خرمشاهی لە حافظ نامەدا وای بۆ چووەکە ئەم بەیتە پەیوەندی بە ئایـەتی (وعـسی ان تکرهوا شیئا و هو خیر لکم - سوره البقره ۲۱٦) ە وە هەیە.

**٤ — هر کو نکند فهمی زین کلك خیال انگیز**

**نقشش به حرام ار خود صورتگر چین باشد**

هە رکەسێ شتێ لەم قەڵەمی خەیاڵ ئەنگیزە تێنـەگات بـێ زەوق و کەلەپوتـە گـەر خـۆی نیگارکێش چینیش بێت.

کلك خیال انگیز: قەڵـەمی خـەیاڵ ئـەنگێز، مەبەسـت لـە قەڵـەمی ئافەرینـشە کـە ئـەم گەردوونە تەواوی مەخلوقاتی بەم جوانییە  و تەواوییە ئافراندووە، یا خود مەبەست لە قەڵەمی پڕ لە خەیاڵی خودی حافظە نقش به حرام: بەکەسێك دەگوترێت کە لە ڕووی جەستەییەوە جـوان و پێکەوتە بێت و بەڵام لەڕووی عەقڵ و مرۆڤایەتییەوە ناپوختە، کەلەپوت، زەوق سز.

صورتگر چین: نیگارکێشی چـین، کارامـە و هونەرمەنـدی گـەورە بێـت وەك هونەرمەنـدی گەورەی چین.

خواجە گەورەیی مرۆڤ بۆ تێگەیشتن لە قەڵەمی پڕ جوانی و خەیاڵی ئافەرینش دەگێڕێتـەوە و پێی وایە هەرکەس شتێ لەو جوانییەی دەرك نەکردبێت و پەی بە جوانی و سەرنجڕاکێشی ئـەم گەردوون و مەخلوقاتە نەبردبێت کەلەپوت و بێ زەوقە گـەر نیگارکێـشێکی کارامـە و لێزانـی وەك نیگارکیشی چینیش بێت.

یاخود ئەو کەسەی کە پەی بە جوانی و خەیاڵ ئەنگێزی قەڵـەمی مـن (حـافظ) نـەبردووە، دەبەنگ و کەلەپوتە.

د. هروی و مهدی معینیان لە (دیوان حافظ با معنی شیوای فارسی، ل ۲۷۵ دا واتایـەکی دیکەیان لە{ ج۱، ل ٦٨٩ }بۆ (نقشش به حـرام) هێنـاوە کـە پێیـان وایـە مانـای دروسـتی نیگارکێشی لێ حەرام بێت.

واتە: کەسێ کە لە جوانی قەڵەمی ئافەرینش تێناگات و پەی بە وردی و جوانی گەردوون نابات گەر  نیگارکێش چینیش بێت نیگارکێشیی لێ حەرام بێت، (چونکە بەرهەمی بێ سەمەرە)، بـەڵام ئەوەی راستی بێت ئەم جۆرە لێکدانەوەیە لە فەرهەنگەکاندا بۆ ئەم زاراوەیە نەهاتووە.

**٥ — جام می و خون دل هریك به کسی دادند**

**در دایرەی قسمت اوضاع چنین باشد**

جامی مەی و خوێنی دڵیان هەریەك بەکەسێ داوە ئەرێ لە بازنـەی قـسمەتدا بـارودۆخ بەم شێوەیەیە.

جام مى: پێکى مەى، نیشانەى لەزەت و چێژى ژیانە، خۆشبەختى.

خون دل: خوێنى دڵ، نارەحەتى و زەحمەت کێشى  دایرەى قسمت: بازنەى قسمەت و چارەنووس.

ئەم بەیتە لەڕوانگەى جەبرییەتى خواجەوە سەرچاوە دەگرێت و دەڵێ: لە چارەنووسى هەرکەسێکدا شتێکیان بۆ دیارى کردووە و هەندێك پێکى مەى واتە خۆشبەختى و خۆشگوزەرانییان پێداوە و هەندێکى دیکە زەحمەت و نارەحەتى و عارەقى نێو چەوان، ئەرێ لە بازنەى چارەنووس و قسمەتدا ئاوایە و بەم شێوەیە پێکەکان دابەشکراوە هەندێك خۆشبەختى هەندێك زەحمەتکێشى و بەدبەختى.

بەڵام ابوالحسن ختمی لاهورى لە {شرح عرفانى غزلهاى حافظ، ج ٢،ل ١٤٩٤}دا، دەڵێ: ئەم دوانەیان هەردووکیان داوە، بە کەسێك و بەم پێیە واتەى بەیتەکە دەبێتە: هەر کەسێك خۆشى و ناخۆشى لە چارەنووسى نووسراوە و دایرەى قسمەت ئاوایە کە مرۆڤ خۆشى و ناخۆشى هەبێت و هەرگیز یەکێکیان بە تەنیا نییە . لەڕاستیدا ئەم رایەى دووەمیان زیاتر لەگەڵ بیرى خواجە ڕێك دەکەوێتەوە، چونکە خواجە لە غەزەلەکانى پێشوودا دونیاى بە خومێکى سەراوبن داوەتە قەڵەم کە دوو رووسافى تێکەڵاو بووە و لێکجیا کردنەوەیان مەحاڵە. بەڵام بەیتى دواى ئەمە زیاتر جەخت لە واتاى یەکەم دەکاتەوە.

**٦ — درکار گلاب و گُل حکم ازلى این بود**

**کاین شاهد بازارى وان پردەنشین باشد**

لەکارى گوڵاو و گوڵدا حوکمى ئەزەلى ئەمە بوو کە ئەم خۆ (نمایى) نواندن و ئەو پەردەنشین بێت.

گلاب: گوڵاو    شاهد بازارى: خۆ نواندن و خۆ دەرخستن لەنێو کۆمەڵدا  پەردەنشین: بێ گومان گوڵ جوانى نێو کۆڕ و کۆمەڵانە و بەردەوام خەریکى خۆنمایش کردنە و لەبەرامبەریشدا گوڵاو لە جێگەیەکدا دادەنرێت و خەڵوەت نشین و شاراوەیە خواجە ئەم حاڵەتە بە حوکمى ئەزەلى ئەداتە قەڵەم و پێى وایە حوکمى ئەزەلى بڕیارى ئەمەى داوە و ئەمى کردووەتە بەشى گوڵ و ئەویشى کردووەتە بەشى گوڵاو.

**٧ — آن نیست کە حافظ را رندى بشد از خاطر**

**کاین سابقەى پیشین تا روز پسین باشد**



ئەوە نییە کە حافظ ڕەندى لەبیر بچێتەوە، چونکە ئەم بڕیارەى ئەزەل تا ڕۆژى قیامەت بەردەوامە.

آن نیست: ئەوە نییە، وانییە، وامەزانە    بشد از خاطر: لەبیر بچێتەوە   سابقە پیشین: بڕیارى ئەزەل چارەنووسى ئەزەلى   روز پسین: دوا ڕۆژ، ڕۆژى قیامەت.

خواجە پێى وایە کە ڕەندى ئەو بڕیارێکى ئەزەلییە و لە چارەنووسى ئەودا وا بڕیاردراوە هەربۆیە مەحاڵە ئەم بڕیارە ئەزەلییە تا ڕۆژى قیامەت هەڵوەشێتەوە و دەڵێ: وامەزانە ڕۆژێ حافظ ڕەندى لەبیر ئەچێتەوە و وازى لێ دەهێنێ، چونکە قەدەرى ئەزەلى منە و تا قیامەت بەردەوام دەبێ.

## غەزەلی سەد و شەست و یەکەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی ئەسلەم**

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لن)**

**١ — نفس بادِ صبا مُشك فشان خواهد شد**

**عالمِ پیر دگر باره جوان خواهد شد**

نەفەسی بای سەبا میسك پرژین دەبێت    جیهانی پیر دیسانەوە لاو دەبێتەوە

مشك فشان: میسك پرژین، بۆنی میسك گرتن.

عالم پیر: جیهانی پیر، مەبەست لە جیهانی وشکی پاییزە کە وەك پیر و کەنەفتە.

دگرباره: دیسانەوە، سەرلەنوێ       جوان خواهد شد: لاو دەبێتەوە، گەنج دەبێتەوە.

خواجە باس لە هاتنەوەی بەهار دەکات کەتیایدا سروەی بەیان بە بۆنی گوڵان و میسکی یار بۆن دەگرێت و میسك دەپرژێنێ و جیهانی پیریش سەرلەنوێ جوان دەبێتەوە.

**٢ - ارغوان جام عقیقی به سمن خواهد داد**

**چشمِ نرگس به شقایق نگران خواهد شد**

ئەرخەوان پێکی سووری (عەقیقی - دوڕی) دەدات بە یاسەمین و چاوی نێرگز سەیری گوڵاڵە دەکات .

ارغوان: درەختی ئەرخەوان گوڵی سووری هەیە     جام عقیقی : پێکی سووری یاقوتی

سمن: یاسەمین    نگران: لەکاتی سەیر کردندا    شەقایق: گوڵاڵە

لەبەردەوامی بەیتی یەکەم و هاتنی بەهاردایە و باسی لە گونجان و هەماهەنگی سروشت دەکات کە هەموویان پێکەوە هەماهەنگ و جوانن، بۆ نموونە ئەرخەوان گوڵی سووری ئاڵی یاقوتی دەگرێت و بەرەو یاسەمین شۆڕدەبێتەوە هەروەك ئەوەی کە دەڵێی پێکی شەراب پێشکەشی گوڵە یاسەمین دەکات و چاوی مەستی نێرگزیش بەردەوام سەیری گوڵاڵە دەکات .

**٣ - زین تطاول که کشید از غم هجران بلبل**

**تا سراپردەی گل نعرەزنان خواهد شد**

لەم ستەمەی کە بولبول بە دەست غەمی دوورییەوە کێشای تا سەراپەردەی گوڵ بە داد و هاوارەوە دەڕوات.

تطاول: ستەم، دەستدرێژی      سراپردە: سەراپەردە، خێمەی گەورە، چادرگا.



نعرەزنان: بەداد و هاوار کردنەوە.

خواهد شد: دەڕوات (هەندێ جار - شد — بەواتای ڕۆیشت دێت)

لە زستانی سارد و کڕێوەدا کە گوڵ هەڵدەوەرێت ئیدی بولبول هەمیشە لە غەمی دووری یاری دێرینەیدا دەتلێتەوە و شاعیر ئەم دووری و خەمی هیجرانە بەستەمێك لەگوڵ دەزانێت. هەر بۆیە گوڵ لە ئەنجامی راکێشانی ئەم زوڵم و ستەمەی خەمی دووری یارەوە کاتێ بەهار دێت بە داد و هاوار و ئاواز خوێندنەوە بەرەو چادرگە و خێمەی سوڵتانی گوڵ دەڕوات ئەم هاوار و دادەشی لە ئەنجامی ستەمی خەمی دووری زستانی سارد و کڕێوەوەیە.

ئەم چەند بەیتەی سەرەوە هەموو لەوەسفی هاتنی بەهاردا کە بۆ عارفەکان وەرزی شەوق و شۆری عەشق و چوونەوە نێو دونیای پاکێتی و ئاشنایی مەعشوقە.

**٤ — گر ز مسجد به خرابات شدم خُرده مگیر**

**مجلس وعظ درازست و زمان خواهد شد**

گەر لە مزگەوتەوە رۆیشتم بۆ مەیخانە رەخنە مەگرە، چونکە کۆڕی ئامۆژگاری درێژە و کات تێدەپەڕێت.

شدم: رۆیشتم   خرده مگیر: رەخنە مەگرە   درازست: درێژە

زمان خواهد شد: کات تێدەپەڕێت.

وەك پێشتریش باسکرا (مزگەوت) و شوێن و چەمکە روکارییەکانی ئایین لای خواجە بەنێگەتیڤی باسکراون و لە بەرامبەر ئەو وشە و چەمکانەشدا حافظ وشە و چەمکی نوێی وەرگرتووە — ئەڵبەت ئەم وەرگرتنە لە پێش حافزیشدا رەواجی هەبووە - لای ابوالحسەن ختمی لاهوری مزگەوت تابلۆی جیلوەی (جەمالی)ی و خەرابات تابلۆی جیلوەی (جەلال)ی یە کە رێبواری رێگەی تەریقەت لەو جیلوە و دەرکەوتنەی زاتی جەلالی حەق فانی ببێت واتە گەر مزگەوت — کە تابلۆی دەرکەوتنی جەمال — جوانییە و مانەوەی بوونی رێبوارە، خەرابات تابلۆی دەرکەوتنی زاتی جەلالە و ئەبێتە مایەی فەنا و نەمانی بوونی رێبوار {شرح عرفانی غزلهای حافظ - ابوالحسن عبدالرحمن لاهوری ـ تصحیح و تعلیقات بهاءالدین خرمشاهی چاپ چهارم / چهار جلدی کورش منصوری ١٣٨١ نشر قطره تهران حسین مطیعی لعین، ج ٣، ل ١٥٩٥}.

بەم پێیە مزگەوت نابێتە هۆی لەدەستدانی خود کە ئەم لەدەستدانە و فەنا بوونە دوا پلە و دوا ئاواتی عارفەکانە، بەڵام مەیخانە و خەرابات کە رەمزی عیرفانە ئەو سیفەتەی تێدایە. خواجە بە رەقیبان دەڵێ: گەر لە مزگەوتەوە دەرکەوتم و رۆیشتم بۆ مەیخانەی عەشق رەخنە

مەگرن و تانە و ناو و ناتۆرەم مەخەنە شوێن، چونکە من عاشقم و کۆڕی وەعز و ئامۆژگاری مزگەوتیش دوور و درێژە و کاتی زۆری دەوێت کە منی عاشق توانای بەسەر بردنی ئەو هەموو کاتەم نییە.

**٥ — ای دل ار عشرتِ امروز به فردا فکنی**

**مایەی نقدِ بقا را کە ضَمان خواهد شد**

ئەی دڵ گەر خۆشگوزەرانی ئەمڕۆ بخەیتە بەیانی کێ زامنی (گرەنتی دڵنیایی) نەقدی مانەوە دەبێت.

ار: ئەگەر، ئەر

عشرت: خۆشگوزەرانی، دڵشادی لە زاراوەی عیرفانیدا بەواتای هاودەمییە لەگەڵ زاتی حەقدا بە شعور و ئیدراك.

فردا: بەیانی

فکنی: بخەیتە، دوابخەی  بقا: مانەوە  کە: کێ  ضمان: زامن، زەمانەت، گرەنتی.

خواجە مانەوە و بەقای وەك دەستمایەیەکی گەورە و گرنگ داوەتە قەڵەم. ئەم بەیتە تەواوکەری بەیتی پێشووە کە تیایدا مزگەوتی بەرەو مەیخانە بەجێ هێشت و بە رەقیبانی گوت تانە و رەخنە مەگرن، چونکە دەرسی مزگەوت درێژە و کارەکانی دیکەمان لە دەست دەدات لێرەدا بە دڵ دەڵێت گەر هاودەمی لەگەڵ زاتی حەقدا بۆ سبەینێ دوا بخەیت و ئەمڕۆ نەڕۆیتە نێو عەشقی ئیلاهییەوە و لەو دەریا و ئاوە زوڵاڵە نەخۆیتەوە و پاراو نەبیت کێ گرەنتی ئەوە دەکات کە تا سبەینێ ئەم کاتەت بەردەوام بێت تا جارێکی دی ئەو فەیزە ئیلاهییەت بەنسیب ببێت بۆیە گوێ بە رەخنە مەدە و بەدڵنیاییەوە هەنگاو بەرەو مەیخانەی عەشق هەڵگرە.

**٦ — ماه شعبان منه از دست قدح کاين خورشيد**

**از نظر تا شبِ عيد رمضان خواهد شد**

مانگی شەعبان پێك لە دەست لامەبە، چونکە ئەم هەتاوە تا شەوی جەژنی رەمەزان لەبەر چاوان ون دەبێ.

شعبان: مانگی شەعبان، مانگی پیش رەمەزان کە لەکوردیدا بە (کۆڵەمانگ — کورتە مانگ) ناسراوە.

از دست منە: لە دەست دامەنێ  خورشید: هەتاو  از نظر: لە چاوان



خواجە زۆر جار ئاماژە بەوە دەکات کە لە مانگی رەمەزاندا بە هۆی سەرقاڵی بە ئەدا کردنی فەرزی رۆژووەوە لە عەشق و عیرفان دوور دەکەوێتەوە. لێرەشدا پێکی عەشقی بەهەتاوێك داوەتە قەڵەم و دەڵێ لە مانگی شەعبانی پێش رەمەزاندا بەردەوام خەریکی بادەنۆشی و سەرقاڵی عەشق بە، چونکە ئەو هەتاوی پێکی عەشقە لە دوائێوارەی مانگی شەعباندا ون دەبێت و تا دوایین رۆژی رەمەزان — تا شەوی جەژن — لە پێش چاوان دەڕوات. بۆیە ئێستا کە مانگی شەعبانە - یاخود مانگی شەعبان - بە فرسەت بزانە و لەدەست خۆتی دەرمەکە.

**٧ — گل عزيزست غنيمت شمريدش صحبت**

**كه به باغ آمد ازين راه و ازان خواهد شد**

گوڵ ئازیزە هاودەمی ئەو بەغەنیمەت بزانن، چونکە لەم رێگەوە هاتە نێو باغەوە و لەویانەوە دەردەچێت (تەمەن کورتە).

غنیمت: غەنیمەت، دەستکەوت  شمریدش: بدەنە قەڵەم، بزانن

خواجە گوڵ بە شتێکی خۆشەویست و ئازیز دەزانێت، ئازیزێك کە تەمەنێکی کورتی هەیە و هەر ئەڵێی لەم دەرگاوە دێت و لەویانەوە دەچێتە دەرەوە بۆیە پێمان دەڵێت، هاودەمی و هاوڕێیەتی گوڵ — لەو تەمەنی کورتەدا — بە دەستکەوت بزانن و لەدەست خۆتانی دەرمەکەن و چێژ لەهاوڕێیەتی کورتی گوڵ ببینن، چونکە هەرکە لەم رێگەوە هاتە نێو باغەوە لەوی دێکەیانەوە دەچێتە دەرەوە و ئاوا دەبێ.

لە میسراعی یەکەمدا (ش) ی جێناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاك جێگۆڕکێ ی پێکراوە و لە ئەسڵدا بەم شێوەیەیە:

غنیمت شمرید صحبتش: هاوڕێیەتیی بە دەستکەوت بزانن.

**٨ — مطربا مجلس انس است غزل خوان و سرود**

**چند گوئی كه چنين رفت و چنان خواهد شد**

ئەی موتریب مەجلیسی هاودەمییە غەزەل بڵێ و سروود بخوێنە  چەندە باسی رابردوو (ئاوا تێپەڕی) و داهاتوو (ئاوا دەبێ) دەکەیت.

مطرب: ئاگادارکەرەوەیە لە جیهانی ئیلاهی — پیری تەریقەت — شێخ و سەردار (انس)یش چێژ وەرگرتنی ناوەڕۆکییە لە هاودەمی لەگەڵ زاتی حەقدا. خواجە بە شێخ و موتریب کە ئاگای لە ربرادوو و داهاتوو هەیە دەڵێ: ئێستا ئێمە لە لوتکەی حاڵ و شەوقی و شورداین مزگەوتمان بەجێ هیشتووە و هاتووینەتە حزوری تۆ، تۆش بە هۆکارەکانی عەشق کە غەزەل و سروودن، غەزەلێکمان لە عالەمی ڕەبانی و سروودێکی گیانیمان بۆ بڵێ تا بچینەوە نێو دونیای پڕ شەوق و

شوری عەشق و هێندە باسی رابردوو و داهاتوومان بۆ مەکە، چونکە ئێمەی تازە عارف پێویستمان بە ئێستا هەیە و رابردوو و داهاتوو لە دونیای عەشقمان دادەبڕێت.

**٩ — حافظ از بهر تو آمد سوىِ اقليم وجود**

**قدمی نهْ به وداعش که روان خواهد شد**

حافظ لەبەر خاتری تۆ هاتە هەرێمی بوونەوە، بۆ ماڵئاوایی هەنگاوێ هەڵگرە کە دەگوزەرێ و دەڕوات (دەمرێ).

از بهر تو: لەبەر خاتری تۆ، لەبەر تۆ    اقليم وجود: هەرێمی بوون

قدمی نه: هەنگاوێ هەڵگرە    به وداعش: بۆ ماڵئاوایی پێکردن

دوان: ڕۆیشتن، لێرەدا مەبەست لە مردن یا فەنابوونە.

(تۆ) لەم بەیتەدا ئەکرێ خودی مەعشوقی ئەزەلی بێت و هەرێمی بوونیش هەمان بوونی مرۆڤە و لەبەر خاتری یار یادخەرەوەی پەیمانی دێرینەی (ئەلەستی) مرۆڤە، بەڵام گەر (تۆ) مەبەست لەموتریب بێت — کە ئەم لێکدانەوەیە زیاتر ڕوویەکی رواڵەتی عارفانە و سۆفییانەی هەیە — ئەوا هەرێمی بوون مەقامی مەیخانە و تەریقەتە.

لەم لێکدانەوەیە دا حافظ لە کاتێکدا کەلە هەرێمی مەقاماتی تەریقەتدا خەریکە دەچێتە نێو جەزبە و حاڵەوە و بەرەو فەنابوونی وجودی خۆی دەچێت بە شێخ (موتریب) دەڵێ: حافظ لەبەر تۆ مزگەوتی بەجێ هێشت و هاتە ئەم هەرێمەوە و ئێستاشی بەرەو فەنابوون دەچێت دەی بەرلەوەی بە مەقامی فەنا بگات لە خەڵوەت هەنگاوێك بنێ و ماڵئاوایی لێ بکە.

ئەکرێ خواجە کە ئەم لێکدانەوەیە لەگەڵ نیگەرانی بەردەوامی ئەودا زیاتر دەگونجێ — بە مەعشوقی حەق — ئەو مەعشوقەی کە لە دیداری بێ بەشە لەم دونیایەدا و هەمیشە بە ئاواتی جیلوەیەکی ئەوەوەیە — دەڵێت: من لەبەر خاتری تۆ و هاودەمی تۆ هاتمە نێو هەرێمی بوونەوە و پەیمانی خۆم بەجێ گەیاند و پەیڕەویم لە عەشق کرد ئەوا ئەمرۆ ئیدی ئەم بوونە بەجێ دەهێڵم و تۆ هەر نەهاتی وەرە و ماڵئاواییەکم لێ بکە. ئەی مەعشوق گەر بۆ ماڵئاوایی یەکجارەکیشم دەرکەویت هەر خۆشحاڵم. ئەم واتایە بەتەواوی لەو ئەسەفە قووڵەی مەحوی دەچێ کە دەڵێ:

**دڵم دەرهات و تۆ هەر دەرنەهاتی**

**نەهاتی هەر نەهاتی هەر نەهاتی**

بەڵام خواجە هەمیشە هەوڵدەدات بە سۆز و عاتیفە دڵی مەعشوق نەرم بکات بێتە سەر جێگەی فەنابوون یا مەرگی تەنانەت سەرگۆڕەکەشی.

لێرەشدا هەمان هەوڵدەدات کەمن بۆ خاتری تۆ هاتم دەتۆش بۆ ماڵئاوایم وەرە ئاخر من ئەمرم و فەنا ئەبم.



## غەزەلی سەد و شەست و دووەم:

**بەحری هەزەجی هەشتی تەواو**

**(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)**

**١ — مرا مهرِ سیه چشمان زسر بیرون نخواهد شد**

**قضایِ آسمان است این و دیگرگون نخواهد شد**

من میهری چاوڕەشانم لەسەر دەرناچێت    ئەمە قەدەری ئاسمانە و ناگۆڕێت

مهر: عەشق    سیە چشمان: چاوڕەشان    بیرون نخواهد شد: دەرناچێت

دیگر گون نخواهد شد: ناگۆڕێت

(چاوڕەشان) مەعشوق و مەحبوب و یاری دونیایین و لای عارفەکانیش ئەم حاڵەتە زۆر ئاسایی بە دی دەکرێت کە باسی عەشقی مەجازی بکەن. د. خرمشاهی پێی وایە گەر گومان لەوە هەبێت کە یاری حافظ چاوڕەش بێت ئەوا گومان لەوە نییە کە خواجە عاشقی چاو ڕەشانە. {حافظ نامە، ج١، ل ٦٣٤} عارفەکان ئەم حاڵەتی عاشق بوونە بە ئاسایی دەزانن، تەنانەت لە روانگەی جەبرییەتەوە سەیری دەکەن و بەقەدەری ئیلاهی دەزانن کە هەر لە سەرەتاوە لە چارەمان نووسراوە. ئەکرێ ئەم دانە پاڵ قەدەرە خۆدزینەوە بێت لەو پرسیارە زۆرانەی کە ڕەقیبان بەردەوام دەیانکەن. خواجە شارەزایانە دەڵێ من عەشقی چاوڕەشانم لە دڵ دەرناچێت و ئەوش قەدەری ئیلاهییە و ئەم قەدەرەش گۆڕانی بەسەردا نایەت.

**٢ — رقیب آزارها فرمود و جایِ آشتی نگذاشت**

**مگر آه سحرخیزان سوی گردون نخواهد شد**

ڕەقیب ئازاری زۆری دام و بواری بۆ ئاشتی نەهێشتەوە، مەگەر ئاهی شەو بێداران بەرەو ئاسمان بەرز نابێتەوە.

فرمود: ئەنجامدا (فرمودن) بەسێ واتای ( فەرموون — گوتن بەڕێزەوە)، (فەرمان دان)، (ئەنجامدان) لە شیعری حافظدا بەکار هێنراوە.

نگذاشت: نەهێشتەوە    سحرخیزان: شەوبێداران    گردون: ئاسمان

ڕەقیبی دێوسیفەت ئازاری زۆری عاشقان دەدات هێندە کە ئیدی بوارێك بۆ ئاشتی و ئاشتبوونەوە ناهێڵێتەوە خواجە لە شێوەی پرسیاردا دەڵێ: مەگەر ئاه و ناڵەی شەوبێداران بەرز نابێتەوە بۆ ئاسمان و ناچێتە گەردنی ئەو ڕەقیبە و نزایەکی بۆ ناکەوێتە کار. یا ئەڵێی ئاه و ناڵەی شەوبێداران کاریگەریی نییە وا ڕەقیب بەردەوام دەبێت.

**٣ — مرا روز ازل کاری بجز رندی نفرمودند**

**هر آن قسمت که آنجا رفت ازان افزون نخواهد شد**

رۆژی ئەزەل بۆ من جگە لە رەندی هیچ کارێکیان بۆ بڕیارنەداوم هەر ئەو بەشەی کە لەوێ بڕیاری لەسەر ئەدرێ ئیدی بۆی زیاد ناکرێت.

نفرمودند: بڕیاریان نەداوە    افزون: زیاد    افزون نخواهد شد: زیاد نابێت

خواجە پێی وایە لە رۆژی ئەزەلدا جگە لە رەندی (رووخساری مەلامەت و ناوەوەی ساغ و سەلامەت) هیچی دیکەیان بۆ بڕیارنەداوە و ئەم بڕیاردانەش قەدەری ئەمە و هیچ شتێکی دیکەی بۆ زیاد و کەم ناکرێت. ئەم بەیتە هەمان واتای بەیتی یەکەمە کە باوەڕی بڕاوە و کۆتاییە بە قەدەر و بەشی دانراو نەگۆڕ و فەرمودەی (رفعت الاقلام وجفت الصحف) قەڵەمەکان هەڵگیراون و پەڕەکان وشکبوونەوە.

لای ئەم هەر لەیەکەم رۆژەوە بڕیارەکان دەرچوون و کۆتاییان هاتووە و هەرگیز گۆڕانیان بەسەردا نایەت.

**٤ — خدا را محتسب ما را به فریاد دف و نی بخش**

**که ساز شرع ازین افسانه بی قانون نخواهد شد**

ئەی موحتەسیب بۆخاتری خوا ئێمە ببەخشە بە هاواری دەف و نەی کە یاسای شەرع لەم رووداوە بێ قانون نابێت.

خدارا: بۆ خاتری خودا، لە رای خودا    محتسب: مەئموری رێگری لە خراپە

فریاد: هاوار، ناڵە   بخش: ببەخشە، بەدەست    ساز: ساز، یاسا و نیزام و پێکهاتە

افسانه: چیرۆك، لێرەدا بەمانای رووداو هاتووە    قانون: قانون و یاسا و شەرع ئامێری مۆسیقایی قانون.

خواجە داوا لە محتسب دەکات کە ئێمەی عاشق و عارف بە هاواری دەف و نەی - کە رەمزی عیرفانی و عەشقی ئیلاهین — ببەخشە و رێگە بدە کە ئێمە مەشغوڵی ئەم عەشقەی خۆمان بین و بە مونکەر و خراپە مەیدەرە قەڵەم، چونکە یاسا و پێکهاتەی شەرع بەم مەسەلەیە تێکناچێت و لە بناغە نایەت و هیچ زەرەرێکی لێ ناکەوێت.

بەکورتی خواجە داوا لە مەئموری نەهی لە خراپە دەکات کە رێگە لە عەشق و عاشقی نەگرێت، چونکە ئەم عەشق و عاشقییە زیانی بۆ ئایین و شەرع نییە.

**٥- شراب لعل و جای امن و یار مهربان ساقی**

**دلا کی بِهْ شود کارت اگر اکنون نخواهد شد**



شەرابی یاقوتین و جێگەی ئەمن و ئاسایش و ساقی یاری میهرەبانە، ئەی دڵ کەی کاروبارت چاك دەبێت گەر ئێستا نەبێت.

لای لاهوری، شەراب، خۆشەویستی زاتییە لە مەیخانەی مەحبوبدا و جای امن: مەیخانە و خەڵوەتخانەی مورشید و ساقی خودی مورشیدی زەمانە {شەرح عرفانی غزلهای حافظ، ج٢، ل١٥٣٩} خواجە بە دڵی خۆی دەڵێت ئێستا کە هەموو مەرج و هۆکارەکان لەبارن بۆئەوەی کە خۆشبەخت بیت و بچیتە نێو دونیای پاکی عەشقەوە گەر ئێستا کارت چاکتر نەبێت و نەتوانی خۆشبەخت بیت ئەی کەی دەبیت واتە ئیدی بوار نابێت بۆ خۆشبەخت بوون. خواجە لێرەدا هانی دڵی دەدات کە تەواوی هۆکارەکان لە بارن بۆ عەشق دەی هەنگاو بنێ بۆ نێو دونیای حاڵ و مەقامەکان.

**٦ — مجال من همین باشد که پنهان مهر او ورزم**

**کنار و بوس و آغوشش چه‌گویم چون نخواهد شد**

بواری من تەنیا ئەمەندەیە کە بەدزییەوە عاشقی ئەوبم، چی لە بارەی پێکەوە بوون و ماچ و باوەشییەوە بڵێم چونکە ناکرێت (بوار نییە).

پەنهان: بە شاراوەیی، بەدزییەوە    مهرورزیدن: عاشق بوون   کنار: پێکەوە بوون

بوس / بوسە: ماچ    آغوش: باوەش

رەقیبان لە گشت لایەکەوە لە بۆسەی ئازاردانی عاشقاندان هەر بۆیە خواجەی عاشق دەڵێ بەم حاڵەوە من تەنیا بوارم ئەوەیەکە بەدزییەوە و بە پەنهان عاشقی ئەوبم و عەشقبازی لەگەڵدا بکەم و ناکرێ باسی پێکەوە بوون و ماچ و باوەشی یار بکەم.

گەر یار حەقیقی بێت و مەبەست زاتی حەق بێت (کنار و بوس و آغوش) کە ماڵی (قرب و وصل و اتحاد)ن واتە: لە کاتێکدا کە من تەنیا لە پەنهاندا ئەتوانم لە عەشقی ئەودا بژیم و عاشقی بم چۆن ئەتوانم لە نزیکی و وەسڵ و اتحاد لەگەڵ یاردا بدوێم.

لێرەدا خواجە دەستە و سانی عاشقان دەخاتەڕوو لە باسکردنی حاڵ و مەقاماتی عیرفانیدا.

**٧ — مشوی ای دیده نقش غم ز لوح سینه‌ی حافظ**

**که زخم تیغ دلدارست و رنگ خون نخواهد شد**

ئەی دیدە نەخشی خەم لەسەر پەڕەی سنگی حافظ مەشۆ، چونکە ئەم نەخشە برینی تیغی دڵدارە و رەنگی خوێنیش ناڕوات.

مشوی: مەشۆ    نقش: جێگە، نەقشی    لوح: پەڕە — لەوح    نخواهد شد: ناڕوات.

یار هەمیشە بێ نیاز و موستەغنییە لە عاشق، ئەم بێنیازییەی یار شمشێرێکی تێژە و برینێکی گەورەی کردۆتەوە دڵی حافظەوە، خواجە بە چاوانی دەڵێت: ئەی چاوانم بە فرمێسك هەوڵی شوشتنی نەخشی خەمی بێ نیازی یارمەدە لەسەر دڵم، چونکە برینی شمشێری دڵدارە و رەنگی خوێنە واتە خوێنە لەسەر دڵم و خوێنیش بە ئاو ناڕوات بۆیە کارێکی بێهودە ئەکەیت و هیچ بەرهەمێکی نابێت. لەواتایەکی قوڵتردا: خەمی یار بەفرمێسکی چاوان ناڕوات و هەرگیز فرمێسك خەمی قووڵی یار لەبیر عاشق ناباتەوە.



## غەزەلی سەد و شەست و سێیەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی ئەسلەم**

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لن)**

**١ — روز هجران و شب فرقت یار آخر شد**

**زدم این فال و گذشت اختر و کار آخر شد**

رۆژی دووری و شەوی دابڕان لەیار دوایی هات   ئەم فاڵەم گرتەوە و ئەستێرەی بەخت هێنای و کار دوایی هات.

اختر: ئەستێرە   گذشت اختر: واتە ئەستێرەی بەخت لە یەکێ لە پلەکانی ناوچەی برجەکان تێپەڕی و بەخت هاوڕێیە.

ئەگەر بێت و زاراوەکانی ئەم غەزەلە بەواتای عیرفانی لێکبدەینەوە ئەوا لە ئاستێکی بەرزی عیرفانیدایە، بەڵام ناکرێ لایەنە مێژوویی و مرۆیی و کۆمەڵایەتییە کاریگەرەکانی سەردەمی خواجەش پشتگوێی بخەین، چونکە بمانەوێ یا نەمانەوێ رووداوە بێ شومار و دڵتەزێن و دڵخۆشکەرەکانی سەردەمی خواجە کاریگەرییەکی بەرچاویان بەسەر شیعرەکانیەوە هەیە - گەر بە شێوەیەکی شاراوەش بێت- لە نێو لێکۆڵەران و شرۆڤەکەرانی غەزەلەکانی خواجە دا د. قاسم غنی و زرین کوب و د.حسین علی هروی زیاتر بایەخیان بەم لایەنە مێژووییە داوە و زۆرجار باکگراوندی مێژویی غەزەلەکان دەخەنەڕوو کەلەگەڵ ناوەڕۆکی غەزەلەکەدا بە تەواوی یەکدەگرێتەوە - هەر چەندە کە هێشتا سرکی غەزەلەکە بوارێك بۆ جۆرە شرۆڤەکانی دیکەش دەهێڵێتەوە -.

د. خرمشاهی لە (د. غنی)یەوە نقڵی کردووە کە  خوالێخۆشبوو ئەگەری ئەوە دادەنێ کە ئەم غەزەلە بۆ لەناو چوونی حکوومەتی ستەمکاری میر پیر حسین لە شیراز و سەرکەوتنی شا شێخ ابواسحاقە بەسەریدا نووسراوە و تایبەتە بە رووداوەکانی ساڵی (٧٤٣ ﻫ)یەوە.{د.غنی، تاریخ عصر حافظ لە خرمشاهی، ج ١ ل ٦٣٧ وەرگیراوە} . بە هەرحاڵ ناتوانرێت تەواوی بەیتەکانی غەزەلەکانی حافظ بخرێتە نێو چوارچێوەیەکەوە، چونکە یەکێتی بابەتیان تێدا نییە، بەڵام ئەم رایە بۆ بەیتێك یاخود چەند بەیتێك راستە.

باوەڕ هێنان بە باکگراوند بوونی ئەم رووداو و راستییە مێژووییانە بەر بەستن لە رێگەی شەرحێکی تەواو عارفانەی غەزەلەکانی خواجەدا، هەر بۆیە هەر شرۆڤە و راڤەیەکی یەك جەمسەری بۆ غەزەلەکانی خواجە ناتەواو و کەم و کوڕیی تێدایە.

سەرنجڕاکێشی خواجە و غەزەلەکانی لەوەدایە — کە ڕەنگە نهێنی نەمری خواجە و غەزەلەکانی بێت -  کە ئەگەر بێت و مێژوو پشتگوێ بخەین مانایەکی مرۆیی بێسنووری بەرز دەدەن بە دەستەوە.

خواجە لەم بەیتەدا باس لە بەسەر چوونی دووری و دابڕان لە یاردەکات و هەڵهاتنی ئەستێرەی بەخت و ئاوابوونی ئەستێرەی نەگبەتییە، گەر لایەنە مێژووییەکەی ئەم بەیتە لەبەرچاو بگرین مەبەست لەیار شاە شێخ ابواسحاقە، بەڵام لە باکگراوندێکی فراوانی مرۆییەوە یار یاری عیرفانی و مەجازی و تەواوی خۆشەویستە دیار و نادیارەکانی مرۆڤە. ئەم تەواو بوونی دابڕانە لای خواجە بەختێکی گەورە و خاڵێکی چاکە وەك خەڵاتێك پێی دەدێت و جەخت لە تەواوی بوونی خەفەتی دووری یار دەکاتەوە.

**٢ — آن همه ناز و تنعّم که خزان می فرمود**

**عاقبت در قدم باد بهار آخر شد**

ئەو هەموو ناز و خۆبەشت زانینەی (فیزەی) کە پاییز دەیکرد   سەرئەنجام لەگەڵ هەنگاوی شەماڵی بەهاردا دوایی هات.

تنعّم: بەناز و نیعمەت ژیان، لەبەیتەکەدا مەبەست لە فیز و نازە. خزان: خەزان مەبەست لەوەرزی پاییزە کە وەرزی خەزانە     عاقبت: دواجار، سەرئەنجام   آخر شد: دوایی هات

خواجە دیسان باس لە کۆتایی هاتنی ناز و فیزی وەرزی خەزان دەکات کە وەرزی بەرهەم و سەمەرە و پێی وایە کە بەهار زیاتر شایانی نازە نەوەك پاییز و هەر بەهاتنی بەهار ئەو نازانەی پاییز دواییان دێت. گەر لە دوو قوناغی جیاوازی مێژووییش بدوێت ئەوا سووککردنی قۆناغی یەکەم و بەرز نرخاندنی قۆناغی دووەمە.

**٣ — شکر ایزد که به اقبال کله گوشەی گُل**

**نخوت باد دی و شوکت خار آخر شد**

سوپاس بۆ خوا کە بە بەرەکەتی سڵاوی گۆشەی گوڵەوە   غروری بای مانگی دەی و شەوکەتی دڕك دوایی هات.

ایزد: یەزدان  نخوت: غرور    دی: مانگی دەی یەکێکە لە مانگەکانی ساڵنامەی ئێرانی کە پێی دەگوترێت کۆچی هەتاوی و ئەوترێ لەسەر دەمی عومەری خەیامەوە دانراوە، سەرەتای ساڵی کۆچی هەتاوی لە ٢١ / ٣ ساڵی زایینی دایە و هەمان ڕێکەوتی ساڵی کوردی هەیە، لە دوازدە مانگی (ناوی مانگە ئێرانییەکان) پێکدێن.



کە ڕیشەی ئاڤێستاییان هەیە و زۆربەی مانگەکان چەمکی ئایینی لە خۆ دەگرن (باسی زەردەشت و ئاڤێستا و شەرحی ناوی مانگەکان.... ژیار ) باسی شەرحی ناوی مانگەکان ژیار — باسی ئەوەی کە ئێستا ١٣٨٣ یە.

لەم بەیتەشدا خواجە باس لە تێپەڕینی ناخۆشی و هاتنی خۆشی دەکات هاتنی ئەم خۆشییەش بە بەرەکەتی گوڵەوەیە  ئاشکرایە گوڵ هەمیشە لە بەهاردا دێت و بای ساردی مانگی (دەی) دڕکیش هەمیشە لە وەرزی خەزان و سەرمادان، لە شەرحە عیرفانییەکاندا گوڵ بە مورشید و شێخی حافظ لێکدراوەتەوە و گوایە مورشیدی حافظ ناوی (گلرنگ) بووە { شرح عرفانی غزلهای حافظ لاهوری، ج ٢، ل ١٢٢٨} واتای شیعرەکەش دەبێتە: بەبەرەکەتی شێخ سەردەمی ناڕەحەتی و  دووری لە یاری حەق دوایی هات، بەڵام ئەم رایە جگە لە گریمانەیەك هیچی دیکە نییە و لەسەرچاوە باوەڕپێکراوەکاندا جەخت لەسەر ئەوە دەکرێتەوە کە خواجە هیچ مورشید و شێخ و تەنانەت مەزهەب و تەریقەتێکیشی نەبووە و شیعرەکانی خواجەش گەواهی ئەم راستییە ئەدەن.

**٤ — صبح اُمّید که بُد معتکف پردەی غیب**

**گو برون آی که کار شب تار آخر شد**

بڵێ بە سپێدە ئومێد کە لە پەردەی نادیاریدا گۆشەگیر بوو وەرە دەرەوە چونکە کاری شەوی تاریك دوایی هات.

معتکف: گۆشەگیر    بدون ای: وەرە دەرەوە     شب تار: شەوی تاریك

خواجە دەڵێ بە سپێدەی پڕ لە ئومێد بڵێن کە لە گۆشەگیری و نێو پەردەی نادیاری بێتە دەرەوە، چونکە سەردەمی شەوی نائومێدی دوایی هات و ئێستا سەردەمی ئومێدە (هەمان واتای بەیتەکانی پێشووە کە باسی بەسەر چوونی نەهاتی دەکات).

**٥ — آن پریشانی شبهای دراز و غم دل**

**همه درسایەی گیسوی نگار آخر شد**

ئەو پەرێشانییەی شەوانی درێژ و خەمی دڵە هەموو لە سایەی پرچی یاردا دوایی هات.

پریشانی: نیگەرانی، پەرێشانی         سایە: سایە، سێبەر، پەنا

لای خواجە سێبەری پرچی یار مایەی دوایی هاتنی تەواوی نارەحەتی و نیگەرانی و خەمەکانی ڕێبوارە و لێرەدا جەخت لەسەر ئەم راستییە دەکاتەوە و دەڵێ: ئەو نیگەرانییانەی شەوانی درێژی دووری و غوربەت و خەمانەی دڵم هەموویان لەسایەی پرچی یار (ڕەزامەندی ئەودا) دوایی هات.

**٦ — باورم نیست ز بد عهدی ایّام هنوز**

**قصّه‌ی غصّه که در دولت یار آخر شد**

له بێ پەیمانی و هیچ و پوچی ڕۆژگارەوە هێشتا باوەڕ ناکەم کە چیرۆکی خەفەتم لە بەرەکەت و ئیقبالّی یار دوایی هاتووە.

باورم نیست: باوەڕ ناکەم      ایام: ڕۆژگار، دونیا      قصه غصه: چیرۆکی خەفەت، چیرۆکی خەم.

خواجە دیسانەوە گومانی هەمیشەیی خۆی لە دونیا دووبارە دەکاتەوە و هەر ئەترسێ کە ئەو هیچ و پوچ و بێ پەیمانە فێڵێکی لێ بکات و خۆشبەختی بە دەستهاتووی لە دەست بداتەوە. ئیستا کە ناڕەحەتی و چیرۆکی خەفەتی بە بەرەکەتی یار دوایی هاتووە هێشتا هەر دڵەڕاوکێ و ترسی دوایی نایەت و ناتوانێ باوەڕ بەخۆی بهێنێ کە دونیا دەستبەردار بێت و بهێڵێ کە ئەو چیرۆکە دوایی هاتووە، خواجە خۆی دەڵێ: لە بێ پەیمانی و وەعدە خلاف و هیچ و پوچی ڕۆژگارەوەیە کە هێشتا باوەڕ ناکەم بەبەرکەتی یار و وەسڵ و ژوانی یار چیرۆکی خەفەتم دوایی هاتووە.

لەڕاستیدا ئەمە حەقیقەتی کێبەرکێی نێوان دونیا و عاشقانی ڕێگەی حەقە و تا دوا چرکەکانی تەمەن بەردەوام دەبێت و ناکرێ مرۆڤ لەنیوە ڕێگەدا ئیدی لە گەیشتن دڵنیا بێتەوە و پێویستە تاکۆتایی هاتنی تەمەن لە هەوڵ و زۆرانبازیدا بێت لەگەڵ دونیای بێ وەفادا، چونکە ئەو تا دوا چرکە لە کەمیندایە بۆ مرۆڤ بۆ ئەوەی لەناومان بەرێت. ئەم بەردەوامییە لە ئایینـدا بە (استقامت) دراوەتە قەڵەم و خودای گەورەش داوای عیبادەت لە مرۆڤ دەکات تا دوا چرکەی تەمەن کە مەرگە (وا عبد ربك حتى يأتيك اليقين) خواجەش ئەم ڕاستییە دەزانێ کە دونیا دەستبەردار نابێت و هەوڵی خەفەت پێدانی مرۆڤ دەدات بۆیە لەم قۆناغەی وەسڵی ئێستاشیدا هێشتا دڵنیانییە لە دوایی هاتنی چیرۆکی خەفەتی بەدەست دونیاوە.

**٧ — ساقیا لطف نمودی قدحت پُر مِیْ باد**

**که بەتدبیر تو تشویشِ خمار آخر شد**

ئەی ساقی چاکەت کرد، پێکت پڕ لەمەی بێت، چونکە بە تەکبیری تۆ پەرێشانی مەستی دوایی هات.

لطف نمودی: لوتفت کرد، چاکەت کرد      تدبیر: تەکبیر  لەڕاستیدا ئەم وشەیە (تگبیر) هەمان (تدبیر)ە کەیە، بەڵام لە کوردیدا گۆڕانی فۆنۆلۆژی بەسەردا هاتووە و بەواتای ڕێکخستن و ئامۆژگاری و ڕێوشوێنی گونجان دانان بۆ کارێك دێت.      تشویش: پەشێوی



خواجە سوپاسی ساقی دەکات کە ئامۆژگاری و تەگبیرەکانی بوونەتە مایەی ڕێکخستنەوەو نەهێشتنی پەشێوی مەستی.

**٨ — درشمار ارچه  نیاورد کسی حافظ را**

**شکر کآن محنت بی حدّ و شمار آخر شد**

گەر چی کەس حساب بۆ حافظ ناکات (کەس باسی حافظ ناکات) سوپاس بۆ خوا کە ئەو مەینەتە بێ سنوور و بێ شومارە دوایی هات.

نیاورد: ناهێنێ    بی حدوشمار: بێ حەد و حیساب بێ سنوور و بێ شومار.

خواجە گەرچی دۆستان منیان هەر لە بیر نەبوو لەکاتی نارەحەتیدا، بەڵام من شوکری خوا ئەکەم کە ئەو نارەحەتی و مەینەتییە بێ حەد و حیسابە دوایی هات. ئەکرێ (محنت) عیرفانی یاخود مێژوویی بێت.

## غەزەلی شەست و چوارەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی ئەسڵەم**
**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع لن)**

**١- ستارەای بدرخشید و ماه مجلس شد**
**دل رمیدەی ما را رفیق و مونس شد**

ئەستێرەیەك درەوشایەوە و بووە مانگی (گوڵی) مەجلیس و بووە رەفیــق و هــاودەمی دڵــی وێڵی ئێمە.

ستارە: ئەستێرە     بدرخشید: درەوشایەوە     رمیدە: راکردوو، هەڵاتوو، وێڵ.

لە سەرەتای شەرحی ئەم غەزەلەدا پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە ئەم غەزەلە لە ســتایش و مەدحی کەسێکدا نووسراوە و تەواوی سەرچاوەکانیش کــۆکن لەســەر ســتایش ئــامێزی ئــەم غەزەلە، بەڵام لــە کەســی ســتایش کــراودا جیاوازییــان هەیــە، سەرچــاوە مێژووییــەکان بــاس لەوەدەکەن کە ئەم غەزەلە لە ســتایش و مــەدحی شــا شــوجاعدا نووســراوە، بــەڵام سەرچــاوە عیرفانی و ئاینیییەکان ئەوکەسە بە پێغەمبەر ـ د.خ ـ دەدەنە قەڵەم.

بەڵگەی ئەوەی کە ئەم ستایشکراوە شــا شــوجاع بێــت ئەوەیــە کەلــە بەیتەکــەدا ئاوەڵنــاوی (ابوالفوارس)ی دراوەتە پاڵ کە ئەم ئاوەڵناوە بۆ شا شوجاع بەکار دەهات، بەڵام لە بەیتی دووەمدا باسی لــە نەچــوونە مەکتــەب و نەخوێنــدەواری ئــەو زاتــە دەکــات و ئــەم ســیفەتانەش ســیفاتی پێغەمبەرە ـ د.خ ـ. بەهەر حاڵ هەردوو بۆچــوونەکە بەڵگــەی رازیکــەریان بەدەســتەوەیە، بــەڵام لەهەمانکاتدا بەڵگەی رەها و یەکلاکەرەوەشیان پێ نییە بۆ رەتکردنەوەی بۆچوونی بەرامبەر.

خواجە لەوەسفی ئەوزاتەدا دەڵێ: ئەستێرەیەك درەوشایەوە و بووە دەمڕاست و گەورەی کــۆڕ و مەجلیس کەسێك کە وەك ئەستێرە جوان و پرشنگدار بــوو بــووە گــەورەی مــەجلیس و بــووە رەفیق و هاودەمی دڵی وێڵ و هەڵاتووی ئێمەش، واتە ئارامی و خۆشبەختیی بە ئێمە بەخــشی وەك چۆن رەفیق و هاودەم ئارامی بە مرۆڤ دەبەخشێ.

**٢ — نگار من کە بە مکتب نرفت خط ننوشت**
**بە غمزە مسئلە آموز صد مدرّس شد**

یاری من کە نەچووە مەکتــەب و هیــچی نەنووســی (توانــای نووســینی نــەبوو) بەخــەمزە مەسەلەی فێری سەد مامۆستا دەکرد.



مکتب: مەکتەب، قوتابخانە     مسئلە آموز: فێرکەری مەسەلە، حەلکەری مەسەلە
مدرّس: مامۆستا.

مەبەست لە (نگار) کە ستایشکراوەکەیە کە لێرەدا بەڵگەی تــەواو ئەوەیــە کــە زاتــی پێغەمبەر (د.خ) لەسەر بێت، چونکە ئەو نەچووە مەکتەب و نەخوێنــدەوار بــوو، شــا شــوجاع پیاوێکی خوێندەوار و مەکتەبی بوو.

خواجە لێرەدا لە گەورەیی ئەوزاتە ئەدوێ کە لەگــەڵ ئــەوەی نەچــووە مەکتــەب و ئەســڵەن خوێندەواریش نەبوو، کەچی هەر بەتیلەی چاو مەسەلەی بۆ سەد مامۆستای کارامە حەلدەکات و فێری دەکردن، لــە قورئــانی پــیرۆزدا چــەندین جــار ئامــاژە (امــی — نەخوێنــدەوار) بــوونی پێغەمبەر ـ د.خ ـ کراوە وەك: ئایەتی ١٥٧-١٥٨ ی الاعراف لە هەمانکاتدا لە سەرچاوەکاندا ئاماژە بەوە کراوە کە شا شوجاع چووتە قوتابخانە و قوتابییەکی زۆر زیرەك بووە، د. خرمشاهی لە زاری محمود کتبی مێژوونووسی ئال مظفر لە ل ٨١ ی مێژووی ئال مظفر ەوە وەریگرتووە و نووسیویەتی لە بارەوەی شا شوجاع دەڵێ: ((لەتەمەنی حەوت ساڵیدا دەستیکرد بە خوێندن لــە ساڵی ٧٤٢ دا کە نۆ ساڵ بوو قورئانی پیرۆزی لەبەر کرد....)) {خرمشاهی، ج ٢، ل ٨٨٦}.

هەربۆیە بەدڵنیاییەوە ستایشکراوی ئەم بەیتە و رەنگە غەزەلەکەش پێغەمــبەر بێــت نــەوەك شا شوجاع هەرچەندە شا شوجاعیش وەك منداڵانی دیکە زۆر نەچووەتە قوتابخانە !؟

**٣ — بە بوی او دل بیمار عاشقان چو صبا**
**فدای عارض نسرین و چشم نرگس شد**

بە ئومێدی ئەوەوە دڵی بیماری عــاشقان وەك ســروە خــۆی کــردە فیــدای گۆنــای نەســرین و چاوانی نێرگز

(ئەو) حەزرەتی (محمد) ە ـ د.خ ـ کە روخساری وەك گوڵی نەسرین و چاوانی وەك نێرگــز روت و جوانن دڵی بیماری عــاشقانی ئەو حەزرەتــە کــە نەســرین و نێرگــز ـ یــا هــەر جــوانی و گوڵێکی دیکە ئەبینن ـ جوانی ئەویان بــیر دەکەوێتــەوە و وەك ســروە خۆیــان دەکەنــە فیــدا و قوربانی ئەو جوانییانەی کە لە جوانی ئەو زاتە ئەچن.

**٤ — بە صدر مصطبە ام می نشانَد اکنون دوست**
**گدای شهر نگە کن کە میر مجلس شد**

دۆست ئێستا مــن لەســەر تــەخت دادەنیشێ   ســەیری گــەدای شــار بکــە کــە چــۆن بووتــە میری مەجلس.

مصطبه: سەکۆ، تەخت لە زاراوەی عیرفانیدا مەقامی (محبت)ە. میر مجلس: میری مەجلیس جۆرێکە لە لێپرسراوی لە میواندا و یەکێکە لە پلەوپایەکانی سەردەمی دەربارەی سەلجۆقییەکان، سەرۆکی دیوانی تەشریفات و میوانداری و لەو جۆرەیە، یا خود سەرۆکی دەستەی رازاندنەوەی سفرە و خوان و مێز و دانانی شەراب، ساقی.

خواجە گەدا و سواڵکەری شار بەخۆی دەڵێت و دەڵێ لە سایەی دۆستی (ستایشکراوە وە) ئێستا منی سواڵکەری شارا لەسەر سەکۆ و تەختی میری مەجلیس دانیشتووم و بوومەتە میری مەجلیس یا خود لەڕووی عیرفانییەوە: لە سایەی دۆستەوە ئێستا من لە مەقامی محبەت دام و زۆر جیاوازم لە رابردووی خۆم وەك: حەزرەتی عومەر دەیفەرموو: (کنا اذلاْء فاعزنا الله بالإسلام).

**٥ - طرب سرای محبت کنون شود معمور**

**که طاق ابروی یار منش مهندس شد**

ئێستا ئیدی تەرە بەسەرای خۆشەویستی ئاوەدان ئەبێتەوە چونکە تاقی برۆی یار بۆتە ئەندازیاری .

طرب سرا: ماڵی شادی و خۆشی.

طرب سراب محبت: لانەی شادی خۆشەویستی درکەیە لە دڵی عاشق.

کاتێ برۆی یار ئەبێتە ئاوەدانکەرەوەی دڵەکان ئیدی خواجە دڵنیایە کە دڵی ئەمیش کە لانەی عەشق و موحیببەتە ئاوەدان دەبێتەوە.

یار لەم بەیتەدا ئەکرێ خودی زاتی حەق بێت و عەشقی ئەو یاخود شاە شوجاع یا پێغەمبەر ـ د.خ ـ خواجە دەڵێ: مادام تاقی برۆی یار بووەتە ئەندازیاری ئاوەدانکەرەوەی دڵان و تیلەیەکی چاوی تێبڕیون ئیدی دڵی پڕ عەشقی من بەو تیلەی چاوە ئاوەدان ئەبێتەوە.

**٦ — لب از ترشح می پاک کن برای خدا**

**که خاطرم به هزاران گنه مُوَسوس شد**

لە رای خوا لێوم لە مەی پاککەرەوە، چونکە خەیاڵ و بیرم وەسوەسەی هەزاران گوناە دەکات.

موسوس شد: وەس وەسە دەکات، تووشی وەسوەسە دەبێت.

ئەکرێ (ترشح می) لێرەدا بە واتای خۆشەویستی خود و خۆشەویستی بێت، خواجە داوا لە یار دەکات کە لەم خۆویستییە پاکم کەرەوە، چونکە ئەبێتە مایەی وەسوەسەی هەزاران گوناە، بەم پێیە بێت خواجە خۆویستی بە هۆکاری وەسوەسەی گوناە دەزانێت خۆ لە خود داماڵین



بەرێگەی رزگار بوون لەم گوناە و وەسوەسانە دەزانێت بۆیە داوا دەکات یار ئەم خودپەسەندییەی لێ داماڵێت.

**٧ — کرشمەی تو شرابی بە عارفان پیمود**

**که علم بیخبر افتاد و عقل بیحس شد**

ناز و خەمزەی تۆ شەرابێکی بە عارفان نۆشی کە زانست بێ خەبەر و عەقڵ بێ ئاگابوو.

شراب پیمودن: شەراب نۆشین، شەراب پێ نۆشین    بیحس: بێ ئاگا

ناز و خەمزەی چاوانی یار کە جلیوەی یارە وا عارفانی مەست کرد و شەرابی پێ نۆشکردن کە بێ عیلم و عەقڵ بوون و هەردووکیانیان لە دەستدا. یا خود لەواتایەکی بەرزتری عیرفانیدا عەشقی جیلوەی تۆ هێندە بەرزە کاتێ عاشقان بەو ئاستە دەگەن ئیدی عیلم و عەقڵ بێ ئاگا دەبن و توانای ئەو جیلوە و مەستییەی عەشقیان نامێنێ.

**٨ — خیال آب خضر بست و جام سکندر**

**بەجرعە نوشی سلطان ابوالفوارس شد**

خەیاڵی ئاوی خدری دەکرد و پێکەکەی ئەسکەندەر بۆیە بووە پێکنۆشی مەجلیسی سوڵتان ابوالفوارس.

خیال بست: خەیاڵی کرد، تەمەننای کرد، خوازیاری بوو.

آب خضر: ئاوی خدر، ئاوی حەیات، ئاوی نەمری.

جام سکندر: پێکی ئەسکەندەر، ئەو پێکەی کە نهێنییەکانی تێدا دەردەکەوت.

جرعە نوش: پێکنۆش

ابوالفوارس: نازناوی شا شوجاعە، ئازای ئازایان، شاسوار.

ئەم بەیتە ئاماژەیەکی دیار و دەستنیشانکراوە بۆ ستایشی شا شوجاع، چونکە (ابوالفوارس) نازناوێکی زۆر بەرچاو و دیاری ئەو پادشایەیە. ئەم ئاماژەیە لە شرۆڤە عیرافانییەکانیشدا باسکراوە، بەڵام گومانی ئەوەش کراوە کە ئەکرێ ئەم نازناوە بۆ زاتی پێغەمبەریش ـ د.خ ـ بەکار بهێنرێت.

خواجە لەم بەیتەدا باس لەوە دەکات کە ئەو — خودی شاعیر — بە هیوای بەدەستهێنانی ئاوی حەیات و پێکی نهێنی دیارخەری ئەسکەندەر بوو، بۆیە چووە کۆڕی بادەنۆشی سوڵتان (ابوالفوارس)ەوە واتە کۆڕی بادەنۆشی سوڵتان هێندە مەزنە دەبێتە مایەی بەدەستهێنانی ئاوی حەیات و جامی ئەسکەندەر ـ کە ئەم دوو سیفەتەی دوایی لە سیفەتی کۆڕی عاشقانە عارفانەکانە.

**٩ — چو زر عزیزْ وجوداست نظم من آری**

**قبول دولتیان کیمیای این مس شد**

شیعری من وەك زێڕ بەرز و بەهادارە، ئەرێ ڕەزامەندی خاوەن بەختان بووە کیمیای ئەم مسە.

زر: زێڕ      عزیز وجود: بەڕێز و بەهادار، خۆشەویستی دڵان، جێگەی پەسەندی هەمووان.

نظم: شیعر

دولتیان: خاوەن بەختان، بەخت یاران   کیمیا: کیمیا  ئەو ماددەییەی کە مس ئەکاتە زێڕ

مس: مس درکەیە لە شیعری خۆی.

خواجە دان بەوەدادەنێت کە شیعرەکانی ئەم ئێستا لای هەموو کەسێك وەك زێڕ بەهادار و سەرنجڕاکێشی و ئەم شیعرانەش لە ئەسڵدا وەك مس بوون. هۆی بوونە زێڕی ئەم شیعرانە ئەوە بووە کە یارانی بەختیار خاوەن طالع و بەختی چاك ڕەزامەندییان لەسەر نواندووە و بەدڵیان بووە، ئەم بە دڵ بوونە بووتە کیمیا و مسی شیعرەکانی خواجەی بە زێڕ گۆڕیوە.

بەگشتی خواجە چاکی و بەهاداری شیعرەکانی بۆ ڕەزامەندی پاکان و چاکان دەگێڕێتەوە .

لە هەندێ نوسخەدا لەبری دولتیان ـ دولت او ـ هاتووە و لێرەدا ڕەزامەندی چاکان لە ڕەزامەندی ئەودا قەتیس کراوەتەوە کە (ئەو)یش بە پێی بەیتەکانی پێشوو یا خودی حەزرەتی ـ د.خ ـ یا شا شوجاع.

**١٠ — ز راه میکده یاران عنان بگردانید**

**چرا که حافظ ازین راه رفت و مفلس شد**

یاران روو لە ڕێگەی مەیخانە وەرگێڕن، چونکە حافظ بەم ڕێگەیەدا ڕۆیشت و موفلیس بوو.

عنان: هەوسار، ڕەشۆ    بگردانید: وەرگێڕان

خواجە عەشق و دونیای عەشق بەو دونیایە ئەداتە قەڵەم کە جگە لە عەشق هیچی دیکەی تێدا نییە و مرۆڤ گەر بە ئومێدی دەستکەوتی دونیایی و دوارۆژی (بەهەشت و نیعمەتەکانی) بڕواتە نێو دونیای عەشقەوە کارێکی بێ ئەنجام دەکات، چونکە عارفەکان عەشق بە سووتان و بە قومارێکی (مەولانا) دۆڕاو و لە دەستدانی دارونەدار دەزانن. بۆیە خواجە ئەڵێ ئەی ئەو دۆستانەی کە حەزتان لە دەستکەوتە و بە هیوای ئەوەن بڕۆنە مەیخانەی عەشقەوە تا دەستکەوتی دونیایی و دوارۆژیتان دەستکەوێت هەوساری ئەسپەکانتان ڕاکێشن و بگەڕێنەوە، چونکە عەشق هەموو شتەکانتان لێ دەسەنێتەوە و موفلیستان دەکات و حافظ ئەزموونی هەیە و بەم ڕێگەیەدا ڕۆیشتووە و موفلیس بووە.



لەڕاستیدا ئەم بەیتە زەنگی ئاگادار کردنەوەیە بۆ ئەو کەسانەی کە دەیانەوێ بۆ خاتری دەستکەوت عاشق بن و ئامادەیی خۆ ونکردن و خۆ دانەدەست و سووتانیان تێدانییە.

سەعدی گوتەنی: اگر از دوست چشمت برنعمت دوست — گەر چاوت لە نیعمەتی دۆستە

تو دربند خویشی نه دربند دوست — تۆ بەخەمی خۆتەوەی نەلەخەمی دۆستدا.

## غەزەلی سەد و شەست و پێنجەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی مەحزوف**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلن)**

**١ — گداخت جان که شود کار دل تمام و نشد**

**بسوختیم درین آرزوی خام و نشد**

گیان توایەوە تا کاری (موراد) دڵ بێتــە بەرهــەم و نــەهات، لــەم ئــارەزووە ناپوختەیــەدا سووتاین و بەدی نەهات.

گداخت: توایەوە، بووە ئاو شود کار دل تمام: بە ئاوات گەیشتنی دڵ نشد: نەبوو

خواجە لەم غەزەلەدا بەگشتی بــاس لــە هــەوڵی زۆری دڵ یــا خــۆی دەکــات کــە بــە هــیچ مەبەستێك ناگات و بەرهەمی نابێت. لێرەدا دەڵێــت: گیــان هێنــدە رەنــج و مەینــەتی کێــشا توایەوە و بوو بە ئاو، کەچی بەمەبەستی بە ئاوات گەیشتنی دڵ و هاتنەدیی موارد.

دڵ هەر بە ئاوات نەگەیشت، ئێمە سووتاین لەم ئارەزووە ناپوختــە و کاڵــەدا — بــە ئــاوات گەیشتنی دڵ — و کە چی بە دی نەهات.

لاهــوری لەشــەرحە عیرافانییەکــەدا (کــار دل) {مەعریفــەی شــهودی عــەیانی، ج ٢، ل١٤٩٠}یە ئەم مەعریفەش بە عەقڵکاری و استدلال دێتەدی، کە ئــەم جــۆرە بۆچــوونەش لای عارفەکان ناپەسەندە. واتــە گیــان توایــەوە تــا لەرێگــەی ئیــستیدلالەوە بــەموراد بگــات کــە نەگەیشت و ئەم روانگەیەش بە ئارەزووی خاو ناکامڵ ئەداتە قەڵەم.

**٢ — فغان که در طلب گنجْ نامەی مقصود**

**شدم خرابِ جهانی ز غم تمام و نشد**

ئەفسوس کەلە هەوڵی بەدەستهێنانی گەنجنامەی مــوارد دا هێنــدەم خــەم خــوارد ریــسوای عالەم بووم و کەچی پەیدام نەکرد.

در طلب: لە هەوڵی بەدەستهێنانی.

گنج نامە: گەنج نامە، ئەو پارچە کاغەزەی یــا هەرشــتێ کــە پــاش شــاردنەوەی گــەنج و گەوهەرەکانی رێوشوێنی دۆزینەوەی خەزێنەی تێدا دەنووسرا و یاخود نیشانە دەکــرا، رێنمــایی دۆزینەوەی خەزێنە.

مقصود: موارد، ئاوات خراب جهانی: ریسوای عالەم



جاران خەزێنە و گەنجیان لە وێرانەکاندا دەشاردەوە لــە شــتێکدا ئاماژەیــەکیان دادەنــا بــۆ ئەوەی کاتی هەڵگرتنەوە رێ بەرنەوە سەر شوێنەکەی، بێگومان بەبێ ئەم گەنجنامەیە گەڕان بە دوای خەزێنەدا کــارێکی بێهودەیــە و تاڕادەیــەك ریــسواییە. خواجــە ئەفــسوس ئــەخوات کــە بەداخەوە من هێندە بــە دوای بەدەســتهێنانی ئــەو نیــشانەیەی شــوێنی خەزێنــەی (مــوراد — مەقصود)دا گەڕام لە غەمدا ریسوای عالەم بووم و کەچی دەستیشم نەکەوت و پەیدام نەکرد.

**٣ — دریغ و درد که در جست و جوی گنج حضور**

**بسی شدم به گدائی بر کِرام و نشد**

درێغ و دەرد کە لە هەوڵی بەدەستهێنانی گەنجی حزووردا زۆر بەگەدایی چوومە بــەردەرگای گەروەکان و دەستم نەکەوت.

درجستوجوی/ در طلب: لە هەوڵی بەدەستهێنانی کــرام: کــۆی کــەریم، گەورە و بەخشتندەکان.

خواجە لێرەدا دەڵێ درێغ دەرد بۆ بەدەستهێنانی خەزێنەی حزوور کە ئامادەیی قەلبییە لای مەعشوقی حەق و دڵ کەندن و دەست شوشتنە لە دونیا و ماددییات وەك سواڵکەر لە دەرگــای زۆرێك لە گەورە و بەخشندەکانم داوە، بەڵام لای ئەوانیش دەستم نەکوتووە.

لە لێکدانەوە (حضور) دا کە وازهێنانە لە دونیا و زەرق و بریقــەکانی وا دەردەکــەوێت کــە خواجە ستایشی ئەم زاراوەیە بکــات و ئەســەف بــۆ بەدەســت نــەهێنانی بخــوات و (کــرام)یــش گەورەکانی تەریقەت بداتە قەڵەم. بەڵام لاهور ئەم بەیتە بەو شێوەیە لێکدەداتــەوە کــە دریــغ و دەرد بۆ بەدەستهێنانی گــەنجی حــزوور لەرێگــەی عەقڵــەوە لــە دەرگــای زۆرێــك لــە گــەورە و ناودارەکانی دونیای عەقڵم دا، بەڵام بێ بەرهەم بوو.

**٤ — به لابه گفت شبی میر مجلس تو شوم**

**شدم بەرغبت خویشش کمین غلام و نشد**

بە زمانلووسی وتی شەوێك ئەبمە میری مەجلیسی تۆ بە ئارەزووی خۆم بو کەمترین غوڵام و نەهات / نەبوو.

لابە: زمانلوسی، فریو، پاڕانەوە کمین: کەمترین، بچووکترین.

یار بەناز و زمانلوسی خۆیەوە گوتی شەوێك دێم و دەبمە میری مەجلیسی تۆ من لە خۆشــی ئەم پەیمانەی ئەوەوە بە ویست و ئیرادەی خۆم بوومە کەمترین و بچووکترین غوڵام و نۆکــەری و کەچی پەیمانەکەی نەبردە سەر و نەهات.

(لابه) دوومانای جیاواز له یەکتری هەیە کە جگە لە زمانلووسی (پاڕانەوە)یە واتە بە پاڕانەوە و داواکردن گوتی شەوێ ئەبمە میری مەجلیست.

**۵ — پیام داد که خواهم نشست با رندان**

**بشد به رندی و دردی کشیم نام و نشد**

هەواڵی نارد (ئاگاداری کردینەوە) لەگەڵ رەنداندا دادەنیشم (دەبمە هاودەم)، ئێمە بەرەندی بادەنۆشی ناوبانگمان دەرکرد و کەچی ئەونەهات.

پەیام داد: هەواڵی نارد، ئاگاداری کردنەوە    دردی کشی: بادەنۆشی

خواجە دەڵێ یار هەواڵی نارد کە لەگەڵ رەندانی بادەنۆشدا دەبمە هاودەم ئێمە لە خۆشی ئەم هەواڵەوە بووینە رەند و بادەنۆش و تا ئەو سنوورەی کە ناوبانگمان بە رەندی و بادەنۆشی دەرکرد کەچی یار نەهات و لە قسەی خۆی پەشیمان بووەوە.

**٦ — رواست در بر اگر میطپد کبوتر دل**

**که دید در ره خود تاب و پیچ دام و نشد**

رەوایە گەر کۆتری دڵ بێ ئارام و بێ قەرارە، چونکە لە ڕێگەی خۆیدا ئەڵقەی داوی بینی و نەڕۆیشت.

رواست: رەوایە، شایانە    میطپد: نیگەرانە    تاب و پێچ دام: ئەڵقەی داو

خواجە دڵی خۆی بە کۆتر ئەداتە قەڵەم و ئەم کۆتری دڵە ئەڵقە و پێچ و لوولی زوڵفی یاری بینیوە و خۆی نەخستۆتە نێو ئەڵقەی پرچی یارەوە و لە عەشقی ئەو خۆی شاردۆتەوە و ئێستا لە قەفەسی سینەدا نێگەرانە، بۆیە ئێستا شایانیەتی و رەوایە کە ئێستا نیگەرانە و لێدەدات.

**۷ — درآن هوس که بەمستی ببوسم آن لب لعل**

**چە خون که در دلم افتاد همچو جام و نشد**

بەو ئارەزووەی کە بەمەستی ئەو لێوە یاقوتینە ماچکەم وەك پێك چەندێك خوێن کەواتە (رژایە) دڵم و کەچی نەشبوو.

درآن هوس: بە ئارەزووی، بەو ئومێدەی.

خوێن رژانە دڵ وەك پێك جگە لە مانا سەرزارەکییەکەی بە واتای نارەحەتی و نیگەرانی.

خواجە دەڵێ: بە ئومێدی ئەوەی کە بەڵکو بەلیقای یار بگەم و لە لێوی یاقوتی بەهرەمەندببم چەندە نیگەران بووم و زەحمەتم کێشا کەچی بۆم مەیسەر نەبوو.

لەڕاستیدا بۆچوونێکی عیرفانی لەم غەزەلەدا جەختی لەسەر کراوەتەوە کە ئەویش سەرکەوتوو نەبوونی مرۆڤە لە تەی کردنی قۆناغەکانی عیرفان و گەیشتن بەحەقیقەتدا بەبێ



ڕێنمایی و یارمەتی کەسێك لەم بەیتانەی پێشوودا خواجە جەخت لەوە دەکاتەوە کە من بەتەنیا هەوڵی بەدەستهێنانی ئەم گەنجەم داوە و سەرکەوتوو نەبووم، بۆیە کرۆك و گەوهەری بیرەکەی لەم بەیتەی داهاتوودا دەخاتەڕوو.

**۸ — به کوی عشق منه بی دلیل راه قدم**

**که من به خویش نمودم صد اهتمام و نشد**

بێ دەلیل (رابەر) پێ مەخە کۆڵانی عەشق، چونکە من لەلایەن خۆمەوە هەوڵمداوە کەچی سەکەوتوو نەبووم.

منە: مەنێ، مەخە    دلیل: رابەر، پێشەوا    قدم: پێ

بەخویش: خۆم، لەلایەن خۆمەوە    اهتمام: هەوڵ، کۆشش

خواجە ڕێنمایی ڕێبواران و ئەو کەسانە دەکات کە دەیانەوێت لەڕێگەی عەقڵەوە بە مەعشوق بگەن و دەڵێ من لەم ڕێگەوە — بەهاوکاری عەقڵ — هەوڵی زۆرم دا و نەمتوانی بگەمە مەبەست و ڕێگەی عەشقی ئیلاهی بەبێ هاوکاری رابەر و دەلیل نابێت و کاری عەقڵ نییە هەربۆیە تۆ بەبێ دەلیل و رابەر پێ مەخەرە نێو کۆڵانی عەشقەوە، چونکە شکست دەهێنی.

**۹ — هزار حیله برانگیخت حافظ از سر فکر**

**در آن هوس که شود آن نگار رام و نشد**

حافظ بە ئومێدی ئەوەی کە ئەو یارە رام بکات لەڕووی هزرەوە هەزار فڕوفێڵی دروستکرد و کەچی نەیتوانی و سەرکەوتوو نەبوو.

برانگیخت: دروستیکرد، سازیکرد.

لە ڕێگەی فکر و عەقڵەوە هەرگیز عاشق بەنیگار(مەعشوق) ناگات خواجە ئەم ڕاستییە دەڵێت: دەڵێ من لە ڕێگەی فکرەوە هەزار فڕوفێڵم دروستکرد تابەڵکو یار والێ بکەم رام ببێت کەچی سەرکەوتوو نەبووم.

بەگشتی غەزەلەکە باس لە رەتکردنەوەی عەقڵ دەکات لەمەسەلە عیرفانییەکان و عەقڵ بەڕێگەیەکی ناتەواو بن بەست دەزانێت بۆ گەیشتنە مەعشوق و دواجار جگە لە ریسوایی و نیگەرانی و عەزاب کێشان و بێ ئاکامی و گەدایی و... هتد هیچی دیکە نابێتە بەشی تاقیکەرەوانی.

## غەزەلی سەد و شەست و شەشەم:

### بەحری رەمەلی هەشتی مەحزوف
### (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)

**١ — یاری اندرکس نمی بینم یاران را چە شد**

**دوستی کی آخر آمد دوستداران را چە شد**

دۆستایەتی (هاودەردی) لەکەسدا نابینم یاران چییان لێهات، دۆستی کـەی کۆتـایی هـات دۆستان چییان لێهات.

یار: دۆستایەتی، هاوخەمی و هاودەردی     چەشد: چییان بەسەرهات، چوونە کوێ.

ئەم غەزەلەی خواجە باس لە نەمانی رێـورەسمی خۆشەویـستی و ونبـوونی خۆشەویـستی و خۆشەویستان دەکات، ئەم غەزەلە پاش بەسەر چوونی سەردەمێکی گـەش و پـڕ لـە دۆسـتی و هاوخەمی نووسراوە، کە رەخنەگر و راڤەکاران پێیان وایە ڕەنگە لە سەردەمی شێخ ابو ئیسحاق بدوێت، یاخود وەك لە شەرحە عیرفانییەکاندا هاتووە لەسـەردەمی یـارانی پێغەمبـەر بـدوێت. هەرچۆن بێت غەزەلەکە ئەسەفێکی قووڵە بۆسەردەمێکی بەسەرچوو کە پڕ بـووە لـە تـەبایی و خۆشەویستی.

خواجە دەڵێ: یاری و دۆستایەتی لەکەسدا بە دی ناکەم ئاخۆ چـی بەسـەر یـاران هـاتووە و یاران بۆ کوێ رۆیشتوون، دۆستایەتی کەی کۆتایی هاتووە و چی بەسەر دۆستاندا هاتووە.

**٢ — آب حیوان تیرەگون شد خضر فرّخ پی کجاست**

**گل بگشت از رنگ خود باد بهاران را چە شد**

ئاوی حەیات لێڵ بوو، خدری قەدەم موبارەك لە کوێیە، گوڵ رەنگی خۆی لـە دەسـتدا بـای بەهاران چی لێهات.

آب حیوان: ئاوی حەیات،     تیرە گون: رەش، لێڵ     فرّخ پی: قەدەم موبارەك.

بگشت از رنگ خود: رەنگی خۆی لەدەستدا، کاڵبووەوە.

بـەگوێرەی ئەفـسانە ئایینییــەکان ئـاوی حـەیات کـە ئـاوی نەمرییــە و زوڵاڵ و پاکــە و سەرچاوەکەی لە تاریکییەوەیە، تەنیا خدری زیندە (خضر) ئـەزانێ سەرچـاوەکەی لەکوێدایـە و لای ئەو دەستدەکەوێت، خواجە بە پشت بەستن بەم ئەفسانە ئاینییـە دەڵێـت: ئـاوی حـەیات و نەمری لێڵ بووە، خدری پیێ و قەدەم موبـارەك لەکوێیـە تـا چارەسـەری بکـات بۆمـان، گـوڵ لەئەنجامی بێ میهری و زوڵمی رۆژگارەوە کاڵبۆتەوە و رەنگی خۆی لەدەستداوە، بـای بـەهاران چی لێهات تاوەکو بە شنەی خۆی رەنگی ئاڵ بە گوڵ بداتەوە.

تەواوی وشەکانی بەیتەکە درکەن لە واتای دیکەی کۆمەڵایەتی، یـا کۆمەڵایـەتی عیرفـانی (پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی عارفان) و باس لە ونبوونی بەها جوانەکان دەکەن.

**٣ — کسی نمی گوید کە یاری داشت حقّ دوستی**

**حق شناسان را چە حال افتاد، یاران را چە شد**

کەس ناڵێت دۆستایەتی حەقی خۆشەویستی و موحیبەتی هەبوو، حەق ناسان چیان بەسـەر هات و یاران چییان لێهات.

داشت: هەیبوو     حەق شناسان: حەق ناسان     چە حال افتاد: چ حاڵێکیان بەسەر هـات، کەوتنە چ حاڵێکەوە.

لەســەردەمە جۆراوجۆرەکانــدا هاوخــەمی و دۆســتایەتی، بــەردەوام بەهایــەکی بــەرزی کۆمەڵایــەتی و ئــایینی بــووە، بــەڵام بــەهۆی مادیــاتی دونیــا و ســەرقاڵ بــوونی مــرۆڤ بــە بەرژەوندییەکانیەوە رۆژ بەرۆژ ئەم بەهایە بەرەو لەناوچوون و توانەوە رۆیشتووە و دەڕوات.

خواجە لەکاتیکدا ئەم گرنگییە دەزانێت دەڵێت: کەس ناڵێت هاوخەمی و دۆسـتایەتی وەك بەهایەك مافی ئەوەی هەبوو کە خۆشمان بوێت، ئەم بەهایە بەتـەواوی پـشتگوێ خـراوە، بڵێـی حەق ناسان چییان بەسەر هاتبێت ئـاوا کـەس باسـی دۆسـتایەتی ناکـات و یـاران چـییان لـێ قەومابێت. لێرەدا خواجە کاڵ بوونەوەی دۆستایەتی بۆ نەمانی یارانی حەق ناس دەگێڕێتەوە.

**٤ — شَهْرِ یاران بود و خاك مهربانان این دیار**

**مهربانی کی سر آمد شَهْریاران را چە شد**

ئەم دیارە شاری یاران و خاکی میهرەبانان بوو، میهرەبانی کەی کۆتایی هاتووە، شەهریاران چییان لێهات.

دیار: دیار، سەرزەوی، شوێن،   سرآمد: کۆتایی هات، دوایی هات،   شهریاران: پادشایان.

خواجە باسی دیاری خۆی (یاخود دیاری ئیسلام) دەکات و دەڵێت: ئـەم دیـارە سـەردەمێ یاران و میهرەبان و خۆشەویستانی تێدا دەژیا بەڵام ئێستا ئەوانەی تێدانەماوە، میهرەبانی کەی دوایی هاتو و پادشا بەرێزەکانی ئەم دیارە چییان لێهات.

(شهریاران)ی یەکەم و (شهریاران)ی دووەم. بە پێی رەنووسی فارسی (هاو پیـت)ن و رەگـەز دۆزی یـاران لەنێواندایـە بـەڵام بـە پێـی رەنووسـی کـوردی لێکـدی جـودا دەبنـەوە چـونکە

(شەھریاران)ی یەکەم (شەھری یاران)ە و دووەم یان (شەھریاران = پادشایان)ە و رەگەز دۆزی ناتەواویان لەنێواندا هەیە.

**٥ — لعلی ازکان مروّت برنیامد سالهاست**
**تابش خورشید و سعی باد و باران را چه شد**

سالّهایە یاقوتێك لەکانی مەردایەتی (پیاوەتی) دەرنەهاتووە، رووناکی خۆر و کاریگەری با و باران چییان لێهات.

کان: کان    مروت: مەردایەتی، پیاوەتی    برنیامد: دەرنەهات، نەهاتە بەرهەم
سالهاست: سالاّنێکە، سالّهایە    تابش: تیشك، رووناکی    سعی: هەولّ لێرەدا بەواتای کاریگەری هاتووە.

بەڕای پێشینەکان (لەعل / یاقوت = بەردی گرانبەها) بەهۆی کاریگەری تیشك و خۆر و با و باران و گۆڕانە سروشتییەکانەوە دروستدەبوو. واتە هەمان بەردی ئاسایی لەژێر کاریگەری بارودۆخێکی سروشتی گونجاودا بە یاقوت دەگۆڕان.

خواجە دەڵێ: سالّهایە لە کانی پیاوەتی و مەردایەتیدا یاقوتێك دەرنەهێنراوە — کۆمەڵگە پیاوی بەرهەم نەهێناوە — رووناکی خۆر و کاریگەری با و باران چییان بەسەر هاتووە.

مەهدی معینیان رووناکی خۆری بە (مەعریفە) و کاریگەری با و بارانی بە (رەحمەت) لێکداوەتەوە {معینیان، ل ٢٨٧}.

**٦ — گوی توفیق و کرامت در میان افکندەاند**
**کس بە میدان در نمی آید سواران را چە شد**

گۆی تۆفیق و کەرامەتیان لە مەیداندا داناوە، کەس نایەتە مەیدانەوە سواران چییان لێهاتووە.

گوی: گۆی    توفیق و کرامت: سەرکەوتن و گەورەیی.

افکندە اند: داناوە، بەجێی هێشتووە لە یاری گۆ و مەیداندا، گۆ لە مەیداندایە و سوارەکان بە چەوگەنایان هەولّی بردنی ئەدەن، بەلاّم ئێستا گۆی سەرکەوتن و کەرامەت و گەورەییان لەمەیدانی ژیاندا داناوە کەچی کەس نایەتە مەیدانەوە بیبات — لەترسا یاخود لەبەر بێ بەهابوونی ئەو بەهاجوانانە — سواران چییان بەسەر هاتووە.

خواجە لەم بەیتەدا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە لە مەیدانی ژیانی ئێستادا کەس لە هەولّی بردنی گۆی تۆفیق و پیاوەتیدا نییە و خەڵك نایەتە مەیدانی کێبەرکێوە لە سەر بەهاجوانە کۆمەڵایەتی و مرۆییەکان، سواران چییان بەسەرهاتووە .



**٧ — صد هزاران گل شکفت و بانگ مرغی برنخاست**
**عندلیبان را چە پیش آمد هزاران را چە شد**

سەد هەزار گولّ پشکوت و سەدای باڵندەیك نەهاتە گوێ، عەندەلیبان چییان بەسەر هات و هەزاران چوونە کوێ.

برنخاست: بەرز نەبوویەوە    عندلیب: بولبول    هەزار: باڵندەیکی بچووکە کە لاسایی دەنگی بولبول دەکاتەوە، یان دەنگی باڵندەکانی دیکە، بولبول (هەزاردستان)یشی پێ دەگوترێت.

لەنێوان (هەزاران)ی یەکەم و (هەزاران)ی دووەمدا رەگەز دۆزی تەواو هەیە، چونکە (هزار) بەواتای هەزار و بولبول یا لاسایی کەرەوەی بولبولیش دێت.

خواجە بەزمانی سیمبولیك دەڵێت هەل و مەرجی زۆرهاتنە ئارا کەچی کەس سوودی لێوەرنەگرت، تەنانەت سەد هەزاران — ژمارەیەکی زۆر زۆر — گولّ پشکوتن (فرسەت هاتنە ئارا) کەچی سەدا و دەنگی باڵندەیەك بەرز نەبووەوە و نەهاتنە گوێ (کەس سوودی لێوەرنەگرتن و بەدەمیانەوە نەچوون) بولبولان و هەزاردستانەکان چییان بەسەر هات.

واتە: زەمینە لەبار بوو بۆ ئەوەی بەها جوانەکان بەدەست بهێنینەوە کەچی کەس خۆی ناکاتە خاوەنیان.

**٨ — زهرە سازی خوش نمی سازد مگر عودش بسوخت**
**کس ندارد ذوق مستی میگساران را چە شد**

زۆهرە سازی خۆش لێنادات ئەڵێی عودەکەی سووتاوە کەس زەوقی مەستیی نییە، بادەنۆشان چییان بەسەر هات.

زهرە: ئەستێرەی زوهرە کە بە ئاواز ژەنەی گەردوون ناسراوە، خواوەندی بەزم و مۆسیقا
ساز: ساز    نمی سازد: ناژەنێت، لێ نادات    عود: عود    میگساران: بادەنۆشان

عود سووتاندن رەسمێك بووە کە مۆسیقاژەن و گۆرانیبێژان لەکاتی تۆبەکردندا ئەنجامیان داوە. خواجە دەڵێ تەنانەت ناهید- زوهرەش کە خواوەندی مۆسیقاو ئاوازژەنی گەردوونە ساز لێ نادات ئەڵێی تۆبەی کردووە عودەی سوتاندووە، کەس زەوقی مەستی و عەشقی نەماوە بادەنۆشان عاشقانی حەق چییان لێهات.

گەر بەیتەکانی دیکە لە گیرۆدە بوونی کۆمەڵگە دوابن و باسیان لە ونبوونی بەها کۆمەڵایەتی و مرۆییەکان کردبێت، ئەم دوو بەیتەی دوایی زیاتر لە گیرۆدە بوونی عاشقان و ونبوونی چێژ و زەوقی عارفەکان دەکات.

لاهوری لە شەرحەکەیدا (زوهرە)ی بە مورشید و پیرەکانی تەریقەت داوەتە قەڵـەم و دەڵـێ ئەوانیش لە ئیرشاد کەوتوون و ئەڵێی زمانیان سووتاوە و کەس زەوقی مەستی و تەریقەتی نییە بادەنۆشانی راستەقینە چییان لێهات.

لەم سەردەمەدا کە خواجە باسی لێوە دەکات نەوەك هەر بـەها کۆمەڵایـەتی و مرۆییـەکان بەڵکو بەها عیرفانییەکانیش دوچاری ئافەت و بەڵا هاتوون.

**٩ — حافظ اسرار الهی کس نمی داند خموش**

**از که می پرسی که دور روزگاران را چه شد**

حـافظ کەس ئەسراری ئیلاهی نازانێت بێ دەنگ بە، لە کێ ئەپرسی لە دەوری رۆژگاران چی لێهات.

خواجە پێی وایە کە دەوری زەمانـە و پێـشهات و رووداوەکـان دەچـێتە خانـەی ئەسـراری ئیلاهییەوە، کەس نازانێت چۆن و بۆچی بەو شێوەی بووە و دەبێت. بۆیـە ئـەم راسـتییە دەڵـێ بەخۆشی دەڵێت کەس ئەسراری ئیلاهی نازانێت بێ دەنگ بە و قسە مەکە تۆ لە دەوری رۆژگار لە کێ ئەپرسی، چونکە کەس نایزانێت.



## غەزەلی سەدو شەست و حەوتەم:

**بەحری مەنسوخی هەشتی مەتوی مەوقوفی مەکشوف**

**مفتعلن فاعلان مفتعلن فاعلن**

**١ — زاهدِ خلوت نشین دوش به میخانه شد**

**از سرِ پیمان برفت با سرِ پیمانه شد**

زاهیدی خەلوەت نشین دوێنێ شەو رۆیشت بۆ مەیخانـە، پەیمانەکـەی شـکاند و رووی کـردە پێکی شەراب.

از سر پیمان برفت: پەیمانی شکاند، لەسەر پەیمانەکەی نەمایەوە    با: لێرەدا بـە واتـای (بر) هاتووە پەیمانە: پێك

لە زۆرێك لە نوسخەکانی دیوانی (حافظ) دا ئەم غەزەلە بە (حافظ) دەستپێدەکات و لەبری (زاهد)(حافظ) هاتووە، بەڵام لە نووسخەی (قزوینـی/ غنـی) دا (زاهـد) هـاتووە لـە هەنـدێ نوسخەشدا (حافظ مسجد نـشین) یـا (واعـظ مسجدنـشین) هـاتووە. بەهـەرحاڵ واتاکـان زۆر لێکدییەوە دوور نین بەڵام گەر (حافظ) تەخەلوصی خودی شاعیر بێت، هەرگیز غەزەلی خواجـە بە تەخەلوصی خۆی هەستی پێ نەکردووە گەر (حافظ قورئان) یش بێت ئەوا ئـەم بەکارهێنانـە لای خواجە زۆر بەکەمی بەکار هاتووە پەیوەندییەکی تۆکمەی لەگەڵ خـەڵوەت نـشینیدا نییـە. بۆیە (زاهد) کە رەمزی دینـداری شـەریعەتییە و لەبەرامبـەر عارفـدا هـاتووە بـە خـەڵوەت و چلەکێشی ناسراوە و پەیمانی بەستووە مونکەرات — شەراب خۆری — نەکات. شیاوترین کەسـە کە ئەم وصفانە دەیگرێتەوە و پەیمان دەشکێنێ و مەیخانە دەگرێتە بەر.

بەهەر حاڵ، خواجە دەڵێت دوێنێ شەو زاهیدی چلەکێشی خەڵوەت نشین و رێگەی عیرفان و مەیخانەی عەشقی گرتەبەر و پەیمانەکەی شکاند — پەیمانی نەخواردنـەوەی شـەراب — و چـووە سەر پەیمانە و پێکەکان و دەستیکرد بە شەراب خواردنەوە.

بەرای ابوالحسن لاهوری ئەم غەزەلە لە مەولانا جلال الدین و شەمسی تـەبریزی ئـەدوێت کـە مەولانا سەرەتا زاهید و مەلایەکی گەورەی شاری قونیە/ رۆم بوو، بەڵام پاش رۆیشتنی شەمـسی تەبریزی و پرسیارە گەورەکەی کە لێی کرد و گوتی: (پێغەمبـەر ﷺ گـەورەترە یـا ئـەبا یەزیـدی بەسطامی)کاتێ (پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ : ((ماعرفناك حق معرفتك))، بەڵام ئەبا یەزید دەڵێ: ((سبحانی اما اعظم شأنی وانا سلطان السلاطین))، بەڵام پاش ئەو پرسـیارە بەیـەکجاری گـۆڕا و

ڕێگەی عیرفان و عەشقی حقیقی/مەیخانەی گرتە بەر و وازی لە زوهد و مەلایەتی هێنا. {بڕوانە پلە پلە تا ملاقات خدا ـ زرین کوب} و{ لاهوری، ج ٢، ل ١٢٥١}.

بەندە پێم وا نییە کە خواجە لە مەولانا جلال الدینی بدوێت چونکە خواجە لە ژێر کاریگەری مەولانا نەبووە و پەیوەندییەکی نزیکیش لەنێوان جۆری عەشقی حافظ و مەولانادا نییە و شوێنی ژیانیشیان زۆر لێکدی دوور بووە هەرچەندە سەردەمیان نزیکە لەیەکەوە.

لێرەدا حافظ باس لە شکاندنی پەیمانی زاهید دەکات کە ئەمە خۆی لە خۆیدا - لای حافظ — جورئەت و گەورەییە بۆ زاهید کە واز لە خەڵوەت نشینی زاهیدانە بهێنێت و روو بکاتە عەشقی ئیلاهی.

**٢ — شاهد عهدِ شباب آمده بودش به خواب**

**باز به پیرانه سر عاشق و دیوانه شد**

یاری سەردەمی لاوی هاتبووە خەونی دووبارە بە پیری عاشق و دێوانە بوو .

شاهد: یار، مەحبوب آمد بودش بخواب: هاتبووە خەونی پیرانه سر: سەردەمی پیری

باس لە زاهیدی خەڵوەت نشین و گۆشەگیر دەکات کە دوێنێ شەو لەپڕ ڕێگەی مەیخانە و عەشقی گرتە بەر و دەڵێ: دوێنێ شەو مەحبوب و یاری سەردەمی لاوی یاخود سەردەمی لاوی وەك یار و خۆشەویستێك هاتبووە خەوی و بەمەش لە پیریدا وەك لاوی دووبارە عاشق و دێوانەی یار بووەوە. واتە پاش ئەوەی یاری لە خەودابینی دێوانە و عاشق بووەوە.

**٣ — صوفی مجلس که دی جام و قدح می شکست**

**دوش به یک جرعه می عاقل و فرزانه شد**

سۆفی مەجلیس کە دوێنێ جام و پێکی ئەشکاند ئەمشەوی رابردوو بەیەك قوم مەی عاقڵ بوو.

فرزانه: عاقڵ

جێگەی ئاماژە پێدانە لە ساغکردنەوە لەم غەزەلەدا جیاوازی لە نێوان نوسخەکاندا بەدی ئەکرێت لەم بەیتەدا لە هەندێك نوسخەدا وەك د.هروی و عیوضی و مهدی معینیان... لە بری (مجلس) (مجنون) هاتووە هەروەها لەبری (دوش)ی میسراعی دوەمیش (زود) یاخود (باز) هاتووە.

لەشەرحەکەی د.هروی (زود) و لە نوسخەی قزوینی، خانلری، خرمشاهی (باز) هاتووە.

بەندە پێم وایە کە پەیوەندییەکی واتایی/ زەمانی لەنێوان (دی/دوش) دا هەیە و لە وشەکانی دیکە پەسەندترە، جگە لەمەش (باز) دووبارەکردنەوەی سەرەتای میسراعی دووەمی بەیتی پێشوو و لەڕووی جوانکارییەوە لەگەڵ حافظ یەك ناگرێتەوە و لە (عیوضی)شدا کەلەسەر



نوسخە یەکەمینەکانی چارەکی یەکەمی سەدەی نۆیەم — واتە نزیکەی سی ساڵ پاش مەرگی حافظ — ساغکراوەتەوە، لە کۆی هەشت نوسخە لە (٧) نوسخەیاندا (دوش) هاتووە.

(دوش) ئەم شەوی رابردوو، خواجە دەڵێت سۆفیی مەجلیسی زیکر و زوهد کە تا دوێنی خەریکی پێکی عەشقی شکاندن بوو، واتە: باوەڕی بە عەشقی عارفانە نەبوو، هێرشی دەکردە سەری و تەنیا لەڕووی سەرزاری رواڵەتییەوە سۆفی ڕێکپۆش و بانگەشەکەری کۆڕ و مەجلیس بوو، ئەم شەوی رابردوو (دوێ شەو) بەتەنیا قومێك مەی (عەشقی حەقیقی ئیلاهی) عاقڵ بوو، هۆشی هاتەوە سەرخۆیی وازی لە سۆفیگەری درۆزنانە هێنا و ڕێگەی عەشقی حەقیقی ئیلاهی گرتەبەر.

**٤ — مغبچەای می گـذشت راهزن دین و دل**

**در پی آن آشنا از همه بیگانه شد**

موغبەچەیەك تێدەپەڕێ کە تالانکەری دین و دڵ بوو، بە دوای ئەو ئاشنایەدا لە هەموان بووە بێگانە.

مغبچه : موغبەچە، منداڵی موغان، لە زماندا ئەو منداڵە جوان و ناسکانەی کە لە مەیخانەکاندا شاگردن و بەزۆری منداڵی موغەکان بوون کە جاران ئەوان خاوەن مەیخانە بوون، بەڵام لە زاراوەی ئەدەبی و عیرفانیدا ڕەمزە بۆ مورشیدی کامل.

راهزن: تالانکەر درپی: بەدوای

(دین و دل) لەم بەیتەدا ئایینداری عامیانە و دڵی ناعارفە، خواجە دەڵێت کاتێ ئەو موغبەچەیە تێدەپەڕێ ئەو مورشیدە کامڵەی کە ئاییـنداری هاکەزایی و دڵی مردوو، تالان دەکات و بەبایان ئەدات تێدەپەڕێت زاهیدی تازە بێدار بووەوە بەمەی عەشقی ئیلاهی وا شوێنی دەکەوت و مەفتونی ئەو ئاشنایە دەبوو کە هەموانی لا دەبووە بێگانە و دڵی لە هەموو شتێك هەڵدەکەنرا و بە دوی مورشید دەکەوت.

**٥ — آتش رخسار گل خرمن بلبل بسوخت**

**چهرەی خندان شمع آفت پروانه شد**

ئاگری رووخساری گوڵ خەرمانی بولبولی سووتاند، چێرەی خەندەی باری (شاد)ی مۆم بووە بەڵا و ئافەتی گیانی پەروانە.

خندان: خەندەبار، شاد و رووخۆش

لەم بەیتەدا (گوڵ و مۆم) هەمان موغبەچە و (بولبول و پەروانە)ش هەمان زاهیدی خەڵوەتنشینی بەیتی پێشوون. خواجە دەڵێت: رووخساری جوانی وەك ئاگری سووری موغبەچە

— مورشید — خەرمانی زوهدی زاهیدی خەڵوەت نشینی سووتاند و دیسانەوە رووخسار و چێهرەی شاد و لێو بەخەندەشی — کە خەندەی مۆم لای حافظ ئەو لەرزینەی روونـاکییەکەیەتی کە لە ئەنجامی جوولەی هەواوە ئەلەرزێت - بووە بەڵای گیانی و بە ئومێدی لەرزینی تیشکەکەی خۆی لێ نزیك کردەوەو سووتاندی.

**٦ — گریەی شام و سحر شکرکە ضایع نگشت**

**قطرەی باران ما گوهر یکدانە شد**

سوپاس بۆ خودا کە گریانی ئێوارە و بەیانی بەفیڕۆ نەچوو، دڵۆپە بارانی ئێمە بووە گەوهەری بێ وێنە.

ضایع نگشت: بەفیڕۆ نەچوو.

گوهر یکدانە شد: بووە دوڕ و گەوهەری بێ وێنە بۆ گەوهەری گرانبەها.

دێرینەکان لەو باوەڕەدا بوون دڵۆپە باران ئەکەوێتە نێو زاری سەدەفەوە و پاش داخرانی ئیدی پەروەردە دەبێت و دەگۆڕێت بۆ گەوهەر و دوڕ.

خواجە شوکری خودا دەکات کە گریان و پاڕانەوەی ئێوارە و بەیانیانی (ئێمە) عارفان بەفیڕۆ نەچوو و دڵۆپە بارانەکەیان بووە گەوهەری گرانبەها، ئەکرێ لێرەدا دڵۆپەباران (زاهیدی خەڵوەتنشین) بێت کە پێشتر دڵۆپە بارانێك زیاتر نەبوو، بەڵام هەر ئەوەی کە وازی لە زوهدی رواڵەتی و سەرزاری هێنا و هاتە نێو عەشقی حەقیقییەوە و قووڵبووەوە بووە گەورهەی گرانبەها و بێ وێنە.

(عارف) بەم پێیە بێت عارفەکان هەمیشە لە نزا و دوعای ئەوەدا بوون کە خودا نووری عەشقی حەقیقی خۆی بخاتە دڵی ئەو زاهیدە خەڵوەتنشینەوە والێ بکات کە واز لە سۆفییایەتی رواڵەتی بهێنێ. ئەم نزا و پاڕانەوەیە لای پێغەمبەری (ﷺ) خوداش هەبوو کە ئەیفەرموو: ((خودایە ئیسلام بەیەکێك لە عومەرەکان بەهێز و عیزەت بکە)).

**٧ — نرگس ساقی بخواند آیت افسونگری**

**حلقەی اوراد ما مجلس افسانە شد**

نێرگزی ساقی ئایەتی جادووگەری خوێند و ئەڵقەی زیکری ئێمە بووە کۆڕی ئەفسانە.

نرگس ساقی: چاوانی ساقی و لە زاراوە عیرفانیدا نووری زات یا درکەیە لە جەمال لەگەڵ کەماڵی مەعشوقدا.

افسونگری: جادوگەری     حلقەی اوراد: کۆڕی زیکر، ئەڵقەی زیکر.



ساقی لێرەدا هەمان مەعشوق کامڵ یاخود خورشیدی کامڵە و خواجە پێی وایە کە جەمال و جوانی ئەو یا نووری ئەو وەك ئەوەی کە ئایەتی جادووگەری خوێندبێ یەکسەر ئەڵقەی زیکری ئێمەی بەتاڵ کردەوە و کردینە چیرۆکی ئەفسانەیی بەر ئاگردان.

ئەکرێ ئەم قسانە لە سەرزاری زاهیدی خەڵوەتنشینەوە کرابن پاش ئەوەی کە هاتووەتە نێو عیرفان و عەشقی حەقیقییەوە.

**٨ — منزل حافظ کنون بارگە پادشاست**

**دل بر دلدار رفت جان بر جانانە شد**

هەواری حافظ ئێستا لە بارەگای پادشا دایە  دل بۆ لای دڵدار و گیان بۆلای جانا (یار) رۆیشت.

منزل: هەوار، ماڵ     بارگە: بارەگا     بر: بۆلای

پێش ئەوەی لە واتای بەیتەکە بدوێین، پێویستە ئەوە بڵێین کە ئەم دوابەیتەش لەنوسخەکاندا جیاوازی بەرچاو لە ساغکردنەوەیدا بەرچاو دەکەوێت لە هەندێ نوسخەدا لە بری (منزل) (مجلس) و لەبری (بارگە) (بزمگە) و لەبری(سوی) (برپی) هاتووە، بەڵام ئەم جیاوازییانە لە رووی واتاوە گۆڕانکاریی دروستنەکردووە.

پاش ئەوەی کە زاهیدی خەڵوەتنشین لە خەوی غرور و رواڵەتبازی بەئاگا هاتەوە و هاتە نێو عەشقی حەقیقییەوە ئیدی بووە گەوهەری بێ وێنە و گەورە بوو، تا ئەو ئاستەی کە ئێستا ئیدی ماڵی ئەویا مەنزڵی ئەو (حافظ مەبەست لە زاهیدی خەڵوەتنشینی بەیتی یەکەم) — ئەم واتایە کاتێ دروستە کە یەکێتی بابەت لە غەزەلەکەدا لەبەر چاو بگرین، بەڵام ئەگەر یەکێتی بابەت فەرامۆش بکەین ئەوا خواجە لێرەدا مەبەستی خۆیەتی نەوەك زاهیدی خەڵوەتنشین — لەبارەگای پادشای حەقدایە و بە یەکجاری لەحەقدا فەنا بووە لاهوری لە شەرحی ئەم چوونە نێو بارەگای پادشایەوە گوتەی النوری نەقڵ کردووە کە دەڵێ: ((ان الله عباداً یأکلون بالله، و یشربون بالله، و یجلسون بالله و یقولون بالله)){ لاهوری،ج ٢،ل ١٢٥٦} واتە ((خودا کۆمەڵێك لە بەندەی هەیە کە بەخودا دەخۆن و دەخۆنەوە و دادەنیشن دەڵێن)) ئەمەش یادهێنەرەوەی ئەم فەرموودەی پیرۆزەیە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: ((مازال عبدي یتقرب الي بالنوافل حتی...))

پاش چوونە نێو ئەم بارەگای پادشایەشەوە دڵبەرە و دڵدار (مورشیدی کامڵ) و گیانی بەرەو یاری حەقیقی — زاتی حەقی — دەڕوات و بە تەواوی نغرۆی دەریای فراوانی عەشقی حەقیقی دەبێت.

## غەزەلی سەد و شەست و هەشتەم:

**بەحری موزاریعی هەشتی ئەخرەب**

**(مفعول فاعلاتن مفعول فاعلاتن)**

**١ — دوش از جنابِ آصف پیک بشارت آمد**

**کز حضرت سلیمان عشرت اشارت آمد**

دوێنی شەو لە جەنابی ئاسەفەوە پەیکی موژدە هات، لەلایەن حەزرەتی سولەیمانەوە ڕەزامەندی لەسەر عەیش و شادی هاتووە.

آصف: وەك پێشتر ڕوونمان کردەوە ئاسەفی بەرخیا وەزیری حەزرەتی سولەیمانەوە و لە غەزەلیاتی خواجەدا ڕەمزی وەزیری عاقڵ و چاکەخوازە.

جناب: جەناب، دەرگا و ئاستانە    بشارت: موژدە

عشرت: زەوق و شادی، هاودەمی و پێکەوە بوون، لە زاراوەی عیرفانیدا چێژی ئونسە (هاودەمی) لەگەڵ زاتی حەقدا.

خواجە لەم غەزەلەدا موژدەی پێکەوەبوون و شەوق و شادی دەدات کە لەلایەن سوڵتانی گەورەوە (سولەیمان)ەوە ڕێگەی پێدراوە و دوێنێ شەو نامەبەر یا قاسید لەلایەن وەزیری گەورە (ئاسەف)ەوە موژدەی هێناوە و موژدەکەش ڕێپێدان و مۆڵەت پێدانی عەیش و شادی و پێکەوە بوونە.

گەر لە ڕوانگەی مێژووییەوە لێکبدرێتەوە ئەکرێ ئاماژە بەسەردەمێکی مێژوویی بێت بەتایبەتی سەردەمی شا شوجاع و وەزیر قوام الدين محمد صاحب عیار، لەم لێکدانەوەیەدا مەبەست لە (سولەیمان) شا شوجاع و مەبەست لە (ئاسەف)یش حاجی قەوامی صاحب عیاری وەزیری ئەوە و (عشرت)یش زەوق و پێکەوە بوونی خۆشگوزەرانەکانە، بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت ئەم غەزەلە مانایەکی دەستنیشانکراوی مێژوویی هەڵناگرێت و پێویستە بە باکگراوەندی عیرفانییانەوە لێکدرێتەوە.

لە لێکدانەوەی عیرفانیدا (عشرت) چێژی هاودەمییە لەگەڵ حەقدا و قاسید نامەبەری عیرفانی یا جوبرەئیل و سلیمان خودی سوڵتانی حەقە. کە دوێنی شەو بانگەوازی ڕۆحانی هات کە موژدە بێت کە حەزرەتی حەق مۆڵەتی هاودەمی داوە. ﴿ قُلْ يَاعِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ لاَ تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ ﴾ سورە الزمر/ ٥٣ — لەم لێکدانەوەیدا (عشرت) ڕەحمەتە.

**٢ — خاک وجود ما را از آب بادە گِل کن**



**ویران سرای دل را گاه عِمارت آمد**

بەئاوی بادە (شەراب) خاکی وجودی ئێمە بکە بە قوڕ، کاتێ ئەوە هاتووە وێرانەی دڵ ئاوەدان بکرێتەوە.

گل: قوڕ، قوڕاو    گل کن: بکە بەقوڕ    ویران سرا: کەلاوە    گاه: کاتی، وەختی

عمارت: ئاوەدان کردنەوە

پاش ئەوەی جەستەی مرۆڤ لە قوڕ دروستکرا و وشککرایەوە بووە بە گڵ / خاك، مەبەستی خواجەش لە خاکی وجودی ئێمە جەستەی خاکی ئێمە یاخود سروشتی وشك و خاکی ئێمەی مرۆڤە. ئاوی بادە و شەرابیش لە زاراوەی عیرفانیدا عەشق و موحیبەتی زاتی حەقە.

خواجە دڵی خۆی بەوێرانەیەك دەزانێت و لەهەمانکاتیشدا دەزانێت کە پێویستە ئەو وێرانەیە ئاوەدان بێتەوە و بگرە کاتیشی هاتووە بۆیە ڕێگەی ئاوەدانکردنەوەی دڵ دەخاتەڕوو، ئەو بە مورشید یاخود بەزاتی حەق — مەحبوب — دەڵێت: وجودی وشکی خاکی ئێمە — کە لە ئەنجامی دوورییمان لە عەشق خۆتەوە وشکبۆتەوە - بە شەرابی عەشقی خودایی بکەرەوە بە قوڕ و جارێکی دیکە تەڕی بکەرەوە، چونکە کاتی ئەوە هاتووە سەرلەنوێ بە عەشق وێرانەی دڵمان ئاوەدان بکەینەوە.

**٣- عیبم بپوش زنهار ای خرقەی می آلود**

**کان پاك پاکدامن بهرِ زیارت آمد**

ها ئەی خرقەی لەمەی هەڵکێشراو عەیبم داپۆشە، چونکە ئەو پاکە بێ گوناهە بۆ سەردانی من هاتووە بۆ ئێرە.

بپوش: داپۆشە، بشارەوە    زنهار: لێرەدا بۆ جەختکردنەوەیە، ها

می آلود : لەمەی هەڵکێشراو خیرقەی عاشقە حەقیقییەکان

پاکدامن: بێ گوناه، ئەوەی کە داوێنی بەگوناه ئالودە نەبووە.

بهر زیارت: بۆ سەردان.

خواجە داوا لە خیرقە و جبەی هەڵکێشراو لەمەی (عەشقی حەقیقی) دەکات کە عەیبەکانی داپۆشێت - ئەو عەیبانەی لە ئەنجامی غرور و ڕواڵەت بازییەوە دوچاری بووە - چونکە ئەمرۆ یاری پاکیزە و پاکتر بە پەرە گوڵ بۆسەردانی ئەو دێت. واتە ئەی جبەی لەمەی هەڵکێشراومان لەکاتی وەسڵی مەعشوقدا عەیبەکانم داپۆشێت. جبەی لەمەی هەڵکێشراو لە ڕواڵەتدا خۆی عەیبە ئیدی چۆن ئەتوانێ عەیبەپۆش بێت، بەڵام ئەم واتا قووڵانە جوانییەکانی شیعری حافظە.

**٤- این شرح بی نهایت کز حسن یار گفتند**
**حرفیست از هزاران کاندر عبارت آمد**

ئەم شەرحە بێ کۆتاییە کە لە جوانی یاردا گوتویانە، قسەیەکە لە هزاران قسە کەلە نێو دەربڕین (ی مەدحی ئەودا) هاتووە.

بی نهایت: بێ کۆتا، بێ پایان      حرف: قسە      کاندر / کە اندار: کەلە نێو

عبارت: دەربڕین، عیبارە

خواجە دەڵێ: ئەم شەرحە بێ کۆتا و دوایی نەهاتووە کە تا ئێستا لەنێو تەواوی کتێبەکاندا — بەدرێژایی مێژوو — دەربارەی جوانی و خوێنشیرینی یار کراوە و بەدرێژ ئەم هەموو قسەیەی لەسەر نووسراوە، تەنیا قسەیەکن لەنێو هەزاران قسەی دیکە کە لەنێو دەربڕین و دەستەواژەی شەرحی جوانی یاردا هاتوون.

واتە: جوانی و خوێن شیرنی یار هێندە بەرز و بێ کۆتاییە، هەرچی مەدح و ستایشە کە تا ئێستا کراون وەك قسەیەکی نێو هەزاران قسەوان و مەدح و ستایش جوانی یار هەرگیز دوایی نایەت.

خەتمی لاهوری پێی وایە کە ئەو ستایش کراوە (پێغەمبەر ـ د.خ ـ)ە {لاهوری، ج٢، ل١٠٨٠} و هرویش بەیەکێ لە پادشاکانی — کە ڕەنگە شا شوجاع بێت — ئەداتە قەڵەم {هروی، ج٢، ل٧١٩}.

**٥ — امروز جای هرکس پیدا شود ز خوبان**
**کآن ماه مجلس افروز اندر صدارت آمد**

ئەمڕۆ پلە و شوێنی هەر کەس لە جوانان و پاکان دەستنیشان دەبێت، چونکە ئەو مانگە مەجلیس ڕووناککەرەوەیە هاتەسەروی مەجلیسەوە.

جای: جێگەی، لەم بەیتەدا بەواتای پلە و پایە هاتووە.

پیدا شود: دەستنیشان دەبێت، دیاری دەکرێت.

مجلس افروز: مەجلیس ڕووناککەرەوە      صدارت: سەروو، پێشەوە، میری مەجلیس

خواجە دەڵێ: ئەمڕۆ کە یاری وەك مانگی ڕووناککەرەوە و ڕوناکی بەخشی مەجلیس هاتووە و بووەتە میری مەجلیس و لە سەرووی مەجلیسەوە دانیشتووە جێگە و پلەوپایەی چاکان و جوانان دیاری دەبێت و لە جێگەی شیاوی خۆیدا دادەنرێن.

گەر مەبەست لەیار پێغەمبەر ـ د.خ ـ بێت مەبەست لە مەجلیس، مەجلیسی پێغەمبەرانە کە بێ شك ئەو زاتە میری ئەو مەجلیسەیە و گەورەی پێغەمبەرانە ـ د.خ ـ.



**۶ — برتخت جم که تاجش معراج آفتاب است**
**همّت نگر که موری با این حقارت آمد**

بڕوانە هیمەت و لێبڕانی، مێرووولەیەك بەم لاوازییەوە هاتەسەر تەختی سولەیمان کە تاجەکەی (هێندە بڵندە) میعراجی هەتاوە.

جم: جەمشید، جەم، لێرەدا مەبەست لە حەزرەتی سولەیمانە.

معراج: لە زماندا میعراج بە واتای پەیژە / پێ پلیکانە دێت و لە زاراوەشدا مەبەست لە بڵندی بوونەوەی حەزرەتی محەمەد ـ د.خ ـ بۆ ئاسمانەکان و بۆ لیقای خوا، میعراج دوو قۆناغ بوو لەڕاستیدا (اسرا و معراج) بوو، (اسرا: واتە شەوڕەوی کە ئەم شەوڕەوییەش قۆناغی یەکەمی گەشتەکە بوو لە مەککەوە بەرەو قودس و بیت المقدس و پاشان قۆناغی دووەم (معراج) بڵند بوونەوە بوو لە (بیت المقدس)ەوە بۆ ئاسمانەکان و بۆ لیقای خودا، ئەم سەفەرە جەستە و ڕۆحانییەی حەزرەتی محەمەد ـ د.خ ـ لە قورئانی پیرۆز و لە سەرەتای سورەتی (الاسری) بە ئاشکرا باسی لێوە کراوە و دەفەرموێت: ﴿سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلاً مِنْ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الأَقْصَى الَّذِي بَارَكْنَا حَوْلَهُ لِنُرِيَهُ مِنْ آيَاتِنَا إِنَّه هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾ سوره الإسرا و ئایەتی (١).

هەرچەندە لە قورئانی پیرۆزدا تەواوی سەفەرەکە باس نەکراوە، بەڵام لە فەرموودە و ژیاننامەی حەزرەتدا بە درێژی لەو سەفەرە دواوە هەر لە میعراجیشدا نوێژ فەرز بووە لەسەر موسڵمانان و (تەحیات)ی نوێژ دیالۆگی ئاسمانی نێوان حەزرەت و زاتی حەقە (الله).

مەولەوی تاوگۆزی شاعیری گەورەی کورد تەنیا لەو دوو دێڕە بەرزەیدا لەم میعراج و ڕووداوەکانی دواوە و دەڵێ:

ڕێی چەند هەزار ساڵ، تەی چەند حیجابات
زاتی حەق کەلام سوئال جەوابات
چوو بوو دی بیستی کەیاد دریاوە
هاتەوە حەڵقە هەر ئەلەرزیاوە

همت: هیمەت و لێبڕان، هەواڵ و کۆشش، بێ گومان هیمەت لە عیرفاندا واتای دیکەی هەیە، بەڵام لەم بەیتەدا مەبەست لە واتای زمانییە.      حقارت: بێ هێزی و لاوازی.

خواجە لێرەدا داستانێکی بەنموونە هێناوەتەوە بۆ شەرحی هیمەت و لێبڕان و دەڵێ، تەختەکەی حەزرەتی سولەیمان کە هێندە بەرز بوو سەری لە ئاسمان بوو بە شێوەیەك کە وەك میعراج وا بوو بۆ هەتاو — هێندە بڵند بوو — کەچی مێروولەیەك، چونکە هیمەتی هەبوو — بەو

هەموو لاوازی و بچووکییەوە چووە سەر تەختەکەی و قسەی لەگەڵ حەزرەتی سولەیماندا کرد چیرۆکی قسە کردنی مێرووله لەگەڵ حەزرەتی سولەیماندا - د.خ-، بریتییە لەوەی کە کاتێ حەزرەتی سولەیمان و سوپاکەی هاتنە (وادی النمل)ەوە سەرۆکی مێروولان رۆیشت بۆلای سولەیمان تاوەکو سوپاکەی نەیانشێلێت و پانیان نەکەنەوە ئەم چیرۆکە لە سورەتی (النمل) دا باسکراوە.

لە شەرحی (هروی) دا گفتوگۆی نێوان حەزرەتی سولەیمان و مێرووله بەم شێوەیەی سەرەوە باسکراوە — مەسەلەی بەپلیشانەوەی مێرولەکان- بەلام لە تەفسیری (کشف الاسرار)دا گفتوگۆیەکی دیکەی نێوان — حەزرەتی سولەیمان و مێروولە دەگێڕێتەوە کە زیاتر هیمەتی مێرولە دەخاتەڕوو.

لەڕاستیدا هیمەتی مێرووله جگە لە خۆگەیاندن بە تەختی سولەیمان، جورئەت کردنیەتی کە ئەو قسە راستەوخۆیانە بە سەرداری جیهان بڵێ. بڕوانە شەرحی بەیتی (شەش)ی غەزەلی(٨٩).

خواجە لێرەدا مەبەستی لەم چیرۆکە ئەوەیە کە هەر کەس و لێبڕانی هەبێت بە ئاوات و ویستی خۆی دەگات بە تایبەتی گەیشتن بە یاری عیرفانی. هەرچەندە بێ هێز و لاوازیش بێت — ئەم رایەش بە تەواوی پێچەوانەی مەشرەبی جەبرییانەی حافظ — زۆرینەی عارفەکانیش ئەم (هیمەت)ە رەتدەکەنەوە تەنانەت خواجە عبدالله انصاری همت بە زیادە دەزانێت و دەڵێ: نزیکی (قرب)ی تۆ چرای وەجد دادەگیرسێنێ، هیمەتی من زیادەیە) {خواجە رشید ابوالفضل میبدی، گزیدەی کشف الاسرار و وعدة الابرار ل ٢٦}.

**٧ — از چشم شوخش ای دل ایمان خودنگەدار**

**کآن جادوی کمانکش بر عزم غارت آمد**

ئەی دڵ ئیمانی خۆت لە چاوانی شۆخی بپارێزە، چونکە ئەو جادووگەرە کەوان بەدەستە بەمەبەستی تاڵانی هاتووە.

چشم شوخ: چاوی شۆخ، چاوی بێ باك، چاوی جەسور   نگەدار: بپارێزە   کمانکش: کەوان کێشکەر، کەوان بەدەست، برۆ کەوانییە.   برعزم: بەمەبەستی، بۆ   غارت: تاڵانی

خواجە دەڵێت چاوانی بێ باکی یار جادووگەرێکی کەوان بەدەستە و (بەتیری برژانگ و کەوانی برۆوە) بۆ تاڵانی ئایین و دینی دڵداران هاتووە بۆیە ئەی دڵ ئیمانی خۆت بپارێزە تا چاوانی جادووگەری تیرهاوێژی یار تاڵانی نەکات.

لاهوری گوتەنی ئەو (پێغەمبەر ـ د.خ ـ)ە بە چاوانی بێ باکییەوە ئیمانی راست و درۆزنانە لێکدی جودا دەکاتەوە ئیمانە درۆزنانەکان تاڵان دەکا. {لاهوری، ج٢، ل١٠٨٢}.

**٨ — آلودەای تو حافظ فیضی ز شاه درخواه**



**کآن عنصر سماحت بهر طهارت آمد**

حافظ تۆ گوناهباری داوای فەیزێك بکە لە پاشا، چونکە ئەو رەگەزی لێبوردەییە بۆ پاککردنەوەی گوناهکاران هاتووە.

آلودەای: گوناهباری، داوێن بەگوناه ئالوودەی.   درخواه: داوابکە، داخوازی بکە.

سماحت: لێبوردەیی   طهارت: پاکبوونەوە.

خواجە بە خۆی دەڵێت کە داوێنت بەگوناه ئالوودەیە و داوای فەیز و چاکەیەك لە پادشای حەق بکە تاوەکو شەفاعەتت بۆ بکات و پاك ببیتەوە، چونکە ئەو رەگەزی لێبوردەیی هەر لە ئەسڵدا بۆ ئەوەی هاتووە کە خەڵکی پاك بکاتەوە لە گوناهان.

ئەکرێ (شاه) لەم بەیتەدا زاتی حەق یا پێغەمبەر ـ د.خ ـ بێت.

**٩ — درياست مجلس او درياب وقت و درُ ياب**

**هان ای زيان کشیدە وقت تجارت آمد**

کۆڕ و مەجلیسی ئەو دەریایە، سوود لە کات وەرگرەوە مرواری کۆکەرەوە، ئەی زیان پێکەوتوو (زەرەر کردوو) کاتی بازرگانی هاتووە.

درياب وقت: سوود لە کات وەرگرە، قەدری کات بزانە.   درُ یاب: مرواری کۆکەرەوە، بدۆزەرەوە.

هان: بۆ ئاگادارکردنەوەیە و، جەختکردنەوە.   زیانی کشیدە: زیان پێکەوتوو، زەرەرکردوو.

خواجە کۆڕ و مەجلیس ئەو یارە (پێغەمبەر — مەعشوق) بە دەریایەکی پڕ لە مرواری دەزانێت و گوناهباری بەیتی پێشوو بە (زیان پێکەوتوو) دەزانێت لە ژیانی رابردوودا و پێی دەڵێ:

ئەی گوناهباری زەرەرکردوو لە ژیانی رابردووتدا، کۆڕ و مەجلیسی ئەو یارە وەك دەریایەکی پڕ لە دوڕ و مرواریە، ئێستا کە هێشتا کات ماوە و دونیایە کاتی بازرگانی و تیجارەتە و بە فرسەتی بزانە و قەدری کات بگرە و لە دەریای کۆڕی ئەو مرواری هاودەمی و عەشق کۆبکەرەوە.

## غەزەلی سەد و شەست و نۆیەم:

**بەحری هەزەجی شەشی ئەخرەبی مەقبوزی مەحزوف**

**(مفعول مفاعلن فعولن)**

**١ — عشق تو نهال حیرت آمد**

**وصل تو کمال حیرت آمد**

عەشقی تۆ نەمامی سەرسامی و وەسڵی تۆ کەماڵی سەرسامییە.

نهال: نەمام            حیرت: سەرسامی، حەیرانی بوون

(حیرت) لە زماندا بەواتای خۆ ونکردن و سەرلێشێوانە لە شتێکدا، بەڵام لە زاراوەی عیرفانیدا کۆمەڵێك پێناسەی بۆ کراوە و شەرحێکی تاڕادەیەك تەواویشی بۆ کراوە.

عاشقەکان کاتێ لە (طلب)ی مەعشوقەوە بە مەنزڵگای (عەشق) و دواتر (معرفت) و (توحید) دەگەن، بەتەواوی سەرسام دەبن و دوچاری حەیران بوون دێن و بەر لە (فنا) پێ دەخەنە مەنزڵ یا قۆناغی (حیرت)ەوە.

حیرەت چوونە نێو مەعشوق و گەیشتنە بە حەقیقەت، بەڵام بە بێ دەرکردنی ئەو حەقیقەتە ئەم دەرك کردنەش دەبێتە مایەی سەرسامی. لە (فرهنگ اصطلاحات) دا هاتووە حیرەت حاڵەتێکە کە لەکاتێ وردبوونەوەدا بەسەر ڕێبوارادا دێت و دەبێتە پەردە لە نێوان ئەوان و حەقیقەتەکاندا. لای عارفەکان حیرەت دوو جۆری چاك و خراپ (محمودە و مذموم - ستایشکراو و بێزراو)ی هەیە. شێخ عبدالغفور لاری لە پەراوێزی (نفحات انس)دا نووسیویەتی ((حیرەت دوو بەشە (ستایشکراو و بێزراو) جۆری یەکەم (چاك) ئەو سەرسامبوونەیە کە ڕێبوار لەکاتی موشاهەدەدا دوچاری دەبێت، بەڵام جۆری دووەم (خراپ) ئەوەیە کەلە نەزانینییەوە (گومڕایی) سەرسام دەبێت)). { لاهوری، ج٢، ل١٤١٩} .

عارفان بەهۆی (نهێنییە غەیبییەکانەوە) تا زیاتر مەعریفەیان زیاتر بکات سەرسام تر و تا زیاتر عاشق تر بن سەرسام تر دەبن، شێخ جونەید (حەقیقەتی مەعریفەیە بە سەرسامی) دەزانێت و امیر محقق دەڵێ: (ئازیزی من) عەشق هەمووی حیرەت و حەیرانییە. {لاهوری، ج٢، ل١٤٢٠} .

(حیرەت) سەرسامی یەکێکە لە قۆناغەکانی تەی کردنی ڕێگەی عیرفان و گەیشتن بە خودا - مەعشوق - (شێخ فریدالدین عطاری نیشاپوری) عارفی گەورەی سەدەی حەوتەم، حەوت (وادی) یا قۆناغی بۆ عیرفانی داناوە کە ئەوانیش (طلب، عشق، معرفت، استغناء، توحید،



حیرت، فنا)ن شێخ عطار پێی وایە کە ڕێبوار لە دۆڵی (حیرت) دا وەك خۆ ونکردوویەك وایە و نازانێ لە کوێدایە و هەرچی پرسیارێکی وەك: (فانیت یا باقی، مەستی یا مەست نیت...) وەڵامی ئەو سەرسامی و نازانمە و دەڵێت: ئەسڵەن هیچ نازانم، نازانم خۆم و ئەوکێین، عاشقم بەڵام نازانم لەسەر چیم...) { تاریخ عرفان و عارفان ایرانی — از بایزید تا نور علیشاه گنابادی، ل ٢٦٧} .

{عبدالرفیع حقیقت (رفیع)، چاپ سوم ١٣٧٥، انتشارات کوشش، تهران }

خودی نووسەری کتێبی (تاریخ عرفان و عارفان ایران)یش (٧) مەنزڵگەی تەیکردنی ڕێگە جیادەکاتەوە کە (طلب، عشق، معرفت، توحید، حیرت، فنا)ن و سەبارەت بە (حیرت) دەڵێت:

لەمەنزڵگەی شەشەمدا (حیرت) دێت، عەقڵ سەرسام دەبێت لەو بەشەی بە دڵ ئەدرێت.

به مەنزلگاه ششم (حیرت) آید            نصیب دل که گردد عقل حیران

(سەرسامی) لای هەندێك لە عارفەکان مایەی جۆرێك لە خەم و پەژارەیە و لای عارفێکی گەورەی وەك خواجە عبدالله انصاری مایەی شادی و لەزەتە. ئەو دەڵێ ((ئیلاهی، هەموان لەسەرسامیدا خەمگین و پەژموردە و من شادم)) {فرهنگ اصطلاحات و تعبیرات عرفانی ذیل کلمە حیرت.}

بەهەرحاڵ عەشقی زاتی حەق تابە کەماڵ ئەگات — کە مەحاڵە بەکەماڵ بگات — چونکە مەعشوق هەر ڕۆژێك بە جۆرێك جیلوە دەکات مایەی سەرسامی و حەیرانی بوونی عارفەکانە، کە ئەم سەرسام بوونە - وەك گوتمان- گەر لە مەعریفە و دەرکی جەمالەوە بێت چاك و گەر لە نەزانی و گومڕاییەوە بێت خراپە.

خواجە لەم غەزەلەدا باس لە (حیرت) سەرسامی عارفەکان یاخود — خودی شاعیر — دەکات لە بەیتی یەکەمدا دەڵێت: عەشقی تۆ سەرەتا نەمانی سەرسامی لەمندا ناشت و پێگەیاند — کە لاهوری ئەم جۆرە لەسەرسامی بە جۆری (مذمومە) ئەداتە قەڵەم، بەڵام وەسڵ و دیداری تۆ - تۆڵبوونەوە لە عەشق و عیرفانیدا - ئەم سەرسامییەی گەیاندە ترۆپك و کاملی کرد، لاهوری ئەم جۆرەیان بە (محمودە) ئەداتە قەڵەم. واتە: سەرەتای عەشقت من لەنەزانینییەوە سەرسام بووم، بەڵام لە قۆناغەکانی دیکەدا سەرسامی من گۆڕا بۆ سەرسامییەکی کامڵ و عارفانە.

**٢ — بس غرقەی حال وصل کآخر**

**هم برسر حال حیرت آمد**

زۆرن ئەوانەی کە نغرۆی حاڵی وەسڵ بوون و دواجار کەوتوونەتە نێو سەرسامییەوە.

خواجه لێرەدا پێی وایە کە دواجار زۆربەی عاشقان دوچاری سەرسامی دەبن و ئەم سەرسامییە حاڵێکە کە هەڵهاتن لێی مەحاڵە، ئەو دەڵێ زۆرن ئەوانەی کە بە بڕوای خۆ نغرۆ و غەرقی وەسڵی دولبەرن و گەیشتوون بەو، کەچی دواجار دوچاری سەرسامی بوون.

**٣ – نه وصل بماند و نه واصل**

**آنجا که خیال حیرت آمد**

کاتێ (لەو شوێنەدا) کە خەیاڵی سەرسامی دێت نەوەسڵ دەمێنێ و نەعاشقی بەویساڵ گەیشتوو.

وصل: دیدار، بەیەك گەیشتن، وەسڵ واصل: بە ویساڵی یار گەیشتوو، عاشق

خواجە ئەو بێ ئاگاییەی عارف دەخاتەڕوو کەلەکاتی قۆناغی سەرسامی (حیرت)دا بەسەریدا دێت، ئاخر عاشق لە (حیرت) دا نازانێت خۆی لە کوێدایە و کێیە و یار لە کوێدایە و کێیە، بۆیە خواجە دەڵێ کە حیرت هات عاشق لە خۆیی و لە مەعشوقیشی بێ ئاگا دەبێت.

شێخ عطار سەبارەت بەم بێ ئاگا بوونە دەڵێت:

**گوید اصلا من ندانم چیز من**

**وان ندانم هم ندانم نیزمن**

**عاشقم امّا ندانم بر کیم**

**نه مسلمانم نه‌کافر،پس چیم ؟**

**لکین از عشقم ندارم آگهی**

**هم دلی پُر عشق دارم، هم تُهی**

عاشقی سەرسام بوو، ئەڵێ من ئەسڵەن هیچ نازانم، عاشقم بەڵام نازانم لەسەر چیم، نە موسڵمانم نەکافر، ئیدی چیم ؟ من لە عەشقی خۆم بێ ئاگام هەم دڵی پڕ عەشقم هەیە و هەم خاڵی.

**٤ – یک دل بنما که در ره او**

**بر چهره نه خال حیرت آمد**

دڵێکم پیشانبدە کە لەڕێگەی (عەشقی) ئەودا، خاڵی حیرەت بەسەر ڕووخسارییەوە نەبێت.

بنما: پیشانبدە

خواجە دڵنیایە لەوەی کە تەواوی عاشقانی ڕێگەی حەق دوچاری حیرەت هاتوون و دەبن و بۆیە بۆ جەختکردنەوە دەڵێ: عارفێکم نیشانبدە کە دوچاری سەرسامی نەبووبێت و خاڵی سەرسامی و حیرەت بە ڕووخسارییەوە نەبێت.



**٥ – از هر طرفی که گوش کردم**

**آواز سؤال حیرت آمد**

لە هەر لایەکەوە گوێم گرت، دەنگی سۆالی (داواکردنی) حیرەت هات.

گوش کردم: گوێم گرت، گوێم هەڵخست آواز: ئاواز، دەنگ سؤال: پرسیار، داوا کردن

وەك خواجە عبداللە زۆرێك لە عارفەکان چێژ لە (سەرسامی) وەردەگرن و لە خودا داوا دەکەن کە زیاتر سەرسامیان بکات، تەنانەت لەسەرچاوەی عیرفانییەکاندا فەرموودەیەکی پێغەمبەر (ﷺ) قسە کراوە کە دەفەرمووێت: (رب زدنی فیك تحیرا) واتە: (خودایە زیاتر سەرسامم بکە لە خۆت).

حافزیش دەڵێت: لەهەر لایەکەوە گوێم هەڵخست و لەنێو هەر کۆڕ و کۆمەڵێکی عارفاندا گوێم گرت هەر دەنگی (رب زدنی فیك غیرا) نی کەوتە بەرگوێ و عارفەکان داوای (حیرت)ی زیاتریان دەکرد. یاخود لەهەموولایەکەوە سەدا و دەنگی سەرسامی بەرز دەبووەوە.

**٦ – سر تا قدم وجود حافظ**

**در عشق نهال حیرت آمد**

سەرتاپێی وجودی حافظ لە عەشقدا وەك نەمامی حیرەت دەرکەوت.

سرتا قدم: سەرتا پێ، سەرپا، هەموو

خواجە باس بە خۆی دەکات کە لە عەشقدا یەکپارچە سەرسامی و حیرەتە، بێگومان یەکێك لە ڕەگەز و بونیادە سەرکییەکان عەشقی حافظ مانەوەیەتی لە مەنزڵی حیرەت و سەرسامیدا، چونکە ئەو بەردەوام لە سەرسامیدا ماوەتەوە و بە فەنا نەگەیشتووە، هەر بۆیە عەشق لای خواجە دەریایەکی ترسناك و ڕێگایەکی بێ کۆتایی و سەرسامییە لەسەرسامیدا ـ لێرەشدا جەخت لەسەر ئەمە دەکاتەوە کە عەشقی حافظ یەکپارچە سەرسامی و حیرەتە و سەراپای بوونی خواجە لەعەشقدا نەونەمامی حیرەتە.

ئەو خاڵەی کە شایانی ئاماژە پێدانە، خۆدزینەوەی هەندێك لە راڤەکاران و لێکۆڵەرانی فارسە – بەتایبەتی هاوسەردەمەکانی – لە سەرح و لەسەر نووسینی ئەم غەزەلە، بۆ نموونە لێکۆڵەر و حافظ ناسێکی گەورەی وەك د. بهاالدین خُرمشاهی کە – حافظ نامە – کەی وەك سەرچاوەیەکی سەرەکی سوودی لێوەردەگرێت و (شەرحی، زاراوە و کەسایەتی و شوێنەکان و چەمکە سەرەکی و بەیتە دژوارەکانی) حافظ بە هیچ شێوەیەك ئاماژەی بەم غەزەلە نەداوە و تەنانەت زاراوەی (حیرەت)یشی شەرح نەکردووە.

هەروەها د. هرویش خۆی لە شەرحی تەفسیری ئەم غەزەلە بەدوور گرتووە و خـۆی گوتـەنی (بەواتای لەفزی بەیتەکان) اکتفای کردووە تەنانەت گومان لە واتا و جوانی غەزەلەکە دەکـات. لە کاتێکدا ئەم غەزەلە لەڕووی واتا و بنەمای عیرفانییەوە بەیەکێ لە غەزەلە بونیادی و قووڵە عیرفانییەکانی خواجە ئەدرێتە قەڵەم و لە تەواوی نوسخە دێرینە رەسەنەکانیشدا هاتووە.



## غەزەلی سەد و حەفتایەم:

### بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی ئەسلەم

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لن)**

**١ — در نمازم خمِ ابروىِ تو به یاد آمد**

**حالتى رفت که محراب به فریاد آمد**

لە نوێژدا کەوانەی برۆی تۆم بیرکەوتەوە، حاڵەتێکم بەسەردا هات کە میحراب هـاواری لـێ بەرزبووەوە.

به یاد آمد: هاتەوە یادم    حالتى رفت: تووشی حاڵەتی بووم، حاڵەتێکم بەسەردا هات

به فریاد آمد: هاواری لێ بەرزبووەوە، کەوتە هاوار کردن.

خواجە دەڵێ لە نوێژدا کاتێ کەوانی برۆی یارم کەوتەوە یاد، کە برۆی یار جیلوەی جـەماڵی مەعشوقە و لای شێخ جەمالی شیرازی ئاماژەیە بە (قاب قوسین) ئەمیش مەقامی (واحدیت)ە کە پێنجەم مەنزڵگەی عیرفانییـە و نیـشتمانی رەسـەنی مرۆڤـە (پـێش هاتنـە سـەر زەوی). {لاهوری، ج ٢، ل١٠٨٦} حاڵەتێکم بەسەردا هات — حاڵەتی غوربـەت و هەسـت بـە دووری یـار — کـە میحـراب دڵـی بـە حـاڵم سـووتا و کەوتـە هـاوار — یـاخود د. هـروی گوتـەنی لەسەرسامیدا کە چۆن لە نوێژدا برۆی یارم بیرکەوتۆتە کەوتە هاوار. {هروی،ج ٢، ل ٧٢٤}

**٢ — از من اکنون طمع صبر و دل و هوش مدار**

**کان تحمّل که تو دیدی همه بر باد آمد**

ئێستا ئیدی چاوەڕێی سەبر و دڵ و هۆش مەکە، چـونکە ئـەو خۆگرییـەی پێـشوو کـە تـۆ بینیت هەموو بەرباد بوو.

برباد آمد: بەرباد بوو، بەباچوو.

خواجە ئێستا کەوتووەتە بیری کەوانی برۆی یار — قاب قوسین — و نیشتمانی رەسەن ئیـدی سەبر و دڵ و هۆشی نەماوە و خۆڕاگری و تەحەمولی بەرباد بـوو بۆیـە دەڵـێ ئێـستا ئـیتر بـە ئومێدی سەبر و خۆگری و دڵ و عەقڵ و هۆش مەبە لـە مـن، چـونکە ئـەو تەحـەمولی جـاران هەمبوو هەمووی فەوتاوە.

**٣ — باده صافى شد و مرغان چمن مست شدند**

**موسم عـــــاشقى و کـــارِ به بنیاد آمد**

شەڕاب بێ خڵتە (ساف) و باڵندەکانی گـولزار مەسـت بـوون، مـەوسمی عاشـقی و کـاری بنەڕەتی هاتووە.

صافی شد: ساف بوو، بێ خەڵتە بوو، ساف بوونی شەڕاب یـا بـەمانای بـێ خەڵتـە بوونـە یاخود بەواتای خۆشبوون و جۆش و خرۆشی شەڕابە.

مرغان چمن: باڵندەکانی گوڵزار، مەبەست بەم باڵندە هاوڕێیانی ڕێگەی تەریقەت و عەشقی.

بەبنیاد: بە ئەساس، پێچەوانەی بێ ئەساسە، واتە گرنگ و بنچینەیی.

لەکاتێکدا کە عاشقی و کاری بەبنیاد و پێکەوە هـاتوون مەبەسـت لـەکاری بنـچینەیی و بنەڕەتی هەمان عاشقییە.

خواجە دەڵێ: ئێستا کە شەڕاب و عەشق جۆشـی سـەند و هاوڕێیـانی تەریقـەت مەسـتی عەشقن کاتی ئەوە هاتووە خەریکی کاری گرنگ و بنەڕەتی عاشقی بین تا بەڵکو بـەو هۆیـەوە کەمێ لە ئازاری غوربەت و دوری نیشتیمانی ڕەسەنمان کەم کەینەوە و کـەمێ (قـرب)مـان بـە نسیب بێت.

**٤ — بوی بهبود ز اوضاع جهان میشنوم**

**شادی آورد گل و باد صبا شاد آمد**

هەست بە بۆنی چاك بوونەوە دەکەم لە باردۆخی جیهان، گوڵ شادی هێنا و نەسـیمی بـەیان بە شادییەوە هات.

بهبود: چاکبوونەوە، چاکتر بوون.

میشنوم: هەستی پێدەکەم، لەڕاستیدا (میشنوم) بەواتای -گوێم لێیـە- بـەڵام لـە زمـانی فارسیدا بۆ بۆنکردنیش بەکار دێت. لێرەدا بەواتای بۆن دەکەم هاتووە.

آورد: هێنا

خواجە دەڵێ: کە لە بارودۆخی جێهان ورد دەبمەوە هەستدەکەم بەرەو چـاکتر بـوون دەچـێت، هەر ئەمەشە دەلیلی ئەوەی کە گوڵ شادی هێنا و سروەی بەیانیش بەشـادییەوە هـات. یـاخود ئەکرێ بە پێچەوانە بێت کاتێ کە گوڵ شادی هێنا و سروەش بەشادییەوە هات ئیدی مـەوسمی بەرەو چاکتر بوونی بارودۆخی دنیایە.

لەڕاستیدا ئەم بەیتـە درێـژ کردنـەوەی واتـای بـەیتی دووەمـە کـە سـەردەم و مەوسـیمی عاشقییە، بەم عاشقییەش شادی ئەکەوێتە دڵان و جیهانەوە.

**٥ — ای عروس هنر بخت شکایت منمای**

**حجلەی حسن بیارای کە داماد آمد**

ئەی بووکی هونەر شکات لەبەخت مەکە، ژووری جوانی بڕازێنەوە، چونکە زاوا دێت.

شکایت معنای: شکات مەکە، گلەیی مەکە.



حجلە: ئەو ژوورەی کە بۆ بووك و زاوا دەڕازێنرێتەوە

بیارای: بڕازێنەرەوە      داماد: زاوا

لە هەندێ نوسخەدا لەبری (هنر) (چمن) هاتووە. لێرەدا خواجە هونەر بە بووکێك دەزانێـت و پێـی دەڵێـت: ڕۆژی ڕزگـاری و خۆشـبەختی تـۆ زۆر نزیکـە و (بـارودۆخی جیهـان بـەرەو چاکبوونەوە ئەچێ) لەبری ئەوەی گلەیی و شکات لە بەختی ڕەشی خۆت بکەیت هەستە خـۆت و ژوورە تایبەتەکەت بڕازێنەرەوە، چونکە زاوا خەریکە لە ڕێوە دەگاتە جێ.

گەر (چمن) بێت بووکی چیمەن گوڵ و زاواش سروەی بەهارە. هەرچۆن بێت بەیتەکە مـژدەی خۆشبەختی دەدات.

**٦ — دلفریبان نباتی همە زیور بستند**

**دلبر ماست کە با حسن خداداد آمد**

دوڵبەری ڕووەکی هەموو خۆیان ڕازاندووەتەوە (بەخـشڵ) تـەنیا دوڵبـەری ئێمەیـە کـە بـە جوانی سروشتییەوە هاتووە.

دلفریبان نباتی: درەخت و گیا و دڵبەرەکان.      زیور: خشڵ و زێڕ، ڕازێنەرەوە

زیور بستند: خۆیان ڕازاندۆتەوە.

حـسن خـداداد: جـوانی سروشـتی (خـداداد) بـە واتـای سروشـتی دێـت واتـە ئـەوەی خـوا بەخشیویەتی. خواجە وەسفی دولبەر دەکات کە بە حوسن و جوانی سروشتییەوە هاتووەتە نێو باغ و گۆی جوانی لە هەموو درەخت و گیاکیان بردۆتەوە لە کاتێکدا کە خۆشیان ڕازاندووەتەوە.

**٧ — زیر بارند درختان کە تعلّق دارند**

**ای خوشا سرو کە از بارِ غم آزاد آمد**

ئەو درەختانەی کە وابەستەییان هەیە میوە دەگرن و بەردارن — هەمیشە لـە ژێـر بـاردان، خۆش بەحاڵی دار سەرو کە لە باری غەم ئازادە.

زیر بارند: لە ژێر باردان.

تعلّق: وابەستە، لە عیرفاندا بە وابەستەیی بە دونیا و چێژ و لەزەتەکانی دونیا دەگوترێـت، کە پێویستە عارف لەم وابەستەییە ڕزگار بێت.      آزاد: تجرد کە پێچەوانەی (تعلق)ە .

خواجە ئەو کەسانەی کە وابەستەییان بە دونیا و ماددییاتەوە هەیە هەمیـشە بـەبارگران و بارقورسی دەزانێت و وەك ئەوە وایە کـە هەمیـشە لـە ژێـر بـاردابن، بـەڵام لەبەرامبـەر ئـەم دەستەیەدا عارف و ئازادەکان هەن کە وەك (دار سەرو)ن و هەرگیز لـە خـەمی دونیـا و چـێژە

دونیاییەکاندا نین و موجەرڕەدن. خواجە لێرەدا حاڵی عارفان بە خۆش دەزانێت و پێی وایەکە دونیا غەمە و ئەوان لە غەم رزگاریان بووە.

**٨ – مُطربْ از گفتەی حافظ غزلی نغز بخوان**

**تا بگریم کە ز عهد طربم یاد آمد**

ئەی موتریب لە گوتەی حافظ غەزەلێکی خۆش بڵێ   تا بگرییەم چونکە سەردەمی شادیم هاتەوە یاد.

نغز: خۆش، سەرنجڕاکێش    بگریم: بگرییەم

عهد طرب: سەردەمی شادی، بێگومان لێرەدا هەمان (خم ابرو)ی میسراعی یەکەمی غەزەلەکەیە کە مەبەست لە نیشتیمانی رەسەنی مرۆڤ و سەردەمی (قرب) نزیکییە لە مەعشوقی حەق.

خواجە بە مورشید (موتریب) دەڵێ یەکێ لە غەزەلە سەرنجڕاکێشەکانی حافظ بەسروود بۆم بڵێ تا مەست بم و بگرییەم، چونکە سەردەمی (قاب قوسین) و مەقامی (قرب) ی ئەزەلم بیر هاتەوە.

لە شەرحە مێژوویی و ئەدەبییەکاندا (عهد طرب) بەسەردەمی لاوی و شادی دونیایی لێکدراوەتەوە.{د.هروی، ج ٢، ل٧٢٦ / مهدی معنیان، ل٢٩٣}ئەڵبەتە رواڵەتی بەیتەکە ئەم واتایە هەڵدەگرێت.



## غەزەلی سەد و حەفتا و یەکەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی ئەسلەم**

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لن)**

**١ – مژدی ای دل کە دگر باد صبا باز آمد**

**هُدهُد خوش خبر از طرف سبا باز آمد**

موژدە ای دڵ کە جارێکی دیکە سروەی بەیان هاتەوە، هودهودی خۆش مژدە لەلای سەباوە هاتەوە.

دگر: لێرەدا بەواتای جارێکی دیکە، دووبارە دێت.

هُدهُد: هودهود، پەپوسولەیمانە، پەیام هێن و قاسیدی حەزرەتی سولەیمان بوو لە لایەن بەلقیسی شاژنی شاری (سبا)ەوە.

خوش خبر: خۆش موژدە، کەسێ کە هەمیشە خەبەر و هەواڵی خۆش دەهێنێ.

سبا: سبأ، شاری بەلقیس    باز آمد : هاتەوە

مسیراعی دووەمی بەیتەکە ئاماژەیە بە چیرۆکی حەزرەتی سولەیمان و ونبوونی هودهود و هێنانی هەواڵی شاری (سبأ) و شاژنەکەی و چۆنیەتی ژیانیان کە لە سورەتی (نمل) دا هاتووە و دەفەرمووێ: ﴿وَتَفَقَّدَ الطَّيْرَ فَقَالَ مَا لِيَ لاَ أَرَى الْهُدْهُدَ أَمْ كَانَ مِنْ الْغَائِبِينَ ﴾ سورە النمل، ئایەتی (٢٠).

خواجە لێرەدا لە خۆشی و کرانەوەی دڵ و ئارام بوونێک ئەدەوێت کە دووبارە بەسەریدا هاتووە، بەگشتی سروەی بەیان پەیامهێنەری لای یارە و لێرەشدا جارێکی دیکە هەڵی کردووەتەوە و پەپوسولەیمانەی خۆش مژدەش لەلای سەباوە بە هەواڵی خۆشەوە گەڕاوەتەوە.

(باد صبا) جگە لەوەی بۆنی یار و هەواڵی یار دەهێنێ، بە (نفحات رحمانی)یش دراوەتە قەڵەم واتە: ئەی دڵ موژدە بێت رەحمەتی دڵشادی و خۆشبەختی هەڵیکرد و مەعشوقی حەق ئاوڕی لێداینەوە.

**٢ – بَرکشْ ای مُرغ سحر نغمەی داودی باز**

**کە سلیمان گل از باد هوا باز آمد**

ئەی بولبول ئاوازی داودی بخوێنەرەوە کە سوڵتانی گوڵان بە بای هەوا هاتەوە.

برکش: دەبرێنە، بخوێنە، بڵێ.

نغمەی داودی: ئاوازی داودی، ئاوازی وەك حەزرەتی داود (د.خ)، چونكە حەزرەتی داود دەنگی زۆر خۆشبووە، واتە ئاوازێك كە وەك هی حەزرەتی داود خۆش بێت.

سلیمان گل: گوڵێ وەك تەختی سولەیمان، مەبەست لە گوڵە باغ كە لە گەورەیی و جوانیدا بە تەختی حەزرەتی سولەیمان دراوەتەوە قەڵەم و لەسەر پشتی هەواش هاتووە.

وەك گوتمان خواجە لەم غەزەلەدا لە خۆشی دڵ ئەدوێت، لێرەدا بەردەوام دەبێت و دەڵێ ئەی بولبول (مەبەست لە دڵە) وەك داود بە دەنگی خۆش ئاوازێك بڵێ، چونكە سەرلەنوێ شای گوڵان (یار) و تەختەكەی حەزرەتی سولەیمان بەسەرپەرشتی باوە هاتەوە.

**٣ – لاله بوی می نوشین بشنید از دم صبح**

**داغ دل بود به امّید دوا باز آمد**

لالە لە دەمی بەیانیدا بۆنی مەیی بە تامی كرد، داغ لەسەر دڵی بوو بە ئومێدی دەوا هاتەوە.

نوشین: بەتام، لەزەت بەخش، شیرین. بوی شنیدن: بۆنكردن.

از دم صبح: لەدەمی بەیانیدا. داغدل: داغ بەسەر دڵیەوە بوو، حەسرەت بار

دوا: دەوا، دەرمان

لالە كە گوڵاڵەیە و خاڵێكی رەش تێدایە، لای شاعیران ئەم خاڵە بەداخی حەسرەت ئەدەنە قەڵەم، لێرەدا ئەكرێ لالە (هەمان دڵی بەیتی یەكەم بێت) و دەڵێ: لە كاتێكدا كە بەهار نەبوو، كە شەرابی عەشق نەبووە،كە لە زەمان و سەردەمی (قبض) دا بوو، حەسرەتی دووری و دڵگرانی بەسەر دڵەوە هەبوو، هەربۆیە كاتێ بە دەمی بەیاندا بۆنی شەرابی لەزەتبەخشی عەشقی حەقی كرد بە ئومێدی دەرمانی ئەو (قبض) و داخی حەسرەتەوە هاتەوە.

**٤ – عارفی كو كه كند فهمْ زبان سوسن**

**تا بپرسد كه چرا رفت و چرا باز آمد**

عارفێك لە كوێیدا كە لە زمانی سەوسەن تێ بگات، تا لێی بپرسێت كە بۆچی رۆیشت و بۆچی هاتەوە.

سوسن: گوڵی سۆسەنە بە گوڵی زماندار یا دە زمان بەناوبانگە.

رفت و آمد: رۆیشتن و هاتن، لێرەدا مەبەست لە هەڵوەرینی پاییز و دووبارە سەوز بوونەوەی بەهارە.

خواجە دەڵێ: عارفێك لەكوێیە كە لە زمانی سەوسەن (دڵی من) تێبگات تا بزانێ رازی رۆیشتن و هەڵوەرینی پاییز و هاتنەوە و دووبارە سەوز بوونەوەی بەهار چییە.



بەم پێیە خواجە عارفی بەو كەسە داناوە كە لە رازی دڵ و زمانی سەوسەن تێدەگات، بەڵام لێرەدا عارفێ دەست ناكەوێت كە ئەم رازەی بۆ شەرح كات.

**٥ – مردمی كرد و كرم بخت خدا داده به من**

**كآن بُتِ سنگدل از راه وفا باز آمد**

بەختی (خودا داو) كەرەم و پیاوەتی بەرامبەر من كرد، كە ئەو یارە دڵڕەقە لەڕووی وەفاوە هاتەوە. (لە رێگەی وەفاوە هاتەوە).

مردمی: پیاوەتی خدا دادە: خودا داو ئەو بەش و قیسمەتە (بەختە)ی كە خودا ئەیبەخشێت. از راه وفا: لە ڕێی وەفادارییەوە، لەڕێگەی وەفادارییەوە.

خواجە دەڵێ: بەخت و قیسمەتی خودایی یاخود قەدەری خودایی پیاوەتی و گەورەیی بەرامبەر من نواند، چونكە وایكرد كە یار لەڕووی وەفاوە دیسانەوە هاتەوە.

لێرەدا حافظ سوپاسی بەخت دەكات (قەدەر و قیمەت) كە چاكی هێناوە و یاری ئەزەلی رووی جوانی لە حافظ كردۆتەوە.

**٦ – چشم من در ره این قافلەی بس آب كشید**

**تا به گوش دلم آواز دَرا باز آمد**

چاوانی من لە رێگەی ئەو كاروانەدا فرمێسكی زۆری رێشت تا ئاواز و دەنگی زەنگی كاروانچیان گەیشتەوە گوێی دڵم.

آب كشیدن: ئاو هەڵگۆزین لە بیر، لێرەدا مەبەست لە فرمێسكی زۆر رژاندنە.

درا: زەنگی وشتری كاروان.

بێگومان ئێستای ئەم غەزەلەدا شاعیر لە خۆشییەكی تەواو دایە، لێرەدا دەڵێ ئەم خۆشی و وەسڵەی بە ئاسانی دەستنەكەوتووە، كاتێ كە یار لێرە نەبوو چاوی من لە رێی ئەو كاروانەی كە یاری تێدابوو زۆر گریا و زۆر فرمێسكی رێشت، تا ئەو كارەی گوێ دڵم لە دەنگی زەنگی وشتری كاروانچییەكان بووهاتەوە. واتە: تا یارم هاتەوە من لە رێگەیدا فرمێسكم رێشت.

**٧ – گر چه حافظ درِ رنجش زد و پیمان بشكست**

**لطف او بین كه به صلح از درما باز آمد**

ئەگەرچی حافظ رەنجا و پەیمانی شكاند، سەیری لوتفی ئەو بكە كە بە ئاشتییەوە لە دەرگای ئێمەوە هاتەوە.

در رنجش زد: لە دەرگای رەنجانیدا، واتە: رەنجا.

خواجه باس له کەم حەوسەڵەیی خۆی دەکات که له کاتی (قبض) و دیار نەبوونی یاردا ڕەنجاوە و پەیمانی عەشقی شکاندووە، بەڵام سەرباری ئەم ڕەنجان و پەیمان شکاندنەی ئەم (عاشق) مەعشوق هەر بە لوتف و خۆشەویستی زیاترە خۆی بۆ ئاشتکردنەوەی عاشقان دێتەوە. لێرەدا حافظ عەشق و لوتفی یار — مەعشوقی حەق — دەخاتەڕوو و دەڵێ: سەیری لوتف و عەشقی یار بکە گەرچی من پەیمانی عەشقم شکاند و دڵی ڕەنجا کەچی ئەو بۆ ئاشتکردنەوەم هاتەوە بۆ لام و لە دەرگاوە خۆی کردبە ژووردا.



## غەزەلی سەد و حەفتا و دووەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی ئەسڵەم**
**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع لن)**

**١ — صبا به تهنیت پیر می فروش آمد**
**که موسم طرب و عیش و ناز و نوش آمد**

سروە بۆ پیرۆزبایی پیری مەیفرۆش هات تا مژدەی بداتێ مەوسیمی تەرەب و خۆشی و ناز و نۆش هات.

تهنیت: پیرۆزبایی، موبارەك بایی.

ئەم غەزەلەش باس لە خۆشی و شادییەکی عیرفانی حافظ دەکات و لەم بەیتەدا دەڵێ: سەبا یاخود سروە هات موبارەك بایی لە پیری تەریقەت و عاشقی ڕێگەی حەق بکات و موژدەی بداتێ کە سەردەم و مەوسیمی شادی خۆشی و عەیش و نۆشی هات.

بێگومان هەریەك لە طرب و عیش واتای عیرفانی خۆیانیان هەیە و پێشتر لێیان دواوین.

**٣ — هوا مسیح نفس گشت و باد نافەگشای**
**درخت سبز شد و مرغ در خروش آمد**

هەوا وەك هەناسەی مەسیحی لێهات و با گرێکەرەوە، چونکە خوی حەزرەتی مەسیح مردووی زیندوو دەکردەوە.

گشت: بووە نافەگشای: گرێ نافەکەرەوە

درخروش آمد: کەوتە خرۆش، دەستیکرد بەخوێندن و ناڵاندن.

موژدەکەی کە سروەی بەیان بە پیری تەریقەتی دەدات هەر بەردەوامە و دەڵێ: هەوا وەك نەفەسی مەسیحی لێ هاتووە و مردوو زیندوو دەکاتەوە و باش گرێی خونچە دەکاتەوە، درەخت سەوز بووە و باڵندەکان کەوتوونەتە جۆش و خرۆش و دەستیان کردووە بە خوێندن.

**٣- تنور لاله چنان بر فروخت باد بهار**
**که غنچه غرق عرق گشت و گل به جوش آمد**

بای بەهار وا تەنوری لالەی داگیرساند کە خونچەی نغرۆی عارەق بوو، گوڵ هاتە جۆش .

تنور: تەنور

برفروخت / برافروخت: داگیرسایا، داگیرساند (لێرەدا بە تێپەڕ بەکار هاتووە) ئەم کارە لە فارسیدا تێپەڕ و تێنەپەڕیش.

غرق عرق گشت: نغری عارەق بوو، شەلاڵی عارق بوو.

بە جۆش آمد: هاتە جۆش.

بای بەهار شەوق و شور و گەرم و گوڕی وای دا بە گولاڵە (وەك ئەوەی کە تەنورەکەی گەرم کردبێت) لە شەرما خونچەی گوڵەباخ شەلاڵی عارەق بوو، گوڵیش هاتە جۆش و کوڵان.

د. هروی پێی وایەکە ئەم بەیتە ئاماژەیە بە گولاو گرتن {هروی، ج٢، ل٧٣١} خواجە لێرەدا باسی سەرنجڕاکێشی گولاڵە دەکات لە نێو گوڵەکانی دیکەدا.

**٤ – بە گوش هوش نیوش از من و بە عشرت کوش**

**کە این سخن سحر از هاتفم بە گوش آمد**

بە گوێی عەقڵ گوێی لە من بگرە و هەوڵی خۆشبەختی بدە، چونکە سەحەر فریشتە ئەم قسەیەی گەیاندە گوێم.

نیوش: گوێبگرە لە (نیوشیدن)ەوە هاتووە کە بەواتای (گوێگرتن) دێت و ئێستا بەکارهێنانی زۆرکەمە.

بەعشرت کوش: هەوڵی خۆشبەختی و شادی بدە.

هاتف: فریشتەی پەیام هێنەر، جوبرەئیل.

(عشرت) کە بەواتای زیانی خۆش و شادە لە عیرفاندا عەشقی ئیلاهییە، خواجە لێرەدا داوادەکات کە بە گوێ ئەو بکەن یاخود بە وردی گوێگرن و لە هەوڵی عەشقی حەقدا بن، چونکە بەرەبەیان فریشتەی غەیبی پەیامهێنەر (عارفەمان بڕوایان بە ئیلهامی خودایی هەیە، کە جیاوازە لەوەحی) ئەم قسەیەی دا بە گوێی مندا.

**٥ – ز مرغِ صبح ندانم کە سوسنِ آزاد**

**چە گوش کرد کە با دە زبان خموش آمد**

نازانم (سەوسەنی سپی) چی لە بولبول بیست وا بە دە زمانەوە بێدەنگ بوو.

مرغ صبح: (باڵندەی سەحەر) مەبەست لە بولبولە.

سوسن آزاد: دەگوترێت کە گوڵە سەوسەن سپی و شینی هەیە گەڵاکانی وەك زمان وان کە دە گەڵان، بۆیە پێی دەگوترێت دە زمان، بەو سەوسەنانەی کە ڕەنگیان سپییە دەگوترێت سەوسەنی ئازاد.

خموش آمد بێ دەنگ بوو، بێدەنگیی هەڵبژارد.

خواجە عارفی بە سەوسەن داوەتە قەڵەم، چونکە عارفیش زۆر نهێنی دەزانێت و هیچیش نادرکێنێ، لێرەدا دەڵێ: نازانم بولبول – عاشقی شەوبێدار- چی نهێنییەکی عەشقی بە عارف



گوت وا بە بوونی دە زمانەوە بێدەنگ بوو، واتای ئەم بەیتە نزیکە لەم گوتەیی شێخ جونەیدەوە کە دەڵێ: (من عرف الله کل لسانه – هەر کەس خودای ناسی زمانی لاڵ دەبێ ).

**٦ – ز فکرِ تفرقە بازآی تا شوی مجموع**

**بە حکم آن کە چو شد اهرمن سروش آمد**

واز لە فکری (تفرقە) بێنە تا (مجموع) بیت، چونکە کاتێ کە ئەهریمەن ڕۆیشت فریشتە (سروش) دێت.

تفرقە و جەمع/ یا جمع و تفرتە: دوو زاراوەی عیرفانین کە هەر یەکەیان پێچەوانەی ئەوی دیکەیانە، (جمع) بریتییە لە حاڵێك کە تیایدا بەندەی ڕێبوار بەناو و یادی خوا و عەشقی ئەو ئارام بێت و جگە لەو ئاسوودە و بێ باك بێت، (تەفرەقە)ش بریتییە لە حاڵێك کە تیایدا دڵی بەندە بە هۆی وابەستەیی بە کاروباری جۆراوجۆر بڵاو و پەراگەندە دەبێت، بێ ئاگا دەبێت لە جیهانی غەیب { نوخوان بزم دلان حاشیه،...}.

مەرج نییە (تەفرەقە) تەنیا لە وابەستەیی دڵی ڕێبوارەوە بە کاروباری دونیاییەوە بێتە ئاراوە، لای هجویری (تفرقە مکاسب و جمع مواهب) ە واتە ئەوەی لەڕێگەی هەوڵ و موجاهیدەوە بێتە دی تەفرەقەیە و ئەوەش عینایەت و هیدایەتی ئیلاهی بێت جەمعە. {خرمشاهی، ج ١، ل ٦٥٣ }.

تەفرەقە مانەوەیە لە ئەفعالدا و جەمع گەیشتنە بە سیفاتی حەق، جەمع یەکلاکردنەوەیە بۆ حەق و تەفرەقە مانەوەیە لە دووریانەکاندا. لەلایەکی دیکەوە تەفرەقە داننانە بە مەخلوقدا و جەمع سەرقاڵبوونە بەحەقەوە سفر کردنی خەڵقە.

بازای: بگەڕێوە، وازبێنە　　اهرمن، شەیتان، دێو　　سروش: فریشتە، سروش

خواجە لێرەدا بە ڕێبواری تەریقەت دەڵێ واز لە حاڵەتی تەفرەقە بهێنە و بڕۆ نێو (جمع) و بگە بە قۆناغی سیفات، چونکە کاتێ کە ئەهریمەن ڕۆیشت پاشان فریشتە دێت.

بەم پێیە بێت خواجە تەفریقەی ئەهریمەن و جەمعی بە فریشتە داوەتە قەڵەم و ئەم دوانە پێکەوە کۆنابنەوە.

**٧ –چە جایِ صحبت نامحرم است مجلسِ انس**

**سرِ پیالە بپوشان کە خرقەپوش آمد**

مەجلیسی هاودەمی (انس) کەی جێگەی نامەحرەمە، سەری پیاڵەی شەڕاب بگرە، چونکە سۆفی خرقەپۆش هات.

بپوشان: بگرە، بپۆشە　　خرقەپۆش: خرقەپۆش، مەبەست لە سۆفی ریاکارە.

خواجه پێی وایە کە کۆڕ و مەجلیس هاودەمی ئونس کە چێژی عەشقی ئیلاهییە جێگەی نامەحرەم و هاوڕێیەتی نامەحرەمان نییە، ئێستا نامەحرەمێك هاتووەتە نێو کۆڕەکەوە سۆفی ریاکاری رەسمی خرقەپۆشە، بۆیە خواجە دەڵێ، پێکەکان بشارنەوە (عەشق)، چونکە نابێ نامەحرەمێکی وەك سۆفی ریاکار بەم مەحرەمە بزانێت.

**٨ — ز خانقاه به میخانه می رود حافظ**

**مگر ز مستی زهدِ ریا به هوش آمد**

حافظ لە خانەقاوە بۆ مەیخانە دەڕوات ئەڵێی لە مەستی زوهدی ریاکاری بە هۆش هاتۆتەوە.

مگر: لێرەدا (مگر) بەواتای ئەڵێی هاتووە.

خواجە زوهد و ریاکاری رەسمی زاهیدەکان بە سەرخۆش دەداتە قەڵەم کە هۆشیان لەسەر خۆیان نییە. دەڵێ ئێستا کە حافظ واز لە خانەقا (کە ڕەمزی سۆفیگەری رەسمی ریاکارانەیە) هێناوە و بەرەو مەیخانە ( رەمزی عەشق و خۆشەویستی ئیلاهییە) دەڕوات، لەبەر ئەوەیە کەلە مەستی زوهدی ریاکارانە بە هۆشی هاتۆتەوە و تێگەیشتووە کە حەقیقەتی عەشق لای ریاکارەکان نییە بەڵکو لای عارفە عاشقەکانە.



## غەزەلی سەد و حەفتا و سێیەم:

### بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی ئەسلەم

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لن)**

**١ — سحرم دولت بیدار به بالین آمد**

**گفت برخیز که آن خسرو شیرین آمد**

سەحەر بەختی بێدار هاتە سەر جێگەم (هاتە خەوم) گوتی هەستە ئەو پاشا شیرینە هات.

دولت بیدار: بەختی بێدار، پێچەوانەی بەختی خەواڵودە.

بالین: نوێن، جێگەی خەوتن، ئەکرێ مەبەست لە خەون بینین بێت.

برخیز: هەستە خسرو: پاشا (خەسرەو کە ناوی پادشای ئێرانی — خەسرەوی پەروێز — یشە بەڵام لێرەدا بەگشتی بۆ پادشا بەکارهاتووە.)

سپێدە و سەحەرکاتێ خواجە لە خەودا بووە بەخت یاوەری بووە و هاتووتە سەرجێگەی و پێی گوتووە هەستە ئەو پادشا شیرینڕەفتار و شیرینکەلامە هات.

لە شەرحە مێژووییەکاندا ئەو (خسرو شیرین)ە بە شا شوجاع لێکدراوەتەوە، بەڵام لاهوری لە شەرحە عیرفانییەکەیدا ئەو پادشایە بە زاتی حەق (خودا) ئەداتە قەڵەم و نموونەیەکی خەوبینینی (خاسانی خودا)ی بەزاتی حەقەوە هێناوەتەوە. هەروەها نووسیویەتی لە (قوت القلوب) دا هاتووە کە (خاسانی ئومەت حەق تەعالا لە دونیادا بە چاوی گیان دەبینن ئەوەش لە خەودا یاخود لە ـ مراقبە ـ دا){ لاهوری، ج٢، ل١٣٢٠}.

**٢ — قَدحی درکش و سرخوش به تماشا بخرام**

**تا ببینی که نگارت به چه آیین آمد**

پێکێ هەڵدە و بەسەر خۆشی بۆ تەماشا بجووڵێ، تا ببینی کە نیگارت بە چ شێوازی هاتووە.

درکش: هەڵدە، بنۆشە آیین: شێواز، ئارایش و خۆڕازاندنەوە.

بەختی بێدار وەسفی هاتنەکەی یار دەکات بۆ خواجە، پێی دەڵێ: پێکێکی شەڕابی عەشقی ئیلاهی هەڵدە تا مەستی عەشقی ئەو ببیت و پاشان بەمەستی برۆ بۆ تەماشا تا ببینی یارت بە چ شکۆ و گەورەییەکەوە هاتووە ـ یاخود تا بزانی یارت بە چ جوانی و رازاوەییەکەوە هاتووە ـ.

**٣ — مژدگانی بده ای خلوتی نافه‌گشای**

**که ز صحرای ختن آهوی مشکین آمد**

مژدە بوو ئەی خەڵوەت نشینی گرێ کەرەوە، چونکە لە بیابانی خۆتەنەوە ئاسکی میسکی هات.

مژدەگانی: موژدە

خلوتی: کەسێ کە لە خەڵوەتدایە، خەڵوەتنشین، گۆشەگیر، دابراو جگە لەخودا.

آهوی مشکین: جۆرە ئاسکێکی تایبەتە کە میسکی لێ دەردەهێنرێت.

خواجە خەڵوەتی و خەڵوەتنشینی بە مایەی کردنەوەی گرێی ناخەکان و بڵاوکردنەوەی میسکە (گۆشەنشینی بە کلیلێکی دەرگاکانی جوانی دەزانێت) لێرەدا بەو گۆشەنشینە دەڵێ موژدە بدە کە لە بیابانی خۆتەنەوە (نیشتیمانی ئاسکان کەمیسکیان لێ دەردەهێنرێت) ئاسکی میسکی هات کە لێرەدا ئاسکی میسکبار دەرمانی یار و پاشای بەیتەکانی پێشووە.

**٤ — گریە آبی بەرخ سوختگان باز آورد**

**نالە فریادرس عاشق مسکین آمد**

گریان ئاوێکی هێنایەوە بەرووی سووتاواندا، ناڵە بەفریای عاشقی هەژار گەیشت.

آبی: ئاوێکی، ئابڕوویەکی    باز آورد: هێنایەوە    فریادرس: فریادڕەس

خواجە لێرەدا دوو دەستمایەی گەورەی عاشقان و دڵسووتاوانی حەق دەخاتەڕوو کە ئەوانیش (گریان و ناڵە)ن.

(آب) بە دوو واتا دێت کە یەکەمیان (ئاوە)، و لێرەدا مانای میسراعی یەکەم دەبێتە: گریان و فرمێسکی چاو تەڕاییەکی هێنایەوە بەرووی سووتاواندا وەك کورد دەڵێ: فرمێسکی چاوم نەبوایە ئاگری دڵم ئەیسووتاندم، بەڵام واتای دووەم آب — ئابڕووە کە لێرەدا واتای بەیتەکە قووڵتر دەبێتەوە: گریان ئابڕووی دایەوە بە سووتاوان و عاشقی ڕێگەی حەق و ناڵەش بووە فەریادرەس و ڕزگاری کەری عاشقی هەژار.

واتە: عاشق و سووتاوان گریان و ناڵە ئابڕوو فریادڕەسیانە.

**٥ — مرغ دل باز هوادار کمان ابروئیست    ای کبوتر نگران باش کە شاهین آمد**

مەلی دڵ دیسانەوە مەیلی لە برۆکەوانییەکە، ئەی کۆتر ئاگاداربە کە شاهێن هاتووە.

هوادار: حەزی، هەوادار    نگران باش: ئاگادار بە، نیگەران بە

شاهین: شەهێن، باڵندەیێکی ڕاوکەر، لە تیرەی باز کە کۆتر ڕاودەکات.

کە یار هاتووە و بە جوانی و جەماڵی خۆیەوە جیلوە دەکات، ئیدی مەلێ دڵی خواجە ئارەزووی یارێکی جوانی برۆکەوانیی کەوتووتەوە سەر. لەم ئارەزوو کەوتنە سەرەی دڵەوە خواجە حەقیقەتی عەشق ئەخاتەڕووکە عاشق ئەسیر و دیل ئەکات و مەعشوق تیایدا شاهێن و عاشق کۆترێکی بێ دەسەڵات بۆیە ئەی دڵ (کۆتری بێ دەسەڵات لەبەردەم عەشقی ئەودا) ئاگاداربە یا نیگەرانبە، چونکە شاهێنی عەشقی هات و داوت ئەکات و گرفتاری عەشقت



ئەکات واتە ئەی دڵ کاتێ یار بەم هەموو جوانییەوە جیلوە بکات بێگومان ئەتخاتە زنجیری عەشقەوە و ڕاوت (شکارت) ئەکا.

**٦ — ساقیا می بدە و غم مخور از دشمن و دوست**

**کە بە کام دل ما آن بشد و این آمد**

ئەی ساقی مەیم بدەرێ لە قسەی دوژمن و دۆست خەم مەخۆ، چونکە بە کامی دڵی ئێمە ئەو ڕۆیشت و ئەم هات.

بەکام دل ما: بەکامی دڵی ئێمە، بە ئارەزووی دڵی ئێمە    بشد: ڕۆیشت

خواجە لێرەدا بە ساقی دەڵێ مەیی خۆشەویستی و عەشقم بدەرێ لەقسەی دوژمنی سەخت کە ڕەقیب و نەفسی شەیتانە و دووری قسەی دۆستانەی دۆست خەم مەخۆ، چونکە کارەکە بەئارەزووی دڵی ئێمە لێ هات و ئەو (دوژمن) ڕۆیشت و ئەم (دۆست) هات.

لەنێوان دوژمن و دۆست، ئەو و ئەمدا پێچان و کرانەوەی ڕێك (لفا و نشری مرتب) هەیە.

**٧ — رسم بد عهدی ایّام چو دید ابر بهار**

**گریەاش بر سمن و سنبل و نسرین آمد**

کاتێ هەوری بەهار پەیمانی ڕۆژگاری بینی بەسەر یاسەمەن و سونبل و نەسریندا گریا.

چو: کە، کاتێ

ئەم بەیتە باس لە بێ پەیمانی نەریت و ڕەسمی ڕۆژگار و زەمانە ئەکات، تەنانەت کاتێ کە هەوری بەهار گوڵەکان ئاو ئەدات لای خواجە گریانی ئەوە بۆ گوڵەکان، چونکە هەوری بەهار نەریت و یاسای بێ پەیمانی ڕۆژگاری بینیوە کە تەواوی گوڵان سیس دەکات و هەڵدەوەرێنێ بۆیە بەسەر یاسەمین و سونبول و نەسریندا دەگریەت.

**٨ — چون صبا گفتەی حافظ بشنید از بلبل**

**عنبر افشان بە تماشای ریاحین آمد**

کاتێ سروە گوتەی حافظ لە بولبول بیست، عەنبەر پرژێن بۆ تەماشای ڕێحانەکان هات.

عنبر افشان: میسك و عەنبەر ڕیژێن    ریاحین : کۆی ڕێحانە، هەر گوڵێکی بۆنخۆش

واتە کاتێ بای سەبا گوێی لە ئاوازی بولبول گرت کە شیعرەکانی حافظی بە کوڵ دەگوتەوە، هێندە شەوق و شور گرتی لە کاتێکدا کە عەنبەری دەپرژان (لە خۆشی و فیداکردندا) هاتە گوڵزار و چەمەن بۆ تەماشای گوڵ و گوڵزار و ڕێحانە بۆنخۆشەکان.

## غەزەلی سەد و حەفتا و چوارەم:

**موجتەسی هەشتی مەخبونی ئەسڵەم**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع لن)**

**١ – نه هرکه چهره برافروخت دلبری داند**

**نه هرکه آیینه سازد سکندری داند**

وانییە کە هەر کەس رووخساری رازاندەوە دولبەری بزانێت و هەرکەسیش ئاوێنەی دروستکرد ئەسکەندەر بێت.

برافروخت: رازاندنەوە و مکیاج کردنی رووخسار      آیینه سازد: ئاوێنە دروستبکات.

سکندری: ئەسکەندەری، گەورەیی ئەسکەندەری و پادشایەتی، ئەگوترێ کە ئەسکەندەر بۆ یەکەمین جار ئاوێنەی دروستکردووە.

خواجە لەم غەزەلەدا جیاوازییەکی قووڵ و بونیادی لە نێوان رواڵەت و ناوی شتەکان و حەقیقەت و ناوەڕۆکی شتەکاندا دادەنێت و لە یەکتریان جودا دەکاتەوە.

خواجە پێی وایە مەرج نییە ئەو کەسەی کە مکیاج بکات و روخساری خۆی بڕازێنێتەوە و بزانی دولبەری و یاری و عەشق یانی چی و مەرجیش نییە ئەو کەسەی کە ئاوێنەی دروستکرد ئیدی وەك ئەسکەندەر ببێتە گەورە و سەرداری دونیا و ناوبانگی گەورەیی دەرکات.

کورد گوتەنی: هەرچی سمێڵی سوور بوو هەمزە ئاغا نییە.

واتە. رووخساری شتەکان حەقیقەتی ئەوان نین و مەرج نییە کە لە رووخساردا هاوشێوەی گەورەکان بوویێت لە حەقیقەتشدا ببیتە ئەوان.

**٢ – نه هرکسی که کله کج نهاد و تند نشست**

**کلاه داری و آیین سروری داند**

مەرج نییە هەر کەسێ کە کڵاوی لار دانا و رێك دانیشێت، رێوڕەسمی کڵاوداری و سەروەری بزانێت.

کله کج نهادن: کڵاو لار دانان، خۆ بەگەورە دەرخستن.

تند نشست: رێك و رەسمی و مڕ و مۆچ دانیشت، خۆ بەگەورە زانین و مەغرورانە.

کڵاوداری: گەورەیی، کڵاوداری

کاتێ کەسێك ببینین وەك گەورە و سەروەرەکان هەڵسوکەوتی دەکرد و کڵاوی لاردانا و رەسمییانە دا ئەنیشت (لە ئەمڕۆدا قاتی لەبەر ئەکردو بە غرور و کیبرەوە لەسەر کورسی



دائەنیشت) ئیدی مەرج نییە وەك ئەوان دابونەریتی گەورەیی و سەرەوەی بزانێت. واتە: بە هەڵسوکەوتی گەورەکان دڵ و دەروون و ناخ گەورە نابێت.

**٣ – تو بندگی چو گدایان به شرط مزد مکن**

**که دوست خود روشِ بندەپروری داند**

تۆ وەك سواڵکەران بە مەرجی هەقدەست بەندایەتی مەکە، چونکە دۆست خۆی شێوازی بەندە پەروەری دەزانێت.

مزد: هەقدەست

بنده پروری: راگرتنی بەندە و پاداشت دانەوەی.

لەم بەیتەدا جیاوازی نێوان بەندایەتی کردنی عارفانە و زاهیدانە یا عەوامانە دەخاتەڕوو، بێگومان خەڵکی عەوام لەبەرخاتری پاداشتی خودا بەهەشت یاخود لە ترسی سزا بەندایەتی دەکەن و ئەم جۆرە بەندایەتییەش بە (بەندایەتی بەرژەوەندی خوازانە) دراوەتە قەڵەم، کە هەمیشە چاوی لە هەقدەست و پاداشتە، بەڵام عارفەکان لەو رووەوە خوا دەپەرستن کە خوا شایانی پەرەستنە و عاشقی ئەون نەوەك لەبەر خۆشی بەهەشت یا لە ترسی جەهەنم. معصوم علی شیرازی لە کتێبی (طرائق) دا نووسیویەتی: عارف کەسێکە کە بتوانێ حەق لەو رووەوە ئەنجام ئەدات کە ئەو بەشایانی پەرستن دەزانێت نەوەك بە ئومێدی پاداشت و ترسی سزا {عطاءالله تدین، ل٥٧٠}.

خواجە ئەم جۆرە بەندایەتییە بەرژەوەندیخوازانە بە بەندایەتی سواڵکەرانە دەزانێت کە بەردەوام چاویان لە دەستی خەڵکی و دەستیان پانکردۆتەوە، دیسانەوە خواجە پێی وایە گەر بە هیوای پاداشتیش هێشتا پێویست بەوە ناکات وەك سواڵکەران هەمیشە داوا بکەیت، چونکە ئەو (کەریمە) و خۆی جوانتر دەزانێ چۆن پاداشتی بەندەکانی بداتەوە، وەك ئەو دەشتەکییەی لە پێغەمبەر ﷺ ی پرسی لە دواڕۆژدا کێ حەشرمان دەکات، حەزرەتیش فەرمووی: خوا، دەشتەکییەکە وتی هەر خوا خۆی. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بەڵێ خوا خۆی. دەشتەکییەکە گوتی: دە ئیتر خەمم نییە، چونکە خوا بەخشندە و کەریمە کاتێ بەشمان ئەدات درێغی ناکات.

بۆیە حافظ دەڵێ: تۆ وەك سواڵکەران بەشەرتی حەقدەست و کرێ بەندایەتی خوامەکە، چونکە ئەو دۆستی خۆی چاکتر دەزانێ چۆن بەندە رازی بکات، وەك دەگوترێ کەسێ کە لە بەهەشتدا کەمترین مولکی هەیە، مولکەکەی هێندەی زەوی و ئاسمانە.

**٤ — غلام همّت آن رندِ عافیت سوزم**

**که در گداصفتی کیمیاگـری داند**

غولامی هیمەتی ئەو ڕەندە خۆشی سوتێنەرەم  کە لە گەدادا سیفەتی کیمیاگەری دەزانێت.

عافیت: خۆشی و ئارامی ژیان، ڕەفاهییەت.

عافیت سوز: ئەو کەسەی خۆشی و ئارامی خۆی وەلا دەنێ.

گداصفتی: گەدا سیفەتی، سادەیی و خۆبەکەم زانین، قەناعەت کردن بەکەم.

کیمیاگری: کیمیاگەری، زانستی مس بە زێڕ کردن.

خواجە خۆی بەغولام و کۆیلەی هیمەت و گەورەیی ئەو ڕەندە عارفە دەزانێت کە ژیانی خۆشی خۆی دەسووتێنێت و دێتە نێو عەشقی حەقیقییەوە، لەگەڵ ئەوەی کە هەموو شتێکی لە دەست بێت و لە کیمیاگەریدا کە مرۆڤە سادە و بێ نرخەکان بەرەو بڵندی و گەورەیی ڕۆح بەرز دەکاتەوە کەچی بە سادەیی و قەناعەتی بە کەم هەیە و سیفەتی گەدایانە (کە لێرەدا وەسفکراوە) پەیڕەو دەکات.

**٥ — وفا و عهد نکو باشد ار بیاموزی**

**و گرنه هرکه تو بینی ستمگری داند**

ئەگەر پەیمان دروستی فێرببی چاکە، گەر نا هەرکەس کە تۆ دەبینی ستەمگەری ئەزانێت.

وفای عهد: دروستی پەیمان، بەجێهێنانی پەیمان و وەعد لەکاتی خۆیدا.

نکو باشد: چاکە		بیاموزی: فێر ببی

خواجە فێر بوونی شتی چاك و فەزیلەت بە گەورەیی دەزانێت نەوەك لایەنە شەڕەنگێزییەکانی مرۆڤ لێرەدا (لەسەر پەیمان و وەعد مانەوە) بە نموونە دەهێنێتەوە و لەبەرامبەر ستەمگەری و بێ پەیمانیدا وای دەنێت و دەڵێ تۆ گەر یەکەمیان فێر بی چاکە ئەگەر نا دوومیان فێر بوونی ناوێ هەر کەس ببین ئاسانە کە ببێتە ستەمکار و ستەمگەری فێر ببێ، بەڵام سەختە کە پەیمان و وەفای وەعد دان فێر ببێ.

لاهوری ئەم پەیمانە بە (بلی)ی ڕۆحەکان دەزانن کە پەروەردگاری خوایان سەلماند.

لە زۆرێك لە نوسخەکاندا (وفا و عهد) هاتووە لەم شێوەیە دا(وەفا و پەیمان) بەچاك دەزانێ.

**٦ — بباختم دل دیوانه و ندانستم**

**که آدمی بچەای  شیوەی پری داند**

دڵی دێوانەم دۆڕاند و نەمزانی کە بەچکە مرۆڤێك ڕەفتاری پەری دەزانێت.



بباختم: دۆڕاندم، بەختم کرد		ندانستم: نەمزانی		آدمی بچە: بەچکە مرۆڤ، مندالی مرۆڤ.

شێوە: ڕەفتار، شێوەی دلڕفاندن		پری: پەری

خواجە دەڵێ: وەك دێوانە و شێت دڵم دۆڕاند و دام بە (ڕند) یاخود شێخ ئەمزانی کە مرۆڤیش (بەگوتەی لاهوری هەمان — رند عافیت سوز — ی بەیتی چوارەم) وەك پەری شێوەی دلڕفاندن دەزانێت.

واتە: نەمدەزانی کە مرۆڤیش وەك پەری دڵ دادەکێشێ، کەچی دڵی دێوانەم لە پای مرۆڤێکدا (شێخێکدا) دۆڕاند.

**٧ — هزار نکتەی باریکتر ز موی اینجاست**

**نە هرکە سر بتراشد قلندری داند**

هەزار نوکتەی لە مووباریکتر لێرەدایە، مەرج نییە هەرکەس سەری خۆی تاشی قەڵەندەری بزانێت.

(نوکتەی باریکتر لە موو) واتە نوکتەیەك کە پڕ بێت لە مەعنای جوان.

بتراشد: بتاشێ.

قلندری: قەڵەندەری، دەورێشی سادەی گوێ بە دونیانەدەر، دەورێشی ماڵ بە کۆڵ.

قەڵەندەری تاقمێکی ڕەوتی (مەلامەتییە)ن،مەلامەتییەکان ڕەوتێکی سۆفیگەرییایە کە پێیان وایە پێویستە مرۆڤ عیبادەتی خۆی بشارێتەوە و کاری نەشیاویان دەکرد بۆ ئەوەی دوچاری ریا نەبن. بەڵام قەڵەندەرییەکان بە پێچەوانەی تەواوی مەلامەتییەکانەوە پابەند نەبوون بە شاردنەوەی نهێنی و عیبادەتەوە و گوێیان پێ نەئەدا و لە عیبادەتیش جگە لە فەرزەکان زیاتریان ئەنجام نەئەدا و جگە لە پاکێتی و سەفای دڵی خۆیان بیریان لە هیچ شتێك و هیچ کەسێ نەئەکردەوە و تاشینی مووی سەر و دەم و چاو تەنانەت برۆش لە تایبەتمەندییەکانی ئەم تاقمەیە { استاد د. رجائی، ل ٤٤٣، عطاءالله قەلەندەری} بە واتای پاکی و ڕوو لە خوایی و گوێ بە دونیا نەدانە، لە دائره المعارف اسلامیدا هاتووە: تەریقەتی قەڵەندەری بۆ — قەڵەندەر یوسف -عربی اندلسی- دەگێڕێتەوە، دامەزرێنەرانی لە ساڵی ٦١٠ هجری لە دیمەشق بوون، شێخ جەمالەدین ساوەیی ئەم تەریقەتەی بردۆتە میسر.

قەڵەندەرییەکان بە چوار تیغ لێدان ناسراون، چونکە مووی سەر و ریش و سمێڵ و برۆشیان دەتاشی {بڕوانە عطاءالله تدین ل ٤٤١ ـ٤٥٠}

د. خرمشامی له (حافظ نامه) دا نووسیویەتی مەسەلەی سەر چوار تیغ لێدان (سەر و ریش و سمێڵ و برۆ) تاشین بۆ شێخ جەمالەدین ساوەیی دەگەڕێتەوە، کە جارێکیان لە میسردا ژنێکی جوان — زلێخا ئاسا — داوای کاری خراپی لێدەکات، شێخیش داوای ئەدەبخانە دەکات و لەوێ بۆ ئەوەی لەبەر چاوی ژنەکە بکەوێت سەر و ریش و سمێڵ و برۆی ئەتاشێت و بەمەش لای ژنەکە ناشیرین دەبێت و لە داوی شەیتان و کاری خراپ رزگاری دەبێت {خرمشاهی حافظ نامه، ج ١، ل٦٥٨}

قەڵەندەرییەکان مرۆڤی دڵ پاکی نزیك لە خوا بوون و بە پلەی بەرزی عیرفانی گەیشتوون، خواجەش دەڵێ و ئەوان لەبەر سەرتاشین، (ڕواڵەتی دەرەوەیان) گەورە نەبوون، بەڵکو لەبەر ناخ و پاکی دڵیان بوو، بۆیە هەزار نوکتەی جوانی لە مووباریکتر لەم (سەرتاشینەدا هەیە) و مەرج نییە ئەوەی سەر و ریشی تاشی ببێتە قەڵەندەر و فێری قەلەندەری ببێت.

**٨ — مدار نقطه ی بینش ز خال تست مرا**

**که قدر گوهر یکدانه جوهری داند**

مەداری خاڵی (سۆمای) چاوانی من خاڵی تۆیە، چونکە گەوهەرفرۆش قەدری گەوهەری بێ وێنە دەزانێ.

مدار: مەدار هێڵی سووڕانەوە بە دەوری شتێکدا، لێرەدا مەبەست لە گرنگی پێدانە.

نقطەی بینش: سۆمای چاو،گلێنەی چاو.      جوهری: گەوهەرفرۆش، ئەو کەسەی کە کاری (گەورهەر ناسین و فرۆشتن) یەتی و شارەزایە تیایدا.

خواجە دەڵێ: سۆمای چاوی من بەردەوام لە دەوری خاڵی تۆ دەسوڕێ و تەواف دەکات، واتە چاوانم تەنیا لە خاڵی تۆیە و تەنیا بیر لە خاڵی ڕەشی تۆ دەکەمەوە، بێگومان ئەم لە دەورەسوڕانە بێ هودە نییە و خاڵی تۆ گەوهەرە و چاوی منیش گەوهەرناس و ڕێز و قەدری گەوهەریش هەر لای گەوهەرناسە یاخود قەدری زێڕلای زیڕنگرە.

**٩ — به قدّ و چهره هر آن کس که شاهِ خوبان شد**

**جهان بگیرد اگر دادگستری داند**

هەر ئەو کەسەی کە بە بەژن و ڕووخسار بووە پاشای جوانان، گەر دادپەروەری بزانێت جیهان دەگرێت.

جهان بگیرد: جیهان دەگرێت، دەبێتە پادشای جیهان.      دادگستری: دادپەروەری

خواجە پێی وایە گەر ئەو کەسەی بە ڕووخسار و شێوە پادشای جوانانە تۆزێ دادپەروەری بزانێت دڵی عاشقان ڕاگرێت دونیا دەگرێت و دەبێتە پادشای جیهان و ناوبانگ دەردەکات.



لێرەدا خواجە بۆ بوونە پادشا بۆ چوونە پادشا و سەردەمی جیهان عەدل و دادپەروەری بە مەرج دەگرێت.

**١٠ — ز شعر دلکش حافظ کسی بود آگاه**

**که لطف طبع و سخن گفتن دری داند**

کەسێ لە شیعری سەرنجڕاکێشی حافظ تێدەگات، کە سروشتی نەرم و قسەکردنی (دەری) بزانێت.

دلکش: سەرنجڕاکێش، دڵکەش      بود آگاه: تێدەگات

لطف طبع: سروشتی نەرم و زەوقی سەلیم و دروست      سخن گفتن: قسە کردن

دری: دەری، قۆناغێکی مێژووی زمانی فارسییە، لە پێش هاتنی ئیسلامدا زمانی جڤاك و خەڵکی بوو، بەڵام پاش ئیسلام بووە زمانی ڕەسمی (دەربارە — کۆشکی پادشایان) و زمانی نووسین و ئەدەب و تا ئێستاش — بە هەندێك گۆڕانی کەمەوە — زمانی نووسینی ڕەسمی و خوێندنە. شیعری حافظ بە فارسیی دەری نووسراوە. دەری لە (دەربارە — کۆشکی پادشایان)ەوە هاتووە، چونکە سەرەتا لەوێوە گەشەی کردووە.

خواجە لێرەدا دەڵێ کەسێ لە شیعری سەرنجڕاکێشی و دڵڕفێنی حافظ دەگات کە هەم زەوقی دروست و سەلیم بێت و هەم قسە کردنی فارسی و دەریش بزانێت.

# غەزەلی سەد و حەفتا و پێنجەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی مەقسور**
**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلان)**

**١ - هر كه شد محرم دل در حرم يار بماند**
**وانكه اين كار ندانست در اِنكار بماند**

هەر كەس بووە مەحرەمی دڵ، لە حەرەمی یاردا دەمێنێتەوە و ئەوەش كە ئەم كارەی نەزانی لە (انكار- بێ باوەڕی و دژایەتی كردنی) دا دەمێنێتەوە.

محرم دل: مەحرەمی دڵ    ندانست: نەیزانی    انكار: ئینكار، نكۆڵی كردن

ئەم بەیتە دوو خاڵی گرنگی تێدایە یەكەمیان بوونە مەرحەمی دڵ و رازە كە مەرجی عیرفانە و هەر كەس توانی ببێتە مەحرەمی دڵ و نهێنی ئاشكرا نەكرد ئەوا لە مەحرەماتی یار دەمێنێتەوە و فەیزی ئیلاهی بەردەوام دەبێت، بەڵام هەر كەس ئەم مەحرەمییە نەزانێت و رازەكان نەپارێزێت لەو حەرەمە دەردەكەوێت و لە بێ باوەڕی و نكۆڵی كردندا دەمێنێتەوە.

خاڵی دووەم بریتییە لەوەی كە هەركس نەزانێت بچێتە نێو عیرفانەوە نكۆڵی دەكات و ئینكاری دەكات و بڕوای پێی نابێت، چونكە هەركەسێك شتێك نەزانێت نكۆڵی دەكات وەك د. خرمشاهی دەڵێ: ئەم میسراعەی دووەم ئەم فەرموودەیەمان بیردەخاتەوە (الناس اعداء...) واتە مرۆڤ دوژمنی ئەوشتەن كە نایزانن.{حافظ نامە، ج ١، ل ٦٦١}.

**٢- اگر از پرده برون شد دل ما عيب مكن**
**شكر ايزد كه نه در پردەی پندار بماند**

ئەگەر دڵی ئێمە لە پەردە هاتە دەرەوە (پەردەی لەسەر رادەكان هەڵدرایەوە) رەخنەی لێ مەگرە، سوپاس بۆ خودا كە لە پەردەی گومان و وەهمدا نەمایەوە .

از پرده برون شد: لە پەردە هاتە دەرەوە، پەردە دڕاندن، بەواتای فاش كردنی راز و نهێنی و لە دەست دانی سەبر و تەحەمولە لە شاردنەوەی رازی ئیلاهیدا.

عیب مكن: رەخنە مەگرە، عەیبی مەگرە.

ایزد: یەزدان، خودا    پندار: گومان، وەهم

خواجە لە بەیتی یەكەمدا (مەحرەمی راز) بوون بە مەرجی مانەوە لە دونیای عیرفان و حەرەمسەرای عەشقدا ئەداتە قەڵەم، بەڵام لێرەدا بە سۆفییە بانگەشەكەرەكان دەڵێت ئەگەر سەبرم نەما و دڵم پەردەدڕی كرد و راز و نهێنییەكانی عەشقی خستەڕوو، رەخنەی لێ



مەگرە، چونكە ئەم فاشكردنە چاكترە لەوەی كە وەك سۆفییەكان لە پەردەی وەهم و گوماندا بمێنێتەوە لە دوای ئەنانیەتدا بیت، بۆیە دەڵێ: ئەی سۆفیلكە ئەگەر دڵم لە بێ ئارامیدا رازی عەشقی دركاند رەخنەی لێ مەگرە، چونكە سوپاس بۆ خوا كە لە نێو پەردەی وەهمی ئەنانیەتدا نەماوەتەوە.

**٣ – صوفيان واستدند از گروِ مىْ همه رخت**
**دلقِ ما بود كه در خانەی خمّار بماند**

سۆفییان هەموو بەرگ و پۆشاكیان كە لە بارمتەی (مەی) دا دانابوو وەریان گرتەوە، تەنیا خرقەی ئێمە بوو كە لەماڵی مەیفرۆشدا مایەوە.

واستدند: وەریانگرتەوە    گرو: بارمتە، رەهن    رخت: بەرگ و پۆشاك

خواجە دەڵێ: ئێمە هەموومان جل و بەرگی سۆفییانەمان لەبارمتەی عەشق (مەی)دا دانا و عەشقمان پێ كڕی، بەڵام سۆفییەكان هەموویان شتەكانیان پێ چاكتر بوو (بۆیە بەرگە رەسمییەكانی سۆفیگەری رواڵەتیان وەرگرتەوە و عەشقی ئیلاهییان نەویست) تەنیا ئێمەی رەندان بووین كە عەشقمان پێ چاكتر بوو بۆیە بەرگی (خرقە)ی سۆفییایەتیمان هەر لە ماڵی مەیفرۆش لەبارمتەی مەی / عەشقدا مایەوە.

ئەكرێ ئەم بەیتە پەیوەندی بە بەیتی پێشوو هەبێت و ماناكەی بەم شێوەیە دەبێت، ئێمە هەموومان لەماڵی مەیفرۆش جلوبەرگمان لە بارمتەی شەڕابدا دانابوو، سۆفییەكان زۆرزان بوون بەرگەكانیان وەرگرتەوە و ئابڕوویان نەچوو، بەڵام ئێمە وەرمان نەگرتەوە و ئاشكرا بووین.

**٤ – داشتم دلقى و صد عيب نهان ميپوشيد**
**خرقه رهنِ مى و مطرب شد و زنّار بماند**

خیرقەیەكم هەبوو سەد عەیبی دادەپۆشیێ خیرقەم دا مەی و موتریب و زونار مایەوە.

داشتم: هەموو    دلقى: خیرقەیەك    نهان ميپوشيد: دەشاردەوە، دادەپۆشی

زنار: پشتوێنی مەسیحی و زەردەشتییەكان.

خواجە دەڵێ: كاتێ كە سۆفییەكی رەسمی بووم و گرنگیم بە لایەنی رواڵەتی و سەرزارەكی عیرفان ئەدا، كۆنە خیرقەیەكم هەبوو —وەك سۆفییەكانی دیكە — كە دنیایەك عەیبی منی ئەشاردەوە، بەڵام كە بوومە عارفی تەواو (رەند) خیرقەم لە بارمتەی عەشق و موتریبدا (رەمزی عەشقی حەقیقین)دانا و (زنار) بە گوتەی سۆفییەكان عەیبەكانم — دەركەوت، بەڵام لە حەقیقەتی شیعرەكەدا ئەوەیە كە رواڵەتی عیرفانم كردە قوربانی حەقیقەتی عیرفان و وازم لە رەسمییاتی وشك هێنا.

**٥ — خرقه پوشان دگر مست گـذشتند و گـذشت**

**قصّه‌ی ماست که در هر سربازار بماند**

خیرقـه پۆشـانی دیکـه مەسـت بـوون و تێپـەڕی، تـەنیا چـیرۆکی ئێمەیـە کـە لـە هـەر سەربازاڕێکدا مایەوە.

خرقه پوشان: سۆفییان، خیرقه پۆشان     مست گـذشتند: مەست بوون، بەمەستی ڕۆیشتن.

گـذشت: تێپەڕی، کەس باسیان ناکات.

خواجه دەڵێ: سۆفییەکانی دیکەش هەر مەست بـوون کەچـی کـەس باسـیان ناکـات و تەنیا چیرۆکی مەستی ئێمە بووەتە بنێشتە خۆشەی سـەرزاران و لـە هـەر بازاڕێکـدا بـاس دەکرێت و دەگێڕێتەوە.

لە زۆرێك لە نوسخەکاندا میسراعی یەکەم (محتسب شیخ شد و فسق خودا زیاد بـبرد) هـاتووە کە هەمان واتای هەیە، واتە: (موحتەسیب بووە شێخ و فیسق و فجوری خۆی لەیاد بردەوە).

**٦ — هر می لعل کزان دست بلورین ستدیم**

**آبِ حسرت شد و در چشم گهربار بماند**

هەر (مەی)یەکی سووری ئاڵمان لەو دەستە بلورینە وەرگرتبێ، بووە ئـاوی حەسـرەت و لـە چاوانی فرمێسکبار(ئەشکبارماندا) مایەوە.

ستدیم: وەرگرت     گهربار: ئەشکبار، فرمێسکی وەك گەوهەر (بار)

خواجه لێرەدا حەسرەتی دووری لە وەسڵ و عەشـقی یـار دەردەبڕێـت و دەڵـێ: هـەر پێکـە شەرابێکی عەشقمان لەو دەستە بلورینانـەی یـاری حەقـەوە وەرگرتبێـت و مەسـتی عەشـق و وەسڵی بووین دوایـی لـە خەفـەتی بـەردەوام نەبوونیـدا بووتـە ئـاوی حەسـرەت و بـە چـاوانی فرمێسکباردا ماوەتەوە.

**٧ — جز دلِ من کــه ز ازل تا به ابد عاشق رفت**

**جاودان کس نشنیدم که درکار بماند**

جگە لە دڵی من کـە لـە ئەزەلـەوە تـا ئەبـەد بـە عاشـقی ڕێگـەی تـەی کـرد (مایـەوە) نەمانبیست هیچ کەسێك بەوشێوەیە بەردەوام بێت.

نشنیدم: نەمانبیست     کە درکاربماند: لەسەر کارەکە (عەشق) بەردەوام بێت.

خواجه لێرەدا لەلایەکەوە وەسفی دڵی خۆی دەکات کـە لـە ئەزەلـەوە تـا ئەبـدەوە لەسـەر عەشقی یار ماوەتەوە لە کاتێکدا کەسی دیکە بەردەوام نەبووە لەلایەکی دیکەوە ئەیەوێت ئـەم یەکلابوونەوەیە (اخلاص)ە بۆ یار بخاتەڕوو.



لەڕاستیدا ئەم غەزەلە یەکێکە لەو غەزەلانەی کـە جیـاوازی لـە سـاغکردنەوەیدا بەرچـاو دەکەوێت جیاوازییەکەش لە سێ خاڵدایە.

١ — گۆڕانی (تەرتیبی) بەیتەکان و پێش و پاش کەوتنیان بۆ نموونە — بـەیتی چـوارەم — لە هەنـدێ نوسـخەدا — وەك عیوضـی — پێنجەمـەوە لـە هەنـدێ نوسـخەدا نۆیەمـە وەك — قزوینی، و...

هەروەها هەندێك بەیتی دیکەش جێگۆڕکێیان پێکراوە:

وەك ئاماژەمان پێداوە لەبەر ئەوەی لـە غەزەلـدا — یـەکێتی بابـەت — نییـە و بەیتـەکان زنجیرەئاسا نین کە ئەگەر هاتوو ڕیزبەندییان تێکبچێت ببێتە هۆی تێکچوون یـا گـۆڕانی واتـای گشتی لەبەر ئەوە ئەم گۆڕانە لە ڕیزکردندا زیاتر پابەندی سـەلیقە و پـشت بەسـتن بـە نوسـخە دێرینەکان دەبێت.

٢ — جیاوازی میسراعی تەواو وەك میسراعی یەکەمی بەیتی (٥).

٣ — جیاوازی لە ئاستی وشەدا، کە لە شوێنی خۆیاندا ئاماژە بە هەندێکیان دەکەین.

لەهەندێك نوسخەدا لەبری (دلِ من) (دلم) هاتووە و لەبری (کە) (کو) هاتووە.

**٨ — گشت بیمار که چون چشم تو گردد نرگس**

**شیوه‌ی او نشدش حاصل و بیمار بماند**

گوڵی نێرگز خۆی نەخۆش خست تا وەك چاوانی تۆی لێ بێت (مەست بێت) وەك ئـەوی لـێ نەهات و بە بیماری مایەوە.

گشت بیمار: نەخۆش کەوت     چون چشم تو گردد: وەك چاوی تۆی لێ بێ.

نشدش حاصل: بە دەستی نەهێنا، بۆی حاصل نەبوو.

خواجه لێرەدا دەیەوێ جوانی و مەستی چاوی یار لـە مەسـتی نێرگـز جـوانتر بخاتـەڕوو، دەڵێ نێرگز کە چاوی مەستی تۆی بینی خۆی نەخۆش خست تـا وەك چـاوانی تـۆ مەسـت و جوان بێت کەچی وەك چاوی تۆی لێ نەهات و - هەر چاوی تۆ جوانتر بـوو- بـە نەخۆشـی و بیماری مایەوە.

وەك ئەو شیعرە کوردییەی کە حەسەن زیرەکی نەمر بە مەقام دەیڵێت:

**مانگی چواردە بۆیە دایم بەرز ئەبێ و ئەشنێتەوە**

**چونکە جوانیی خۆی لە رووی تۆ ئەبینێتەوە**

**٩ – از صدای سخن عشق ندیدم خوشتر**

**یـــادگاری که درین گنبد دَوّار بماند**

یادگارییەکی خۆشترم لەسەدای قسەی عەشق نەدیوە کە لەم گومبەتە سوڕاوە (ئاسمان)دا مابێتەوە.

صدا: سەدا    یادگاری: یادگارییەك    گنبد: گومبەتە    دوار: سوڕاوە

مەبەست لە (گنبد دوار) ئاسمان و گەردوونە.

بێگومان ژیانی ژێر ئەم ئاسمانە و نێو ئەم گومبەتەی گەردوونە یادگاری بێ شوماری تێدا تۆمار دەکرێت، بەڵام خواجە دەڵێ من هیچ سەدایەکم نەدیوە کە وەك یادگاری مابێتەوە جگە لە سەدای قسە و باسی عەشق و عاشقی.

**١٠ – بر جمالِ تو چنـــان صووت چین حیران شد**

**که حدیثش همه جا بر در و دیوار بماند**

لە جوانی تۆدا نیگاری چین واسەرسام بوو، کە دەنگوباسی لە هەمووشوێنێکدا بەسەر دەرو دیوارەوە مایەوە. صورت چین: نیگاری چینی، وێنەکێشانی شێوازی چینی، وێنەی زۆر جوان (چونکە چین بە نیگارکێشی بەناوبانگ بوو).

حیران شد: سەرسام بوو    حدیث: دەنگوباس

بردرودیوار: بەسەر دەرودیوارەوە {واتە: دەنگی دایەوە و بەسەر هەموو شوێنێکەوە مایەوە}.

خواجە باسی لە حیرەتی خەڵك دەکات لە جوانی و جەماڵی حەق، تەنانەت دەڵێ: وێنەی چینی کە رەمزی جوانییە لە وێنە و نیگاردا بە شێوەیەك لە جوانیتدا مەست و حەیران بوو کە بووە دەنگوباس و لە هەموو شوێنێکدا دەنگی دایەوە و بەسەر دەرودیوارەوە مایەوە.

**١١ – بەتماشاگەِ زلفش دلِ حافظ روزی**

**شد که باز آید و جاوید گرفتار بماند**

رۆژێك دڵی حافظ رۆیشت بۆ تەماشاگەی (تەماشا کردنی) زوڵفی کە بگەڕێتەوە، بەڵام لەوێ وا گرفتار بوو بۆ هەمیشە مایەوە.

تەماشاگە: شوێنی تەماشا    شد: رۆیشت    باز آید: بگەڕێتەوە.

جاوید: (لێرەدا بەواتای) بەردەوامی، بۆ هەمیشە.

خواجە دەڵێ کە باسی زوڵفی تۆم بیست و قسەی سەدای راز و نهێنی عەشق و جوانی رووی تۆ و سەرنجڕاکێشی پرچ و گیسوی تۆم بیست دڵم مەفتونی تۆ بوو، رۆژێك دڵم بڕیاریدا کە



بڕواتە حزور و سەیری پرچت بکات و بگەڕێتەوە (واتە بۆ هەمیشە ئەسیری عەشقت نەبێ)، بەڵام کە رۆیشت ئیدی نەگەڕایەوە و بۆ هەمیشە لە داوی پرچی تۆدا مایەوە.

واتە بەنیاز نەبووم بۆ هەمیشە لە عەشقتدا بمێنمەوە، بەڵام کە گرفتاری عەشقت بووم بۆ هەمیشە مامەوە.

## غەزەلی سەد و حەفتا و شەشەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی ئەسڵەمی موسبەغ**
**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع لان)**

**١ – رسید مژده که ایّام غم نخواهد ماند**
**چنان نماند و چنین نیز هم نخواهد ماند**

مژدە هات کە رۆژگاری خەم دوایی دێت، ئـەرێ هـەروەك چـۆن شـادی بـەردەوام بـوو، غەمیش نامێنێت.

نخواهد ماند: نامێنێت (لە داهاتوودا) ئێمە لە زمانی کوردیدا ڕێـژەی داهاتوومـان نییـە، بەڵام لە فارسیدا ئەم ڕێژەیە لە (خواه + جێناو + قەدی فرمان) دروسـتدەبێت، لـەم نموونەیـەدا نەرێیە و (ن) نەرێ چووتە سەر (خواه).

(چنان) ئاوا، لێرەدا مەبەست لە شادییە و (چنین) یش مەبەست لە غەمە.

(نیز) و (هم) هەردووکیان بەواتای (یش) کوردی دێن هەندێك لـە لێکۆڵـەران پێیـان وایـە یەکێکیان زیادە، بەڵام بەکارهێنانی لە فارسیدا ئاساییە و بۆ جەختکردنەوەیە.

ئەکرێ لێرەدا مەبەست لە (غم) قبض و لە (شادی) بسطی عارفانەبێت. خواجـە ئێـستاکە لە حاڵەتی قـبض – یا دڵگیران و نارەحەتی دووری و فیراق دایە – بەوە دڵخۆشە یاخود ئیلـهام و مژدەی شادی بەوە دڵخۆشی کردووە کە رۆژگاری غەم – قبض – کورتە و دواجار کۆتایی پێ دێت، هەروەك چۆن رۆژگاری شادیش کورت بوو. بۆیە دیسانەوە جەخت دەکاتەوە کە رۆژگـاری غەمیش کورت دەبێ.

**٢ – من ارچه در نظر یار خاکسار شدم**
**رقیب نیز چنین محترم نخواهد ماند**

گەرچی لە پێش چاوی یار کەوتم (زەبون بووم) رقیبیش ئاوا بە بەڕێزی نامێنێتەوە.

درنظر یار: لە پێش چاوی یار، لەڕوانگەی یارەوە.

خاکسار: سووك و بێ نرخ، وەك خاك، لەبەرچاوکەوتن.

خواجە دەڵێ گەرچی من بەهۆی هەڵە و گوناهێکەوە لەبەرچاوی یار کەوتووم دوچاری غـەم (قبض) بوومەتەوە، بەڵام رەقیبیش کە خـودی قـبض و غـەمـە رۆژێ لای یـار بێڕێـز و سـووك دەبێت و نامێنێتەوە.



**٣ – چو پردەدار به شمشیر می زند همەرا**
**کسی مقیم حریم حرم نخواهد ماند**

کاتێ (چونکە) دەرگەوانی حەرەم بە شمشێری لە هەموان دەدا کەس لە حەوشـەی حـەرەمی یاردا نامێنێتەوە.

پردەدار: دەرگاوان، ئەو مجێورەی پەردەی حەرەم هەڵدەداتەوە و لەبەر دەرگا وەستا.

حریم: لە رووبەری ماڵ یا حەوشەی ماڵ        مقیم نخواهد ماند: نامێنێتەوە.

ژیانی عارف بەردەوام لە (قەبـض و بـەسـط) دایـە و تـا لـە دونیادایـە هـیچ کامیـان بەردەوام نابن، هەربۆیە عارفەکان هەرگیز بە دڵنیایی ناگـەن، گـەر (پـەردەدار) دەرگـاوان قەدەر و بڕیـاری (قـەبـض) بێـت و نـەهێڵێت کـەس بەبـەردەوامی لـە وەسـڵی مەحبوبـدا بمێنێتەوە ئەوا (بەسط) بەردەوام نابێـت، لێـرەدا خواجـە ئـەم حەقیقەتـەی ژیـانی عارفـان (هاتووچۆی نێوان قبض (بەسط) دەخاتەڕوو، دەڵێ: کە قەدەر و پەردەداری غەیب هـەموان بەشمشێری قەبض دەرکات و دوچاریان بکات دڵنیابە کەس بە بەردەوامی لە وەسـڵی یـار و مەحبوبدا ناتوانێ بمێنێتەوە تەنانەت ناتوانێت لە چواردەوری ماڵەکەشدا نیـشتەجێ ببێـت چ جای بگات بە حەرەمی وەسڵ.

**٤ – چه جای شکر و شکایت ز نقش نیك و بد است**
**که بر صحیفەی  هستی رقم نخواهد ماند**

کاتێ کەلەسەر پەرەی ژیان نیشانەیەك نامێنێت، ئیدی شیاوی ئەوە نییـە کـە لـە شـوکری رۆڵی چاك و شکات لە رۆڵی خراپ بکەین.

نیك و بد: چاك و خراپ        صحیفەی هستی: پەردەی بوون، پەڕەی ژیان

رقم: نیشانە، خەت نووسراو.

مادام هەمووشتێك لەناو دەچێت هیچ نیشانەیەك و نووسراوێك لەسـەر لاپـەڕەی بوونـدا نامێنێتەوە و بەهیلاکدا دەچێت ئیدی شیاوی ئەوە نییە خۆمان گرفتاری قسەی چاك و خراپی خەڵکی بکەین هەرخەریکی سوپاس و ستایش یا شکات و گلەیی کردن بین. هەموو شتێك لە نێو دەچێت واتای ئایەتی ﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ (٢٦) وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالإِكْرَامِ (٢٧)﴾ سوره الرحمن، ئایەتی  (٢٦ – ٢٧)، یاخود (کل شيء هالك الا وجهه) ئایـەتی ٨٨ سورەتی قصص.

**٥ — سرود مجلس جمشید گفته‌اند این بود**

**که جام باده بیاور که جم نخواهد ماند**

ئەڵێن له کۆڕی جەمشیددا سروود هەبووە ئەمه بووە، پێکی بادە بهێنە، چونکە جەمشید (جەم) نامێنێتەوە.

جم / جمشید: جەم کورتکراوەی جەمشیدە و یەکێکە لە پادشایانی زنجیرەی پیشدادییەکان و ئاڤێستا ناوی هاتووە.

بیاور: بهێنە

خواجە دەیەوێت لێرەدا زیاتر جەخت لە واتای بەیتی پێشوو بکاتەوە و دەڵێت: ئەڵێن گوایە لە کۆڕ و مەجلیس جەمشیدی پادشای پیشدادییەکاندا سروودێك گوتراوە مانا و ناوەڕۆکەکەی ئەمە بووە، دونیا بۆ کەس نییە و جەمشیدیش لەناو دەچێت کەوا بێ پێکی بادە و شەرابی عەشق بهێنە.

**٦ — توانگرا دلِ درویشِ خود بەدست آور**

**که مخزنِ زر و گنج درم نخواهد ماند**

ئەی بەتوانا دڵی دەروێش و بێ نەوای خۆت بە دەست بهێنە، چونکە مەخزەنی زێڕ و گەنجی درهەم نامێنێتەوە.

توانگر: بەتوانا، دەسەڵاتدار توانگرا: ئەی بە توانا

درویش خود: دەورێشی خۆت، مەبەست لەو بێنەوا و نەدارانەیە کە بەدەوروبەرتدان و پێویستیان بەتۆیە.

بەدست آور: بەدەست بهێنە، رازییان بکە.

درم: درهەم و پارە

خواجە روو لە دەسەڵاتدار و بە تواناکان دەکات و دەڵێ: دڵی بێنەوا و نەدارەکانی دەوروبەرتان رابگرن و دڵیان مەڕەنجێنن، چونکە هەر ئەوە دەمێنێتەوە و هەرچی پارە و پول و ماددە هەیە هەمووی تەواو دەبێت و مەخزەنی زێڕ و گەنجینەی درهەم و دینار نامێنێتەوە و تیا دەچێ.

**٧ — غنیمتی شمر ای شمع وصل پروانە**

**که این معاملە تا صبحدم نخواهد ماند**

ئەی مۆم وەسڵی پەروانە بە دەستکەوت بزانە، چونکە ئەم مامەڵەیە تابەرەبەیان زیاتر بەردەوام نابێت.



صبحدم: بەیان

خواجە بە مەعشوقان دەڵێت، وەسڵی عاشقان بە دەستکەوت بزانن (لێرەدا مۆم بە نموونەی مەعشوق و پەروانەش بە نموونەی عاشق دەهێنێتەوە)، چونکە ئەم مامەڵەی عەشق و عاشقایەتییە ماوەیەکی کورتە و هەتا هەتایە بەردەوام نابێت، بەیتەکە ئاماژەیە بە کورتی ماوەی وەسڵ و دیداری عەشق.

**٨ — بدین رواقِ زبرجد نوشته‌اند بە زر**

**که جز نکویی اهل کرم نخواهد ماند**

بەسەر ئەم هەیوانە نیلییەی ئاسمانەوە بە زێڕ نوسیوویانە، کە جگە لە چاکەی ئەهلی کەرەم و پیاوەتی هیچ نامێنێتەوە.

بدین: بەسەر ئەم رواق: هەیوان، تاق

زبرجد: جۆرە زومرۆتێکە کە رەنگی سەوزی مەیلەو زەردە.

رواق زبر جد: مەبەست لە ئاسمانی نیلییە. نیکویی: چاکەکاری.

خواجە دەڵێ: بەسەر ئاسمانەوە بە ئاوی زێڕ (واتە لەبەر گرنگی گوتەکە) نووسیویانە: جگە لە چاکەکاری و پیاوەتی مرۆڤی چاك و جوامێرەکان هیچی دیکە نامێنێتەوە و هەموو شتێ لەناو دەچێت.

واتە: دەوران دەوڵەت لە دەست ئەسێنێ و تەنیا ناوی چاك تاسەر ئەمێنێ.

**٩ — ز مهربانی جانان طمع مَبُر حافظ**

**که نقشِ جور و نشانِ ستم نخواهد ماند**

حافظ لە میهرەبانی یار بێ ئومێد مەبە، چونکە پاشماوەی جەور و نیشانەی ستەم نامێنێتەوە.

طمع مبر: بێ ئومێد مەبە.

جور: جەور، زوڵم.

خواجە لێرەدا باوەڕی تەواوی خۆی بە کۆتایی هاتنی نارەحەتی و زوڵم و ستەمە و ئەمەش بە میهرەبانی یار (خالق) ئەداتە قەڵەم، بە خۆی و خەڵکی دەڵێ: خودا میهرەبانە و لە میهرەبانی ئەو بێ ئومێد مەبن، چونکە بە گەورەیی ئەو زوڵم و ستەم دوایی دێت و نامێنێتەوە.

مسراعی یەکەم لە ئایەتی ﴿لاَ تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللَّـهِ﴾ الزمر ئایەتی(٣٩)، وەرگیراوە و هەمان واتای هەیە.

ئەکرێ مەبەست لە (نقش جورنشان ستم)ی میسراعی دووەم (قبض) بێت و لێرەدا باس لە تەواو بوونی قەبض بێت.

## غەزەلی سەد و حەفتا و حەفتەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی ئەسلەمی موسبەغ**
**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لان)**

**١ – حسبِ حالی ننوشتی و شد ایّامی چند**
**محرمی کو که فرستم به تو پیغامی چند**

شەرحی حاڵێکت نەنووسی چەند رۆژێك تێپەڕی، مەحرەمێك کوا چەند پەیامێك بۆتۆ بنێرم.

حسب حالی: شەرحی حاڵ، حاڵ و ئەحواڵ.

شد ایّامی چند: چەند رۆژێ تێپەڕی.

فرستم: بنێرم.

وەك بڵێی ماوەیەکە خواجە لەیار دووره و ئاگایان لە حاڵی یەکتری نییە، نە ئەو حاڵ و وەزعی خۆی بۆ ناردووە و نە ئەمیش کەسێکی مەحرەمی دەست ئەکەوێت کە چەند پەیامێك بۆ یار بنێرێت.

دەڵێ: چەند رۆژێك تێپەڕی و حاڵ و ئەحواڵی خۆتت بۆ نەناردم و منیش مەحرەمێکم دەست ناکەوێت کە چەند پەیامێکت بۆ بنێرم.

**٢ - ما به آن مقصد عالی نتوانیم رسید**
**هم مگر پیش نهد لطف شما گامی چند**

ئێمە ناتوانین بەو پایەبەرزە بگەین، مەگەر لوتفی تۆ چەند هەنگاوێك بێتە پێشەوە.

مقصد: پلەو پایە، نتوانیم رسید: ناتوانین بگەین

پیش نهد: بێتە پێشەوە گامی چند: چەند هەنگاوێك

یەکێك لەو پەیامانەی کە خواجە بۆ مەعشوقی ئەنێرێت، ئەم مانابەرزە عیرفانییەیە، کەبە یار دەڵێت: پلە و مەقامی تۆ هێندە بەرز و بڵندە ئێمە هەرگیز بە هەوڵ و کۆشش و ریازەت ناتوانین پێی بگەین و هەرگیز پێی ناگەین مەگەر ئەوەی کە لوتفی تۆ چەند هەنگاوێك لە ئێمە بێتە پێشەوە و بە مەرحەمەت و لوتفی خۆت بتوانین بە پلەی (قرب) بگەین.

**٣ – چون می از خم به سبو رفت و گل افکند نقاب**
**فرصت عیش نگەدار و بزن جامی چند**

کاتێ مەی لە (کوپەڵەوەی) خۆمەوە کرایە گۆزە و گوڵ پەردەی لەروو لادا (پشکوت)، بۆ خۆشگوزەرانی بەفرسەتی بزانە و چەند پێکی هەڵدە.



خم: کوپەڵەی گەورەی شەرابە و (سبو)ش گۆزەی بچووکترە کە شەراب لە (خم) خانەوە بە (سبو) دەبردێتە مەیخانە و لێرەدا مەبەست لەوادەی مەینۆش و بەهارە.

گل افکند نقاب: گوڵ پەردەی لەروو لادا، پشکوت.

فرصت نگەدار: بەفرسەتی بزانە بزن جامی چند: چەند پێکی هەڵدە

خواجە دەڵێ: کاتێ کە وەختی عەیش و شادی عەشقە و باروودۆخ لەبارە بۆ عەشق بەفرسەتی بزانە و پێکی عەشقی حەقیقی هەڵدە، کە مەی لە کوپەڵەوە ئەکرێتە گۆزە و گوڵ دەپشکوێت و باروودۆخ لەبارە بۆ عەشق و مەینۆشین تۆش بەفرسەتی بزانە و چەند پێکێکی عەشقی حەق هەڵدە.

**٤ – قند آمیخته با گُل نه علاج دل ماست**
**بوسەای چند برآمیز به دشنامی چند**

دەرمانی شەکری تێکەڵاوی گوڵ چارەی دڵی ئێمە نییە، چەند ماچێك تێکەڵاوی چەند جنێوێك بکەوە بماندەیە.

آمیختە: تێکەڵاو.

دەرمانی (شەکر و گوڵاو) جۆرە دەرمانێکە کە چارەی دڵ ئەکات و بۆ بەهێز کردنی دڵ بەسوودە.

برآمیز: تێکەڵاو بکە دشنامی چند: چەند جنێوێك.

خواجە لێرەدا دەڵێ: چارەی دڵی ئێمە دەرمانی گوڵاو و شەکر نییە بەڵکو چەند ماچێکی لێوی یارە با بەجنێو و قسەی ناشیرینیشەوە بێت، یاخود لەبری تێکەڵاو کردنی شەکر و گوڵاو چەند ماچ و جنێوێك تێکەڵاو بکە و بماندەیە.

هەروەك لە (لاهوری) دا هاتووە لە عیرفاندا (ماچ) جەزبە و (جنێو) سەرزەنشت و پەروەردە کردنی مەعشوقن، بەم واتایە مەبەستی خواجە لەوەیە کە جەزبە و سەرزەنشت تێکەڵاو بکە تا پەروەردەبین و لەنێوان (خوف و رجا) دا چارەسەر بکرێین.

**٥ – زاهد از کوچه رندان به سلامت بگذر**
**تا خراب نکند صحبت بدنامی چند**

زاهید، لەکۆڵانی رەندانەوە بەسەلامەتی تێپەڕە، تا هاودەمی چەند بە ناوێك پیاو (وێران) خراپت نەکات.

بەسلامت بگذر: بەسلامەتی دەرچوو / تێ پەڕی.

خراب: بەدناو، پیاو خراپ، ریسوا.

بێگومان زاهید هەمیشە لە هەوڵی پاراستنی ئابڕوو و سەلامەتی ڕووکاری و رواڵەتی خۆیدایە و ئێستا ڕێی کەوتووەتە کۆڵانی ڕەندان کە گوێ بە ئابڕووی رواڵەتی نادەن، بۆیە خواجە پێی دەڵێ: چەند ڕەندێك (کەلای خەڵکی عەوام بەدناون و ناخیان پاکە) پیاو خراپ و بەدناو و ریسوای نەکات.

(خراب) بەمانای مەستیش دێت و ئەم مەستییەش مەستی عەشقی ئیلاهییە، لەم مانایەدا خواجە زاهید بەشیاوی ئەو مەستییە نازانێت بۆیە پێی دەڵێ بەسەلامەتی دەرچوو تا هاودەمی ڕەندان مەستی عەشقی ئیلاهیت نەکات = (بەڵام لێکدانەوەی یەکەم کەدیسانەوە توانجە بۆ زاهید شیاوتر و نزیکترە لە بەیتەکەوە).

**۶ – عیب میْ جمله چو گفتی هنرش نیز بگو**

**نفیِ حکمت مکن از بهرِ دل عامی چند**

(ئەی زاهید) کە تەواوی خراپییەکانی (مەی)ت گوت چاکییەکانیشی بڵێ، لەبەر خاتری دڵی چەند عەوامێ نەفی حیکمەت مەکە.

جملە: تەواوی، هەموو     از بهر: لەبەر خاتری     عامی: عەوام، رەمەکی

دیارە زاهید هەر خراپییەکانی مەی / عەشقی بۆ خەڵکی باس دەکات، بۆیە خواجە دەڵێ: تەواوی عەیب و خراپییەکانی مەی / عەشقت باسکرد دەباسی چاکیشی بکە، چونکە حیکمەت وایە کە باسی شتێکت کرد باسی چاکە و خراپەی بکەیت، بەڵام تۆ لەبەر خاتری دڵی چەند نەزان و عەوامێك حیکمەتیش وەلادەنێی.

لە قورئانی پیرۆزدا کەباسی (مەی) دەکات لەگەڵ خراپە زۆرەکانیدا باسی هەندێ چاکەی دەکات کە دەفەرموێت: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنْ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَا أَكْبَرُ مِنْ نَفْعِهِمَا وَيَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلْ الْعَفْوَ كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ الآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ﴾ سورە البقرە، ئایەتی (۲۱۹).

**۷ – ای گدایانِ خرابات خدا یارِ شماست**

**چشمِ اِنعام مَدارید ز اَنعامی چند**

ئەی گەدایانی خەرابات خوا یار و هاودەمی ئێوەیە، چاوتان لەبەخششی چەند (ئاژەڵ ئاسا) یەك نەبێت.

گدایان خرابات: سوڵکەرانی مەیخانە، ئەو هەژار و نەدارانەی کە لە عەشقی خودا دەژین.

یار: هاودەم و یار، هاوکار و پشتیوان     اِنعام: بەخشش و چاکە.

چشم مدارید: چاوتان لێی نەبێت.     اَنعام: چوارپێ، ئاژەڵ.



خواجە کەسانی ئاژەڵ ئاسای لە ئایەتی: ﴿أُوْلَئِكَ كَالأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ أُوْلَئِكَ هُمْ الْغَافِلُونَ﴾ سورە الأعراف، ئایەتی (۱۷۹) وەرگرتووە واتە: ئەوانەی وەك چوارپێ و ئاژەڵ وان و تەنانەت خراپتریشن، ئەو بە هەژار و فەقیرانی ڕێگەی عەشقی حەق دەڵێ چاوتان لەچاکەی مرۆڤی سووك و خراپەوە نەبێ کەوەك ئاژەڵان هەست وسۆزیان نییە و چاکە نازانن، چونکە ئێوە خوا پشت و هاوکارتانە و پێویستتان بەوان نییە.

**۸ – پیر میخانە چەخوش گفت بە دُردی کش خویش**

**کە مگو حالِ دلِ سوختە با خامی چند**

پیری مەیخانە چەند جوانی گوت بەمەیخۆشی خۆی، حاڵی دڵی سووتاو بەچەند خامێك مەڵێ.

دردی کش: مەینۆش.     خویش: خۆی .

خام: کەسی ناپوختە و هەرزە.

پیری مەیخانە پیر و مورشیدی تەریقەت و (مەینۆش)یش مورید و ڕێبوارانە و ئامۆژگارییەکی جوان و گەورەی کردوون و پێی گوتوون: حاڵی دڵی سووتاوی عاشقان و ئەحواڵی عەشقی ئیلاهی لای هەرزە و ناپوختەکان باس مەکەن، ئەکرێ مەبەست لە (خام) زاهید و انعام (ئاژەڵییەکان)ی بەیتەکانی پێشووبن.

بێگومان نەدرکاندنی رازەکانی عەشقی ئیلاهی لای نائەهلەکان یەکێکە لەمەرجەکانی عارف و نابێت ئەو رازانە لای نامەحرەم بدرکێنێت.

**۹ – حافظ از شوق رخ مِهرْ فروغ تو بسوخت**

**کامگـارا نظری کن سوی ناکامی چند**

حافظ لە تاسەی رووخساری وەك رۆژگار رووناکی تۆوە سووتا، ئەی خۆشبەخت لایەك بەلای موشتاقە بەمراد نەگیشتووەکانەوە بکە.

مهر فروغ: وەك رۆژ رووناك     کامگار: خۆشبەخت، بەختەوەر، خاوەن بەختی چاك

نظری کن: لایەك بکەرەوە

خواجە بەیاری حەق دەڵێ حافظ لەتاو دووری تاسەی وەسڵ و دیداری رووخساری وەك خۆر رووناکی تۆوە سووتا، تۆش ئەی بەختەوەر و (خاوەن بەختی چاك) لایەك بەلای ئەم سووتاوە بە موراد نەگەیشتوانەی خۆتەوە بکەرەوە.

## غەزەلی سەد و حەفتا و هەشتەم:

**بەحری موزاریعی هەشتی ئەخرەبی مەکفونی مەقسور**

**(مفعول فاعلات مفاعیل فاعلان)**

**١ — ای پستەی تو خندە زدە بر حدیثِ قند**

**مشتاقم از برای خدا یک شکر بخند**

ئەی ئەو کەسەی کە دەمی وەك فستەق بچووکت بە قسەی شەکر (شەکر لە هەمو شتێ شیرینترە) پێکەنیوە، موشتاق بۆ خاتری خوا هێندە ماوەی ماچێك پێ بکەنە.

پستە: فستەق، لە ئەدەبیاتی فارسیدا بۆ وەسفی دەمی بچووك بەکار دێت، لێرەدا درکەیە لە دەم.

خندە زدە: پێکەنیوە، گاڵتەی پێ هاتووە.

حدیث قند: قسەی شەکر، ئەبێ قسەی شەکر و چیرۆکی شەکر ئەمەبێ کەشەکر لە هەموو شتێك شیرینترە.

از برای خدا: لەڕای خوا، بۆ خاتری خوا.

شکر: شەکر لێرەدا بەواتای ماچ هاتووە، واتە: هێندەی ماچێك، کەمێك.

بخند: پێ بکەنە.

خواجە وەسفی دەمی بچووکی یار دەکات و بەفستەقی ئەداتە قەڵەم و دەڵێ هێندە شیرینە گاڵتەی بە شیرینی شەکر دێت، ئێمە موشتاقی خەندەیەکی ئەودەم و لێوەین بۆ خاتری خوا یا لە رای خوا هێندەی شەکر (کە لێرەدا درکەیە لە ماچ)ێك یاخود هێندەی ماوەی ماچێك پێ بکەنە تا دڵمان سووکنایی بێت.

ئەم غەزەلە لەڕووی ساغکردنەوەوە یەکێکە لەو غەزەلانەی کە جیاوازی لەنێوان نوسخەکاندا بەدی دەکرێت و لە هەندێ نوسخەدا سێ بەیت و لە هەندێ نوسخەدا هەشت و لەهەندێ نوسخەدا حەوت بەیتە.

هەروەها بەیتەکانیش پاش و پێش خراون و لە هەندێ وشەشدا جیاوازی سەرەکی هەیە.

ئێمە لێرەدا چاوپۆشی لە باسکردنی جیاوازییەکانی دەکەین و پشت بە ساغکردنەوەی (عیوضی) دەبەستین.

**٢ — خواهی کە بر نخیزَدَت ازدیدە رودِ خون**

**دل در وفای صحبت رودِ کسان مبند**



گەر دەتەوێت رووباری خوێن لە چاوت هەڵنەستێت، دڵ مەبەستە بەوەفای هاودەمی کوڕی خەڵکییەوە.

برنخیزەد: هەڵنەستێ (بۆ رووبار)، نەیەت.          رود خون: رووباری خوێن.

(رود)ی دووەم بە واتای فەرزەند و کوڕ یا منداڵ دێت.

کسان: کەسان، خەڵکی.

دل مبند: دڵ مەبەستە، بە ئومێد مەبە.

منداڵ و فەرزەندی خەڵکی مەبەستی مرۆڤە و مرۆڤیش وەفای نییە، ئەو دەڵێ: گەر ئەتەوێت لەبەر خەم و خەفەت هێندە نەگریەیت تا فرمێسکی خوێنین لە چاوتەوە وەك رووبار هەڵنەستێ و نەڕوات ئەوا دڵ مەبەستە بە وەفای خەڵکی و منداڵی خەڵکییەوە، چونکە بێ وەفایی ئەوان دوچاری خەم و خەفەتت ئەکات.

**٣ — طوبی ز قامتِ تو نیارد کە دم زند**

**زین قصّە بگذرم کە سخن می شود بلند**

(توبا) ناوێرێت باسی بەرامبەری لەگەڵ بەژنی تۆدا بکات، واز لەم باسە دەهێنم، چونکە قسە درێژ ئەبێتەوە (ئاو زۆر ئەکێشێ).

طوبی: درەختی توبا کە لە بەهەشتدایە و یەکێکە لە درەختەکانی بەهەشت، زۆربەرز و گەورەیە و گوتراوە کە هەر گەڵایەکی سێبەری بۆ کەسێك هەیە...

نیارد: ناوێرێت          بگذرم: وازدەهێنم          بلند: درێژ

خواجە دەڵێ درەختی توبا هەرگیز ناوێرێت باسی ئەوە بکات کەشان لەشانی بەژنی ڕێك و بەرزی تۆ بدات، ئەم قسەیە — جوانی تۆ درەختی توبا و بەهەشت — هەویرێکە و ئاوی زۆر دەکێشێ بۆیە وازی لێ دەهێنم و باسی ناکەم.

**٤ — ار طیرە مینمائی و گر طعنە میزنی**

**ما نیستیم معتقد شیخ خود پسند**

ئەگەر تورە دەبیت و گەر تانەم لێ ئەدەیت   ئێمە باوەڕمان بە شێخی خۆپەسەند نییە

طیرە: تورەیی، پەشێوی          طیرە مینمایی: تورەیی دەنوێنی.

مانیستیم معتقد: باوەڕمان پێی نییە.          خودپسند: خۆپەسەند، خۆ بەشت زان.

خواجە بەرامبەر بە رەخنەگران و سۆفییە رەسمییەکان دەڵێ، گەر تورە ببیت و تانەمان لێ بدەیت و هەرچی بەرامبەرمان بکەیت ئێمەی (رەندان) باوەڕمان بە شێخێك نییە کە خۆپەسەند بێت.

**٥ — ز آشفتگیّ حالِ من آگاه کی شود**

**آن را که دل نگشت گرفتارِ این کمند**

ئەوکەسەی کە دڵی گرفتاری ئەم کەمەندە نەبێ کەی لە پەرێشان حاڵی من ئاگادار ئەبێ (تێ ئەگا).

آشفتگی حال: پەرێشانی حاڵ    نگشت: نەبوو    کمند: کەمەند

ئەم بەیتە تەواوکەری بەیتی پێشووە و کەمەند دوای فرِوفێڵی شێخی خۆپەسەند بەیتی پێوە و خواجە دەڵێ: کەسێ کە گرفتاری داوی فرِوفێڵی شێخ نەبووبێت لە پەرێشانی حاڵی من سەبارەت بە شێخ تێناگات.

**٦ — بازارِ شوق گرم شد آن سرو قد کجاست**

**تاجانِ خود بر آتش رویش کنم سپند**

بازاڕی شەوق و تاسە گەرم بوو، ئەو بەژن سەروە لەکوێیە تاگیانی خۆم وەك (سپەند، اسفند) بکەم ئاگری رووخساری دا.

سپند: گیایەکە (ئەکرێ وەك بوخورد بێت) کە ئەکرێتە سەرئاگر، بەڵام بۆ لەچاو نەچوون

خواجە لە دوی یار ئەگەڕێت تا گیانی خۆی وەك (اسفند بکاتە قوربانی و بیخاتە نێو رووخساری وەك ئاگری تا لە چاو نەچێت و ئازاری پێ نەگات، چونکە بازاڕی شەوق و تاسە بۆ یاری بەژن بڵند زۆر گەرم بووە.

جێگەی ئاماژە پێدانە (سروقد) ی میسراعی یەکەم بە دوو شێوەی دیکە هاتووە کە (شمع قد)لە خانلری — عیوض و (شمع رخ) لە قدس — هروی کە لەڕاستیدا و لە روالەتدا وا دەردەکەوێت کە (شمع قد) لەڕووی واتاوە کەمێ نەشاز دەردەکەوێت، چونکە بەژنی وەك مۆم بۆ بەژن بەرزی یار دەست نادات.

**٨ — حافظ چو ترکِ غمزەی ترکان نمی کنی**

**دانی کجاست جای تو خوارزم یا خجند**

حافظ ئێستا کە واز لە خەمزەی جوانان ناهێنی، ئەزانی شوێنت کوێیە، خوارزم یا خوجەندە.

ترك نمیکنی: وازی لێ ناهێنی    ترکان: تورکان، جوانان.

خوارزم و خجند: دوو شاری تورکستانن، کە تورکی جوانی زۆر تێدایە.

خواجە بە خۆی دەڵێ، ئێستا کە ناتوانی واز لەناز و خەمزەی جوانانی تورك بهێنی دەبێ بڕۆیت لەیەکێ لە شارەکانی تورکستان (خوارزم یا خوجەند) بژیت.

واتە تۆ کە توانای وازهێنانت نییە لە ناز و کریشمەی جوانان و یاران پێویستە بڕۆیتە شوێنی ژیانی ئەوان.



## غەزەلی سەد و حەفتا و نۆیەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی ئەسڵەمی موسبەغ**

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لان)**

**١ — دوش وقتِ سحر از غصّه نجاتم دادند**

**وندر آن ظلمتِ شبِ آبِ حیاتم دادند**

دوێنی شەو (ئەم شەوی رابردوو) کاتی سەحەر لە خەفەت رزگاریان کردم و لەو تاریکی شەوەدا ئاوی نەمریان پێ دام.

غصە: خەفەت، غەم    نجاتم دادند: رزگاریان کردم

وندر: لەو، لەنێو    ظلمت: تاریکی

ئەم غەزەلە بەگوتەی رەخنەگران و لێکۆڵەوەرانی دیوانی حافظ یەکێك لەچوار بەرزترین غەزەلی عیرفانی حافظە کە (دوش دیدم کە ملایك) و (در ازل پرتو حسنت) و (سالها دل طلب جام جم از ما میکرد)ن.

خواجە وەك هەمیشە وەك زەمەنی سەرفرازی لەبەرەبەیان و سەحەر ئەدوێت، چونکە ئەو هەمیشە بەرەبەیان بە زەمەنی رزگاری لەخەم و خەفەت و پەیوەندییە نەفسانی و دونیاییەکان ئەداتە قەڵەم. لێرەشدا دەڵێ ئەم شەوی رابردوو کاتی سپێدە لەخەم و خەفەتی نەفسانی و پەیوەندییە دونیاییەکان (حەزە دونیاییەکان) رزگاریان کردم و لەو تاریکەشەوەدا ئاوی نەمریان (لە دەستی حەزرەتی خدرەوە پێدام) کە ئاوی رزگار بوونە لە خەفەت و چوونە نێو دونیای باڵای عەشق و عیرفان.

خەتمی لاهوری لەشەرحە عیرفانییەکەی خۆیدا چیرۆکێك ئەکاتە باکگراوندی ئەم بەیتە، کورتەی چیرۆکەکەی لاهوری ئەوەیکە (شاخ نبات) ژنێکی جوانی شیراز بووە و هەموان بە ئاواتەوە بوون بەدیداری بگەن، یەکێ لەوانەش حافظ بووە و پاش دۆعا و نزا کردن حافظ بەدیداری ئەگات و ئەو شەوە بەجۆرێك خەوی لێ ئەکەوێت کە بۆسەحەر خەبەری نابێتەوە و کاتی سەحەر لەخەودا حەزرەتی خدر بە دەستی موبارەکی پەرداخێك ئاوی حەیاتی ئەداتێ و کە خواجە ئەیخواتەوە لە خەم و خەفەتی حەزی دیداری شاخ بنات رزگاری دەبێت و بەیەکجاری دڵی یەکلا دەبێتەوە بۆ عەشقی ئیلاهی.{ختمی لاهوری، ج ٢، ل١١٩٨ ـ ١١٩٩}.

ئەم گوتانەی لاهوری گەرچی پێویستیان بە بەڵگەی مێژوویی هەیە، بەڵام لەگەڵ مەشرەبی حافظدا تاڕادەیەك یەکدەگرێتەوە، چونکە حافظ لەو دەستەیە لە عارفان کە بڕوایان بە عەشقی

دونیایی و جیلوە جوانەکانی حەق هەیە لە دونیادا کەشایانی چێژ لێ بینینن — بێگومـان ئـەم چێژبینینەش لەلایەنی مەعنەوییەوە نەوەك لەڕووی نەفسانی و ماددییەوە — ئەم دەستەیە کـە (غەزالی و شێخ اوحد الدینی کرمانی و شێخ محی الدینی عراقی) لە گەورە و بەناوبانگەکانن لە جوانییە دونیاییەکان سەیری جوانی حەقیان کردووە و بەدونیاوە پەیوەست نەبوون {لاهوری ج٢ ل ٨٠٠ }، بەڵام شایانی گوتنە ئەم غەزەلە باس لە جوانییە دونیاییەکان ناکات بـەڵکو (گـەر ئەم چیرۆکە راست بێت) بە خەفەت و غەمیان دەزانێت.

**٢ — بیخود از شعشعەی پرتوِ ذاتم کردند**

**بادە از جام تجلّیِ صفاتم دادند**

لە ڕووناکی پرتەوی زاتدا بێ هۆشیان کردم و لەجامی تەجەلی سیفاتیش شەرابیان پێدام.

بیخود: بێ ئاگا، بێ هۆش. شعـشعە: ڕوونـاکی، تیـشك. تجلـی: جیلـوە کردن، خۆ دەرخستن. تجلّی صفات: جیلوە کردنی سیفات.

جیلوە کردنی زاتی حەق واتە: دەرکەوتن و جیلوە کردنی لە دڵـی عارفانـدا، خـودی جیلـوە کردن کە بەواتای دەرکەوتن بێـت جەمـەلێکی گـەورەی لـە فەلـسەفە و کـەلامی ئیـسلامی و عیرافانیدا دروستکردووە، زۆرینەی عارفەکان بڕوایـان بـە جیلـوەکردنی ئیلاهـی هەیـە، بـەڵام جیلوەکردن بە سێ بەشەوە:

١ — جیلوەی زاتی حەق، ٢ — جیلوەی سیفات، ٣ — جیلوەی افعال.

شوێن و کات و توانای جیلوەی زاتی حەقیان نییە و لەگەڵ جیلوەکردنیدا فـەنا دەبـن بۆیـە گوتراوە کە جیلوە زات فـەنا بـوون یـاخود (اسـتتار) و شـاردنەوەی (خلـق) دەهێنێـت و ئـەم حاڵەتەش لە قورئاندا بە (صعقا) ناوبراوە هەروەك حـەزرەتی موسـا داوای جیلـوە کردنـی ذات دەکات، بەڵام خوای گەورە پێی دەفەرموێت تۆ توانای دیتنی منت نییە، بـەڵام سـەیری کێـوی طور بکە ئەگەر لە جێی خۆیدا بەرگەی گرت ئەوا دەبینی، کە خوا بۆ کێوی طـور جیلوەی کرد، کێوەکە شی بووەوە و موساش دوچاری (صعق) واتـە: بـێ هۆشـی هـات. وەك دەفـەرموێت: ﴿وَلَمَّا جَاءَ مُوسَى لِمِيقَاتِنَا وَكَلَّمَهُ رَبُّهُ قَالَ رَبِّ أَرِنِي أَنظُرْ إِلَيْكَ قَالَ لَـنْ تَرَانِـي وَلَكِـنْ انظُـرْ إِلَـى الْجَبَلِ فَإِنْ اسْتَقَرَّ مَكَانَهُ فَسَوْفَ تَرَانِي فَلَمَّا تَجَلَّى رَبُّهُ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُ دَكًّا وَخَرَّ مُوسَى صَعِقًا فَلَمَّا أَفَاقَ قَالَ سُبْحَانَكَ تُبْتُ إِلَيْكَ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُؤْمِنِينَ ﴾ سورەتی الأعراف، ئایەتی (١٤٣).

هەندێك لە عارفەکان پێیان وایە جیلوەی زاتی حەق ئیمکانی نییـە، چـونکە لـە کاتێکـدا دەبێت کە جوملە خەلق بشارێتەوە.



جۆری دووەمی جیلوە کە جیلوەی سیفاتە بریتییە لە دەرکـەوتن و جیلـوەکردنی یـەکێ یـا چەند سیفەتێکی خودا لە مرۆڤدا و ئەم جۆرە ئیمکانی هەیە. بۆ نموونە گەر بە سیفەتی جـەلال جیلوە بکات گەورەیی و بـەڕێزی مەعـشوق دێتەکایـەوە، وەك دەفـەرمووێت: ﴿اذا تَجلی الله لشئ خشع لە﴾ و گەر لە جمال جیلوە بکات خۆش و نەرمی و هاودەمی دێتە ئاراوە.

لە جیلوەی سیفاتدا سیفاتی خەلق لە سیفاتی خودا دا دەشارێتەوە نـەوەك زاتیـان وەك لـە جۆری یەکەمدا.

جۆری سێیەمی جیلوە کردنیش کە جیلوەی ئەفعالە تیایدا کردارەکانی مرۆڤ جێگیر دەبێت. یەکەمین جیلوە لای مرۆڤ جیلوەی ئەفعال و پاشان سیفات و پاشان ذاتە، لە جیلـوەی ئەفعالـدا کردارەکانی خەلق جێگیر دەبێت و لـە سـیفاتدا کـردار و سـیفاتی خـەلق دەشـاردرێتەوە و لـە جیلوەی زاتیشدا کردار و سیفات و زاتی مرۆڤ دەشارێتەوە و فانی دەبێت.

جیلوەی ئیلاهی لەناکاو دێت و پەیوەستە بە بڵندبوونەوەی ڕۆحی مرۆڤەوە هەروەك هەندێك لە گەورەکانی تەریقەت گوتوویانە: جیلوە بەبێ ئاگایی دێت، بەڵام بۆ سەر دڵی بە ئاگا دێت.

<u>بۆ ئەم زانیارییانە بڕوانە ئەم سەرچاوانەی خوارەوە:</u>

- د. سجادی، فرهنگ اصطلاحات و تعبیرات عرفانی.
- عطاءالله، تدین جلوەهای تصوف و عرفان در ایران و جهان.
- د. خرمشاهی، حافظ نامە، ج١، ل٥٩٨.

پاش ئەوەی سەحەری و شەوی رابردوو خواجەیان لە خەفەت و خەم دەرهێناوە، لـە پرتـەوی زاتی حەق بێ هۆش بووە.

واتە: لە جیلوەی حەق شارامەوە (وەك حەزرەتی موسا بێ هۆش بوو) یـاخود لێـرەدا بـەواتای بێ هۆش بوونە لە دونیا و (غیبت) ە، دەڵێ: شەوی رابردوو دوای ئەوەی لە تیشکی زاتـی حەقـدا بێ هۆش بووم جیلوەی سیفاتی هاتە سەر دڵم. یان لە شەڕابی جیلوەی سیفات شەڕابیان پێدام.

عارفەکان بڕوایان وایە کە پێویستە مرۆڤ بە پلەیەك لە پاکبوونەوە بگات تا بە پلەی جیلـوەی سیفاتی حەق وەك گوتمان بگات، لەم بەیتەدا میسراعی یەکەم لەم بەرزبوونەوەیە ئەدوێت.

**٣ — چە مبارک سحری بود و چە فرخندە شبی**

**آن شبِ قدر کە این تازە براتم دادند**

چ بەرەبەیانێکی موبارەك و شەوێکی پیرۆز بوو ئەو شەوی قەدرەی کە ئەم سەنەد و قەواڵـە تازەیان پێدام.

فرخندە: پیرۆز — موبارەك

برات: سەنەد، قەواڵە، (بەرات) ئاماژەیە بە شەوی بەرات کە شەوی (١٤ — ١٥)ی مانگی شەعبانە، خەڵك وایە کە خوا — لەو شەوەدا بڕیاری رزق و رۆزی دەرئەکات و هەر لەو شەوەدا لە موسڵمانان و تۆبەکاران خۆش دەبێت.

هەروەها (برات) بەواتای (براءة الذمە) دێت کە نووسراوێکە لەلایەن کاربەدەستانەوە بەو کەسانە دەدرێت کە باج و خەراجیان لەسەر نەمابێت.

خواجە باس لە موبارەکی و پیرۆزی ئەو سەحەر و شەوە دەکات کە تیایدا لە کۆت و دادی دونیا رزگاری بووە و دەڵێت ئەو سەحەر و شەوە چەند پیرۆز و موبارەك بوو کە وەك شەوی قەدر سەنەدی رزگاری و لێ خۆشبوونیان پێدام.

د. خرمشاهی پەیوەندی نێوان شەوی قەدر و شەوی بەرات لەم بەیتەدا بۆ ئەو فەرموودەیە دەگێڕێتەوە کە لە (عکرمە) وەرگێڕاوەتەوە و شەوی قەدر بە بەرات دەزانێت یاخود ئەو گوتەیەی کە — ابوالفتح — لە (تفسیر ابوالفتوح) دا هێناویەتی و دەڵێ: ابوالضحی لە عبداللەی کوڕی عەباسەوە گێڕاوەتەوە کە گوتوویەتی خوای گەورە حوکمەکان لە شەوی بەراتدا دەردەکات و لەشەوی قەدردا بە فریشتەکانی دەسپێرێت) {حافظ نامە، ج ١، ل ٦٧٢ }.

**٤ — بعد ازین روی ِمن و آینەی وصف جمال**

**که در آنجا خبر از جلوەی ذاتم دادند**

دوای ئەمە ئیدی رووی من و ئاوێنەی وەسفی جمال (جوانی) لەوێدا هەواڵی جیلوەی زاتیان پێدام.

بعد ازین: دوای ئەمە.

(رووی من و ئاوێنەی وەسفی جەمال) واتە: رووی من هەمیشە لەو ئاوێنەیە دەبێت کە وەسفی جوانی مەعشوقی کردووە و جوانی ئەوی تیادا دەرکەوتووە.

خواجە پێی وایە کە لە ئاوێنەی وەسفی مەعشوقدا هەواڵی جیلوەی زاتیان پێداوە، ئەو ئاوێنەیەش ئەکرێ دڵی مورشیدی کامڵ یاخود جیهان و مەخلوقات بێت کە بە جیلوەی حەق ئەدرێتە قەڵەم.

لە بەیتی دووەمدا و لە قۆناغ و جۆرەکانی جیلوەکردندا جیلوەی کردار و جیلوەی سیفات و جیلوەی زاتمان باسکرد، لێرەدا خواجە لە دوو جیلوەی دووەم دەدوێت کە جیلوەی سیفات و زاتن و دەڵێ لە جیلوەی سیفاتدا کە قۆناغێکی پێش جیلوەی زاتە هەواڵی جیلوەی زاتمان پێ دەدەن، بۆیە لەمەودوا من بەردەوام چاو لە جیلوەی سیفات یاخود ئاوێنەی جوانی مەعشوق — مورشید یا مەخلوقات — ناتروکێنم و هەمیشە چاوم لێیەتی.



سیفات هەمیشە رێنماییکەرێکە بۆ گەیشتن بە زات. شێخ جونەیدی بەغدادی دەڵێ: (سیفاتی ئەو رێنماییکەری زاتی ئەوە و زاتی ئەو رووناککەرەوەی زاتی ئەوە) { لاهوری، ج ١، ل ١٢٠١ }هەربۆیە زۆرێك لە عارف و خواناسان رستەی (عرفت الله بالله) یا (عرفت ربی بربی)یان دووبارە کردۆتەوە.

**٥ — من اگر کامروا گشتم و خوشدل چه عجب**

**مستحق بودم و اینها به زکاتم دادند**

من ئەگەر خۆشبەخت و شاد بووم چ عەجەبە، چونکە موستەحەق بووم و ئەمانەیان وەك زەکات پێدام.

کامروا: خۆشبەخت، (بە ئاوات گەیشتوو)    گشتم: بووم    خوشدل: دڵخۆش، شاد

مستحق بودم: موستەحەق بووم، حەقم بوو، پێم دەشیا    زکات: زەکات

خواجە دەڵێ من کە خۆشبەخت و دڵشاد بووم و خەفەتم نەما هیچ جێگەی سەرسوڕمان نییە، چونکە موستەحەقێ بووم و زەکاتم پێدەشیا و ئەمانەیان (خۆشبەختی و شادی) وەك زەکات پێدام.

لە شەرحی موستەحەق بووندا بە زۆری ئەوە گوتراوە کە قوناغەکانی سیر و سلوکم بڕیوە و شیاوی ئەو پلە و مەقامە بووم، بەڵام لەڕاستیدا موستەحەق بەزەکات لە بێ هیچی و نەداریدا پێی دەدرێت نەوەك لە بڕین قۆناغەدا بڵوکە لە عیشقکدا سووتام و خوداش ئەم لوتفەی لەگەڵ کردم و خۆم بەدەستم نەهێناوە.

**٦ — هاتف آن روز به من مژدەی این دولت داد**

**که بدان جور و جفا صبر و ثباتم دادند**

هاتف ئەو رۆژە مژدەی ئەم خۆشبەختییەی پێدام، کە لەبەرامبەر ئەو جەور و جەفا (یەی مەعشوقدا) ئارامی و خۆڕاگرییان پێدام.

ثبات: خۆڕاگری

(هاتف) یا فریشتەی پەیامهێنەری غەیب هەر ئەو رۆژە ئەم موژدەیەی پێدام کە لە بەرامبەر جەور و جەفا و زوڵم و ستەمی مەعشوقدا ئارامی و خۆڕاگرییان پێ بەخشیوە و توانای هەڵگرتنی باری گرانی عەشقم هەیە.

**٧ – این همه شهد و شکر کز سخنم می ریزد**

**اجرِ صبریست کزآن شاخِ نباتم دارند**

ئەم هەموو هەنگوین و شەکرە کە لە قسەم دەپرژێ، هەقدەستی سەبرێکە کە لەو (شاخ نبات) لقەدارە پێیان داوم.

شهد: هەنگوین، شیرین    میریزد: دەپرژێ، دەرزێ.

شاخ نبات: لقەدار، مەبەست لە قەڵەمەکەیەتی ـ یاخود ئەو ژنەیە کە لە بەیتی یەکەمدا ئاماژەمان پێکرد، واتە: بۆیە حافظ ئاوا گەورە و قسە شیرین بووە و شیرنی و شەکر لە شیعرەکانی دەرژێت و سەرنجڕاکێشن ئەوە پاداشتی ئەو سەبر و ئارامییەیان داوەتەوە کە لە بەرامبەر قەڵەمەکەیدا هەیبووە و بە پەلە شتی نەنووسیوە (ئەم واتایە ڕواڵەتی بەیتەکەیە) یاخود پاداشت و هەقدەستی ئەو سەبرەیە کەلە بەرامبەر دونیا و جوانییەکانی دونیادا هەمبووە.

- ﴿وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ بِشَيْءٍ مِنْ الْخَوْفِ وَالْجُوعِ وَنَقْصٍ مِنْ الاَمْوَالِ وَالاَنفُسِ وَالثَّمَرَاتِ وَبَشِّرْ الصَّابِرِينَ﴾ سورة البقرة، ئایەتی (١٥٥).

- ﴿سَلاَمٌ عَلَيْكُمْ بِمَا صَبَرْتُمْ فَنِعْمَ عُقْبَى الدَّارِ﴾ سورة الرعد، ئایەتی (٢٤).

- ﴿وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُمْ بِهِ وَلَئِنْ صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِلصَّابِرِينَ) سورة النحل، ئایەتی (١٢٦).

- ﴿وَاصْبِرْ فَإِنَّ اللَّهَ لاَ يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ﴾ سورة هود، ئایەتی (١١٥).

- ﴿وَاصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ وَلاَ تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ تُرِيدُ زِينَةَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَلاَ تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُ عَنْ ذِكْرِنَا وَاتَّبَعَ هَوَاهُ وَكَانَ أَمْرُهُ فُرُطًا﴾ سورة الکهف، ئایەتی (٢٨).

سەبر و ئارامگرتن: سەبر وشەیەکی قورئانییە و لە قورئاندا سەبر و موشتەقاتی نزیکەی سەد جار بەکار هاتووە و خوای گەورە زۆرجار داوا لە پێغەمبەر و بڕواداران دەکات کە سەبر بگرن کە ئەم سەبر کردنەش پاداشتی خۆی دەبێت، تەنانەت سەبر بە واتای ئستقامەت و بەردەوامی لەسەر ئایینی خودا هاتووە و خودا بەبەندەکانی دەفەرموێت: ﴿سَلاَمٌ عَلَيْكُمْ بِمَا صَبَرْتُمْ فَنِعْمَ عُقْبَى الدَّارِ﴾ سورة الرعد، ئایەتی (٢٤).

سەبر چەندین جۆری هەیە لەوانەش سەبرگرتن لەسەر موسیبەت و نارەحەتی کە لە ترس و برسێتی و کەمی پارە و بەروبووم خۆی دەبینێتەوە (البقرة، ١٥٥) هەروەها



سەبرگرتن لەسەر خۆشی نیعمەتەکان کە ئەم جۆری دووەمەیان زۆر نارەحەتە و سەبرگرتن لەسەر موسیبەت ئاسانترە.

لای عارفەکان سەبر پلەوپایەیەکی زۆر بەرزی هەیە و یەکێکە لە مەقامەکانی تەریقەت و مەقامی پێنجەمی حەوت مەقامی (تۆبە، وەرع، زوهد، نەقر، سەبر، تەوەکول، فەنا).

د. خرمشاهی سەبارەت بە سەختترینی جۆری سەبر لە ئیمام قشریەوە دەگێڕێتەوە...

(علي عبدالله بصري) ئەڵێ پیاوێك چووە لای ئەبوبەکری شبلی و پێی گوت کام سەبر گرتنە نارەحەتترە بۆ ئارامگرتن، گوتی سەبر لە خودادا (الصبر فی الله) گوتی نەخێر گوتی سەبر بۆ خودا (الصبر لله) گوتی نەخێر، گوتی سەبر لەگەڵ خودا (الصبر مع الله) گوتی نەخێر، شبلی وتی کەوایە چییە؟ کابرا گوتی سەبر لە خودا (الصبر عن الله) شبلی هاواری لێ بەرزبووەوە خەریك بۆ گیانی دەرچێت (الترجمە رسالە قشیریە، ل ٢٨١)   {حافظ نامە، ج ١، ل٦٧٥}.

سەبر گرتن لە خودا و لەگەڵ خودا و لەبەر خودا بۆ خودا هەریەکە جۆرێکن، بەڵام لای عارفەکان سەبر لەگەڵ خودا تەحەمول کردنی رازی عەشق گەورەترین جۆری سەبرە.

(هما نواب) لە کتێبی (شعلە های عرفان) کە کتێبێکی سادەیی لەسەر عیرفان –مەقامی سەبری لە عیرفاندا کردوو بە (٩) قۆناغەوە، یەکێك لەو قۆناغانەدا سەبر گرتنە لە بەرامبەر پاراستنی نهێنی و ئەسراری عەشقدا و فاش نەکردنیان کە ئەکرێ خواجە لەکاتی باسکردنی سەبردا چاوێکی لەم جۆرە سەبرە بێت { شعلەهای عرفان – هما نواب / بهار ١٣٦٨ – چاپ اول، ل ١٩٠ }.

**٨ – همّت حافظ و انفاسِ سحرخیزان بود**

**کــه زبندِ غم ایّام نجــاتم دادند**

هیمەتی حافظ و دۆعای نفوسی شەوبێداران بوو، کە لە کۆت و بەندی غەمی ڕۆژگار ڕزگاریان کردم.

انفاس: دۆعا و نفوس    سحرخێزان: شەوبێداران

خواجە ڕزگار بوونی لەکۆت و بەندی غەمی رووخساری خەفەتی ڕۆژگار و چوونە نێو دونیای بڵندی و ڕۆح بۆ دوو هۆکار دەگێڕێتەوە کە یەکەمیان ئیراد و هیمەتی خۆیی و دووەم دوعا و نزای پیاوچاکان و شەوبێداران.

## غەزەلی سەد و هەشتایەم:

### بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی مەقسور
### (فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلان)

**١ — دوش دیدم کە ملائك در میخانە زدند**

**گل آدم بسرشتند و بە پیمانە زدند**

شەوی رابردوو (دوێنێ شەو) بینیم کە فریشتەکان لە دەرگای مەیخانەیان دا و گڵی ئادەمیان خۆشکرد و بە پێکەوە (بە عەشقەوە) دروستیانکرد.

ملائك: فریشتەکان درمیخانە زدند: لە دەرگای مەیخانەیان دا، هاتنە مەیخانە

گل: گڵ آدم: حەزرەتی ئادەم ـ د.خ -

بسرشتند: خۆشەیان کرد، شێلایان، تێکەڵاویان کرد، گرتیانەوە، دروستیانکرد.

ئەم غەزەلەی حافظ یەکێکە — وەك غەزەلی پێشوو — یەکێکە لەو غەزەلە عیرفانییانەی کە لەڕووی وشە و سەرزاری و رواڵەتییەوە هەموان دان بە عیرفانی غەزەلەکەدا دەنێن. غەزەلەکە تاڕادەیەکی زۆر یەکێتی بابەتی تێدایە — بە پێچەوانەی زۆرینەی غەزەلەکانی دیکەی خواجە — باس لەسەرەتای دروستبوونی مرۆڤ دەکات لەلایەن خودای گەورەوە.

بێگومان رای باوی ئایینەکان سەبارەت بە دروستکردنی مرۆڤ لەلایەن خوداوە بەم شێوە کە خودا نموونەی جەستەی مرۆڤی لە گڵ و قوڕی دونیا وەرگرتووە و پاشان شێلاویەتی و جەستەی دروستکردووە و دواتر لەگیانی خۆیی تێکردووە.

چۆنیەتی دروستکردنی مرۆڤ و وردەکارییەکانی لە قورئانی پیرۆزدا باس نەکراوە تەنیا ئەوەندە نەبێت کە خودا ئادەمی لە قوڕ، گڵ دروستکردووە و لە رۆحی خۆیی تێکردووە و پاشان چیرۆك و گفتوگۆی نێوان خودا و فریشتەکان و کڕنووشی رێزی ئەوان بۆ ئادەم و یاخی بوونی شەیتان و دەرکردنیان لە بەهەشت و دەستپێکردنی ژیانی دونیا.

گەر سەیری تەفسیرەکانی قورئان و رای زانا و لێکۆڵەرە ئایینی و تەنانەت نائایینەکانیش بدەین کۆتایی نەهاتووە راو بۆچوونی — هەندێ جار سەرسوڕ هێنەر — لەسەر چۆنیەتی دروستبوونی مرۆڤ دەخنەڕوو.

عارفەکان لەکاتی باسکردنی خەلقدا زیاتر جەخت لەسەر ئەو چەمکانە دەکەنەوە کە عەشقی خودا بۆ مرۆڤ دەخاتەڕوو پلەی مرۆڤێك لای خودا و رۆحی پیرۆز بەرزدەکاتەوە. بۆ



نموونە لەتەفسیری کشف الاسرار دا هاتووە: (کە ئادەمیان لەسەر تەختێك دانا کە حەوت سەد پایەی هەبوو دووری نێوان هەرپایە یەك حەوت سەد ساڵ رێگە بوو، فەرمان درا کە ئەی جوبرەئیل و میکائیل ئێوە سەرۆکی فریشتەکانن ئەم تەختەی ئادەم هەڵگرن و بە ئاسمانەکاندا بیگێڕن تا شەرەف و پلە و پایەی ئەو بزانن و ئەوان کە گوتیان: (اتجعل فیها من یفسد فیها) ئەو کاتە عەرشەکەی ئادەمیان لەبەرامبەر عەرشی خوادا دانا و فەرمان درا لەلایەن خواوەندەوە — کە ئەی فریشتەکان ئێوە بڕۆن بۆ لای عەرشەکەی ئادەم و کڕنووش بۆ ئادەم ببەن، فریشتەکان هاتن و سەیری ئادەمیان کرد و هەموویان لە جوانی ئەودا مەست بوون) {کشف الاسرارمیبدی، ل٣١} .

هەر لە کشف الاسراردا ئەم فەرموودەیە هێنراوەتەوە کە — خلق الله علی صورتە — واتە خودا ئادەمی لەسەر شێوەی خۆی دروستکردووە و (نفخت فیە من روحی) لە رۆحی خۆشی بەشیداوە.

لە جەختکردنەوە لە جوانی مرۆڤ دا عارفەکان دەڵێن خودا چل ڕۆژ ئادەمی دانا تا بەجوانترین شێوە و احسن تقویم — (حسن صورکم) دەرکەوێت و هەر گەردێکی بە گوڵێکەوە شێلا و بۆنخۆش کرد.

لەڕاستیدا مەبەستی لەم هەموو زێدەڕۆییەی عارفەکان لە چۆنیەتی دروستکردنی ئادەمدا ئەوەیە کە بۆچوونی خۆیان سەبارەت بە عەشقی خودا بۆ مرۆڤ و خۆشەویستی مرۆڤ لای خودا تۆکمە بکەن.

مەیخانە لە زاراوەی عیرفانیدا جیهانی لاهوت و عەشقە، دوێنێ شەویش واتای نهێنی و تاریکی رازەکان دەگەیەنێت و خواجە لەکاتی باسکردن لە رازەکانی زۆرجار پشت بەم (دوشی)ە دەبەستێ.

خواجە هێندە نزیك باسی دروستبوونی مرۆڤ دەکات کە ئەسڵەن ئەڵێی ئەم شەوی رابردووە و فریشتەکان خۆیان رازەکانیان بۆ هێناوە. لەم بەیتەدا ئەو هێندە باس لە رەگەزی عەشق دەکات لە مرۆڤدا لە خودی چۆنیەتی دروستبوون نادوێت و دەڵێ: شەوی رابردوو بینیم فریشتەکان هاتنە مەیخانە و گڵی ئادەمیان بەشەڕابەوە شێلا و خۆشەیان کرد و ئادەمیان لێ دروستکرد. بێگومان مەیخانە شوێنی عەشقی ئیلاهی و شەڕابیش عەشقی ئیلاهییە، خواجە بەم موفرەدانەوە ئەوە دەڵێ کە شەوی خەلقکردنی مرۆڤ بەرلەوەی رۆحی بەبەردا بکەن ئادەم و ئادەمییان بە عەشقی ئیلاهییەوە شێلا و عەشقی ئیلاهی بەشێکە لە گیانی مرۆڤ و لێی جودا ناکرێتەوە.

**٢ — ساكنانِ حرم ستر و عفافِ ملكوت**

**با منِ راهنشين بادهی مستانه زدند**

دانیشتوانی حەرەمی نادیار و پاکێتی مەلەکوت، لەگەڵ منی سەرەڕێ نشیندا بادەیەکی مەستانەیان هەڵدا.

ساکنان: دانیشتوان ستر: شاراوەیی، داپۆشراوی و نادیاری عفاف: پاکێتی

راهنشين: سەرەڕێ نشین، هەژار و بێ ماڵ و سەرپا.

مەبەست لە دانیشتوانی جیهانی باڵا و مەلەکوتی ئەعلا کە پاك و شاراوەیە فریشتە پاکەکانی خودایە، خواجە باس لە شەوی رابردوو دەکات و دەڵێ: فریشتەکانی خوا لەگەڵ منی مرۆڤی هەژاری بێ ماڵ و سەرپەنادا کە وەك سواڵکەرێکی سەرەڕێم — بە هۆی ئەسیرییەوە لە جەستەدا — وەك مەستان پێکی شەڕابی عەشقیان هەڵدا. لێرەدا دوو مەبەست هەست پێدەکرێت. یەکەمیان: فریشتەکانی عالەمی مەلەکوتی ئەعلا کە بەرز و پیرۆز بوون لەبەر خاتری منی مرۆڤ کە لە بەندی جەستەدام و هەژار و فەقیری سەرەڕێم هاتنە خوارەوە بۆ سەرزەوی. دووەمیان: فریشتەکانیش پێکی عەشقیان هەڵدا چونکە دەیانزانی مایەی سەربەرزی من و خۆشەویستی من لای خودا هەر ئەو شەڕابی عەشق و عاشقییەیە.

ئەکرێ مەبەست ساکنان حرم ستر عنان سیفاتی ئیلاهی بن کە هاتوونەتە نێو مرۆڤەوە و بادەی مەستانەی عاشقانەیان لەگەڵدا نۆشیووە.

**٣ — آسمان بارِ امانت نتوانست كشيد**

**قرعهی كار بەنام منِ ديوانه زدند**

ئاسمان نەیتوانی باری ئەمانەت راکێشێ بۆیە ناوی منی دێوانەیان لە تیروپشکدا راکێشا.

نتوانست كشيد: نەیتوانی رایکێشێ، نەیتوانی بەرگەی بگرێ.

(ئەمانەت) لەبەیتەکەدا ئاماژەیە بە ئەمانەتی ئیلاهی کە جێنشینی خودایە لەسەر زەوی و بینینی رۆڵی مرۆیی و عەقڵ و ئیختیار و پاداشت و سزایە). بەیتەکە وەرگێڕانێکی شیعرییانەی زۆر ناسکی ئایەتی (٧٢)ی سورەتی (الاحزاب)ە، کە تیایدا باس لە سەرەتای (ئەمانەت) دەکات و خودا دەفەرموویت ئێمە ئەمانەتمان بۆ ئاسمان و زەوی و کێوەکان خستەڕوو کە هەڵی گرن، بەڵام ناتوانایی خۆیانیان دەرخست و خۆیانیان لێ دەرباز کرد و مرۆڤ هەڵیگرت، بەڕاستی مرۆڤ زۆر زاڵم و زۆر نەزان بوو — وەك دەفەرموویت: ﴿إِنَّا عَرَضْنَا الأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَنْ يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الإِنْسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُومًا جَهُولاً ﴾ سورة الأحزاب، الأية (٧٢). لەم ئایەتەدا هۆکاری رازی بوونی مرۆڤ



بەهەڵگرتنی باری ئەمانەتی ئیلاهی کە عارفەکان بە باری عەشقی ئیلاهی ئەدەنە قەڵەم هەردوو هۆکاری (زاڵمی و نەزانی)ن. عارفەکان زاڵمی بە زاڵمی مرۆڤ بەرامبەر بە نەفسی خۆی و نەزانیشی بە نەزانی بەرامبەر بە شتەکانی دەرەوەی خۆی (بەرژەوەندییەکان) ئەدەنە قەڵەم واتە مرۆڤ لە دوابەندی خۆی و بەرژەوەندییەکانی دەرچووبوو بۆیە توانی ئەمانەتی عەشقی ئیلاهی قەبووڵبکات. ئەم ئەمانەتەش بوونە مەحرەمی سیفات و ئەسمائی ئیلاهییە، بەگوتەی فەیلەسووفەکان (بۆ خودایەکی بچووکە).

بەڕاستی مرۆڤ دێوانە بوو کاتێ کە باری ئەمانەتی عەشق و بوونە مەحرەمی ئەسماء و سیفاتی ئیلاهی رازی بوو، دێوانەیەك کە تەنیا مەعشوق دەبینێت و جگە لە مەعشوق هیچ ناناسێت و نەزانە بەهەموو شتەکانی دەرەوەی ئەو. چەندە گەورە بوو ئەم دێوانەیە کە بە عەشق ئەو بارەی هەڵگرت کە کێو و ئاسمان و زەوی توانای هەڵگرتنیان نەبوو.

لە ژێر ڕووناکی ئەم بەیتەوە لەم ئایەتەدا ئاماژە بە سێ خاڵی گرنگ دەکەم لە راڤەی ئایەتەکەدا کە تا ئێستا لە تەفسیری رەسمییەکان — مەلاکانی — ئێمەدا نەگوتراوە.

١ — لای ئێمە ئەمانەت بە خواپەرستی دراوەتە قەڵەم، بەڵام لە تەفسیر — نامە مەئلوفەکانی دا — ئەمانەت بە کۆی ئەسماء و سیفات لێکدراوەتەوە کە لە مرۆڤدا هەیە، جگە لەمە لە خودی ئایەتەکەدا باس لەوە دەکرێت کە مرۆڤ رازی بوو بە هەڵگرتنی — بێگومان مرۆڤیش ئیماندار و بێ ئیمانیشە، بەڵام بەهرەی مرۆیی خواوەندیان تێدایە.

٢ — سموات و اراضی و جبال بە خودی ئاسمان و زەوی و کیوەکان لێکدراوەتەوە و گوتراوە کە ئاسمان و زەوی و کێوەکان رازی نەبوون و خۆیان دزییەوە، بەڵام محمد پارسا — کە لاهوری لەشەرحە (لاهوری، ج١، ل١١٨٠) عیرفانییەکەیدا نقڵی کردووە دەڵێ مەبەست لە جەبەروت و مەلەکوتی نێو ئاسمان و کێو زەوییە کە هەبوون و بەهرەی عەشقییان نییە.

٣ — لە تەفسیرە رسمییەکانی ئێمەدا لۆمەی مرۆڤ دەکرێت و زاڵم و جاهلی دەدرێتە پاڵ و دەگوترێ بۆیە رازی بوو، چونکە زاڵم بوو — لغتاً — واتە: نەیدەزانی شتەکان لە شوێنی ئەسڵی خۆیان دابنێ و هەروەها نەزان و جاهیلش بوو، بەڵام لە تەفسیرە عیرفانییەکاندا ئەم دوو زاراوە و وەسفە بە گەورەیی مرۆڤ لێکدراوەتەوە.

راستە ئەو باری ئەمانەتی مرۆڤ هەڵیگرت زۆر قورس بوو، بەڵام کاتێ مرۆڤ عاشق بوو بە ئومێدی رووخساری مەعشوقەوە تەواوی کێوەکانیش لەسەر شانی سووك دەبن، شاعیرێك دەڵێ:

**آن بار که از بردن آن عرش ابا کرد**

**با قوت تو حامل آن بار توان برد**

{به نقل از لاهوری، ج١، ل١١٨١}

واتە: ئەو بارەی کە عەرش خۆی لەبردنی پاراست، بەهێز و قوەتی تۆ (یار — خودا) ئەتوانرێ هەڵگیرێت.

بەهەرحاڵ کورتەی بەیتەکە دەبێتە، ئاسمان و زەوی و کێوەکان یا مەخلوقات و مەلەکوتی نێو ئاسمان و زەوی و کێوەکان خۆیان لە هەڵگرتنی باری ئەمانەتی خودایی (عەشق یا سیفات و ئەسماء) دزییەوە و نەیانتوانی هەڵیگرن، بۆیە منی دێوانەیان بۆ ئەم پلە و مەقامە هەڵبژاردووە لە قورعەدا دەریان هێنام.

**٤ — جنگِ هفتاد و دو ملّت همه را عذر بنه**

**چون ندیدند حقیقت رهِ افسانه زدند**

عوزر و بیانوو بۆ جەنگی هەفتا و دوو میللەت (فیرقە) بهێنەرەوە، چونکە ڕێگەی حەقیقەتیان نەدی بە ڕێگەی ئەفسانەدا ڕۆیشتن ئاوازی ئەفسانە بازی یان لێدا).

جنگ: جەنگ، جیاوزی و کێبەرکێ.

هفتاد و دو ملّت: حەفتا و دوو میللەت یا تایفە، ئاماژەیە بە فەرموودەی پیرۆزی پێغەمبەر (ﷺ) کە دەفەرمووێ: (افترقت الیهود علی احدی و سبعین فرقه، و تفرقت النصاری علی اثنین و سبعین فرقه، و تفرقت امت علی ثلاث وسبعین فرقه).

لە تەفسیرە رسمییەکان و دەقە جیاوازەکانی فەرموودەکەدا، لەم حەفتا و سێ فرقەیە و میللەتە تەنیا میلەتێکیان سەرفراز دەبێت و حەفتا و دووەکەی دیکە گومڕاه دەبن.

بەهەر حاڵ لە کتێبە مێژوویی و ئیسلامییەکاندا ناوی تەواوی حەفتا و دوو فیرقە گومڕاکە و میللەتە سەرفرازەکەش کە (ئەهلی سوونە و جەماعە)یە نووسراوە.

عذربنه: عوزریان بۆ بهێنەرەوە    ندید از: نەیانبینی    حقیقت: ڕاستی، حەق

ره افسانه زدند: ئاوازی ئەفسانەیان لێدا، شوێن ئەفسانە نەکەوتن و دەستیان دایە ئەفسانە بازی.

خواجە دەزانێت کە حەفتا و دوو فیرقەکەی ئومەتی ئیسلامی بەرێگەی حەقیەقەتدا نەرۆیشتوون و خەریکی خەیاڵ و ئەفسانە سازی بوون، بەڵام دەڵێ تۆ هێندە لە جیاوازی و خیلاف و جەنگ و جەدەلەکانی نێوانیان مەدوێ و عوزریان بۆ بهێنەرەوە، چونکە ئەوان بەرێگەی حەقدا نەرۆیشتن یاخود ڕاستتر ڕێگەی حەقیان نەدی و خەریکی ئەفسانەی بوون.



کرۆکی مانای بەیتەکە لەوەدایە کە عوزر بۆ جەنگ و جیاوازییەکی ئەوانی دیکە بهێنەرەوە.

**٥ — شکرِ ایزد که میانِ من و او صلح افتاد**

**حوریان رقص کنان ساغرِ شکرانه زدند**

شوکری خودا (یەزدان) کە لەنێوان من و ئەودا ئاشتی بەرپا بوو، حۆرییەکان بە سەماکردنەوە پێکی شوکرانەیان هەڵدا.

صلح افتاد: ئاشتی بەرپا بوو    رقص کنان: بەدەم سەماکردنەوە

ساغر شکرانه: پێکی شوکرانە، بێگومان لەکاتی ئاشتبوونەوەدا مەجلسێکی خۆشی و شادی ڕێکدەخرێت و پێکهەڵدانی شوکرانە و سوپاسگوزاری ئاماژەیە بەو مەجلیسی ئاشتییە.

خواجە سوپاس خودا (یەزدان) دەکات کەلە نێوان حافظ و ئەو (یاری حەق — خودا) دا ئاشتی و سوڵح بەرپا بوو، ئاشتبوونەوە، واتە: پاش ئەوەی کە باری ئەمانەتی هەڵگرت و بەتەواوی نزیکبووتەوە لەخودا، لەم کاتەدا حۆرییەکان — سیفاتی بڵند و بەرز کە لێرەدا بە حۆری ناویان دەبات — لەو کۆڕی ئاشتییەدا لە خۆشی و لە سوپاسگوزاریدا پێکی بادەی شوکرانەیان هەڵدا.

ئەم بەیتە لە نوسخە جیاوازەکاندا بەشێوەی جیاوازی ساغکراوەتەوە بۆ نموونە لەبری (ایزد) — (آنرا) هاتووە لەبری (حوریان) (صوفیان / قدیسان) هاتووە.

**٦ — آتش آن نیست که بر شعلەی او خندد شمع**

**آتش آن است که در خرمنِ پروانه زدند**

ئاگر ئەوە نییە کە مۆم بە گڕەکەی پێدەکەنێت، ئاگری ڕاستی ئەوەیە کە لە خەرمانی پەروانەیان بەردا.

حافظ لێرەدا جیاوازی لە نێوان ئاگری ماددی و ئاگری حەقیقیدا دەکات کە عەشقە و دەڵێ:

ئاگری حەقیقی ئەو ئاگرە نییە کە مۆم ـ کاتێ دادەگیرسێت و دەلەرزێ و ئەم لەرزینە بە پێکەنین ئەداتە قەڵەم ـ بەگڕ و تیشتەکەی داگیرسێت پێبکەنێت، ئاگری حەقیقی ئەو ئاگری عەشقی ئەزەلییەیە کەلە خەرمانی پەروانە — مرۆڤ — یان بەردا و بەجارێك سووتاندی.

**٧ — کس چو حافظ نکشید از رخ اندیشه نقاب**

**تا سرِ زلفِ سخن را به قلم شانه زدند**

کەس وەك حافظ ڕووبەندی لە ڕووخساری هەزر هەڵنراوەتەوە (لەو کاتەوە کە بەقەڵەم سەری زوڵفی قسەیان داهێناوم).

نکشید: هەڵی نەدایەوە — لای نەدا.   اندیشه: هزر، فکر.   شانه زدند: شانەیان کرد.

